# دەریای تاوان

## وەڵامێك بۆ كتێبی تاوانی بوخاری




نووسینی

مەروان عەزیز

پێداچوونەوە و لەسەر نووسینی

د.عادل شێخانی

مامۆستای زانکۆی سلێمانی

بسم الله الرحمن الرحيم

پێشکەشە بە:

پێشەواي فەرموودەناسان ( محمدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری رحمه الله )

بە هەر مسوڵمانێکی دڵسۆزی ڕابوونی ئیسلامی

تەواوی مامۆستا بەڕێزەکانم

دایك و باوکی خۆشەویست و خێزانی دڵسۆزم

## پێشەكی مامۆستای خۆشەویستم د.عادل شێخانی

## مامۆستای سكولّی زانستە ئیسلامییەكانی زانكۆی سلێمانی

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس‌و ستایش بیّ سنوور بۆ پەروەردگارو خواوەندی هەموو جیهان، بارانی دروودو میهری خودایی برِژیّ بەسەر گیانی پاكی پەیامبەری ئاخری زەمانو یارو یاوەرانو هەموو شوێنكەوتووان.

هەرگیز رِێگەم بە خۆم نەدەدا كە پێشەكی بۆ كتێبێك بنووسم كە باسی پێشەوای فەرموودەناسان "ئیمامی بوخاری" دەكرد، ئەگەر لە پێش تكای نووسەر هەستكردن بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر بە سوننەتی پێغەمبەرو هەلّگرانو پارێزەرانی نەبا!

لێرە حالّی من شاعیر وێنای دەكات كە دەلّێت:

إِذَا لَـــمْ تَكُـــنْ إِلا الأَسِـــنَّةُ مَرْكَبـــاً　　فَمَـــا حِيْلَـــةُ الْمُضْـــطَرِّ إِلا رُكُوْبُهَـــا

تانەدان لە بوخاری و كتێبەكەی كە رِاسترین كتێبە لە دوای قورئانی پیرۆز تانەدانە لە سوننەتی پەیامبەر(ﷺ) و تانەدان لە سوننەتیش تانە دانە لە ئەصلی نبوەت‌و رِیسالەت!

خۆشەویستی ئەهلی ئیسلام بۆ ئیمامی بوخاری، دەمارگیری نییە بۆ زاتی بوخاری، بەلّكو تەسلیم بوونە بە شایەدی هەموو زانایانی ئیسلام بەتایبەت پسپۆرِانی بواری فەرموودەناسی و شارەزایانی وردودروشت و كونج و كەلەبەری زانستی فەرموودەو هونەری تەسنیف‌و دانانی كتێب!

صەحیحی بوخاری خاوەنی دەیان شەرح و رِاڤەیە لەلایەن گەورە زانایانی خورهەلاّت و خۆرئاوای جیهانی ئیسلامی، بەشێوەیەك "تەراجوم" واتە: سەرباسی كتێب‌و ئەبوابی بوخاری‌و رِیزبەندی نێوانیان جێگای سەرسورِمان و رِامانو وردبوونەوەی زانایانی فیقە و فەرموودەیەو چەندین كتێب لەوبارەوە دانراوە!

تا لە نێو زانایاندا وەها مەشهورە كە "فِقْهُ الْبُخَارِيِّ فِي تَرَاجُمِهِ"

دەتوانن بۆ ئاشنابوونێكی خێرا بەم پەڕاوە نوورینەدا كە "صحيحي بوخاري"ە تەماشایەكی "هَدِيُ السَّارِي" پێشەكی "فَتْحُ البَارِي" پێشەوا "ابنُ حَجَر" بكەن، تا بزانن بوخاری كێیەو صەحیحی بوخاری یانی چی؟!

خۆ من لێرەدا نامەوێ خۆم لەقەرەی باس و وەسف و ناساندنی بوخاری بدەم، وەها كارێك زۆر لەوە قورسترە بەندە شانی بداتە بەر!

فەزایل و پلەوپایەی بوخاریش زۆر لەوە بەرزترە كە پێویستی بەوەبێت قەڵەمێك بۆ پارێزگاری لێ كردن پەرەی كتێبێك رەش بكاتەوە!

بوخاری ئیمامی دونیاو چیای زانستو زانیاریو خوداپەرستی و تەقوایە بێ ڕكابەر!

لەگەڵ ئەوەشدا زانایانی ئیسلام رێگرییان نەكردووە كە هەر كتێبێك جگە لە قورئان لەسەر ڕێورەسمی زانستی و بەپێی ڕێساو یاسای تایبەت بەو زانستەی تێیدا نووسراوە بخرێتە بەر باس و لێكۆڵینەوە.

سەحیحی بوخاری بەو گەورەیی و جەلالەتەوە لە رەخنەی زانستی و هونەری فەرموودەناسیەوە بێ بەش نەبووە پێشەوایەكی وەك "دارەقوتنی" هەنگاو بە هەنگاو و دێڕ بە دێڕ دیراسەی كردووەو لە ژێر ڕۆشنایی ئەو مەرج و مەنهەجیەتەی كە بوخاری بۆ خۆی داناوە كتێبێكی لەو بارەیەوە بە ناونیشانی "الإِلْزَامَاتُ وَالتَّتَبُّعُ" نووسیوە!

ئەوانەش كە ڕاڤەی "بوخاری"یان كردووە لەسەر مەتنو سەنەدی هەر فەرموودەیەك كە پێویستی كردبێت سەرنجی خۆیان فەرمووە!

بەڵام هەموو لەسەر ئەوە كۆكن كە بوخاری لوتكەیەو صەحیحەكەشی ناوازەو بێ وێنەیەو سەرچاوەی هەموو دەقەكانی فەرموودەیەو هەموو جۆگاو ڕووبارەكانی دی بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

دڵنیاشم مامۆستا "مەروان" بە پێویستی نەدەزانی كە ڕەددی كەسێك بداتەوە كە دوور لە هەموو رێورەسمێكی زانستی رەخنە لە بوخاری دەگرێت، لەوێشەوە بە ناشرینترین شێوە هێرش دەكاتە سەر سێ كوچكەی سوننەتی پێغەمبەر(خاتونی یەكەم "خاتوو عائیشە"و ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێت) .

ئەگەر خەڵكی بیانزانییایە كە ئەو كتێبە هیچ گرنگیەكی زانستی و لۆژیكی نییەو شایەنی خوێندنەوە نییە!

مەسەلەكەش تەنها بوخاری نیە! كاری بوخاری تەنها تەدوینو كۆكردنەوەی فەرموودەكانەو دەكرێت وەكو مێژوو نوسێكی كارامەو شارەزاو وردبین تەماشا بكرێت، كە بەپێی رێساگەلێكی زانستی ورد فەرموودە هەرە راستو درووستەكانی پەیامبەری ئیسلامی كۆكردوەتەوە.

وەلیّ مەسەلەكە هەوڵی روخاندنی بناغەی شەریعەتو بەیانی قورئانو چرای نبوەتە!

بوخاری تاوانی چی یە؟! مەگەر كۆكردنەوەی دەق تاوانە؟!

لە كۆتایی دا داوا لە خوێنەری ئەم كتێبە دەكەم با رێساو رێگای زانستی بكاتە پێوەرو سەبارەت بە فەرموودەو چۆنێتی كۆكردنەوەو تۆماركردنو زانستی فەرموودەناسیو "عِلْم الرِّجَال"و هونەری زاراوەكانی فەرموودە بخوێنێتەوەو با بزانێت ئەم زانستە چەند تۆكمەو بەهێزەو ئەوسا بەزەیی بە "ئۆززۆن"دا دێتەوەو دەزانێت چەندە داماوو مایە پوچو نەشارەزایە!

هاوكات خۆشەویستان ئاگاداربن كە "سوننەت" واتە قەڵاو شورای پۆلاَینی ئیسلام، هەر بۆیە هەمیشە دوژمنان لێرەوە دەیانەوێت گورزی خۆیان بوەشێنن!

بەلاَم "هیهات" لە بەرامبەر نووری نبوەتو چل چرای سوننەتا كەی دەیجور توانای بەرگری كردنی هەیە؟!

بۆ زیاتر ناسینی ئۆززۆن تەنها ئەم دەقەی بەسە كە لە كتێبی " الإسلام هل هو الحل"دا دەڵێت: (إنَّ الحَلَّ يَكُوْنُ فِي العَلْمَانِيَّةِ..وَلْيَكُن الدِّينُ مَا يَكُوْنُ إِسْلامِيًا ـ مَسِيْحِيًا ـ يَهُوْدِيًّا سَمَاوِيًا أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ عَامًّا أَوْ خَاصًّا، فَلا مَكَانَ لِلدِّيْنِ فِي سِيَاسَةِ البِلادِ وَالـمُوَاطَنَةِ كَمَا رَأَيْنَا فِي بُحُوْثِ كِتَابِنَا هَذَا..)[1].

---

[1] الإسلام هل هو الحل، لزكريا أوزون، ص: (١٤٥-١٤٦). درێژەی وتەكانم هێناوەو كردوومە بە كوردی لە كۆتایی كتێبەكەماندا لە ناساندنی زەكەریا ئۆززۆن.(مەروان)

داواكارم لە خوای گەورە پاداشتی مامۆستای بەڕێز كاك مەروان بداتەوە كە لەم كتێبە نایابەدا بە شێوەیەكی زانستی و ئەكادیمی ڕاستیەكان ڕوون دەكاتەوەو دەیسەلمێنێ كە جیاوازی نێوان ڕێبازی زانایان و ڕێبازی نەشارەزایان ئاسمانو ڕێسمانە!

بە ڕوونكردنەوەی ڕاستیەكانی قورئانو سوننەتیش ڕێبازی تاوانباران ئاشكرا دەبێت تا بزانرێت كێ تاوانبارە.

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَـٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾الأنعام

د.عادل شێخانی

زانكۆی سلێمانی

٢٨/رجب/١٤٣٧ھ

## پێشەكی

الحَمْدُلله الذِي أَنْزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الفُرْقَان، العَلِيِّ المُتَعَالِ الكَرِيْمِ المَنَّان، والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلَى مَنْ وَكّلَ إِلَيْهِ شَرْحَ كِتَابِهِ وَالبَيَان، نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ سَيِّدِ الإِنْسِ وَالجَآن، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ الّذِيْنَ أَتَوْ أَوَامِرَهُ بِغَيْرِ زِيَادَةٍ وَلا نُقْصَان، وَمَنِ اتَّبَعَهُمْ إِلَى يَوْمِ الجَزَاءِ بِإِحْسَان، أَمَّا بَعْدُ.

زۆر جار دەبینین بۆ چەند ساتێك هەوری تارو سیا ڕووناكی خۆر و شینایی جوانی ئاسمان دادەپۆشن، بەڵام هەرگیز نەماندیوە درێژە بكێشێت و تەنها بۆ ماوەیەكی كاتیەو نامێنێت، هەم جوانی ئاسمان و هەم تیشكی خۆر جارێكی تر دەردەكەونەوەو دەبنەوە میوانی شەیدایانیان.

جار جارە هەندێك كەف و خاشاك سەر ڕووی ئاوی سازگارو جوانی ڕووبار دادەپۆشن و نایەڵن بەدیاركەوێت، بەڵام ماوەی تەمەنیان دیاریكراوەو تەنها لەكاتی وەستاویی و مەنگی ئاوەكەدا بوونیان هەیە، هەر ئەوەندەی شەپۆلێك دروستبوو ئیتر تێكڕا كەنار دەكەون و ئاوی سازگاریش بۆ جارێكی تر دەردەكەوێتەوە.

بۆیە لات سەیر نەبێت ئەگەر كەسانێك هاتن و ویستیان پێش بەخۆری ئیسلام بگرن و سەرچاوەكانی لێڵ بكەن، چونكە لە كاتی وەستانی زانایان و خەمخۆرانی ئیسلام و لاوازی مسوڵمانانندا ئەمە دێتە ئاراوە.

بەڵام هەرگیز بەردەوامی بەخۆیەوە نابینێتو هەر دەبێت ئەو خۆرە هەموو جیهان بگرێتەوەو بەڵێنی خوای گەورەیەو هەر دەبێت بەو شێوەیەبێت.

بەدرێژایی مێژوو هەوڵدراوە بۆ تێكدان و شێواندنی حەقیقەتی ئیسلام و سەرچاوەكانی، لەلایەن چەندین دەستەو تاقمی جیاجیاوە كە هەر یەكەو بە دروشمێكەوە هاتوەتە مەیدان، بەڵام هەموو خاوەن یەك ئامانج و مەبەستبوون ئەویش: گومان دروستكردنە لەسەر ئیسلامی مەزن!

ئەكرێت ئەو گومانانە بۆ ماوەیەك لەلای خەڵكی بـێن بـە ڕاسـتی و مـۆركی زانسـت و حەقیقەتیان بدرێتێ، بەڵام دوای ئەوەی وەڵام درانـەوەو ڕوونكرانـەوە ئـیتر دەپوكێنـەوەو ناتوانن لەبەرامبەر شەپۆلی بەهێزی بەڵگەدا خۆیان ڕاگرن!!

بەدرێژایی مێژوو دەبینین خوای گەورە خەڵكانێكی هێناوەتەبوون بۆ وەڵامدانەوەی چەواشەكاران و لادانی پەردە لەسەریان و هەڵماڵینی خیانەتە زانستیەكانیان، هەم بە نووسین و هەم بە گفتوگۆی زانستی.

هەرچەندە ئێمە شیاو نین كە لەو مەیدانەدا ئەسپی خۆمان تاودەین و شوێن دەستمان دیاربێت، بەڵام وەكو زیندووكردنەوەی ڕێبازی ئەوان كاتێك بینیمان وا خەڵكانێك خەریكی تانەدانن لە سوننەت بە تێكڕاو فەرموودەكانی پێشەوا بوخاری بە تایبەت، زنجیرەیەك وتاری بینراومان بڵاوكردەوە بە ناوی "وەڵامدانەوەی نەیارانی سوننەت" و تێیدا توانیمان تیشك بخەینە سەر هەندێك بابەتی گرنگ كە جێی باس و خواسە لەم ڕۆژگارەدا.

وا ئێستاش بۆ جارێكی تر بینیمان كتێبی "تاوانی بوخاری"[١] كە نووسراوێكی "زەكەریا ئۆزۆن"ەو وەرگێڕدراوە بۆ زمانی كوردی وبەشێك لە خەڵكی پێوەی سەرقاڵن، لەكاتێكدا كتێبەكە پڕیەتی لە خیانەت و چەواشەكاری و زیادەخستنە سەر و پچڕاندنی دەقەكان و شێواندنیان و ...هتد، بۆیە بە پێویستم زانی هەستم بە وەڵامدانەوەی بەپێی توانای كەمی خۆم، هەروەها دەستپێكی كارەكەشم بەراوردكردن بوو لە نێوان دەقە عەرەبی و كوردیەكەدا، بۆ ئەوەی دڵنیابم لەوەی كە وەكو خۆی وەرگێردراوەو خیانەتی تێدا نەكراوە، بەڵام ئەنجامەكان زۆر سەیربوون وەكو دواتر لە بابەتەكانی كتێبەكەدا دەیبینن، بە ویستی خوای گەورە.

---

[١] وەرگێڕانی: ئارام حاجی، پێداچوونەوەی: هاوژینی مەلا ئەمین، پـرۆژەی هاوبەشـی مـاڵی سـوهرەوەردی و ناوەندی غەزەلنوس.

كاتێك كتێبەكەم بینی هەر بە وێنەی بەرگەكەیدا بۆم دەركەوت ڕقێكی زۆر شاراوە هەیە بەرامبەر پێشەوا بوخاری(ﷺ)، چونكە وێنەیەكی لیێڵ و ناڕونیان داناوە كە ئاماژەیە بۆ خراپی و ناڕوونی ئەو زاتەو كردویانە بە دووكەرتەوە ئەویش ئاماژەیە بۆ نیفاق و دوڕوویی[1]!!

خوێنەری خۆشەویست! ئەم نووسراوەی بەردەستت لەسەر بابەتێكی حەق و ڕەوا نووسراوەو ئەگەر بێت و من تێیدا سەركەوتوو نەبم مانای وا نییە ئەو بابەتە لە بنچینەدا ڕاست نیە، بەڵكو هەڵەكە لە منە كە نەمتوانیوە مافی خۆی پێ بدەم هەروەكو چۆن پارێزەرێك نەتوانێت ڕەوایەتی دۆسێیەكی حەق دەر بخات و مافەكەی بۆ بگێڕێتەوە، دەلالەت ناكات لەوەی كە ئەو دۆسێیە حەق نیە!

هەروەها كاتێك وتاربێژێك دێڕە شیعرێكی "نالی" یان "مەحوی" یان "موتەنەبی" و "بوحتوری" بە لاوازی ئەدا دەكات و هیچ ڕۆحێكی تێدا ناهێڵێتەوە، مانای وا نییە شیعرەكە لاوازە، بەڵكو ئەو وتاربێژە نەیتوانیوە باشی ئەدا بكات!

جا تۆش بزانە ئەم وەڵامە لەلایەن فێرخوازێكی سەرەتایی ئەم ئیسلامەوەیەو مەرج نییە لە هەموو شتێكدا ڕاستیی میوانی بێت و ئەكرێت لە زۆر شوێندا پێی هەڵخلیسكێت، بۆیە هەرگیز بانگەشەی ئەوەش ناكەم لە هەموو خاڵێكدا پێكاومە.

ئەم وتانەشم مانای وا نییە نەمانتوانیبێت وەڵامی ئۆزۆن بدەینەوە، یان دڵنیا نەبین لە وەڵامەكانمان، سوپاس بۆ خوای گەورە كتێبەكە "تاوانی بوخاری" زۆر لەوە لاوازترە كە تۆ بیری لێ دەكەیتەوەو تەنها یەك گومانیش نەماوە كە لەسەری نەوەستابین و قسەمان لەسەری نەكردبێت، تەنانەت كاتێك كتێبەكەم خوێندەوە تەنها چەند شتێكی كەمی تێدابوو كە نوێبن و پێشتر نەمبیستبێت و پێویست بەوە بكات بەدواداچوونی بۆ بكەم،

[1] ئێمەش كاتێك وێنەیەكمان داناوە لەسەر بەرگەكەی مەبەستمان پێی پێشەوا بوخاری نیەو بە ڕەوای نابینین وەها كارێك، بەڵكو تەنها بۆ ناسینەوەی كتێبەكەیەو بۆ ئەوەی بزانرێت وەڵامی كتێبی "تاوانی بوخاری"یە.

چونكە سەرلەبەری كتێبەكە هێنانی وتەی نەیارانی تربوو، ئێمەش چەندین ساڵ لەوەو پێش ئەو كتێبانەمان پێشچاو كەوتبوو، ئیتر ئەم جارەیان لای ئێمە كۆنبوو چونكە بەدواداچوونمان كردبوو بۆ هەموو وتەكان لەكاتی خۆیدا، بۆیە وەڵامی ئەم كتێبە نە كاتێكی وەهای ویست و نە ماندووبونێكی بەرچاو، چونكە هەمان وتەی ڕۆژهەڵاتناسان و نەیارانی سوننەی هێنابوو كە پێش خۆی نووسیویانە و وەكو خۆی دایناوەتەوە، بۆیە تەنها یەك وتەشی نەماوەتەوە كە نەمانخستبێتە ژێر پرسی عەقل و بەرپەرچدانەوەی زانستیەوە، وەكو لە درێژەی كتێبەكەدا دەبینن بەوپەڕی لەسەر خۆیی و ڕەچاوكردنی ئەدەبەوە، هەموویمان خستوەتە ڕوو بۆ ئێوەی خۆشەویست.

خوێنەری خۆشەویست: نامەوێت ڕاستگۆ نەبم لەگەڵت وەكو زۆر نووسەری تر كاتێك نێتی ڕاستیان لە خوێنەر دەشارنەوە، بۆیە پێت دەڵێم: كاتێك ئەم كتێبەم خوێندەوە بە چاوی ڕەخنەوە خوێندمەوە!! چونكە كەسێك كتێبەكانی سوننەتی خوێندبێتەوەو لێیان تێگەیشتبێت و لەسەری هەمووشیانەوە "سەحیحی بوخاری" هەرگیز ناكەوێتە گومانەوە لەوەی كە هەموو ئەو دەقانەی لەبارەی ئاینەوە تێیدایە سرووش و وەحی خوای گەورەیە، ئەوە كەسێكە بە گومانە كە لێیان تێنەگەیشتبێت و نەچوبێتە قوڵایی ماناكانیانەوە!

جا ئەگەربێت و ئەم كارەش یەكێك لە كەسە لێهاتوو زاناكانی ئیسلام بیكردایە بێگومان وەڵامەكە چەندهێندەی ئەوەی من بەهێز دەبوو، بەڵام ئەم جۆرە كتێبانە پێویستی بەوە نییە زانایانمان كاتی خۆیانی بۆ تەرخان بكەن، پێویستە فێرخوازی سەرەتایی وەكو من ئەم كارانە بگەیەنێتە ئەنجام!

چونكە ئەوانەی دژایەتی سوننەت دەكەن هێندە لاوازن ناتوانن لە ئاستی فێرخوازێكی سەرەتایی فێرگای سوننەت بوەستن، چ جای بگاتە زاناو كەسە پسپۆڕەكانمان، هەروەكو عەمری كوڕی كولسومی گەورە شاعیری چاخی نەمافی لە وەسفی هۆزەكەیدا دەڵێت:

إِذَا بَلَــغَ الرَّضِــيْعُ لَنَــا فِطَامــاً     تَخِــرُّ لَــهُ الجَبَــابِرُ سَــاجِدِيْنَا

واتە: شێرە خۆرەكانمان هەر ئەوەندەی لە شیر بڕانەوە، ئەوا دەسەڵاتدار و زۆردار و ملهوڕان لە ترسا كڕنوشیان بۆ دەبەن!

لە كۆتاییدا داوام وایە لە خوای گەورە بیكاتە توێشووی قیامەت و مایەی سوود بۆ تێكڕای مسوڵمانان و لە هەڵەو كەم و كورتیشمان ببورێت.

وَ آخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِيْنَ، وَصَلِّ اللهُمَّ وَسَلِّمْ وَبَارِكْ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِيْنَ.

تكاكاری بەزەیی خوای گەورە:
مەروان عەزیز
سلێمانی/مەجید بەگ
شەوی پێنج شەممە ٢٢/٦/١٤٣٧كۆچی
٣١/٣/٢٠١٦ كاتژمێر(١٣: ١)
salafimarwan@gmail.com

## چەند تێبینیەكی گرنگ لەبارەی كتێبەكە

بەباشم زانی لەسەرەتای كتێبەكەماندا چەند تێبینیەك باس بكەین بۆ زیاتر ئاشنابوون و تێگەیشتن لە بابەت و دەستەواژەكانی، ئەوانیش:

ئەگەر گومانەكانی كتێبی "تاوانی بوخاری" لە هەر بابەتێكدا زۆربوبێت، ئەوا دابەشمان كردووە بەسەر چەند خاڵێكدا، بۆ ئەوەی تەواو گومانەكەی بەرچاوبێت و هیچ گومانێكمان بەسەردا تێپەڕ نەبێت.

هەندێك جار دەقی وەرگێڕانەكەمان نەهێناوە لەبەر نەبەخشینی مەبەستی نووسەر، هەركاتێكیش ئەمە كرابێت ئاماژەمان بە ژمارەی لاپەڕەی دەقە عەرەبی و كوردیەكەش كردووە.

هەندێك جار ئەو وتانەی دەیهێنم لە "تاوانی بوخاری" بێزارت دەكات، لەبەر خراپی ئاستی داڕشتنی وەرگێڕانەكە، هیوام وایە منی پێ تاوانبار نەكەیت.

جاری وا هەیە فەرموودەیەكی درێژ دەهێنینەوە كە پێویست بە هەمووی ناكات و گرنگتر وایە بەس ئەو بەشەمان بهێنایە كە جێگەی ڕەخنەیە، بەڵام بۆ ئەوەی گومانی پچڕاندن و شاردنەوە بنبڕ بكەین بۆیە بەناچاری هەمووی دەهێنین، چونكە نووسەر هێناویەتی و نەدەبوو هەمووی بهێنێت.

تەفسیری ئایەتەكانمان هەمووی نەكردووە، مەگەر ئەوانە نەبێت كە پێویست بووە ڕوونكردنەوەیەك بدەین، ئەمیش لەبەر بوونی تەفسیر لە هەموو ماڵەكانداو، درێژ نەبوونەوەی كتێبەكەو زیاتر نەبوونی قەبارەكەی لەوە زیاتر.

چەند هێمایەكی بەكارهاتوو:

ع: دەقی وتەكەی ئۆزۆن لە كتێبە عەرەبیەكەدا.

ك: دەقی وەرگێڕانەكە.

پ: پەراوێز.

هـ: هامش.

## چەند هەلَوێستەیەك لەسەر پێشەكییەكەی وەرگێڕ

وەرگێڕی بەڕێز هەرچەندە چەند دێڕێكی كەمی نووسیوە، بەلاَم ڕقو كینەیەكی یەكجار زۆر و بیَ سنووری حەشارداوەو هەندێكیشی ئاشكرا كردووە، بۆ نموونە دەلَێت:

(نووسەری ئەم كتێبە گولَبژێرێك لەو فەرموودانەی هەلَبژاردوەو لە ڕوانگەی دروستیی عەقلَی و ئاینیەوە گفتوگۆی كردوون و دەیەوێت ئەو ئیسلامەمان پیَ بناسێنێت كە فەرموودەپەرستان پەیڕەوی دەكەن ...)

سەرەڕای ئەوەی ئێمە بە ویستی خوای گەورە پرسی(عەقلَ)و بڕیارەكانی لەكاتی گفتوگۆمان لەگەلَ زەكەریا ئۆزۆن ئەوروژێنین و باسی ئەكەین ئایا عەقلَ و ژیریی و هەست و نەست ئەتوانن ڕاستەوخۆ بگەنە پەی بردن بە ڕاستیەكان یاخود نا؟!

بۆیە ئێستا نایەن ڕوو بكەینە وەرگێڕی بەڕێز و لەگەلَی بدوێین لەمەڕ ئەوبابەتە، بەلاَم ئەم دێڕەی وەرگێڕ" فەرموودەپەرستان" بەلاَی منەوە سەیربوو لەهەمان كاتدا نەدەبوو سەیربێت!!

سەیربوو چونكە ئەم دەستەواژەیە بە چی مافێك ئەدا بەسەر مسولَمانانداو لەكەداریان ئەكات بەغەیری پەرستنی خودای گەورە، مسولَمان وەك چۆن بڕوایان بە وتەی خوای گەورە هەیە كە بریتییە لەو قورئانەی كە دەستكاری نەكراوەو گەیشتوەتە دەستمان شوێن زانست و وتەكانی ئەكەون و لەڕێگەیەوە پەرستشی خۆیان بەجیَ دەگەیننن و تینوێتی خۆیانی لیَ ئەڕەوێننەوە، بەلاَم ناپەرستن و بەندایەتی بۆ ناكەن بەلَكو پابەندی دەبن و شوێنی ئەكەون، جا ئەگەر مسولَمانان قورئان نەپەرستن فەرموودە چۆن دەپەرستن؟!

هەرچەندە نووسەر ڕەنگە لە وشەی پەرستن مەبەستێكی تری هەبێت بێجگە لەوەی كە ئێمە لەسەری ڕاهاتووین، بەلاَم لە تانەو تەشەر زیاتر شتێكی تر هەلَناگرێت و ئەمەش لە نرخی زانستی كتێبەكە كەم دەكاتەوە، كاتێك كە خوێنەر ئەبینێت دوای چەند دێڕێك خێرا هێرشكردنی تێدایە.

نەدەبوو لاشم سەیربێت‌وهیچ سەیرییەك نەما كاتێك كتێبەكەم بەتەواوی خوێندەوەو بەراوردم كرد لەگەڵ چاپە عەرەبیەكەی ئۆزۆن، لەوێوە چیرۆكی خیانەت و دەستكاریكردن و چەواشەو گۆڕانكاری دەستی پێكرد، نەدەبوو وەرگێڕ بێدەنگبێت لەو هەموو خیانەتەی "ئۆزۆن"و پەردەپۆشی بكات، بەلام نەك هەر بێدەنگ نەبوو بەڵكو لە زۆر شوێندا زیادەشی ئەخاتە سەر وەكو لە تەواوی كتێبەكەدا ئەیبینن، ئیتر من لێرەوە بۆم دەركەوت كە ئیشەكەی "ئۆزۆن"یش و وەرگێڕیش بۆ خوای گەورەو بەدەستهێنانی ڕازیبوونی نیەو ئیتر هیچ مایەی سەرسوڕمان نییە ئەگەر هەر وشەیەكی نەشیاو و زبرو خراپ بەكاربێنن.

پاشان دەڵێت: (چیدی ئاین لە گێڕانەكانەوە وەرنەگرین و هەستی ئاینیی ڕاستەقینەی خۆمان بكەینە مەحەك بۆ پەسەندكردنی ئەوەی كە بە ناوی ئاینین و فەرموودەوە لە ڕابردوەوە پێمان گەیشتووە ...) لا: ٨

ئەم وتانە هەمووی لە كتێبەكەدا بە شێوەیەكی زانستی دوور لە سۆزو عاتیفە وەلام ئەدرێنەوە بە ویستی خوای گەورە، چونكە نووسەری كتێبەكەش ئەم وتانەی وتووە و وەرگێڕیش بەشێوەیەكی تر دایڕشتوونەتەوە.

دواتر باس لەمەبەستی خۆی ئەكات لە وەرگێڕانی ئەم كتێبەداو دەڵێت: (وەگەڕخستنی ژیری و بیری ساغ و ویژدانی زیندوو لە پێناو خزمەتكردنی ئاین و بەرەو پێشبردن و دەستپێوەگرتنیدا وەك سەرمایەیەكی ڕۆحیی گەلانی مسوڵمان ئامانجی سەرەكی ئێمەیە لە وەرگێڕانی ئەم كتێبەدا) لا: ٨

من وانابینم كە ئەوە مەبەستی وەرگێڕبێت لەبەر ئەو هەموو نەپاراستنی حورمەتی زانست و خۆڵكردنە چەوی خوێنەرو خیانەتكردنەی، وەك دەیبینن بە ویستی خوای گەورە.

وەرگێڕ بۆ شەرعیەتدان بە چەواشەكانی خۆیی و مامۆستاكەی، ئەیەوێت لەڕێگەی چەواشەوە جێگاو ڕێگا بكاتەوەو بەویستی خۆیان لە هەموو بابەتێكدا بدوێن و وتەی خۆیان هەبێت ئەگەر چی شارەزایشیان نەبێت‌و دەڵێت: (گرفت چیە لەوەی بپرسین ئاخۆ تەواوی فەرموودەكانی پێغەمبەر(د.خ) سرووشتی خودایین؟ یاخود شیاون بۆ ئەوەی ببنە

سەرچاوەی بڕیار و یاساكان؟ یاخود هەمویان پیرۆز و بیٚ لەكەو پەڵەن؟ یاخود... تێگەیشتنی ئێمە لەبارەیانەوە پێویستی بە پێداچوونەوەی ڕاستەقینە هەیە؟) لا: ٨

ئێمەش دەڵێین گرفت نییە لەوەی وەها پرسیارێك بكەیت و بەدواداچوون بكەیت و خۆت بگەیتە تەواوی ڕاستیەكان، بەڵام ئەوەی كە ڕێگەی پێنەدراوە خیانەت كردن و شێواندنی ڕاستیەكانە وەكو لەم كتێبەدا لە زۆر شوێندا بەرچاو دەكەوێت.

ئەم چەند دێڕەی بەردەستت تەنها وەكو ئاشنابونی تۆی خوێنەری بەڕێزبوو بە وەرگێڕی كتێبەكە نەك زیاتر، بۆیە نامانەویٚ لەوە زیاتر لەسەر ئەوە بڕۆین و لەناوەڕۆكی بابەتەكەی خۆمان دووربكەوینەوە كە بریتییە لە هەڵسەنگاندنی وتەكانی زەكەریا ئۆزۆنو دەرخستنی ڕاستیەكان، بەڵام چەند شتێكی تر هەیە كە هەر پەیوەندی بە كتێبەكەو وەرگێڕانەكەوە هەیە باسیان دەكەین و پاشان گفتوگۆ خۆمان لەگەڵ زەكەریا ئۆزۆن دەكەین بەویستی خوای گەورە.

## وەرگێڕ و نەزانیی بە زمانی عەرەبی!!

بەداخەوە ئەڵێم وەرگێڕ هیچ پەیوەندیەك نایبەستێتەوە بە زمانی عەرەبیەوە دوور و نزیك، ئەتوانم بڵێم بە زۆر خۆی هەڵواسیوە بە دنیای وەرگێڕان و جێگای بۆ خۆی كردوەتەوە لەو مەیدانە بەبێ ئەوەی كە مافی شوێن وەرگرتنی هەبێت تێیدا، تەنانەت زۆر جار نووسینەكەی ئەوم نەهێناوە لەبەر لاوازی و درێژدادڕیەك كە دەقی عەرەبیەكە هەڵێناگرێت و بە ناچاری خۆم وەرم گێڕاوە.

لێرەدا تەنها ئاماژە ئەكەم بە چەند هەڵەیەكی كەمی وەرگێڕ و زۆر لەسەری ناوەستم بۆ ئەوەی زۆر درێژ نەبێتەوە:

١ – ئۆزۆن دەڵێت: (وَلكنَّ النياتِ الحَسَنَةَ والصَّادِقَةَ الّتِي تَتَرَافَقُ معَ الجُهْدِ والبَحْثِ العِلمِيِّ المَوْضُوعِيِّ كَفِيلةٌ بِتَذْلِيْلِ تِلْكَ الْمَصَاعِبِ وَالْمَخَاطِرِ وَالوُعُوْرَةِ وَبِتَحْرِيْكِ العُقُوْلِ الْمَرِنَةِ وَالضَّمَائِرِ الْحَيَّةِ التي لا يمكنُ لِلأُمَّةِ أنْ تَتطَّوَرَ وَتَسْتَمِّرَ بِدُوْنِهَا) لا:١٣

كاكی وەرگێڕ بە ویستی خۆی دەستەواژەی هێناوەو دایڕێژاوەتەوە بێ گوێدانە كتێبی وەرگێڕدراو جا نازانم كتێبەكە دارشتنی لاوازەو ویستویەتی بۆی بشارێتەوە، یاخود بەهۆی كەمی شارەزایی بە زمانی عەرەبی و وەرگێڕانەوە كەوتوەتە ئەم كارەوە، بۆ نموونە سەیری ئەم وەرگێڕانەی بكە بۆ ئەو وتانەی ئۆزۆن: "**بەڵام مەبەستی پاك و ڕاستگۆیی هاوتا لەگەڵ هەوڵ و ماندوونەبوون و لێكۆڵینەوەی زانستی و بابەتییانەدا ئەمانە دەبنە دەستەبەری ئەوەی ئەو بەربەستانە نەمێنن و وەك بەفر بتوێنەوە. دەبێت ژیری و بیری ساغ و ویژدانی زیندوو وەگەڕخرێن كە بەبێ ئەوانە ناكرێت نەتەوەی ئیسلام بەرەو پێشەوە بچێت. لا: ١٣**"

٢ – ئۆزۆن لە لا: ١٤ كەوتوەتە هەڵەی زمانەوانی و ڕێنووسیەوە و وەرگێڕیش چاوی خۆی گرتوەو نەزانانە شوێنی كەوتووە، هەر وەكو دەڵێت:

(س٥/: هل كل رواة الحديث النبوي من الصحابة عدول ثقاة؟) لا:١٤

وەرگێڕی وەرگێڕیش[١] دەڵێت: ﴿ پرسیاری٥/ ئایا ئەو هاوەڵانەی كە فەرموودەكانیان گێڕاوەتەوە هەموویان دادپەروەر(عدل) ومتمانە(ثقاة)دارن؟﴾ لا: ١٤

نازانم چۆن تا ئێستا ئەوان نەیانزانیوە كە جەمعی(ثِقة) ئەبێتە(ثِقات) نەوەك(ثقاة)ی ئەوان؟!

ڕەنگە كەسێكیش بڵێ هەڵەی تایپە، ئەی باشە بۆچی هەم دیسانەوە لە(ع: ١٨، ك: ٢٣) هەم دووبارە دەبێتەوە چەندین جاری تریش هەر بەو شێوەیە هاتووە؟!

ئەوەی كە سەیرە ئۆزۆن ڕەخنە لە " سِیبَوَیْه " دەگرێت و كتێبی لەسەر دەنووسێت، بەڵام نەیزانیوە هێشتا پێویستی بە خوێندنی وانەی ئیملایە و سەرەتایی ترین بابەتی زمانەوانی نازانێت!!

٣ – جارێكی تر وەرگێڕی هەڵدێر ئەكەوێتە هەڵەیەكی ترەوە لەكاتێكدا(تحريم مكة) كە لە لاپەڕە(١٥)دا هاتووە لە كتێبە عەرەبیەكەدا ئەیكات بەكوردی و دەڵێت: (سنووری مەككە) لا: ١٦!!

نازانم ئاخر سنووری مەككە ئەو بە جوگرافیا تێگەیشتووە، یان بە گۆڕەپان یان بە چی؟!

(تحريم مكة) مەبەست پێی حەرامكردنی مەككەیە، هەر لە نەڕشتنی خوێن و ڕاونەكردن و ... تیایدا بەڵام كاكی وەرگێڕ خۆشی نازانێت چی نووسیوە!!

ئەگەر بڵێت: ئەو شتانە هەمووی سنوورەو دانراوە هێشتا بۆی ناچێتە سەر چونكە مەككە سنووری بۆ دانەنراوە بەڵكو ئەوەی سنووری بۆ دانراوە خەڵكیە نەوەك مەككە خۆ مەككە ڕاو ناكات و خەڵكی ناكوژێت، بەڵكو ئەبوو بنوسێت(سنووردار كردنی مەككە) نەوەك(سنووری مەككە)!!

---

[١] نووسینەكەی وەرگێڕاوە لە ماناكەی خۆی!

٤ – دوای ئەوەش هەم جارێكی تر نەزانی وەرگێڕ بە زمانی عەرەبی گەیشتوەتە ئەو ڕادەیە كە وشەی(عَمْرو)ی عەرەبی كە بە كوردیی خۆمان بەرامبەر(عەمر)ە لەكاتێكدا بەكوردی نووسیویەتی بەم شێوەیە نووسیویەتی(عەمرو)!! لا: ١٨

بەستەزمانە نەیزانیوە كە ئەو واوە بۆیە دراوەتە "عەمر" بۆ ئەوەی لە "عومەر" جیا بكرێتەوە، چونكە كاتی خۆی حەرەكەو سەر و بۆر نەدەكرا بۆ نووسین تاوەكو جیابكرێتەوە بۆیە هاتن وشەی عەمریان نووسی بەم شێوەیە(عمرو) بۆ ئەوەی لە(عمر) جیا بكرێتەوە!!

بەلآم وەرگێڕ واتێگەیشتووە كە(عەمرو)ە نەك(عەمر) ...

٥ – وەرگێڕی بەستەزمان لە لاپەڕە(١٩) هەستاوە بە وەرگێڕانی(العُوْدُ الهِنديّ) و كردویەتی بە "داری هیندی" .

ڕەنگە گەڕابێتەوە بۆ فەرهەنگێك و بینیبێتی كە(العود) یەكێك لە ماناكانی بریتییە لە(تەختە)[1]، ئیتر كەوتبێتە ئەو هەڵەیەوە، ئێمە ترساین لەوەی كە كتێبەكەمان ببێتە كتێبی وێنە –چونكە ڕەنگە لە نووسین تێنەگات و وێنە بۆ ئەو باشتربێت– ئەگینا وێنەكەیمان ئەهێنا بۆ وەرگێڕ بۆ ئەوەی ببینێت كە(العُوْدُ الهِنديّ) بریتییە لە جۆرە بۆنێك كە وەك بوخور بەكار دێت و ئەبێت بوترێت(بۆنی هیندی) نەوەك داری هیندی، هەروەكو گەورە شاعیری عەرەب ئەبو تەمام دەڵێت:

وإذا أَرادَ اللهُ نَشْـــــــــرَ فَضِــــــــيْلَةٍ    طُويَـــتْ أَتـــاحَ لهـــا لِسَـــانَ حَسُـــودِ
لَـــوْلا اشْـــتِعالُ النَّـــارِ فِيْمَـــا جَـــاوَرَتْ    مَـــا كـــانَ يُعْـــرَفُ طِيـــبُ عَـــرفِ العُـــوْدِ

[1] جا نەگبەتی وەرگێڕ لەوەدایە نووسیویەتی دار، كە لە ماناكانی عود تەختەیە نەوەك دار، چونكە لە نێوان تەختەو دار جیاوازی هەیە هێندەی ئاسمان و ڕێسمان، مزراح و تیمساح!!

واتە:

كـــــەخودا ویســـــتی نەشـــــری چــــاكەیەك

بــــــەكاری دەخــــــات زمــــــانی حەســــــود

گـــــەر نــــــەبێت ســــــوتان لـەلایـــــەن ئـــــاگر

قــــــەت نـــــەدەزانرا بــــــۆنی خۆشــــــی عــــــود

هەروەها زانای گەورە و ئەدیبی بەتوانا عبدالرحمن ی كوڕی سەققاف كتێبە ئەدەبیە بەناوبانگەكەی كە شەرحی كۆمەڵێك بەیتی دیوانی موتەنەبیە ناوناوە(العُودُ الهِنديُّ عن أماليّ في ديوانِ الكِنديِّ) لەبەر خاتری ئەو بۆنە.

ڕەنگە وەرگێڕ وتبێتی خۆ دارچینیش هەیە ئەمەش هەر لەسەر هەمان وەزن و ڕیتم دائەنێم و با دار هیندیشمان هەبێت!!

٦ – ئەم جارەیان وەرگێڕ بەشتێكی زۆر سەرسوڕهێنەرەوە دێت، ئەویش: لە لاپەڕە(٢٤)ی وەرگێڕانەكەیدا(اعمال العقل) كە ئۆززۆن هێناویەتی، واتە: بەگەڕخستن و بەكارخستنی عەقڵ، وەرگێڕ نووسیویەتی كارەكانی عەقڵ!!

بەستەزمانە بە(أعمال) تێگەیشتووە كە جەمعی(عمل)ە بەلاّم نەیزانیوە مەصدەری بابی(أَعْمَلَ يُعْمِلُ)ە، جا بۆیە دەبینیت ئەو دەستەواژەیەی ئەو نووسیویەتی لەگەڵ بابەتەكەدا یەك نایەتەوەو خوێنەر هەست بە كەم وكورتی دەكات!!

٧– نەزانی وەرگێڕ بە زمانی عەرەبی ئەیخاتە گەورەترین بێ ئەدەبیەوەو بەخۆی نەزانیوە!!

بێ ئەدەبی ئۆززۆن گەیشتوەتە ئەو ڕادەیەی كە بلێ پێشەوا عومەر بە ئەبوهورەیرەی وتووە ﵄:

(مارجعت بك أميمة إلا لرعاية الحمير). واتە: ئومەیمە –دایكت– نەیهێناویی مەگەر بۆ شوانی گوێدرێژ نەبێت .

ئەم چیرۆكە سەرەڕای ئەوەی سەنەدی نیەو پشتی پیٚ نابەسترێت و ئەتوانن خۆتان بگەڕێنەوە بۆ(العقد الفريد)[1] و ببینن كە چی شتی خراپ و نەشیاوی تێدایە، چونكە كتێبی مێژوو هەروایە ئەگەر بیٚ سەنەد بوو، پاشان لێرەش دیسانەوە ئەوەی تێدایە كە عومەری كوڕی خەتتاب ئەزانیٚ ئەبو هورەیرە لەسەر حەق بوەو داوای لیٚ ئەكات پۆستێك وەرگرێت و ئەویش ڕازی نابێت[٢]، بەڵام ئۆزۆن نەیبینیوە!!

بەڵام ئەوەی كە زۆر ئازار بەخشە ئۆزۆن(ما رجعت بك أميمة)ی بە ئارەزووی خۆی لێك داوەتەوەو وشەیەكی زۆر نەشیاوی هێناوەو دەڵێت: (ما تغوطت بك أمك)، واتە: دایكت وەكو پیسایی(پاشەڕۆ) هێناویتی. ع: ه(١١)، لا: ٢٩، ك: پ(١٤) لا: ٢٧

من لێرەوە تەحەددای نووسەر و وەرگێڕو ئەوكەسەشی پێیدا چوەتەوە ئەكەم ئەگەر توانیان بیسەلمێنن كە لە زمانی عەرەبیدا جێی ئەبێتەوە ئەوا دیاریەكیان ئەدەمیٚ هێندەی ناشرینی وتەكەیان گەورەبێت!!

٨ – ئۆزۆن ئەم دێڕەی هێناوە: "ما كنت أستطيع أن أقول: قال رسول الله..."لا: ٢١

وەرگێڕ نووسیویەتی: " نەمدەوێرا بڵێم پێغەمبەر(د.خ) وای دەفەرموو" لا: ٢٧

لەبری ئەوەی بنووسێت: وای فەرموو، لە كاتی ڕابردوو نەك بەجۆرێك كە واتای بەردەوامێتی تێدایە!!

هیچ سەیر نەبێت كەسێك جیاوازی نەكات لە نێوان "قال" و "يقول" هەر چاوەڕوانی وەرگێڕانی كتێبێكی هاوشێوەی ئەمەی لیٚ دەكرێت!!

٩ – ئۆزۆن باسی هاوەڵان ئەكات و دەڵێت:

(دون أن ينعتوا بصفة العدول أو الثقاة) لا: ٢٣

واتە: بیٚ ئەوەی وەسف بكرێن بەوەی ئەوان دادپەروەرن یان متمانە پێكراو.

---

[1] لەشوێنی خۆشی باسی دەكەین بە ویستی خوای گەورە.

[٢] العقد الفريد لابن عبد ربه (١/٤٥)، دار الكتب العلمية – بيروت –، الطبعة: الأولى، ١٤٠٤ هـ.(ما رجعت بك أميمة إلا لرعية الحمر).

ئەمە سەرەڕای هەڵەكەی وەكو جارەكانی پێشوو، هەركاتێكیش بەكاری دێنێت وشەی "ثقات" هەر دەڵێت "ثقاة"، بەڵام ئەمە واز لێبێنین و سەیری وەرگێڕانەكەی جەنابی وەرگێڕ بكەن:

"بەدەر لەوەی كە باسی دادپەروەری و وەرگرتنی فەرموودە بكەین یان نا " لا: ٣٢

باشە ئەوە تۆ بڵێی جەنابی وەرگێڕ كتێبێكی تری لەبەردەستا نەبوبێت و شتێكی تری وەرنەگێڕابێت؟! هەر بەلای وتەكەی ئۆزۆندا ناچێت و ئەگەر ئەم وتەیە نیشانی ئۆزۆن بدەیت و پێی بڵێی ئەرێ ئەمە وتەی تۆیە؟ تۆ بڵێی وەڵامی ئۆزۆن چیبێت؟

١٠ – وەرگێڕ دیسانەوە لە وەرگێڕانی(الثَّرِيد) كە بە مانای تریت یاخود تشریب دێت، كردویەتیە(قاورمە) ئاخر ماڵت وێران نەبێت تریت و قاورمە بەس لێنەرەكەیان یەكێكە كە مرۆڤە!! لا: (٢٠٧)

١١– ئۆزۆن باسێكی داناوە بە ناونیشانی: (الاستدراك في الذكر الحكيم) لا: ٣٩

واتە: پەی بردن بەسەر قورئانەوە.

بەڵام وەرگێڕ نووسیویەتی: (گەڕانەوە سەرو پێداچوونەوە لە قورئانی پیرۆزدا) ل: ٥٦

باشە ئەم دوو وەرگێڕانە لەگەڵ كوێی وتەكەی ئۆزۆندا یەكانگیر دەبێت، تا بگاتە ئەوەی یەكبێت؟!

١٢ – ڕەنگە وەرگێر تا ئێستاش ئاستی زمانەوانی لەعەرەبیدا ئەوەندەبێت كە وابزانێ سەروبۆر لە زمانی عەرەبیدا بۆ جوانیەو بە ویستی خۆیەتی هەرچیەك دابنێ هەرئەبێت و هیچ ڕێسایەك نیەو ئەتوانێت هەرچیەك لابدا یاخود زیادی بكات هەر كێشەی نیە، بۆ نموونە وشەیەك كە فاعل بووە هاتووە فیعلەكەی سڕیوەتەوەو ئیزافەی كردووە ئەمە لەكاتێكدا وا ئەخوازێت بكرێتە مەجرور و هێمای ڕەفعەكە لابرێت، یاخود "مفعول به" بووە و هاتووە فعلەكەی لاداوەو ئیزافەی كردووە لەم حاڵەتەدا ئەبێت هێمای نەسبەكە لابەیت كە ئەدرێ "بە مفعول به" و مەجروری بكەیت، بەڵام ئە هەروەكو خۆی حەرەكەكەی داناوەتەوە بەبێ هیچ گۆڕانكاریەك، هەروەكو ئەبینین لە چەندین شوێندا بەویستی خۆی حەرەكەی داناوە بۆ نموونە:

**(حديث البراءَ[1]..) سێ جار لا: (٥٤ و ٥٨ و ٥٩)، (حديث عُمرُ[2] بنُ[3] الخطّابِ) لا: ٦٢، (حديث عبدُالله بنُ أبي أوفى)[4] لا: ١٠٣، (حديث أنسٌ[5]) لا: ١١٩،(حديث أنسَ[6] بنَ[7] مالكٍ) لا:١٧٥، (حديث عائشةُ[8]) لا:١٧٨، (حديث عبدَ[9]اللهِ بنَ[10] عمرَ) لا: ٢١٣، (عن مالكُ بنُ أوس...النصريُّ)[11] لا: ١٨٠، ....تاد**

---

[1] ئەبێ مەجروربێت و كەسرەی هەبێت چونكە (مضاف إليه)یەو مەجرورە!!

[2] ئەبێ فەتحەی هەبێت چونكە (مضاف إليه)یەو مەجرورەو عەلامەی جەرەكەشی فەتحەیە چونكە غەیرە مونصەریفە!

[3] ئەبێ كەسرەی هەبێت جونكە سیفەتە بۆ (عمر)و ئەویش مجرورە!!

[4] وەكو هەمان جملەی پێشوو.

[5] ئەبێت كەسرەی هەبێت چونكە (مضاف إليه)ەو مەجرورە.

[6] ئەبێت كەسرەی هەبێت چونكە (مضاف اليه)ە.

[7] ئەبێت كەسرەی هەبێت چونكە سیفەتە بۆ (أنس) و ئەویش مەجرورە.

[8] ئەبێت زەممەكە لابدرێت و فەتحەی بدرێێ لەبەرئەوەی مەجرورەو عەلامەی جەرەكەشی فەتحەیە چونكە غەیرە مونصەریفە.

[9] ئەبێت بكرێتە كەسرە جونكە (مضاف اليه)ە و مەجرورە.

[10] ئەبێ بكرێتە كەسرە چونكە سیفەتە بۆ (عبدالله) و ئەویش مەجرورە.

[11] ئەبێ بكرێتە كەسرە هەرسێكەیان چونكە (مالك) مەجرورە بە هۆی حەرفی جەری (عن) و (بن)یش سیفەتە بۆی و ئەبێت هەمان حەرەكەی هەبێت و بەهەمان شێوەش (النصري) نیسبەیەو ئەبێت هەمان حەرەكەی ناوەكەی هەبێت كە كەسرەیە.

## وەرگێڕ و خیانەت لـە خوێنەر!

بەداخەوە **دەڵێم** هەركارو پیشەیەك بۆ خوای گەورە نەبێت پەردەی تارو ناشرینی خیانەت دایدەپۆشێت و مەودایەك نامێنێتەوە بۆ متمانە پێكردن، هەرچەندە هەوڵی ئەوەشی تێدا بدرێت بروامان پێ بێنێت كە بەو پەڕی ئەمانەتەوە هەستاوە بە كارو پیشەكەی، هەروەكو وەرگێڕی ئەم كتێبە هەوڵی داوە بەڵام سەركەوتوو نەبوو لـەوەی خۆڵ لـە چاومان بكات، وەرگێڕ ئەیەوێت وای وێنا بكات و وەرگێڕانەكەی زۆر زانستیە و خۆشی ماندوو كردووەو لێكۆڵینەوەی لـە بابەتەكە كردووە، هەر وەكو لـە لاپەڕە(١٦)دا لـە پەراوێزی ژمارە(١)دا دوای ئەوەی كە چیرۆكی نووسینەوەی فەرموودە بۆ "ئەبووشا" باس دەكات و زیادەیەك كە نووسەر نەیهێناوە ئەو لـە نێوان دوو كەوانەدا ئەیهێنێت و دەڵێت:

"لـەكاتی بەراودكردنەكەدا ئەم دێڕە لـەدەقە عەرەبیەكەدا نەبوو"!!

خۆزگە وابوایەو ئەو هێندە بە ئەمەكەوە هەستایە بە كارەكەی و وەك چۆن لێرەدا بەشێكی فەرموودەكە لـە كتێبەكەی ئۆزۆندا نەهاتوە ئەو ئەیهێنێ و پەراوێزێكی بۆ دائەنێ و خۆیمان نیشان ئەدات بەوپەڕی متمانەوە، بەڵام لـەگەڵم وەرە خوارەو ببینە كە وەرگێڕ خەریكی چیە تەنها لـە چەند شوێنێكی كەمدا:

١ – ئۆزۆن دەڵێت: (أخيرا فإن الصحابة أنفسهم اختلفوا في جواز كتابة الحديث النبوي حيث كرهها عمر بن الخطاب وعبدالله بن مسعود وزيد بن ثابت وأبو موسى وأبو سعيد وآخرون غيرهم) لا: ١٦

واتە: بە دڵنیاییەوە هاوەڵان بۆخۆیان ڕاجیاوازبوون لـەبارەی نووسینەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، هەرچی عومەری كوڕی خەتتاب و عبداللـەی كوڕی مەسعود(رضي الله عنهم) ...و بێجگە لـەمانیش پێیان باش نەبووە!!

بەڵام وەرگێڕی دەڵێت: (لـە كۆتاییدا تەنانەت هاوەڵانیش لـەنێو خۆیاندا جیاوازن لـەسەر ڕیوایەتیی نووسینەوەی فەرموودە ...) لا: ١٨

باشە پێمان ناڵێ جەنابی وەرگێڕ سەرەڕای گۆڕانكاری لـە وەرگێڕانەكەی مەبەستی چییە لـە(ڕیوایەتیی نووسینەوەی فەرموودە) چونكە ڕیوایەت شتێكەو نووسینەوە شتێكی تر!!

ئۆزۆن ویستویەتی گومان بخاتە سەر ئەوەی كە هاوەڵان نووسینەوەی فەرموودەیان پێ باش نەبووە بەتەنها، بەڵام وەرگێڕ ریوایەت و گێڕانەوەكەشی بۆ زیاد ئەكات، لە بری ئەوەی ڕەخنەی لە ئۆزۆن بگرتایە لایەنی كەم و بیوتایە چۆن دەڵێتی ڕاجیاوازی هەیەو بەتەنها ئەو ڕایە دێنیت كە خۆت پێت خۆشە، بەڵام بۆ خۆشی شتێكی تری ئەخاتە سەرو هەوڵی خیانەت ئەدات!!

وەڵامەكەش لە باسی ئەوەی فەرموودە وەحیە یاخود نا، دێتە بەردەستان بە ویستی خوای گەورە.

٢ – ئۆزۆن دەڵێت فەرموودە ڕاستەكانی سوونە جێی متمانە نییە لای(الأخوة الشيعة)[١] لا: ١٨، واتە: برایانی شیعە، بەڵام وەرگێڕ تەنها كردویەتی بە شیعە و وشەی برایانی لاداوە لە(لا: ٢٢).

ڕەنگە وەرگێڕ ناچار بووبێت ئەم كارە بكات چونكە وای گومان بردبێت كە خەڵكی حەز بەو وشەیە نەكەن و باشتر وایە لای بدات، خۆ كێ هەستی پێ ئەكات ئەو خیانەتی كردووە لە دەقەكەو وەكو مەبەستی نووسەر وەری نەگێڕاوە!!

٣ – كاتێك ئۆزۆن باسی ئەوە دەكات كە هاوەڵان بە بڕیاری پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەبوون و بەڵگە بە وتەی زولخوەیسرە دێنێتەوە كە بە تێكڕای هەموو مسوڵمانان خەواریج بوەو هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) نەبووە تاوەكو ئەو بێ ئەدەبیەی كردی و وتی: دادپەروەربە ئەی ﴿محمد﴾ بكرێتە بەڵگە بۆ ئەو بابەتە، ئۆزۆن دەڵێت: (من اعتبروا الخوارج) ع: ٧٦، واتە: ئەوانەی كە بەخواریج دانراون. بەڵام وەرگێڕش دەڵێت: (هەندێ دایاندەنێن بە خەواریج) ك: ١٢٧ جا بەمە گومانێك دروست دەكات و ڕەنگە كەسێك بڵێ هەندێك بەخەواریجیان داناون ڕەنگە خەواریج نەبوبێتن!!

بەمەش دەرگای گومان ئەكاتەوە بەڕووی هاوەڵاندا، بەڵام نازانم بە ئەنقەست ئەمەی كردووە یاخود بە هۆی نەزانی بە زمانی عەرەبی كەوتوەتە ناو ئەم هەڵەیەوە؟

---

[١] ئەبێت بنووسێت: (الإخوة) چونكە ئەمەیان بە مانای برایان دێت، بەڵام (الأخوة) بە مانای برایەتی دێت، كاكی ڕەخنەگر لە "سیبویە"!

## وەرگێڕ و نەبوونی پاشخانی زانستی!!

بەبەراوردكردن لەگەڵ دەقە عەرەبی و كوردیەكەدا بۆت بە دیار دەكەویٚ كە وەرگێڕی كتێبەكە هیچ پاشخانێكی زانستی و سەقافەتێكی ئیسلامی نیە، بۆیە زۆر جار ئەكەوێتە هەندێك هەڵەوە كە سەرەتایی ترین فێرخوازی زانستی شەرعی تێی ناكەوێت و زۆر نەزانانە شوێن ئۆزۆن كەوتووە لە هەڵەكانیداو بیٚ ئەوەی هۆشی بەخۆیەوەبێت، بۆ نموونە:

١ – كاتێك ئۆزۆن لەپەراوێزی(٦) ی لاپەڕە(١٨) دا، لە باسی ئەوەی هاوەڵان ناكۆك بوون لە نووسینەوەی فەرموودە، وتەكەی دەداتە پاڵ یەكێك لە سەرچاوەكان كە كتێبی(الباعث الحثيث)ی پێشەوا "أحمد شاكر"ە(ﷺ) و دەیكات بە(الباحث الحثيث)، وەرگێڕیش وەها دەینووسێتەوە، ئەمە لەكاتێكدا سەرەتایی ترین خوێندكاری زانستی فەرموودە زانیاری دەربارەی ئەم كتێبە هەیە ئەگەر نەیخوێندبێت بەوانەش!!

٢ – لە كۆتاییدا كە ناوی سەرچاوەكان هاتووە، هەم نووسەر و هەم وەرگێڕ زۆر بەستەزمانانە دەری ئەخەنئاشكرای ئەدەكەن كە كەسیان ئەو سەرچاوانەیان نەدیوە كە شتی لێوە نەقڵ ئەكەن و بەڵكو دزراوی نووسەری ترە، كاتێك كە ناوی كتێبە بەناوبانگەكەی "پێشەوا ئیبن جەوزی"(ﷺ) نەقڵ دەكەن ئەنووسن(صفوة الصفوة) لە كاتێكدا كتێبەكە(صفة الصفوة)یە، نووسەر كوێرانە لە خەڵكی دزیوەو وەرگێڕیش كوێرانە داینا وەتەوە!!

٣ – هەر لەبەر نەبوونی بەرچاوڕوونیە كە ئەكەوێتە هەڵەیەكەوە كە ئۆزۆن داوی بۆ ناوەتەوەو و هەردووكیان ئەبن بە یەك داوەوە، لەكاتێكدا پێناسەی ڕەسول ئەكات لە پەراوێزی(٨) ی لاپەڕە(٢١)دا دەڵێت: "

(رسول) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای پەیامبەر دێت(ئەو كەسەی لە كەسێكی دیكەوە پەیامێك دێنێت و ئەو تەنها گەیەنەری ئەو پەیامەیە".

بەڵام بەستەزمانە هەر لەدەقی وەرگێڕانەكەدا خۆی بەدرۆ دەخاتەوە، لەكاتێكدا ئەم وتەیەی ئۆزۆن دەهێنێت:

ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمویێت:(وَأَقِيمُوا الصّلاةَ وَآتُوا الزّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرّسُولَ...)، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە تەنها ئەم دوو بوارەی لێ وەردەگیرێت و ئەمەش لە ڕێگەی سوننەتە كرداریەكانەوە پێمان گەیشتووە و بۆمان ڕوون بوەتەوە، نەك سوننەتە گوفتاریەكانی). ع: ١٦، ك: ١٩

باشە خۆ ئەوە تەشریعەو دراوەتە پاڵ ڕەسول و ئۆزۆن خۆشی دانی پێدا دەنێ بە سوننەت بڕیاری لەسەر دراوە، ئەگەر بەپێی بۆچوونی ئۆزۆن بێت ئەبوو بدرێتە پاڵ نەبی نەوەك ڕەسول، ئەگەریش بدرێتە پاڵ نەبی ئەوا بریتییە لە ئیجتهاد و عیبادەت و پەرستشەكانیش لەسەر ئیجتهاد دانامەزرێن و بەڵگوو ئەبێت لەلای خوای گەورەوەبێت جا ئیتر بەڵگەی قورئان بێت یاخود سوننەت!!

ئەوەی كە پێچەوانەو هەڵوەشێنەری وتەی وەرگێرە ئەوەیە كە دەڵێت ڕەسول تەنها ئەو پەیامە ئەگەیەنێ و بەس، بەڵام وا بینیمان هەردوو دانیان بەوەدا نا بێجگە لەو پەیامەش كاری تریان هەبوە، ئەویش بریتییە لە ڕوونكردنەوەو زیادە خستنە سەر پەیامەكەش كە بابەتی نوێژ و زەكات بوو.

٤ – ئۆزۆن كەوتوەتە هەڵەوە لە نووسینی ناوی پێشەوا بوخاری و نووسیویەتی "أبو عبدالله محمد بن إسماعيل بن إبراهيم بن المغيرة بن بروبه(البخاري) " لا: ١٦١

وەرگێڕیش بە حوكمی ئەوەی هەر نەقڵ ئەكات و بەبێ زانینی ڕاست و ناڕاست هەر ئەوەندە ئەزانێ وەرگێڕێ و ئەویش وەرەگێڕێ لە حەقیقەت و ڕاستی، بۆیە هەمان هەڵەی ئەوی كردوەتەوە لە لاپەرە(٢٨٧)، لەكاتێكدا كۆتا وشەی ناوەكەی بریتییە لە: ( بَرْدِزْبَهْ، وَقِيلَ بَذْدُزْبَهْ)[1] كە بەزمانی بوخارای ئەوكات بەمانای "جوتیار" دێت.

٥ – وەرگێڕ كڵاوی ئۆزۆنی چوەتە سەر بەوەی لە لاپەرە(٣٣-٣٥)ی وەرگێڕانەكە درواتە پاڵ تەبەری و ئبن ئەسیر لەكاتێكدا كە چوار دێری وەكو خۆی لەو دوو سەرچاوەیەدا نیە، هەروەكو ئەیبینن لە باسی هاوەڵی بەڕێز ئبن عەبباس(ﷺ)، ئەمەش

---

[1] سير أعلام النبلاء (١٢/٣٩١).

ئەوەمان بۆ دەردەخات كە وەرگێڕ هیچ شتێك دەربارەی سەرچاوە ئیسلامییەكان نازانێ و بێ خەبەرە لێیان.

٦ – تەنانەت ئۆزۆن ئایەتێك دروست دەكات و ئەیداتە پاڵ قورئانی پیرۆز و وەرگێر لێی بێ ئاگایەو نازانێت، هەروەكو دەڵێت: "(وَلَيْسَ الأَعْمَى كالبَصِيْرِ) " ع: ١٣١، ك: ٢٣٢-٢٣١

بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی نەزانیە بە ئیسلام و سەرچاوەی یەكەمی كە بریتییە لە قورئان، سەرەڕای سەندنەوەی گشت متمانەیەك لە ئۆزۆن دوای ئەم چەواشەو خیانەتە گەورەیە كە دروستكردنی ئایەتە بۆ مەرامی تایبەتی خۆی وەكو لە شوێنی خۆیدا ئاماژەی پێ دەكەین و وەڵامی دەدەینەوە!!

## ئۆزۆن و قەیرانی سەرچاوە!!

گرنگترین بابەتێك لەدوای ئینصاف و دادگەری و گواستنەوەی زانیاری ڕاست و دروست بریتییە لە پشت قایم بوون بە كۆمەڵێك سەرچاوەی متمانەپێكراو و جێی باوەڕ لە هەموو توێژینەوەیەكی زانستیدا.

بەڵام كتێبەكانی ئۆزۆن خاڵین لە هەردوو لایەنەكە هەم نەبوونی دادگەری و هەم بێ سەرچاوەیی و نەقڵكردنی زانیاری بەبێ گەڕانەوە بۆ سەرچاوەی سەرەكی و دڵنیابوونەوە لە بابەتی وەرگیراو.

ئەگەر كەسێك چاوبگێڕێت بەكتێبەكەی ئۆزۆندا ئەبینێت زۆر لاوازە لە ڕووی سەرچاوەوەو ئەمەش وا ئەكات نرخی زانستی كتێبەكە هەژاربكەوێت و تەواوی بابەتەكانی بكەوێتە ژێر پرسیارەوە .

ئۆزۆنیش هەروەكو پێش خۆی لە ڕۆژهەڵاتناسان و قوتابیانی ئەوان و كەسە قیناوییەكان بەرامبەر سوننەت كەوتوونەتە كۆكردنەوەی هەواڵ و سەرگوزەشتەی نێو كتێبەكانی نوكتەو پێكەنین و ئەدەب و... تاد!!

كاتێك "ئەبوریە"[١] زانیاریەكانی "گۆڵد تسەیهەر"[٢] نەقڵ دەكات و بێ چوونەسەر سەرچاوەكان و دڵنیابوونەوە لە ڕاستی بابەتەكانی، لەكاتێكدا ئەم ڕۆژهەڵاتناسە قین لەدڵە تەواوی كتێبەكەی پشت ئەستوورە بەهەندێك سەرچاوەی وەكو: (حياة الحيوان للدميري) و(البيان والتبيين للجاحظ) و(الأغاني لأبي الفرج) و(مروج الذهب للمسعودي)و لەكاتێكدا ئەم كتێبانە هەموویان پشتیان پێ نابەسترێت و بریتین لە كتێبی نوكتە و مەجلیس گەرمكردن و وتەی ناڕاست و بێ سەنەد.

---

[١] مەحمود ئەبو ڕییە، یەكێك بوو لە نەیارانی سوننەت و لەدواتریشدا باسی دێتە ئاراوە.

[٢] گۆڵد تسەیهەر، یان زیهەر، ڕۆژهەڵاتناسێكی خیانەتكاربووەو دكتۆر موستەفا سباعی زۆر لە خیانەتەكانی وەڵامداوەتەوەو ئێمەش لە زنجیرە وتاری وەڵامی نەیارانی سوننەت باسمان لێوە كردووە.

ئەم جۆرە كتێبانە تەنها بۆ كات بەسەربردنەو ڕاست و هەڵەیان تێدا نووسراوەو بەس ویستویانە شت كۆ بكەنەوەو بەدوای خۆشترینا گەڕاون نەك ڕاسترین!!

ئۆزۆنیش قوتابی هەمان قوتابخانەیەو لە هەمان سەرچاوە ئاوی نۆش كردووە، هەر ئەوانیشن سەرچاوەی فیكر و ئەندێشەی، جا بۆیە هەرگیز لات سەیر نەبێت كاتێك ئەكەوێتە هەمان هەڵەی زانستی ئەوان و خیانەتكردن لە ڕاستیە زانستیەكان!!

ئۆزۆن لەم كتێبەدا هەوڵ دەدات كە زۆر بابەتی گرنگ و چارەنووس ساز بە كۆمەڵێك سەرچاوەی زۆر لاوەكی و وەرنەگیراو یەكلایی بكاتەوەو بەوشێوەی كە خۆی پێی خۆشەو بڕیاری لەسەر بدات، سەرەڕای ئەوەی كە هەر نەشگەڕاوەتەوە بۆ كتێبەكەو نەیدیوون بۆیە زۆر جار كەوتوەتە هەڵەوە تەنانەت لە نووسینی ناوی سەرچاوەكەش، وەكو بینیتان ناوی كتێبی "صفة الصفوة" ی گۆڕیبوو بۆ " صفوة الصفوة"[1] و "الباعث الحثيث" ی گۆڕیبوو بۆ "الباحث الحثيث" و وەرگێڕیش وەكو ئەو دایناوبویەوە!!

هەروەها ئۆزۆن ئاماژەی بە خانەی چاپ و ساڵی چاپ و شوێنی چاپی هیچ كام لەو كتێبانەی نەكردووە، لە كاتێكدا ئەو كتێبانە تیایەتی بە یەك بەرگ چاپ كراوەو بە(١٠) بەرگ و زیاتر لەو و ٢٨ و سەرووی ٢٨ بەرگیش بۆ نموونە كتێبی(سير أعلام النبلاء) بە چەندین چاپی جیا جیا هەیەو بەردەستەو هەر چاپێك و ژمارەی بەرگەكانی جیاوازە، ئایا ئەگەر تۆ ئاماژەی پێ نەكەیت كام چاپەیانە خوێنەر چۆن بتوانێت بە ئاسانی بچێتەوە سەری و ڕاست و هەڵەیی وتەكەی تۆی بۆ دەركەوێت؟!

ئەمەش لە فێڵێك زیاتر نیەو ئەیەوێت هەڵەو كەم و كوڕی و خیانەتەكانی پێ پەردەپۆش بكات و هاتووە لە كۆتایی كتێبەكەی دێڕێكی هێناوەو ئەیەوێت فریومان بدات بەو دێڕە بێكەڵكەی و دەڵێت: "بەلەبەرچاوگرتنی بەناوبانگیی سەرچاوەكان ئێمە باس لە ژمارەی بەرگەكان و خانەی چاپكردنەكانیان ناكەین" ع: ١٦١، ك: ٢٨٧

[1] لە تاوانی شافعیش دووبارە ئەم هەڵەی كردوەتەوەو وەرگێڕی ئەم كتێبەش نەزانانە هێناویـەتی، بڕوانـە بەشـی سەرچاوەكانی، ك: (٢١٦)، ع: (١٨٧)!!

ڕەنگە ئۆزۆن خوێنەرەکانی خۆی زۆر بێ گێل بێت و وای دانابێت تەنها بەم دێڕە سادەیە بڕوا دەکەن و ناپرسن و ناڵێن: باشە ئۆزۆن بۆچی لەپەراوێزی(١٩)ی لاپەڕە(٢٩) تەنها نووسیویەتی(طبقات ابن سعد)[١]!!

خانەی چاپ و ساڵی چاپم نەویست بەس ئەی کوانێ ژمارەی بەرگ و لاپەڕە؟!

باشە ئەگەر کەسێك پێشتر شارەزایی لەو کتێبە نەبێت و چاپەکەی "مەکتەبەی خانجی" لەبەردەستبێت کە(١١) بەرگە چۆن بیدۆزێتەوە؟!!

ئەمەش واز لێبێنەو دیاری ئۆزۆن بێت بەڵام کەسی خوێنەر چۆن ئەو کتێبە بدۆزێتەوە کە کردوویەتی بەسەرچاوە و لەپەراوێزی(٢٠)ی لاپەڕە(٢٩) تەنها نووسیویەتی(ابن الجوزی)[٢] باشە گریمان وتمان خانەی چاپ و ساڵی چاپ دیاریی خۆت بەڵام کام کتێبەو بەرگی چەن و لاپەڕە چەند؟!

کتێبەکانی ئیمامی ئیبن جەوزی دانەو دوان و سەد و دووسەد نین تاوەکو بەس بنووسیت "ئیبن جەوزی" هەر وەك ئەوەی هەموو تەمەنی یەك کتێبی نووسیبێت و ئیتر بەس ناوی خۆی بنووسێت بەسبێت، هەروەکو پێشەوا زەهەبی دەفەرموێت: هێندەی نووسیوە ئەگەر هێندەی تر تەمەنی کردباو جارێکی تر بهاتایەتەوە ژیان نەیدەتوانی ئەوەی خۆی نووسیویەتی پێیدا بچێتەوەو تۆکمەیان بکات و لەبەریان بکات[٣].

جا ئۆزۆنیش هاتووە تەنها ئاماژەی بە ناوەکەی کردووەو ئەیەوێت خۆڵ لە چاوی خوێنەرانی بکات.

بەڵام ئۆزۆن هەر زوو خۆی بە درۆ دەخاتەوەو لە ناوی دووەم کتێبدا کە(اللؤلؤ والمرجان)ە[٤] خانەی چاپەکەی نووسیوە، ڕەنگە تەنها ئەو کتێبە سەرچاوەی بوبێت و

---

[١] لە وەرگێڕانەکەش پەراوێزی (٢٢) لا: (٣٢).

[٢] لە وەرگێڕانەکەش پەراوێزی (٢٣) لا: (٣٢).

[٣] سير أعلام النبلاء (٢١/٣٧٨)، ط: مؤسسة الرسالة.

[٤] وەرگێڕ نووسیوەتی (الؤلؤ)!! لا:

ئەوانی تری هەمووی لـەخەڵكی تر وەرگرتبێت و خۆی نەچوبێتە سەری بۆیە هێندەی دڵ پیێ خۆشبوەو خانەی چاپەكەی نووسیوە!!

ئەمەی ڕابوورد لـە لایەكەوەو لـەلایەكی تریشەوە ئۆزۆن لـەهەندێك سەرچاوەوە شتی نەقڵ كردووە كە هەرگیز جێی متمانە نین و بۆ كۆمەڵێك بابەتیش بەكاری هێناون كە هەمووی بابەتی گرنگن، وەكو خیلافی نێوان هاوەڵان و خراپی هاوەڵان و ...

ئەم بابەتانە هەمووی ئۆزۆن ویستوویەتی بە كۆمەڵێك سەرچاوەی وەكو ئەمانە پشت ڕاستیان بكاتەوە، ئەوانیش:

١ – كتێبەكانی مێژوو: "تأريخ الطبري" و "تأريخ دمشق لابن عساكر" و "الكامل لابن الأثير" و "البداية والنهاية لابن كثير" و "سير أعلام النبلاء للذهبــي" و "تأريخ الإسلام للذهبــي" و ، ئەوەشی كە ئۆزۆن بەكاری نەهێناون و بەردەوام دەكرێنە بەڵگە وەكو: "تأريخ بغداد للخطيب البغدادي" و "المنتظم لابن الجوزي" و...هتد[1]

هەموو ئەم كتێبە مێژووییانە، هەندێكیان خاڵین لـەسەنەدو بە هیچ شێوەیەك ناكرێنە بەڵگە، هەرچی ئەوانەشە كە سەنەدیان هەیە، وەكو "الطبري" بە نمونە، هەموو ئەو ڕووداوانەی كە تێیدایە ڕاست نیە، بەڵكو ئەو تەنها ئەو هەواڵانەی كە پێی گەیشتووە كۆی كردوەتەوەو جیاكردنەوەی ڕاست و ناڕاستیشی بەجێ هێشتووە بۆ خوێنەر!

جا ئەوەی كە جێگەی داخە ئەمڕۆ خەڵكێكی زۆر وا دەزانێت هەر عەرەبی بزانێت بخوێنێتەوەو تێبگات ئەگەر چی لە عەسكەریش فێری بوبێت، ئیتر مافی ئەوەی هەیە بێت ئەم كتێبانە بخوێنێتەوەو بە بەڵگەی بهێنێتەوەو باسیان بكات، بێخەبەر لـەوەی كە بەبێ بەدواداچوون لـە سەنەدی هەواڵەكان بەرەو هەڵدێر دەچێت وماڵی خۆی و خەڵكی تریش وێران دەكات!

---

[1] كتێبەكانی تەفسیریش بەهەمان شێوە فەرموودەی لاواز و هەڵبەستراویان تێدایەو پێویستە ئاگاداربین كە هەموو ئەوانەی لـە كتێبەكانی زانایانی كۆندا هاتووە ڕاست و دروست نین و جێیان هێشتووە بۆ خوێنەر، چـونكە ئـەوان بۆ خەڵكانێكیان نووسیوە كە توانای ئەو كارەیان هەبوەو شیاوبوون، نەك خەڵكی ئـەمڕۆ كـە هـەموو بـە شـوێن كارئاسانیەوەین هەمیشە!

جا ئەمەیە گەورەترین هەڵەی ئۆزۆن و زۆربەی ئەوانەی ڕەخنە لە مێژووی ئیسلامی دەگرن.

٢ – كتێبی(الأغاني) أبو الفرج الأصفهاني:

ئەبولفەرەج خۆشی و كتێبەكەشی زۆر جێی ڕەخنەن و زانایان زۆر قسەیان لەسەركردوەو بەكەسێكی جێی متمانەیان دانەناوەو كەسێكی خراپ و بەد ئەخلاق و خراپەكاربوەو ئەم كتێبەشی لەبری ئەوەی كتێبێكی مێژوویی و ئەدەبی بێت زیاتر گۆرانی و شتی بێ سوود و بێ كەڵك و وشەی خراپ و ... ئەو بابەتانەی تیا بەدی دەكرێت، بۆیە وتەكانی جێی بڕوا نین و زانایان بەكەسێكی دامەزراویان نەزانیوەو كەسێكی درۆزن بووەو بەس بۆ خۆشی مەجلیس پڕیكردووە لە وتەی بێ بنەماو بێ كەڵك، هەروەكو خەتیبی بەغدادی لە زانایانی سەردەمی خۆیەوە نەقڵی دەكات و دەفەرموێت:

"درۆزنترین كەسبوەو كۆمەڵێكی زۆر پەڕاوی دەكڕی و گشت ڕیوایەتەكانی لەوانە دەبوون"[1]

یاقوتی حەمەوی دەفەرموێت: زۆر كەسێكی دەم پیس و جلو بەرگ پیس بوەو خەڵكی لەسەر هەموو نارەحەتیەكانی و زمان پیسیەكەی ئارامیان ئەگرت لەترسی زمانی و شیعرە شۆردنەوەكانی"[2]

ئەمە وانەبێت ئێمەش تەنها بەو وتانە بڕوامان كردبێت بەڵكو خۆمان سەیری كتێبەكەمان كردوەو حاڵی بەباشی ئەزانین چۆنە و ئەمەش چەردەیەك لەو شتانەی كە تیایەتی:

١ – چیرۆكێكی ساختەی هێناوە و ئەوپەڕی سووكایەتی و گاڵتەكردن بە نوێژی تێدایە:

"یەحیای كوڕی زیاد و موتیعی كوڕی ئیاس و هاوەڵەكانی پێكەوە كۆبوونەوەو چەند ڕۆژێك خەریكی مەی خواردنەوەبوون، یەحیا پێی وتن: ئەی هاوار بۆ ئێوە! سێ ڕۆژە نوێژمان نەكردوە، خەڵكەكەش وتیان بەڵێ. موتیع هەستاو بانگی داو قامەتی كرد و بوە

---

[1] لسان الميزان لابن حجر (٤/٢٢٢)، مؤسسة الأعلمي للمطبوعات بيروت – لبنان– .

[2] معجم الأدباء لياقوت الحموي (٤/١٧٠٩)، ت: إحسان عباس، الناشر: دار الغرب الإسلامي، بيروت ،الطبعة: الأولى، ١٤١٤ هـ.

ناكۆكیان كە كێ پێشنوێژی بكات، ئیتر موتیع بە كیژۆڵە گۆرانیبێژەكەی وت: پێشكەوە تۆو نوێژەكەمان بۆ بكە، پارچەیەكی شەفافی لەبەردابوو بێ ئەوەی هیچی لەژێرەوەبێت و كاتێك چووە سوجدەوە دامێنی دەركەوت و موتیع پەلاماری داو ماچێكی كرد و دەستیان كردە پێكەنین و نوێژەكەیان بڕی و دەستیان كردەوە خواردنەوەكەی خۆیان"[1]

٢ – خێزانی پێشەوا حەسەنی كوڕی عەلی(رضي الله عنهما) تۆمەتبار دەكات بە داوێنپیسی لەدوای پێشەوا حەسەن(رضي الله عنه)[2].

٣ – پێی وابوە فارسەكان كەعبەیان بنیاد ناوەو لەكاتی بنیادنانیشی گۆرانیان بە فارسی ئەوت[3]

٤ – سوكایەتی كردن بە پیرۆزیەكانی ئایین و گۆرانیبێژە كچەكانیشیان وەسفكردوە بەوە كە دەزانن لە لەوحل مەحفوز چی نووسراوەو غەیبیان زانیوە[4]!!

جا ئەو كتێبە هەرگیز پشتی پێ نابەسترێ بۆ هیچ شتێك و تەنها كتێبێكی ئەدەبیەو بۆ شیعر و پەخشانەكانی سوودی لێ وەردەگیرێت نەك بكرێتە سەرچاوەیەكی مێژوویی و بابەتەكانی پێ یەكلایی بكرێتەوە، چونكە خاوەنەكەی كەسێك بووە حەزی بەڕابواردن و شتی پووچ بووە كتێبەكەشی ڕەنگدانەوەی خۆیەتی نەوەك ژینگەو گوزەرانی ئەوكاتە، جا كەسێكیش بەو شێوەیە نەبێت نانیشێت بەو كتێبەوە!!

٥ – ڕێژەیەكی زۆر خوراڤەو ئەفسانەو درۆی تێدایە كە ناچێتە عەقڵی كەسەوە، لەوانە جارێك مارێكی گەورە لە ئاسمانەوە دێت و پێشەوا عەلی(رضي الله عنه) هەڵدەگرێ و ئەبیات[5].

٣ – ئیبن ئەبی حەدید:

---

[1] الأغاني (٢١٨/١٣)، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت – الطبعة: الأولى، ١٤١٥ هـ.

[2] الأغاني (٤٠٩/١٢–٤١٠)

[3] الأغاني (١٩٣/٣).

[4] الأغاني (٢٥/١٥).

[5] الأغاني (١٨٧/٧)..

یەكێكی تر لەو كەسایەتیانەی كە ئۆزۆن پشتی پێ بەستووە، ئیبن ئەبی حەدیدی ڕاڤەكاری "نهج البلاغة"ی "الرَّضي"یە كە دراوەتە پاڵ ئیمامی عەلی(رضي الله عنه) و شتی لێوەگێڕاوەتەوە لە زۆربەی كتێبەكانیداو لەم كتێبەشی.

ئیبن ئەبی حەدید كەسێكی موعتەزیلی شیعەبوەو زۆریش زیادڕەوبووە لە تەشەیوعەكەیداو بەشێوەیەك ئەوەی كە وەسفی خوای گەورەیەو بۆ دروستكراوەكان نابێت، ئەو ئەیداتە پاڵ ئیمامی عەلی لە شیعرەكانی "العلويات السبع" و ئەتوانن بگەڕێنەوە سەری و بزانن لەو شیعرانەدا چۆن سیفەتەكانی خوای گەورەی ئەداتێ و دكتۆر محمد موسی الشريف یش هەندێكی لێوە گێڕاوەتەوە لە كتێبی(المختار)[1].

ڕەنگە ئەم دێڕە شیعرەی خۆی بەسبێت بۆ ئەوەی بیناسیت كە دەڵێت من موعتەزیلیم و لەبەر تۆش ئەی پێشەوا عەلی هەموو شیعەیەكم خۆشدەوێت:

وَرَأَيْتُ دِيْنَ الاعْتِزَالِ وَأَنَّنِي أَهْوَى لِأَجْلِكَ كُلَّ مَنْ يَتَشَيَّعُ

ئیتر من نازانم ئۆزۆن چۆن وەها كتێبێك دەكاتە سەرچاوەی ڕەخنە لەسەر هاوەڵان؟!

وەڵامەكەی ڕوونە: چونكە مامۆستاكانی تری هەر لە "ئەبو ریە" و "گۆلد زیهەر" و ڕۆژهەڵاتناسان و نەیارانی سوننەت هەمان سەرچاوەیان بەكارهێناوەو ئەمیش لێیانی وەرگرتووە!

٤ – كتێبی "الإمامة والسياسة لابن قتيبة" زۆر شتی تێدایە كە وائەخوازێت كتێبێكی هەڵبەستراوبێت سەرەڕای نەبوونی سەنەد بۆ كتێبەكە، لەكاتی خوێندنەوەیدا تەواو بۆت دەردەكەوێت كە هی ئیبن قوتەیبە نییە و ئەوەی لێ ئەخوێنرێتەوە كە كەسێكی زیادڕەوی شیعە نووسیبێتی و پێچەوانەی تەواوی كتێبەكانی تری ئیبن قوتەیبەیەو كەسێك تەنها بەراوردێك بكات لە نێوان بەرگریكردنی ئیمامی ئیبن قوتەیبە لە هاوەڵان لەسەرەتای كتێبی(تأويل مختلف الحديث) و ئەوەی لەم كتێبەدا هاتووە بەتەواوی بۆی دەردەكەوێ كە

---

[1] المختار المصون من أعلام القرون د.محمد موسى الشريف، ص: (١٨٦١)، دار الأندلس الخضراء، ١٤١٥هـ.

ئەم نووسراوە دراوەتە پاڵی بۆ ئەوەی بەناوی ئەمەوە بڵاو بێتەوەو لەناو خەڵكیدا، چونكە نووسینەكانی ئەو بەربڵاوبوون و خەڵكی تێكڕا متمانەیان پێی هەبووە.

ئەمە سەرەڕای بوونی چەندین بەڵگەی حاشا هەڵنەگر كە شەیخ مەشهور حەسەن ال سەلمان لە كتێبی "كُتبٌ حذَّرَ منها العلماءُ" هەم دكتۆر عەلی نەفیع علیانی لە كتێبی "عقیدةُ الامَامِ ابنِ قُتیبةَ" بەڵگەی بەهێز باس دەكەن لەسەر ئەوەی كە كتێبێكی هەڵبەستراوەو درۆیە.

لەكۆتاییدا دەڵێم:

كەسێك بیەوێت تانە لە بوخاری بدات و بیسەلمێنێت كە كتێبێكی لاوازەو فەرموودەكانی هەڵبەستراوەو پێویستە متمانەی لێوەرگیرێتەوە، دەبێت كۆمەڵێك سەرچاوە بێنێت لایەنی كەم لە ئاستی "بوخاری"دا بێت، نەك كۆمەڵێك كتێبی نوكتەو مەجلیس گەرمكردنو و كۆمەڵێك سەرچاوەی بێ بنەما بكاتە بڕیاردەر بەسەر پێشەوا بوخاریەوە!!

## ئۆزۆن و عەقل و نەقل[1]

قسەكردن لەسەر بابەتی پێشخستنی عەقڵ بەسەر نەقڵدا "زەكەریا ئۆزۆن" یەكەم كەس نییە لەم مەیدانەداو پێش ئەو خەڵكێكی تریش هاتوونەتە ئەم مەیدانە، بەڵام كەسیان نەیانتوانیوە سەركەوتووبن‌و لە بەهای نەقڵ بێننە خوارەوە بە وتەكانیان‌و هەرزوو وەڵامدراونەتەوە، جا "ئۆزۆن"یش ئەیەوێت ئەسپی خۆی تاوداو بازاڕی گەرم بكات و دێتە مەیدانی نووسین‌و لەسەرەتای كتێبەكەیداو لەسەرەتاوە پێشكەشی ئەكات بە خەڵكانێك‌و دەڵێت: (إلى كل من يحترم العقل ويقدره، إلى كل من يحتكم إلى العقل في الحكم على النقل)لا:٩

واتە: بەهەموو ئەوانەی بەهای عەقڵیان لەلایە، بە هەموو ئەوانەی كە عەقڵ ئەكەنە دادوەر لە حوكمدان بەسەر نەقڵەوە.

ئێمە كێشەمان نییە لەگەڵ "ئۆزۆن" لەوەی كە كتێبەكەی پێشكەش بەكێ ئەكات‌و ئەوە مافی خۆیەتی، بەڵام كێشەكە لەوەدایە كە وائەزانێ ئەو كەسانەی كە ئەو كتێبەكەی خۆی پێشكەش كردوون لەوان خوێندەوارتر و مرۆڤتر بەسەر زەویدا نەڕۆشتووە!!

ئەوەی لای ئێمە گرنگە ئەوەیە كە ئایا عەقڵ ئەتوانێت یەكلا ببێتەوە بە بڕیاردان‌و ئیتر ئەوەی پێی وترا "بڕیاری عەقڵ" ئیتر ڕاست‌و دروستە؟ ئایا عەقڵی مرۆڤ بەشێوەیەكە كە بتوانێت بڕیاری یەكلاكەرەوە بدات بەبێ ئەوەی پشت ببەستێت بە شتێكی دیكە؟ ئایا قورئان و سوننەت شوێنكەوتەی عەقڵن وەكو ئۆزۆن دەڵێت[1] یاخود عەقڵ شوێنكەوتەی ئەو دوو سەرچاوەیە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیاری تر كە لە بیری تۆی بەڕێزدا دێت و دەچێت لەگەڵم بەردەوامبەو دێڕ دێڕ بە ئارامی لەگەڵم وەرە:

عەقڵی مرۆڤ و بیركردنەوەی مرۆڤ و بەباش و خراپ دانانی مرۆڤ بۆ هەر شتێك بەستراوەتەوە بە تێڕوانینی لەو شتەو بیركردنەوە لێی، هەروەكو زانایانی لۆژیك(المنطق) دەڵێت: "الحُكْمُ عَلَى الشَّيْءِ فَرْعٌ عَنْ تَصَوُّرِهِ"[2].

واتە: بڕیاردان لەسەر هەرشتێك بەشێكە لە تێڕوانین بۆی.

مرۆڤ ناتوانێت لە شتێك بدوێت و بڕیارێك لەبارەیەوە بدات یاخود بیناسێت بە ناسینێكی تەواو، مەگەر دوای ئەوەی كە شارەزای ئەوشتەبێت و بیناسێت و زەمینەسازی بۆكردبێت، یان ماریفەتێكی پێش وەختەی لەبارەیەوە هەبێت.

جا عەقڵ ناتوانێت هیچ بڕیارێك بدات و لێی تێ بگات مەگەر بە كۆمەڵێك ئامراز و ئەوانیش كاریگەری ڕاستەوخۆیان بەسەر بڕیارەكانیەوە هەیە، ئەو ئامرازانەش بریتین لەمانە:

## یەکەم: پێنج هەستەکەی مرۆڤ:

(بینین، بیستن، تامکردن، بۆنکردن، دەست لێدان)

بینین: یەکێك لەو هۆکارانەی کە وا دەکات لە ئێمەی مرۆڤ بتوانین گوزارشت بکەین لەبارەی شتەکان و عەقڵ و ژیریمان بخەینە گەڕ لەبارەیەوە بریتییە لە "بینین".

هەرچی ئەو ئامرازەیە شتێکی سنووردارەو هەرگیز وەسف ناکرێت بەرەهایەتی لە ڕوانین بۆ شتەکان و لەگۆشەیەکی دیاریکراو بەدەر ناتوانێت ببینێت و شتێك وێنا بکات وەکو خۆی ئەگەر دووربێت بەئەندازەیەکی کەم، بەڵام ئەگەر هات و شتەکە زۆر دوورکەوتەوە ئەوا بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت گوزارشتی لێوە بکات، ئەمە سەرەڕای ئەو نەخۆشی و دەردانەی ڕوو دەکەنە بینین و لەکاری دەخەن، ئەگەر شتێك ببێتە بەربەست لەنێوان چاوی ئێمەو ئەو شتەی کە بۆی ئەڕوانین ئەوا هیچ شتێك لای ئێمە زانراو نیەو لەکاتێکدا لەو دیو ئەو بەربەستەوە چەندین ڕاستی و حەقیقەت هەیە، بەڵام بینینی لاوازی ئێمە پەییان پیَ نابات!!

ئەگەر ئێمە لە پەنای شوشەیەکەوە بڕوانینە تیشکی خۆر جیاوازە لەوەی کە ڕاستەوخۆ بۆی بڕوانین، باشە ئەگەر کەسێك یەکەمجاری بوو بۆ تیشکی خۆری ڕوانی لە پەنای پەنجەرەی ماڵی خۆیانەوەو بڕیاری دا کە تیشکی خۆر هێزو توانایی کەمەو مرۆڤ ئەتوانێت کە ڕاستەوخۆ سەیری بکات ئەمە پێی ئەوترێت بڕیارێکی دروست؟

باشە خۆ هەر ئەو کەسە ئەگەر هاتە دەرەوەو بۆ تیشکی خۆری ڕوانی و بینی تیشکێکی زۆر بەهێزی هەیەو هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت بۆ چەند خولەکێك بەرامبەری بوەستێت ئەوکات چی؟

سەرەڕای ئەوەی کە دووری و نزیکی کاریگەریەکی زۆریان هەیە بەسەر بڕیارەکانی بینینەوە، بۆ نموونە کەسی تینوو لە بیابان تراویلکە(سەڕاب)ی لیَ ئەبێتە ئاو لەدوورەوەو تەواو دڵنیا ئەبێت لەوەی کە ئاوە، بەڵام کەنزیك ئەبێتەوە ئەبینێت لە ئەندازەیەك خۆڵی گەرمی بیابان زیاتر نییە!!

بیستن: هەرچی بیستنە كەمتر نییە ئەو هۆكارانەی كە بیَ تواناى ئەكات لە "بینین" ئەگەر زیاتریش نەبێت، ئەویش بە هەمان شێوە سنووردارەو لە مەودایەكدا ئەتوانێت كارى خۆى جێبەجیَ بكات، بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤ دەنگێك ببیستێت لە نزیكەوە باش لێی تیَ دەگاو ئەزانیَ وردەكاریەكەشی چیە، بەلاَم هەر ئەو دەنگە كاتێك كە دوور دەكەوێتەوە ئایا وەك جارى پێشووە یان تەواو كاریگەرى لەسەرى ئەبێت و وەكو خۆى ناگەیەت دەنگەكە؟ئەگەر ئێمە لە ناو خانویەكداین(مالَ) و لەودیوى دیوارەكەوە قسە بكرێت ئێمە بەهۆى سنووردارى تواناى بیستنەوە ناتوانین لە وشەكان تێبگەین و بزانین چی ئەگوزەرێ مەگەر دەنگەكە زۆر بەرز بكرێتەوەو بە ئاستێك بێت كە ئەو سنوورداریەی كە بیستنی ئێمە هەیەتی تێی بپەڕێنێت، باشە دەكرێت ئەو لەبەر ئەوەی كە گوێی لەو دەنگانەی ئەودیو خانووەكە نابێت لێرەوە دانیشێت و بڕیارى ئەوەبدات كە لەودیو خانوەكەوە هیچ دەنگێك نیەو هیچ ناگوزەرێ؟ ئایا ئەگەر وەها قسەیەكی كرد لێی وەردەگیرێت؟

تامكردن: هەستی تامكردنیش بەهەمان شێوەیەو لەدوتوێی سنوورداریدایەو هەرگیز ڕەهایی بەخۆیەوە نابینێت، بۆ نموونە هەر ئەو مرۆڤەی كە ئەمرۆ هەنگوینی لا شیرینە، ئەگەر هات و سبەی نەخۆش بكەوێت و كەوچكێك لەو هەنگوینە شیرینە بخوات، بەتالَی ئەبینێت و ئەیچێژێت و ئەگەر بێت ولەپێشتردا هەنگوینی نەخواردبێت ئەوا بەدلَنیاییەوە بڕیارى تالَی لەسەر هەنگوین ئەدات.

باشە وەها بڕیارێك دروست و شیاوەو مایەی قەبولَكردنە؟

بۆنكردن: ئەمیش دیسانەوە سنووردارە بەشێوەیەكی زیاتر لەوانی دی بەڕادەیەك ئەگەر شتێك لە نزیكەوە نەبێت هەستی پیَ ناكات و بۆنەكەی نابیستیَ، جگە لەمەش جارى واهەیە مرۆڤ بە تووشبوون بە هەلاَمەتێك هەستی بۆنكردنی نامێنێت و ئەگەر لەوحالَەتەدا بۆنی خۆشترین "بۆن" بكات هەستی پیَ ناكات و نازانێت كە ئەوە هەر بۆنی هەیە ئەگەر بێت و پێشتر تاقی نەكردبێتەوە.

ئایا هەرگیز پرسیوتە كە بۆچی بۆنفرۆشەكان(قاوە) یان(نیسكافە) دادەنێن لە دوكانەكانیاندا؟

وەڵامەكەی ئاشكرایە: زۆری بۆنی جۆراوجۆر ئەبێتە هۆكاری هەست نەكردن بە هیچ بۆنێك، ئەو "قاوە"یەش ئەبێتە هۆی ماڵینی ئەو بۆنانە لە لوتداو وات لیٚ دەكات بۆنی تر بكات.

تەنها ئەم نمونەیە بەسە بۆ هەستكردن بەوپەڕی سنووردارێتی هەستی بۆنكردن!!

دەست لێدان: زۆر جار بەرگوێمان دەكەوێت و ئەوترێت فلانە شت سافە و ئەوی تر زبرە و...، هەر شتێك و دابەشكراوە بە جۆرێك لە شێوەو سرووشت، بەلاّم ئەگەر هات و مرۆڤ تووشی هەندێك جۆری نەخۆشی پێست بوو ئەوكات هەست ناكات بە شتە زبر و سافەكان، ڕەنگە درکێك بە زبر نەناسێت تاوەكو دەستی بۆ ئەبات و لە دەرەنجامی بینینی خوێن لە دەستی ئەوكات بزانێت شتێكی زبر و تیژ بووە، ئەگەر بێت و پێشوەختە ئەمەی تاقی نەكردبێتەوە!!

جا خوێنەری بەڕێز: عەقڵ و ژیریی بۆ بڕیارەكانی یەكێك لەو شتانەی كە پشتی پیٚ دەبەستێت بریتییە لە هەستەكانی مرۆڤ، جا ئەگەر ئەمە یەكێك بێت لە بناغەو بنچینەكانی عەقڵ لە كاتێكدا هەمیشە ئەگەری هەڵەی هەیە، ئیتر چۆن كەسێك ئەتوانێت بێت و بانگەشەی ئەوە بكات كە پێویستە عەقڵ بڕیاری یەكلاكەرەوە بدات؟

## دووەم: پاشخانی زانستی:

هەر كەسێك لە ئێمە كاتێك ڕۆژانە ئەوەی ئەیبیستین و ئەیبینین ...، بەهەر یەكێك لە ئەندامانی هەستكردن، لای خۆمان هەمووی تۆمار دەكەین و ئەو شتە نوێیانەش كە دێتە ئاراوە زۆرێكیان هەر بەو پێوانەو ڕێسایانەی كە فێری بووین هەڵدەسەنگێنین و بڕیاریان لەسەر دەدەین، جا ئەگەر هات و ئەو زانیاریانەی كە پاشخانمان كردوون زانیاری ڕاست و دروست بوو ئەوا بڕیارەكانیش ڕاست ئەبن و ڕەوانن، بەلاّم ئەگەر هات و ئەو زانیاریانە هەڵەبن و بەجۆرێك خواری و خێچیان تێدابێت ئەوا بڕیارەكانی عەقڵیش بەرەو نەنگی ئەبەن، هیچ كەسێك ناتوانێت حاشا لەوە بكات كە زانیاری پێشوەختە چەندێك كاریگەری بەسەر بڕیارەكانی عەقڵەوە هەیەو ڕۆژانەش هەموو هەست بەو ڕاستیە دەكەین.

پرسیارەكەمان لێرە بۆ ئۆزۆن و خەڵكانێكی پێش ئەویش كە بانگەشەی حوكمی عەقڵیان كردووە بەسەر نەقڵدا ئەوەیە:

ئایا چۆن عەقڵ دەكرێتە دادوەر بەسەر نەقڵەوە لەكاتێكدا ئاست و جۆری زانیاری پاشخانكراو لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر ئەگۆڕێت و شتێكی جێگیر نییە و كەسێك زانیاری هەڵەی پاشخانكردوەو بەڕاستیشی ئەزانێت ئەی پێمان ناڵێن دیسانەوە پێوەری ڕاست و چەوتی چیە چونكە هەر كەسەو بە تێگەیشتنی خۆی ئەوەی كە لەلایەتی بەڕاستی ئەزانێت و بەڵگەشی بۆ دێنێتەوە؟

## سێیەم: كاریگەری ژینگەو دەوروبەر:

هەموو ئەو ڕاستییە حاشاهەڵنەگرە دەزانین، كە ژینگە كاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە بەسەر بڕیارەكانی "عەقڵ"ەوەو هۆكارێكی زۆر گرنگی جیاوازی بیركردنەوەكانە، بۆ نموونە كەسێك كە لادێ نشینەو لەو ژینگەیەدا گەورە بووە هەندێك شت بەباش دەزانێت و بیری لێ دەكاتەوە، لەهەمان كاتدا كەسێك كە شارنشینە بەوپەڕی دواكەوتنی ئەزانێت و لەكاتێكدا هیچ كامێكیش لەوان هەموو ڕاستیەكانی لەلا كۆنەبوەتەوە.

ئەمە لە ڕویەكەوەو لە ڕویەكی تریشەوە پسپۆڕی و ژینگەی كاركردن هۆكارێكی تری گرنگە بۆ جیاوازی بڕیارەكانی عەقڵ، بۆ نموونە عەقڵی مامۆستا جیاوازە لە هی ئەندازیا و عەقڵی هەردووكیشیان لە هی دكتۆر و...، باشە هەر یەكێك لە ئەمان بەهۆی جیاوازی كارو پسپۆڕیانەوە هەندێك شتیان پێ باشەو هەندێكیش خراپ، ئەی پێمان ناڵێن عەقڵی كامیان حاكم بێت و دادوەربێت بەسەر نەقڵەوە؟ ئەگەر عەقڵی هەركامێكیان وەرگرین بەجۆرێك لەجۆرەكان ستەمە لەوی تریان و مافیمان پێشێل كردووە، ئەگەر عەقڵی هەمووشیان وەرگرین ئەوا هیچ حورمەتێك بۆ نەقڵ(قورئان و سوننەت) نامێنێتەوەو بەمەش وەحی هەڵەوەشێنینەوە، چونكە هەر یەكێكیان و شتێكی لا پەسەندەو شتێكیشی لا خراپە،

بۆیە بە گوێرەی عەقڵی هەریەكێكیان هەندێك دەق لائەبرێت و ئەوكات شتێك نامێنێتەوە پێی بوترێت دەق!

ئەوكات تووشی چی گێچەڵ و بگرەو بەردەیەك ئەبین و چی چاوەڕێمان دەكات ئەگەر هات و شوێنی وەها بانگەشەیەك كەوتین؟!

خوای گەورە عەقڵی بەشێوەیەك دروستكردووە كە هەمیشە پێویستی بە هێزێك هەیە لە سەروویەوەو ئەبێت شتێك هەبێت كە بگەڕێتەوە لای بۆ تەواو تێگەیشتن، پاشان خوای گەورە هەندێك بابەتیشی هێشتوەتەوە كە غەیبیاتن و عەقڵ دەركی پێ ناكات، چونكە عەقڵی مرۆڤ ئەوە عادەتێتی كە تووشی غرور و لەخۆ دەرچوون دێت زۆر بەزویی، بۆیە پێویستی بە شتێك هەیە ڕاستی بكاتەوە و ڕێگای نیشان بدات و ئەویش بریتییە لە سرووش(وەحی).

بەڵام بەداخەوە من وا ئەبینم ئەوانەی كە بانگەشەی حوكمی عەقڵ دەكەن و ئەیكەنە حاكم بەسەر نەقڵەوە تا ئێستاش نە لە مانای عەقڵ تێگەیشتوون نە لە مانای نەقڵ!!

هیوام وایە هەموو كات ئەو جۆرە خەڵكانە بیر لەم دێڕ شیعرە بكەنەوە زۆر بە وردی:

يَعْتَرِضُ العَقْلُ عَلَى خَالِقٍ        مِنْ بَعْضِ مَخْلُوْقَاتِهِ العَقْلُ

عەقڵی بەد لە خالقێك ڕەخنە دەگرێ

بەهەندێك مەخلوقاتی ئەوهەژمار دەكرێ

شكسپیر دەڵێت: "زۆر شت هەن لە زەوی و ئاسمانەكاندا كە هیچ فەلسەفەیەك ناتوانێ خەونیشی پێوە ببینێت"[1]

ڕەنگە دان پێدانانێكی جوانبێت و بەسبێت بۆ كەسێك بفامێ.

---

[1] فلسفات عصرنا، جان فرانسوا دورتيي، ص: (٣٠٠)، ترجمة: إبراهيم صحراوي ،الدار العربية للعلوم ناشرون، ط:١، ١٤٣٠هـ.

## بانێکەو دوو هەوا!!

ئۆزۆن زۆر باسی ئەوە دەكات كە پێویستە بگەڕێنەوە بۆ قورئانی پیرۆز بەتەنها و واز لەهەموو سەرچاوەیەکی تر بێنین، بەڵام وا ئۆزۆن هەر زوو وتەکەی خۆی لە سەرەتای کتێبەکەیدا هەڵوەشاندوەتەوەو خۆی بەدرۆخستوەتەوە، لایەنی کەم مرۆڤ ئەگەر چەواشەکاربێت ئەبێت لێزانبێت چونکە چەواشەکاری و گێلێتی پێکەوە ناشرینترن ئەگەر هەر کۆ ببنەوە!!

ئۆزۆن هەر لەمیانەی پێشکەشکردنی کتێبەکەیدا ئەیکاتەدیاری و دەڵێت پێشکەشە بە:

(كل من أحبّ الناسَ على اختلاف أجناسهم وأديانهم ومعتقداتهم)[1] لا: ١١

واتە: هەموو ئەوانەی کە تێکرای خەڵکیان خۆشەوێ سەرەڕای جیاوازی ڕەگەزو ئایین و بیروباوەڕیان.

ئێمە لێرە لە ئۆزۆن ئەپرسین ئایا ئەمە لەگەڵ بانگەوازی قورئاندا یەکدێتەوە؟ ئایا قورئان بەم شێوەیە هاتووە؟

ڕاستە بانگەوازی ئیسلامی ڕەحمەت و بەزەییە بۆ هەموو خەڵکی و حەزکردنە بە هیدایەتیان و نەچونیانە بۆ دۆزەخ، بەڵام یەکێك لەهەرە بابەتە گرنگەکان و تایبەتمەندیەکانی بریتییە لە بابەتی(الوَلاءُ وَالبَرَاءُ)، کە دەستەواژەی یەکەمیان(الوَلاءُ): خۆشەویستی و سەرخستن و هاوکاریکردنی تێکرای مسوڵمانانە.

دەستەواژەی دووەمیشیان(البَرَاءُ): بریتییە لە دژایەتیکردن و ڕقبوونەوە لە کافران و دوژمنانی ئایین.

ئەویش لەبەر خاتری کوفرو بێباوەڕییەکەیان و لادانیان لە ڕێگەی حەقە، ئەگەر بێت و تۆ کافرانت خۆش بوێت و هەڵسان و دانیشتنت هەر لەگەڵ ئەوانبێت، باشە پێم ناڵێیت ئەبێتە هۆی چی کێشەیەك و چۆن ڕاست و چەوت لەخەڵکی ئەشێوێنیت؟ هەروەها خۆشویستنت بۆ ئەوان و جێبوونەوەی ئەوان لە دڵتا ڕاستەوخۆ کاریگەری دروست

---

[1] وەرگێڕ نەیهێناوە.

ئەكات لەساردبوونەوەت لە ئاین و ئیسلامەتیەكەت، ڕەنگە تۆی بەرێز وابزانیت ئۆزۆن تا ئێستا ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزی نەبیستووە كە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ... ﴾المجادلة

واتە: هەرگیز دەستت ناكەوێ خەڵكانێك بڕوایان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت و لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستیان بۆ خەڵكانێك هەبێت كە دژایەتی خوای گەورەو دینی خوا ئەكەن، ئەگەر چی ئەوكەسانە باوكیشیانبن یان منداڵیانبن یان برایانبن یان كەس و كاریانبن.

نەخێر خوێنەری بەرێز هەرگیز وەها گومانێك نەبەیت چونكە ئۆزۆن زۆر باش ئەو ئایەتەی دیوەو باشیش ئەزانێ كە ئەوە فەرمانی خوای گەورەیە، بەڵام ئەو مەرامی تری هەیە لە پشت ئەو وتانەیەوە.

ئۆزۆن لەپێشەكی كتێبەكەیداو هەر لەسەرەتای دەستپێكردنیدا بە ناپاكی و خیانەت لە زانست و شەیدایانی دەست پێدەكات و دەڵێت: (كێشەو گرێی فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) یەكێكە لە گرنگترین و ئاڵۆزترین باسەكانی نێو ئاینی ئیسلام) ع: ١١، ك: ١١

ئێمە ئۆزۆن ئەخەینە بەردەم دووڕیانێك و لێی ئەپرسین: ئەگەر مەبەستت لەو كێشەو گرفتە زۆر و گەورانەی كە لە فەرموودەكاندا هەیە و تۆ دۆزیوتەتەوەو ساڵەهای ساڵ زانایانی ئوممەت لێی بێ ئاگان، لەسەر بەبەڵگەگرتنی سوننەت و نەبوونیەتی بەبەڵگە، ئەوا هەر لە ئێستاوە با دڵت ئاوبخواتەوە كە زانایانی ئوممەتی ئیسلامی بە خیلافی مەزهەبی بیرووباوەڕی و فیقهیشەوە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) بەبەڵگە زانیوە و فەرموون ئێوەو بەڵگە:

### فەرموودە لای ئەهلی سوننە:

كتێبەكانی ئەهلی سوننە بەربڵاون و بەردەستن و هەركەس ئەیەوێت ئەتوانیٚ بگەڕێتەوە سەریان، بۆ نموونە كتێبی(الرسالة للامام الشافعي، المسودة في أصول الفقه لآل تيمية، الموافقات للشاطبي ...)، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها وتەی پێشەوا سەمعانی ئەهێنین كە دەفەرموێت: "إِنَّ سُنةَ الرَّسُولِ(ﷺ) فِي حُكْمِ الكتابِ فِي وجُوبِ العَمَلِ بِهَا"[1].

واتە: بەدڵنیاییەوە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) وەك حوكمی قورئانە لە ڕووی واجب بوونەوە سەبارەت بە كارپێكردنی.

[1] قواطع الأدلة(القواطع في أصول الفقه) لأبي المظفر السمعاني (٤٩٢/١)، دار الفاروق – عمان – الأردن، ط: الأولى ١٤٢٢هـ.

زەیدیەكان:

زانای گەورەی جیهانی ئیسلامی پێشەوا شەوكانی(رحمه الله) دەفەرموێت:

(اعْلَمْ أَنَّهُ قَدِ اتَّفَقَ مَنْ يُعْتَدُّ بِهِ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ عَلَى أَنَّ السُّنَّةَ الْمُطَهَّرَةَ مُسْتَقِلَّةٌ بِتَشْرِيعِ الْأَحْكَامِ وَأَنَّهَا كَالْقُرْآنِ فِي تَحْلِيلِ الْحَلَالِ وَتَحْرِيمِ الْحَرَامِ)[1]

واتە: بزانە یەكدەنگن هەموو ئەوانەی كە بایەخدراوە بە وتەیان لـە زانایان لـەسەر ئەوەی كە سوننەتی پاك و بەرز، بەتەنها دەبێتەوە لـە بڕیاری حوكمە شەرعیەكان و هەروەكو قورئانە لـە حەلاَلكردنی حەلاَلْ و حەرامكردنی حەرامدا.

موعتەزیلە:

هەرچی موعتەزیلـەشە بەشێوەیەكی گشتی هەمان ڕایان هەیە، هەروەكو لـە دیارترین كتێبی ئصولـییاندا هاتوە، كە(أبو الحسين البصري) باسێكی داناوەو دەلێت:

( "فصل فِي أَن الْخَبَر لَا يُرَدُّ إِذا كَانَ رَاوِيه وَاحِدًا"

ذهب جلّ الْقَائِلين بأخبار الْآحَاد إِلَى قبُول الْخَبَر وَإِن رَوَاهُ وَاحِد وَقَالَ أَبُو عَليّ إِذا روى العدلان خَبرا وَجب الْعَمَل بِهِ وَإِن رَوَاهُ وَاحِد فَقَط لم يجز الْعَمَل بِهِ إِلَّا بأحد شُرُوط مِنْهَا أَن يعضده ظَاهر أَو عمل بعض الصَّحَابَة أَو اجْتِهَاد أَو يكون منتشرا ....

وَالدَّلِيل على القَوْل الاول قِيَاسه على أَخْبَار الْمُعَامَلَات على مَا ذكرْنَاهُ فِي الْبَاب الْمُتَقَدّم وَيدل عَلَيْهِ إِجْمَاع السّلف عمل أَبُو بكر رَضِي الله عَنهُ على خبر رَوَاهُ بِلَال وَعمل عمر على خبر حمل بن مَالك وعملت الصَّحَابَة على خبر أبي سعيد فِي الرِّبَا...)[2].

وەكو بینیمان كە باسی ئەوە دەكات كە كار بە فەرموودەیەكیش دەكرێت كە تەنها یەك كەس گێڕابێتیەوە(ئاحاد)، هەروەها بۆچوونی ئەبو عەلی جوبائی گەورەی زانایانی موعتەزیلـە لـە سەردەمی خۆیدا ئەگێڕێتەوە كە وتویەتی: ئەگەر دوو كەس گێڕایانەوە ئەوا

---

[1] ارشاد الفحول للشوكاني (٩٦/١)

[2] المعتمد لأبي الحسين البصري المعتزلي (١٣٨/٢)، ت: خليل الميس، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت – ،الطبعة: الأولى، ١٤٠٣هـ.

واجبە كاری پێبكرێت، بۆ هەواڵی یەك كەسیش كۆمەڵێك مەرجی داناوەو بەو مەرجانە وەرگیراوە نەك ڕەتبكرێتەوە هەر لە ڕیگەوە، ئەمە وتەیانبێت بەرامبەر فەرموودەی ئاحاد ئە تۆ بڵێیت بۆ فەرموودەی تر چی بڵێن؟ ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە ئیجماعی سەلەفیش نەقڵ دەكات لەسەر وەرگرتنی خەبەری ئاحاد!

## جەعفەریەكان(شیعەی ئیمامی)[1]:

یەكێك لە كتێبە دیارەكانی شیعە كە لە حەوزە زانستیەكانیان ئەخوێنرێت بریتییە لە كتێبی "أصول الفقه"ي "محمد المظفر" كە زۆر گرنگی پیٚ ئەدرێت جا بۆیە ئێمەش لێوەی نەقڵ ئەكەین و وتەی ئەو دێنینەوە كە دەڵێت: (والأدلةُ الشَّرعيةُ هِي الكِتابُ والسُّنةُ وَالعَقْلُ وَالاجمَاعُ)[2]

واتە: بەڵگە شەرعیەكان بریتین لە قورئان و سوننەت و عەقڵ و ئیجماع.

هەروەها ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆ كتێبی(أصول الفقه)ی(ئایەتوڵا حوسەین حیلی)[3] كە ئەم كتێبە بەناوبانگترین كتێبیانە و زۆر بایەخی پیٚ ئەدەن، لەوێدا تەنانەت بەڵگەیەكی زۆر دێنێتەوە لەسەر وەرگرتنی "فەرموودەی ئاحاد"[4] چ جای بگاتە فەرموودەی تر؟!

هەرچی تاقمەكانی تریشە بەهەمان شێوە كەسیان نەهاتوون فەرموودە ڕەت بكەنەوەو بڵێن كێشەی تیایە، ئەگەر فەرموودەیەكیش لەگەڵ بنەمای مەزهەبی داهێنراویاندا نەگونجابێت ئەوا لە ماناكەی خۆی لایانداوەو مانایەكی تریان پێی داوە نەوەك بێن و ڕەتی بكەنەوە.

---

[1] هەندێك جیاوازی ناكەن لە نێوانیان لەبەر ئەوەی جیاوازی نێوانییان بریتیە لە هەندێك شتی لاوەكی، هەروەكو شیخ صالح كرباسی زانای خۆیان باسی ئەكات. جا بۆیە هەردووكیانمان هێناوە بۆ ئەوەی هەم مەزهەبی فیقهی و هەم مەزهەبی ئیعتقادیش بپێكین پێكەوە.

[2] أصول الفقه لمحمد المظفر (٥/١)، الناشر: مؤسسة النشر الاسلامي التابعة لجماعة المدرسين بقم، بدون سنة نشر ومكانه.

[3] أصول الفقه لآية الله الحسين الحلي (٣٩٣/٦)، مطبعة ستارة–قم–، الطبعة الأولى ١٤٣١هـ.

[4] هەر فەرموودەیەك نەگەیشتبێتە ئاستی متەواتیر.

پێشەوا ئیبن حەزم(رحمه الله) دەفەرموێت:

(فإن جميع أهل الإسلام كانوا على قبول خبر الواحد الثقة عن النبي صلى الله عليه وسلم يجزي على ذلك كل فرقة في علمها كأهل السنة والخوارج والشيعة والقدرية حتى حدث متكلمو المعتزلة بعد المائة من التاريخ فخالفوا الإجماع في ذلك)[1].

واتە: بەدڵنیاییەوە هەموو مسوڵمانان لەسەر وەرگرتنی خەبەری ئاحاد بوون(كەسێكی جێی متمانە لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ەوە بیگێڕێتەوە و گشت تاقمەكان ئەوە دەزانن، هەر لە ئەهلی سوننەو خەواریج و شیعەو قەدەریەكان، تاوەكو زانایانی كەلامی موعتەزیلە هاتن لە دوای ساڵی سەدی كۆچی و پێچەوانەی ئەو ئیجماعەیان كرد.

ئەمە وەكو فەرموودەی ئاحاد، كە لە پێشدا ئیجماع هەبوەو نابێت هەڵوەشێتەوە ئەو ئیجماعە، بەلاَم فەرموودە بە شێوەیەكی گشتی كەس لاری و نەنگی لەوە نەبووە كە شەریعەتەو پێویستە شوێنی بكەوین، جا ئێستا داوامان وایە ئۆزۆن بۆمان ڕوون بكاتەوە كە ئەو گرێو كێشە زۆرەی باسی ئەكات لە كوێدایە؟!

ئەگەر بێت و ئۆزۆن بڵێت كێشە لە جیاكردنەوەی ڕاست و چەوت و سەحیح و زەعیفی فەرموودەكان و لێكدانەوەو ماناكانیەتی، ئەوا پێی دەڵێن: هیچ كێشەیەكی تێدا نییە بۆ كەسێك لێی بزانێت و پیاوی ئەو مەیدانەبێت بەلاَم كەسێك هەر بەزۆر خۆی هەڵواسیبێت بە زانستی شەرعیدا بێگومان لەلای زۆر قورسە، هەر وەكو چۆن ئێستا قسەكردن لە لای ئێمە ئاسان و سانایە بەلاَم بە پێچەوانەوە لای منداڵێكی ساوا زۆر ئەستەمە!!

هیچ فەرموودەیەك نییە كە ڕوون نەبێت و نەتوانین بگەینە ئەنجامێك لە حوكمدان بەسەریدا بەوەی كە سەحیحە یاخود زەعیف و ژیانی هەموو گێڕەوەكانی تۆماركراوەو زانایانی فەرموودەش بەردەوام لێكۆڵینەوەیان كردوەو ئەشیكەن، بەلاَم وەك وتم ئەوە پیشەی هەموو كەس نیە.

---

[1] الإحكام في أصول الأحكام لابن حزم (١/١١٣-١١٤)، ت: أحمد محمد شاكر، الناشر: دار الآفاق الجديـدة، بيروت

بۆ لێكدانەوەی فەرموودەكان و بوونی كێشەش لەناو یەكدا دەلێم وەكو چۆن پێشەوا "ئیبن خوزەیمە"(رحمه الله) تەحەدداى هەموو نەیارانی سوننەتی ئەكرد لە كۆنداو ڕووبەڕوویان ئەبویەوەو ئەیفەرموو:

(لَا أَعْرِفُ حَدِيثَيْنِ مُتَضَادَّيْنِ" فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ فَلْيَأْتِنِي بِهِ لِأُوَلِّفَ بَيْنَهُمَا)[1].

واتە: دوو فەرموودەی دژبەیەك پێنازانم، جا هەركەس لایەتی بیهێنێت تاوەكو جەمع بكەم لە نێوانیان و بۆی ڕوون بكەمەوە.

ئێستاو لە داهاتووشدا بە دڵنیاییەوە خوای گەورە خەڵكانێك ئامادە دەكات بۆ وەلاّمی ئەو گومانانەو پیلانی نەیارانی سوننەت هەڵەوەشێننەوە بەبەڵگەی بەهێز و حاشاهەڵنەگر، بە ویستی خوای گەورە ڕێگە نادەین تەنها وشەیەك بەسەر ئۆزۆن و هیچ كەسێكی تریش تێپەڕێت بەبێ ڕونكردنەوەو وەلاّمدانەوە، ئامۆژگاریشم بۆ نووسەرو وەرگێر ئەو وتەیەی شاعیرە كە دەڵێت:

فـدَعْ عنـكَ الكتابـةَ لسـتَ منهـا ولـو سـوَّدتَ وَجْهَـكَ بالِمـدادِ

واتە:

وازبێنـە ڕۆڵـە نووسـین كـەی ئیشـی تۆیـە
گـەر سـیایكەیت ڕووت بـە حیـبرو بۆیـە[2]

## ئایا بوخاری پیرۆزو بڤەیە؟

ئۆزۆن دەڵێت: (ئەگەر(صحيح البخاري) هێندە پیرۆزو گەورەبێت لەلای پێشەوایان ئەوا ئەم پەرتووكەی بەردەستت كار لەسەر بەگەڕخستنی عەقڵ و ڕزگاركردنی ئێمە لە وەهمی گێڕانەوەكان دەكات) ع: ١١-١٢ ك: ١١

---

[1] تدريب الراوي للسيوطي (٦٥٢/٢)، حققه: أبو قتيبة نظر محمد الفاريابي، الناشر: دار طيبة

[2] واتە: باشترە بەو حیبرە ڕووت ڕەنگ بكەی تاوەكو پەڕەیەك بنووسیت بە نەزانی !!

مسولَمانان هەم بە گوفتار و هەم بەكرداریش ئەوەیان سەلماندووە كە بێجگە لە قورئان شتێكی تر پیرۆز نییە و هەموو شتێكی تر بێجگە لەو مەجالی لێكۆلَینەوەی تێدایە بۆ ڕاستی و چەوتی، بەلاَم كێشەی ئۆزۆن و هاوشێوەكانی لەوەدایە دوای ئەوەشی كە بۆی ڕوون بویەوە كە وتەی پێغەمبەرە(ﷺ) هێشتا خۆی بەگەورە ئەزانێت لە ئاستیداو بڕوای پێ ناهێنێت.

لەگەلَ ئەوەشدا صەحیحی ئیمامی بوخاری(رحمه الله) ڕاسترین و دروسترین كتێبە لەدوای قورئانی پیرۆزو هەموو ئوممەت بە صەحیحیان داناوەو وەریانگرتووەو كاریان بە فەرموودەكانی كردووە، بەلاَم سەرەڕای هەموو ئەمانەش زانایانی ئەم ئوممەتە نەوەستاون و فەرموودەكانیان خستوەتە ژێر پێوانەكاری زانستی بەبێ هیچ مەرام و مەبەستێكی خراپ و بەوپەڕی دادپەروەریەوە هەستاون بە كاری خۆیان و بەجێیان هێناوە .

من لێرەدا نامەوێت بێ بەلَگەو بە سۆزو عاتیفە بڕوام پێ بكەیت و پەلكێشی وتەكانم بكەم، بەلَكو بە پێچەوانەی ئۆزۆنەوە بەلَگەت ئەدەمێ لەسەر ڕاست و دروستی وتەكانم وكۆمەلَێك نمونەت ئەدەمێ زانایانمان(ڕەحمەتی خوای گەورە لە هەموویانبێت)و ئەوە ئەسەلمێنم كە ئۆزۆن لە بانگەشە زیاتر شتێكی لانیە، بۆ نموونە(الحافظ ابن حجر العسقلاني) (رحمه الله) لەبارەی هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلم دەفەرموێت:

(وقد اعتنى أبو الحسنِ الدَّارَقُطنِيُّ بتتبعِ ما فيهما من الأحَاديثِ المُعَلَّلَةِ فزادتْ على المائتين)[1].

واتە: ئەبولحەسەنی(الدَّارَقُطنِيُّ)(رحمه الله) بایەخی داوە بە بەدواداچوونی ئەو فەرموودانەی كە قسەی تیاكراوەو گەیشتوەتە سەرووی دووسەد فەرموودە.

هەرچەندە ئیمامی(الدَّارَقُطنِيُّ)(رحمه الله) لە هەموویدا نەیپێكاوە، بەلاَم بەوپەڕی ئەدەب و بەڕەچاوكردنی بنەما زانستیەكان وتەی فەرمووە، هەروەكو پێشەوا ئیبن صەلاحی شارەزووری(رحمه الله) دەفەرموێت:

---

[1] النكت على مقدمة ابن الصلاح للحافظ ابن حجر (١/٣٨١)، ت: ربيع المدخلي، الناشر: الجامعة الاسلامية بالمدينة المنورة.

(قد استدرك الدَّارَقُطْنِيّ على البُخَارِيِّ وَمُسلمٍ أَحَادِيثَ فَطعنَ فِي بَعْضهَا وَذَلِكَ الطعْنُ مَبْنِيٌّ على قَوَاعِدَ لبَعضِ الْمُحدِّثينَ ضَعِيفَةٍ جَدًّا مُخَالِفَةٍ لِمَا عَلَيْهِ الْجُمْهُورُ من أهل الْفِقْه وَالْأُصُولِ وَغَيرِهم فَلَا تغترَّ بذَلِكَ)[1].

واته: (الدَّارَقُطْنِيّ) پەی بەهەندێك فەرموودە بردووە بەسەر "بوخاری" و "موسلیم"ەوە و تانەی لێداوە[2]و تانەكانیشی لەسەر هەندێك بنەمای لاوازی زانایانی فەرموودەن كە پێچەوانەی ئەوەیە كە زۆرینەی زانایانی لەسەرە لە زانایانی(فقه) و(أصول) و بێجگە لەوانیش، بۆیە بەوە نەخەڵەتێی.

ئیدی لێرەوە بەدیار دەكەوێت وتەكانی ئۆزۆن دوورن لە بنەمای زانستی و لۆژیكیو كەس نەیوتووە پێشەوا بوخاری مەعسومو بیٚ هەڵەیە، بەڵام كێشەكە ڕەخنەی هەندێك ڕەخنەگری نەشارەزایە!!

---

[1] نقل عنه الحافظ في الفتح (١/٣٤٧)، دار المعرفة – بيروت، ١٣٧٩هـ.

[2] تانە لە فەرموودەكان (واتە بە لاوازی داناون).

## ئۆزۆن و ئەوپەڕی لەخۆڕازیبوون

هەمیشە ڕێبازی زانایانی سەر ڕاست و ڕاستگۆ لەگەڵ خوای گەورە خۆبەكەمزانی و دووركەوتنەوەبووە لە مەحدح و پیاهەڵدانی نەفس.

بەردەوام كەم وكورتییان داوەتە پاڵ نووسینەكانیان و پێی سەرسام نەبوون وەكو خەڵكانێكی تر كە بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە نانووسن، سەیر نەبێت لەلات چونكە كەسێك بۆ خوای گەورە نەنووسێت هەر بۆدونیاو پیاهەڵدانی خەڵكیەتی و بۆیە ئەیەوێت بەزووترین كات وەسف و سەنای نووسراوەكەی خۆی ببیستێتەوە لەلایەن خەڵكەوە بۆیە ناچار خۆی هەرزوو دەست دەكات بە وەسفكردنی، جا ئێستاش سەیری ئەوپەڕی غرور و كیبری ئۆزۆن بكەن كە لە وەسفی كتێبەكەی خۆیی و كەمكردنەوەی بەهای كتێبی زانایانماندا دەڵێت: (جاءت أبحاثه مبسطة مركزة مباشرة و بعيدة عن التعقيد والتكرار والاستطراد الذي اتصفت به معظم كتب التراث)[1].

واتە: باسەكانی ئەم كتێبە كورت و پوختن و ڕاستەوخۆ پەیوەندیدارەو دوورە لە ئاڵۆزی و دووبارەكردنەوەو لادان لەبابەت هەروەكو زۆربەی كتێبەكانی(كەلەپور)[2]ی پیّ وەسف دەكرێت!!

ئەم وتەیەی ئۆزۆن وەرگێڕ نەیهێناوەو ئەبوو لە لاپەڕە(١١)ی كتێبەكەدا هەبێت بەڵام نیە، پیّ ئەچێت هێندە بیّ ئەمەكی بێت وەرگێڕ نەیتوانیبێت یاداشتی بكات، یان لە بەرهەر هۆكارێكی تر، بەڵام بەهەرحاڵ ئەبوو وەرگێڕ بیهێنایەو تۆماری بكردایە و ئەمانەتی زانستی بپاراستایە.

باشە ئۆزۆن چۆن ئەتوانێت وەها ڕێگا بەخۆی بدات و وەسفی كتێبەكانی بكات و بەهایان بۆ پەیدا بكات، بەڵام لەهەمان كاتتدا بەو شێوە ناشرینە وەسفی ئەو هەموو هەوڵ

---

[1] لە لاپەڕە(١٢)ی كتێبەكەی ئۆزۆن و ئەبوایە لە لاپەڕە (١١)ی وەرگێڕدراوەكەدا هەبوایە، بەڵام وەرگێڕ نەیهێناوە.

[2] ئەوانەی وا زانایانی كۆن نووسیویانە لە هەموو بوارەكاندا.

و ماندوبوونەی زانایانی پێشوو بكات، ئایا ئەمە ناوبنێین بێ سیفەتی؟ یان بلێین بێ ڕێزی و بێ شەرمی و بێ ئەمەكی بەرامبەر ئەرك و ماندوبوونی خەڵكانێكی دڵسۆزوو ماندونەناس؟!

فَــلا تَكتُــبْ بخطِّــكَ غَــيرَ شَــيءٍ     يَسُــرُّكَ فِــي العَوَاقِــبِ أَنْ تَــرَاهُ

واته:

مەنووســـــە بەدەســـــتەكانت بێجگـــــە شـــــتێ

بـــــەبینیی لەپاشـــــەڕۆژدا ڕووت دەگەشـــــێ

## ئۆزۆن ڕاستگۆ نەبوو لەگەڵ بانگەشەكەی!!

لەوەوپێش باسی ئەوەمان كرد و وتەی ئۆزۆنمان هێنا كە پێویستە هەمووان عەقڵ و ژیری بخەنە گەڕ و كتێبەكەی خۆشی پێشكەشی بەوانە دەكرد كە عەقڵیان پێش نەقڵ دەخەن و ژیریی خۆیان ئەكەنە سەنگی مەحەك بۆ هەڵسەنگاندنی گشت پرسێك(خراپی ئەم وتەیەمان لەوەو پێش وەڵامدایەوە)، بەڵام وا ئۆزۆن بە سەد پلە پێچەوانەی وتەكەی خۆی هەنگاو ئەنێت و قسەكردن بە گوێرەی عەقڵ و ژیریی لەسەر هەموو زانایانمان حەرام دەكات و ئەیانترسێنێت بە ئاگرو گومڕاكردنی خەڵكی و دەڵێت:

(لە كۆتاییدا بەلای پێشینەكانەوە، ئەو زاناو پێشەوایانەی كە خۆیان ماندوو كردووە گەر هەڵەشبن خوا هەر پاداشتیان بۆ دەنووسێت بەڵام باشترین وتە ئەوەیە كە خوای گەورە لە سورەتی ئەحزابدا دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٨﴾ ﴾الأحزاب

ع: ١٢ ك: ١١-١٢

ڕەنگە وەرگێڕ زۆر شەرمی كردبێت لەوەی كە ئایەتەكە تەفسیر بكات وەكو خۆی چونكە ئەو هەموو ماندوو بونە بە گومڕاكردنی خەڵكی و سەرلێشێوانی خەڵكی لەقەڵەم ئەدات و ئاگری دۆزەخیش ئەكاتە شوێنی زانایان و ئەوانەشی كە بە گوێی ئیجتهادی ئەوانیان كردووە!!

یان ئەكرێ وەرگێڕ تەفسیری لەبەردەستدا نەبوبێت و نەیزانیبێت و لەعەرەبیدا كۆڵبێت، چونكە ئەگەر بەراوردی بكەی دەقی وەرگێڕانەكەی لەگەڵ عەرەبیەكەدا جیاوازییان زۆرە، بۆ نموونە: ئۆزۆن دەڵێت: (لكن الأجدر اعتماد قوله تعالى) لا: ١٢

واتە: بەڵام لەپێشترە كە پشت بە وتەی خوای گەورە ببەستن.

بەڵام وەرگێڕ دەڵێت: (بەڵام باشترین وتە ئەوەیە كە خوای گەورە لە سورەتی ئەحزابدا دەفەرموێت) لا: ١٢!!

ئێستا با پێكەوە بچینە خزمەتی ئایەتەكەو ئەوپەڕی بێ ویژدانی ئۆزۆن ببینین، خوای گەورە باس لە حاڵی كافران و ئەوانەی كە شوێن گەورەو ملهوڕو خوێنڕێژەكان ئەكەون دەكات ودەفەرموێت:

﴿وتیان ئەی پەروەردگارا ئێمە گوێڕایەڵی گەورەو كاربەدەستەكانمان كرد و دەسا ئەوانیش لە ڕێگەی ڕاست لایانداین(٦٧)، ئەی پەروەردگارا دوو هێندە سزای ئەوان بدەو نەفرینیان لێ بكە(٦٨)﴾.

ئۆزۆن زۆر بێ شەرمانە ئەم ئایەتە دائەبەزێنێتە سەر زانایان لە كاتێكدا خوای گەورە لە ئایەتی(٦٤) بەدواوە زۆر بە ڕوونی باس لەوە دەكات كە ئەمە حاڵی بێباوەڕانەو دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ ﴾الأحزاب

پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەفەرموێت كە نەفرینی لە كافران كردووەو سزای دۆزەخی بۆیان داناوە، بەڵام ئۆزۆن دایدەبڕێت بەسەر زانایان و پێشەوایانی ئیسلامدا!!

ئایا هەرئەوەندە بەس نییە تا ئێستا بۆ ئەوەی كە بزانیت ئۆزۆن چی لەژێر سەردایە؟ ئایا ئیتر بەوە دەخەڵەتێی كە ئۆزۆن لە كتێبەكەیدا هەر دەڵێت(السادة العلماء) زانا بەڕێزەكان؟! كامە ڕێز و كامە ئەدەب لەكاتێكدا ئەوە مامەڵەتبێت لەگەڵیاندا؟!

## ئایا فەرموودە وەحیەو لای خوای گەورەوە هاتووە؟

پاشان خۆی دێتە وەڵام و دەڵێت: "فەرموودەكانی پێغەمبەر بێگومان سرووشتی دابەزێنراو نین، چونكە گەر وابوایە ئەوا وەك هەر دەقێكی قورئان مامەڵەی لەگەڵ دەكراو دەقەكەی لەكاتی نوێژەكاندا دەخوێنرا" ع لا: ١٤، ك: ١٥

دەڵێم: ئۆزۆن زۆر دڵنیایە لەوەی كە فەرموودە وەحیی نیە، بەڵام خۆزگە چارەكێكی ئەو دڵنیاییەی بەڵگەی بەهێزیشی هەبوایەو هەمان شتی نووسەرەكانی پێش خۆی دووبارە نەكردایەتەوە، بەهەرحاڵ بۆ وەڵامی ئەو دڵنیاییەی تەنها پشت بە قورئانی پیرۆز دەبەستم و دەڵێم خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝٤ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ۝٥﴾النجم

باشە خوای گەورە ئەم تەزكیەی پێغەمبەر(ﷺ) بكات و بفەرموێ هیچ گۆو وتەیەكی پیغەمبەر لە هەواوە نییە و بە دڵنیاییەوە تەنها وەحیە و جبریل فێری كردووە ئیتر كێ ئەتوانێت بەرەنگاری بێتەوە بێجگە لە ئۆزۆن و نەیارانی سوننەت؟!

هەندێك كەس دەڵێت مەبەست لە زەمیری(هو) قورئانەو بۆ قورئان ئەگەڕێتەوە و مانای وایە ئەو قورئانە سرووشەو سرووش ئەكرێ.

دەڵێین: سەرەڕای ئەوەی كە باسی قورئان لە ئارادا نییە تاوەكو بڵێین(هو) بۆ قورئان ئەگەڕێتەوە.

ئەمە لەلایەك و لەلایەكی تریشەوە وشەی(نطق) كە هاتووەو نەفی ئەكات كە بێجگە لە وەحی بێت و هەمووی وەحیە، ئەو گۆیەش دوو جۆرە:

یەكەم: گۆی پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی دونیاوە، ئەوە بە تێكڕای هەموو كەسێكی خاوەن عەقڵ و ژیریی بریتییە لە بۆچوونی خۆیی و وەحی نییە.

دووەم: وتەكانی لەبارەی شەریعەتەوە كە ئەویش یان قورئانە یاخود سوننەت، كە ئەو گشتگیریەی كە لە وشەی(وَمَا يَنطِقُ) دا هەیە هەردووكیان ئەگرێتەوە، چونكە(يَنطِقُ)

فیعلی مضارعەو، (عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ) جارو مەجرورەو تەعەلوقی پێوە ئەبەستێت و ماناكەی وای لێ دێت(مَا يَصْدُرُ نُطْقُهُ عَنْ هَوًى مِنْ نَفْسِهِ)

واتە: وتەو گفتی ئەو هەرگیز لە نەفسی خۆیەوە نیەو بەڵكو وەحیە لە لایەن خوای گەورەوە، كەواتە ئەمە گەورەترین تەزكیەیە بۆ سوننەت.

هەروەها لە چەندین ئایەتدا خوای گەورە باسی(الكتاب) ئەكات كە بریتییە لە قورئانی پیرۆز و دوا بەدوای ئەویش وشەی(الحِكْمَة) دێنێ، باشە تاوەكو ئێستا پرسیومانە ئەو حكمەیە چیەو بریتییە لە چی و وائەخوازێت چیبێت؟!

هەندێك لەو ئایەتانەی كە خوای گەورە(ﷻ) باسی هەردووكیانی پێكەوە كردووە:

﴿ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٢٩ ﴾البقرة

هەروەها: ﴿ كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمۡ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ١٥١ ﴾البقرة

هەروەها: ﴿ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ٣٤ ﴾الأحزاب

هەروەها: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٢ ﴾الجمعة

بێجگە لەمانەش لە چەندین ئایەتی تری قورئانی پیرۆزدا كە پێكەوە گرێدراون، باشە تۆ بڵێی ئەو حیكمەتە چیبێت و وتەی كێ بێت؟ تۆ بڵێی هیچ نهێنیەك لەپشتیەوە هەبێت وا ئەو هەموو جارە لەگەڵ قورئاندا پێكەوە هاتوون؟

هەرچیەك بوترێت دەربارەی حیكمەت بێجگە لە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە جێی خۆیدا نییە و ئەتوانین بڵێین لێكدانەوەیەكی دوورە لەبەر دوو هۆكاری سەرەكی ئەوانیش:

یەكەم: ئەم ئایەتە و ئەم شێوازی خیتابە وەكو گوێڕایەڵی خوای گەورەو پێغەمبەرەكەیەتی(ﷺ) كە لەچەندین شوێنی قورئاندا پێكەوە هاتوون.

بۆ نموونە: ﴿قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٢﴾آل عمران

هەروەها لەچەندین ئایەتی تریشدا وەكو(النساء:٥٩)و(الانفال: ٢٠)و(النور: ٥٤) و(محمد: ٣٣)، زانراوە لەكاتی تەفسیركردنی قورئاندا لەپێشچاوگرتنی شێوازی گووتار تیایدا شتێكی خوازراوەو ڕۆڵی گرنگی هەیە لە تەفسیرو لێتێگەیشتنیدا.

وەك چۆن گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بەستراوەتەوە بە گوێڕایەڵی خوای گەورەوە بەهەمان شێوە ئەو حیكمەتەش كە گرێدراوە بە قورئانی كەلامی خوای گەورەوە پێویستە سوننەت بێت كە وتەو كەلامی پێغەمبەرەكەیەتی.

دووەم: حیكمەت لەپاڵ قورئاندا هاتوەو بە حەرفی عەتف هاتوەو ئەمەش وا ئەخوازێت كە جیابێت لە قورئانەكەو بەڵكو شتێكی تربێت، باشە پێم ناڵێن نەیارانی سوننەت چ وتەیەك و چ شتێك مافی ئەوەی هەیە ئەو هەموو جارە لەپاڵ قورئاندا ناوی بێت بێجگە لە وتەی ئەو كەسەی كە شەرح و ڕاڤەی ئەكات؟!

بەڵگەكان زۆر زۆرن لەسەر ئەوەی كە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) وەحیە بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها یەك بەڵگەی تر باس ئەكەین و لێكدانەوەی بۆ ئەكەین، ئەویش وتەی خوای گەورەیە كە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾النساء

ئەم ئایەتە لە چەند ڕوویەكەوە بەڵگەیە بەدەستمانەوە كە سوننەت وەحیە وهەرشتێكی لەبارەی شەریعەت تێدابێت بێگومان لەلایەن خوای گەورەوە هاتووە و، ئەوانیش:

١ – خوای گەورە گوێڕایەڵی خۆیی و پێغەمبەری(ﷺ) گرێداوە پێكەوەو وشەی(أَطِيعُواْ)ی بۆ هەردووكیان بەكارهێناوە، بەڵام دواتر كە گوێڕایەڵی كاربەدەست و پێشەوایانی مسوڵمانان دێتە ئاراوە وشەی(أَطِيعُواْ)ی لێ دەكاتەوەو تەنها عەتفی ئەكاتە سەر گوێڕایەڵی زاتی پاكی خۆیی و نێردراوەكەی.

لەمەشەوە بۆمان بەدیار دەكەوێ كە گوێڕایەڵی خۆی ڕەهایەو لە گشت كات و ساتێكدایەو گوێڕایەڵی پێغەمبەرەكەشی(ﷺ) لەگشت كاروباری ئایین و حەرام و حەڵاڵ و ڕوونكردنەوەی شەریعەت و..، بەبێ شوێنكەوتنی لە هەموو شتێكی دونیادا چونكە ئەوەیان وەحی نیە، دوا بەدوای ئەوانیش لە پلەی سێیەم گوێڕایەڵی كاربەدەستانی مسوڵمانان دێت كە گرێدراوە بەوەی فرمان بە چاكە بكەن و تەنها لە چاكەدا گوێڕایەڵیان دەكرێت و بۆیان نییە شتێك لە ئاین زیاد یاخود كەم بكەن.

٢ – خوای گەورە بەمەرجی گرتووە گەڕانەوە لەكاتی ناكۆكی بۆ لای خوای گەورەو پێغەمبەرەكەی(ﷺ) لە سەر هەركەسێك كە خۆی بە ئیماندار دەزانێت، دیارە كە گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە واتە گەڕانەوە بۆ قورئان، ئەی گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا دوای وەفاتی چی ئەكات بێجگە لە سوننەت؟

٣ – خوای گەورە گەڕانەوەی كردە مەرج بۆ لای خۆیی و پێغەمبەرەكەی ئەگەر بێت و بڕیارەكانی پێغەمبەر(ﷺ) وەحی نەبێت و تەنها ئیجتهادی خۆی بێت بۆچی گەڕانەوە بۆ لای ئەوی كردە هاودەمی گەڕانەوە بۆ لای خۆیی و كاربەدەستانی لەو گەڕانەوەیە دەركردو فەرموی: ﴿ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ لەكاتێكدا كاربەدەستانیش توانای ئیجتهادكردنیان هەیە؟

٤ – باشە ئەگەر گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەكاتی ژیانی و بۆ لای فەرموودەكانیشی دوای وەفاتی وەحی نەبێت و ئاین نەبێت و فرمانی خوای گەورە نەبێت، چۆن خوای گەورە ئەیكاتە مەرجی هەبوونی ئیمان و بە نەبوونی ئەو گەڕانەوەش كەسەكە ئیمان لەدەست ئەدات، هەروەكو دەفەرموێت: ﴿فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ﴾؟ [١]

---

[١] بەڵگەكان زۆر لەوە زیاترن كە بتوانین لێرە هەمووی باس بكەین، بەڵام ئەگەر كەسێك زیاتری بوێت ئەوا لە زنجیرە وەڵامی نەیارانی سوننەت كە (٢٢) ڤیدیۆیە تیشكێكی زۆر باشیشمان خستوەتە سەر ئەم بابەتەو ئەتوانن بینەریان بن و لە یوتیوب بەردەستە لە كەناڵی تایبەتی خۆم (مروان الكردي).

پاشان دێینەوە لای ئۆزۆن و بەڵگە لاوازەكەی كە دەڵێ: ئەگەر وەحیی بوایە ئەوا لە نوێژدا وەكو قورئان ئەخوێنرا!!

بەڕاستی ئەم وتەیە زۆر نازانستییە لە چەند ڕوویەكەوە:

١ - قورئان لەلایەن خوای گەورەوە هاتووە بە لەفزو ماناكەشیەوە بۆیە لە نوێژدا ئەخوێنریت، بەڵام فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) تەنها ماناكەی لەلایەن خوای گەورەوەیەو لەفز و گۆكەی هی پێغەمبەرە(ﷺ).

٢ - كەس نەیوتووە ئاستی قورئان و سوننەت وەكو یەكن و لەیەك پلەدا دێن تاوەكو هەردووكیان یەك تایبەتمەندییان هەبێت و هەركامێكیان هەر سیفەتێكی هەبوو ئەویش بەهامان شێوەبێت.

٣ - بۆچی ناكرێت ئەگەر هەردووكیان وەحیبن، بەڵام خوای گەورە قورئانی تایبەت كردبێت بەوەی كە لە نوێژدا بخوێنرێت بەبێ سوننەت و چی ڕێگرە لەوە؟ بۆچی مەگەر لە مەرجی وەحی ئەوەیە كە ئەبێت لە نوێژدا بخوێنرێت؟ باشە خۆ پێغەمبەرەكانی تر(عليهم السلام) وەحیان بۆ هاتوەو كێ دەڵێت هەر لە بنچینەدا نوێژیان كردوەو بەم شێوەیەو ئەو وەحیەی بۆیان كراوە لە نوێژدا خوێندویانە؟ چ بەڵگەیەك هەیە پێمان خۆشە ئۆزۆن پێمانی نیشان بدات؟!

٤ - باشە تۆ بڵێی ئۆزۆن و ئەوانەی ئەم بانگەشەیە ئەكەن بڕوایان بە تاكە فەرموودەیەك نەبێت كە وەحی بێت و لەلایەن خوای گەورەوە بەشێوەی ئیلهام یان هەر شێوەیەك هاتبێت بۆ پێغەمبەر (ﷺ)؟ بێگومان ئەبێت بۆی هاتبێت بە درێژایی تەمەنی پێغەمبەرایەتی، باشە ئەگەر هەبێت ئۆزۆن لە نوێژدا ئەیخوێنێت؟

٥ - نوێژكردن عیبادەتەو پێویستە بەو شێوەیە بكرێت كە خوای گەورە فرمانی پێ كردوەو ئەو شتانەی تێدا بخوێنرێت كە خۆی فرمان ئەكات نەوەك هەركەسەو بە ویستی خۆی شتێك بێنێت و بۆنوێژی زیاد بكات.

ئەگەر بمانەوێت زیاتر لەسەری بڕۆین ئەتوانین خاڵەكان زیاتر بكەین بەڵام هەر بەوەندە كۆتایی دێنین و گومانەكە هێندە ناهێنێت كە زیاتر لەسەری بوەستین.

## ئایا جێگیر بوونی فەرمووده شوێنی گومانە؟

پاشان ئۆزۆن گومانێکی تر دێنیت و دەڵێت(جێگیر بوونی فەرمووده شوێنی گومانە)(ظني الثبوت)!! ع:١٤، ك:١٥

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم وتەیە دەڵێین: یەقین تەنها لە بیروباوەڕدا داواکراوەو پێویستە نەوەك بابەتەکانی وەك(فقەو زمانو ...)، با ئۆزۆن باش بزانێت کاتێك ئەوترێت فەرمووده(ظني الثبوت)ە مانای وا نییە جێی گومانەو ئیتر پێویستە لێی بەئاگابین، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە پلەیەك لە خوار یەقینەوەیەو دوای ئەودێت چونکە لەو خانەیە دەرەچێت کە پێی ئەوترێت(شَك)، ئەوەی کە ئەبێتە بەڵگە ئەوەیە کاتێك زنجیرەیەك ڕاوی کە فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە پێویستە متمانەیان پێ بکرێت لە کاتێکدا هەموو مەرجێکی وەرگرتنی فەرموودەیان تێدایەو کەسانی جێی متمانەو ڕاستگۆو لەبەرکردنیان باش بووە، ئیتر چۆن گومانی ئەخرێتە سەر لەکاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ﴿٦﴾﴾الحجرات

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێنا ئەگەر هات و کەسێکی(فاسق) هەواڵێکی بۆ هێنان بەدواداچوون بکەن و لێی بکۆڵنەوە.

باشە ناکرێت بپرسین ئەگەر هاتوو ڕاستگۆبوو ئەو کەسە فاسقە و هەواڵەکەی لێ وەرنەگیرا دوای بەدواداچوون و دڵنیابوونەوە لە ڕاستی وتەکە، ئیتر سوودی ئەم ئایەتە چییە؟!

ئەمە بۆ کەسێکی فاسق پێویستە هەواڵەکەی وەرگیرێت ئەگەر دوای بەدواداچوون دەرکەوت ڕاست دەکات، ئەی باشە ئەگەر ئەو کەسەی هەواڵەکە ئەهێنێ مسوڵمانێکی متمانەپێکراوی ڕاستگۆبێت کە هەموو تەمەنی نەبینراوە درۆیەك بکات؟!

هەروەها ئەو ڕەهاییەی كە ئۆزۆن هێناویەتی زۆر ستەمكارانەیەو هەرگیز جێی قەبوڵ نییە چونكە لەفەرموودەكاندا(متواتر)[1] هەیە و ئەم جۆرەی فەرموودەش بێگومان یەقین ئەبەخشێت نەوەك بەو شێوەی كە ئۆزۆن باسی ئەكات كە فەرموودەی تێكڕا كردووە بە جێگەی گومان.

جا وەكو باسمان كرد فەرموودەیەك "ئاحاد"بێت لە پلەدا وەكو "متواتر" نیە، بۆیە زانایان فەرموویانە(ظني الثبوت) نەك بەو شێوەی كە گومانی لیَ بكریَ و حوكمی لیَ وەرنەگیرێت.

بەمەش ئاستی زانستی ئۆزۆنت بۆ دەدەكەوێت و ئەزانیت كە ئاستی زانستی كتێبەكەشی چەندە!!

## ئایا فەرموودە بە واتا گێڕدراوەتەوە؟

پاشان ئۆزۆن هەموو توانای خۆی ئەخاتە گەڕ و گومانێكی تر دێنێت و دەڵێت:

(بە واتا گێڕدراوەتەوە) ع: ١٤، ك: ١٥

ئەم بەڵگەیەی ئۆزۆن تەواو دەری ئەخات كە ئاستی خوێندەواری چەندەو چەندە لە بابەتەكان تێگەیشتووە، دوای ئەوەی كە وەڵامەكەیتان بینی:

بۆ وەڵامی ئەو گومانە دەڵێین: گشت فەرموودەكان بە واتا نەگێڕدراونەتەوە، بەڵكو ئەوەی كە بەواتا گێڕدراوەتەوە هەندێك لە فەرموودەكانەو هەندێك لە وشەكانیشی بە واتا گێڕدراوەتەوە نەوەك تەواوی فەرموودەكە، وەك زانراوە لای هەموو كەسێكیش كە فەرموودە بەتەنها ماناكەی وەحیە نەوەك وشەكانیشی(پێشتر باسی ئەوەمان كرد)، جا ئەگەر ماناكەی وەكو خۆی هات و مەبەستەكە تێك نەچوو چ كێشەیەكی تێدایە؟!

---

[1] بەفەرموودەیەك دەوترێت كە لە گشت تەبەقەكانی فەرموودەكەدا (جیل لە دوای جیل) هێندە خەڵكی گێڕابێتیانەوە، كە گومانی درۆی لیَ نەكرێت. التذكرة لابن الملقن، ص:(١٧)، التقييد والإيضاح شرح مقدمة ابن الصلاح للحافظ العراقي، ص: (٢٦٥)، شرح ألفية العراقي للمؤلف، (٨١/٢)

بۆ نموونە لەو فەرموودەیەی كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئافرەتەكە ئەدات بە شوو، بە چەند ڕیوایەتێك هاتوە، بۆ نموونە: (أنكَحتُكَهَا) یان(زَوَّجتُكَهَا) یان ...

هەر هەموو ئەمانە یەك مانایان تێدایەو ماناو مەبەستەكە وەكو خۆی گەیشتووە كە بریتییە لەوەی(لێم مارە كردی)(كردمە خێزانی تۆ) یان هەر شتێكی تر كە ئەو مانایەی تێدابێت، ئیتر پێم نالێیت چی لە بەهای وەحیەكە كەم بوەتەوە؟!

پاشان باسی ئەوە دەكات كە ڕیوایەتی جیاواز هەیە لەیەك ڕاویەوە، دەكرێت ئەم گومانەش هەر وەكو پێشوو وەڵام بدرێتەوە لەكاتێكدا كە وشەیەك دانراوە لەبری وشەیەكی تر كە هەمان ماناو مەبەست لە هەردوكیاندا هەیە، یان ڕاویەكە فەرموودەیەكی گێڕاوەتەوە و چەند كەسێكی تر لێیان بیستووەو ئەوانەی كە بیستوویانە هەموویان لەبەركردنیان وەكو یەك نەبووەو ئەوەیان كە لەبەركردنی باش نەبووە شتێكی گۆڕیوە، بەم شێوەش هیچ تاوانێك ناكەوێتە سەر فەرموودەكەو گێڕەوەی یەكەمیش بەڵكو كێشەكە لەسەر ئەو كەسەیە كە لەبەركردنی باش نەبووەو بە پشت بەستن بە كتێبەكانی(زانستی ناسینی گێڕەوەكان) ژیانی تۆماركراوەو بە وردی باسی لێوەكراوەو ئێمەش فەرموودەكەی وەرناگرین، ئیتر پێم نالێن توخوا ئەمە كەی بیانووە كە ئۆزۆن هێناویەتی؟!

## پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی نەكردووە بە نووسینەوەی سوننەت!

ئۆزۆن وەكو غەیری خۆی هەمان ڕخنە دەگرێت و دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی نەكردووە بە نووسینەوەی سوننەت و سوننەت هەمووی نەنووسراوەتەوە لەسەر دەمی خۆیدا، پێش ئەوەی باسی نووسینەوەو نەنووسینەوەی بكەم ئەمەوێت چەند خاڵێك بخەمە بەردەستی خوێنەری خۆشەویست و بیكەمە دەستپێكی بابەتەكەو وەڵامێكیش بۆ هەموو ئەوانەی كە دەڵێن بۆچی سوننەت هەمووی نەنووسراوەتەوە یاخود بۆچی فەرمان بە نووسینەوەی هەمووی نەكراوە، ئەوانیش:

١ – قورئانی پیرۆز سەرچاوەی سەرەكی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەو بەدوای ئەویشدا سوننەت دێت وەكو شەرح و ڕاڤەی سەرچاوەی یەكەم، جائەگەر بێت و سەرچاوەی یەكەم بەتەواوی دانەبەزیبێت و هەمووی نەهاتبێت چۆن شەرحەكە دەنووسرێتەوە، لەكاتێكدا حوكمە شەرعیەكان تەواو نەبوون و بەردەوام ئەگەری گۆڕانكاری هەیە بەهۆی ڕەچاوكردنی گوزەرانی خەڵكیەوە؟

٢ – ئەوانەی كە دەڵێن ئەبوایە سوننەت هەمووی بنووسرایەتەوە، زۆر بێ ئاگان لە مێژوو، چونكە ئەوان ئەگەر بێت و بیانڕوانیایە بۆ نووسینەوەی قورئان ئەیانبینی كە چەند بە نارەحەتی و بارگرانی نووسراوەتەوە، بەهۆی نەبوونی هۆكاری نووسین و تیانووسیشەوە، كاكی ڕەخنەگر وائەزانێت ئەم سەردەمەی ئێستایە كە پێنووس و تیانووس لە هەموو شوێنێك زۆر و زەبەندە و نازانێت كە قورئانەكەشیان لەسەر پارچەی بەرد و پەلی خورماو ... ئەنووسیەوە!!

٣ – چۆن داوای نووسینەوەی تەواوی ژیانی كەسێك دەكرێت لەكاتێكدا شتێكی ئاسان نییە كە هەمووی بەدەست بێت و لە ئێستاشدا ئەوە نایەتەجێ چ جای لەو سەردەمەی پێشوو، بەڵام دوای بەدوادا گەڕانی فەرموودەناسان و وەرگرتنی شوێنكەوتوان لە هاوەڵان و هەوڵیان بۆ زانینی تەواوی ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر ڕاویەك و هەندێكی لابوەو گەیاندویەتی تاوەكو گەیشتوەتە ئێمە.

٤ – كاكی ڕەخنەگر وا تێگەیشتووە كە هەموو هاوەڵان توانای نووسینەوەیان هەبووەو شتیان نووسیوەتەوە، سەرەڕای ڕێژەیی ئەوانەی كە توانای نووسینەوەیان هەبوەو بۆیە ئەستەم بووە ئەو هەموو سوننەن و مەسانیدانەی كە ئێستا هەیە هەمووی بنووسرێتەوە و هێندە نووسەر نەبووە لەو سەردەمەدا تاوەكو ڕەخنە بگیرێت.

٥– كاتێك توانای نووسینەوەی هەموویان نەبووە لەوەش ترساون كە هەندێكی كەمی بنووسنەوەو پاشان خەڵكی وا بزانێت كە سوننەت هەر ئەوەندەیە، بۆیە دەم بەدەم گێڕاویانەتەوەو گەیاندویانە بە جیلی دوای خۆیان، بێجگە لەو ڕێژە فەرموودەیەی كە نووسراوەتەوەو باسی دەكەین بە ویستی خوای گەورە.

٦ – گرنگیدانی عەرەب لەوكاتەدا بە لەبەركردن و بەلاوەنانی نووسین، زانراوە كە هەر گەل و هۆزێك بە شتێك تایبەتمەندن و ئەوەی كە عەرەبی پێ جیاكراوەتەوە توانای لەبەركردنیان بووە، ئەگەر بێت و سەیری توانای لەبەركردنیان بكەین سەرمان ئەسوڕمێ بۆ نموونە "ئەبو هیلالی عەسكەری" لەبەرەبەیانێكدا قەسیدەیەكی "ڕوئبەی كوڕی عەجاج"ی لەبەركردووە كە هەموو وشەكانی زۆر قورس و نامۆن، هەروەها "ئیبن عەبباس"یش بە یەك جار بیستن قەسیدەیەكی "عومەری كوڕی ئەبی ڕەبیعە" لەبەر دەكات كە ژمارەی بەیتەكانی(٧٥) بەیتە و ئەمەش سەرەتاكەیەتی:

أَمِـن آلِ نُعـمٍ أَنـتَ غـادٍ فَمُبكِـرُ    غَـداةَ غَـدٍ أَمْ رائِـحٌ فَمُهَجّـرُ

ڕەنگە خەڵكانێك ئەمەیان لەلا سەیربێت و جێی بڕوا نەبێت لایان، بەڵام لە ئێستاشدا ئەوانەی كە توانایەكی لەبەركردنی زۆر سەیریان هەیە هەر ماون و ئەتوانن سەیری تواناو قودرەتی(شەنقیتیەكان) بكەن لە وڵاتی(مۆریتانیا)!!

٧ – چۆن داوای نووسینەوەی هەموو سوننەت دەكرێت لەكاتێكدا سوننەت ڕاڤەی قورئانەو هەندێكی بەگوفتارو هەندێكی بەكردار لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕوونكراوەتەوەو ئەمەش ئاسان نەبوەو پێویستی بەكاتێكی زۆر هەبووە تاوەكو هەمووی بنووسرێتەوە.

٨ – كۆكردنەوەی تەواوی سوننەت پێویستی بە كۆكردنەوەی تەواوی هاوەڵان بووە چونكە هەر یەكێكیان و هەندێك فەرموودەی لابووەو ئەمەش كارێكی ئاسان نەبووە بەهۆی بڵاوبوونەوەیان بە ناوچە ڕزگاركراوەكان و فێركردنی خەڵكی و بڵاوكردنەوەی ئاین بەتەواوی جیهاندا.

نووسینەوەی فەرموودە زۆر بابەتێكی گرنگ و هەستیارەو جێی ئەوەیە كە لەسەری بوەستین، بەڵام هەرچەندە بگەڕێین و خۆمان ماندوو بكەین لەوەی كە(الدكتور حاكم المطيري)[١] نووسیویەتی باشتر نانووسین، جا بۆیە تەنها ئەوەی كە ئەو نووسیویەتی وەری ئەگێڕین بە هەندێك دەستكاریەوە:

زۆربەی ئەو شتانەی كە لە سوننەتدا هەیەو لە بابەتە هەنوكەیی و گرنگەكان بوەو لە بارەی پرسە چارەنووس سازەكان بووە هەر لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) نووسراوەتەوە، هەرچەندە ئۆزۆن و باوو باپیرانی لە ڕۆژهەڵاتناسە قین لەدڵەكان ئینكاری بكەن.

ئەكریَ قۆناغەكانی دابەشكردنی سوننەت دابەش بكەین بەسەر سیَ قۆناغداو بەم شێوەیەی خوارەوە[٢]:

قۆناغی یەكەم: لە ساڵی یەكەمی كۆچی تاوەكو ساڵی یانزەی كۆچی و ئەم قۆناغە هەر لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تەواو بووە، بە كۆچكردنی بۆ مەدینە دەستی پێكردوەو بە وەفاتی كۆتایی پێهاتووە.

---

[١] كتێبێكی نووسیوه به ناوی (تأريخ تدوين السنة وشبهات المستشرقين) الناشر: جامعة الكويت، ٢٠٠٣م، نامەی دكتۆراكەیەتی و لە دووتوێی (٢١٦) لاپەڕەدایە و زۆر بابەتی جوانی تێدایە، بەڵام ئەوەی كە ئێمە هێناومانە، لە كتێبێكی تریەتی كە وەڵامی ئۆزۆن و هەندێك نووسەری ترە بەناوی (جناية أوزون عندما يتحدث الجنون) لا:٢٣-٣٥، لە ماڵپەری تایبەتی خۆی دایناوە.

[٢] ئێمە تەنها باسی قۆناغی یەكەم دەكەین چونكە سەردەمی پێغەمبەری خوابووە صلى الله عليه وسلم.

ئەم قۆناغەش دابەش دەبێت بەسەر دوو جۆر نووسینەوەدا:

یەكەم: ئەو نووسینانەنی كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێكردووە، وەكو بەڵێننامەو رێكەوتن و بەڵگەنامەو ئەو نامانەی كە ناردویەتی، وەكو ئەو بەڵگەنامەیەی كە نووسی لەكاتی چوونە ناو شاری مەدینەو، چەندین بواری گرنگی لە خۆ گرتبو هەر لە یاسا ئابووری و سیاسی و یاسای سزادان و كاروباری كەسێتی و ....، هەروەكو ئیبن ئیسحاق لە(السیرة)و ئەبو عوبەید لە كتێبی(الأموال)دا بە نزیكی سیٚ پەڕە هێناویەتی[١].

ئەم جۆرە نووسراوانە زۆر زۆرن و زانایانی مێژوو خۆیان دیویانەو ریوایەتیشیان كردووە لە كتێبەكانیانداو باسیان فەرمووە[٢].

هەروەها هەندێك كتێبی تر و نامە هەن كە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی بە نووسینیان كردووەو زۆر بە وردی باسی یاساكان ئەكات وەك:

١ – كتێبی(الصدقات) كە خۆی تیایدا پێش وەفاتی ئەندازەی زەكات و چۆنیەتی وەرگرتنەكەی تیادایە، لەدوای وەفاتیشی لای جێنشینی یەكەم ئەبوبەكری صدیق(رضي الله عنه) مایەوەو كۆمەڵێك نوسخەی لەبەر گرتەوەو دایە ئەوانەی كە زەكاتیان كۆ دەكردەوەو مۆری پێغەمبەریشی پێوەبوو[٣]، دوای ئەویش لای جێنشینی دووەم عومەری كوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) مایەوە[٤]، ماڵ و ماڵەكەی دەستیان پێوەگرت و پاراستیان هەتاوەكو پێشەوا زوهریش نوسخەیەكی لەبەرگرتەوە، دوای ئەوەی كە سالم ی كوڕی عبدالله ی كوڕی عومەر سەیری كرد[٥].

---

[١] السيرة النبوية لابن هشام(٥٠٥/١-٥٠٤)، الأموال لأبي عبيد: (٢١٥) رقم:(٥١٨)، سنن البيهقي (١٠٦/٨)، وعيون الأثر لابن سيد الناس اليعمري(٣١٨/١)، ط:١، سنة ١٩٩٢م، دار التراث، المدينة، والبداية والنهاية لابن كثير (٢٢٣/٣) .

[٢] ابن سعد لە (الطبقات) زۆربەیانی باسكردووە لە (١٩٨/١-٢٢١)، و أبو عبيد لە (الأموال) لا:(٢٠١-٢١٩) و ابن ماجەش لە سەحیحەكەیدا (٤٩١/١٤-٥١٠).

[٣] صحيح البخاري رقم: (١٤٥٣-١٤٥٥)، وفتح الباري(٣١٨/٣).

[٤] سنن أبي داود: (١٥٦٨) والترمذي: (٦٢١٩، وابن ماجة: (١٧٩٨).

[٥] سنن أبي داود: (١٥٧٠).

هەروەك چۆن پێشەوا عومەری كوڕی عبدالعزیز یش وەریگرت لە خالّی خۆی "سالم " لە كاتێكدا پێشەوای مەدینە بوو، هەروەها خەلیفەی ئومەویش هیشامی كوڕی عبدالملك نووسخەگەلێكی لێ گرتەوەو ناردی بۆ كاربەدەستی ناوچەكان بۆ ئەوەی پێوەی پابەندبن[1].

٢ – پەڕاوەكەی "عەمری كوڕی حەزم" كاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ یەمەن كتێبێكی بۆ نووسی كە تیایدا زۆربەی فەرموودەكانی تێدابوو لەبارەی ئابووری و جگە لەوەش لە یاساكانی سزادان و خوێنبایی و ...، كە زۆرێك لە زانایان بە تەواوی هەموویان هێناوە[2].

خەلیفەی كوڕی خەییات لەبارەی ناردنی عەمری كوڕی حەزم لە لایەن پێغەمبەرەوە دەفەرموێت: (بعثَ رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم عمرَو بنَ حزمٍ لِيُفَقِّهَهُم فِي الدِّينِ ويُعلِّمَهم السُّنةَ وَيأخُذَ صَدَقَاتِهِم)[3].

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەمری كوڕی حەزمی نارد بۆ یەمەن بۆ ئەوەی لە ئاین تێیان بگەیەنێت و فێری سوننەتیان بكات و خێرو زەكاتیان لێ وەرگرێت.

لێرەوە بە دیار دەكەوێ كە پەڕاوەكەی تەشریعات و یاسای تێدابووە، كەواتە مەبەستی لە فێركردنی سوننەت ڕیوایەتی هەوالّ و سەرگوزشتە نییە بەلّكو ئاین و شەریعەتی ئەحكامە!!

ئەم كتێبەش لەلای كەس و كاری عەمری كوڕی حەزم مایەوە پشتاوپشت تاوەكو گەیشتە دەستی نەوەكەی كە ئەكاتە "ئەبوبەكر ی كوڕی محمد ی كوڕی عەمری كوڕی

---

[1] مستدرك الحاكم (١/٣٩٢-٣٩٥).

[2] صحيح ابن حبان، برقم: (٦٥٥٩)، والحاكم في المستدرك (١/٣٥٩-٣٩٧)، والبيهقي في السنن الكبرى: (٤/٨٩-٩٠)، عبدالرزاق یش زۆربەی هێناوە لە "المصنف"دا (٤/٤)، مالكیش هەندێكی هێناوە: (٢/٨٤٩)، وابن خزيمة (٢/٨٤٩).

[3] تأريخ خليفة بن خياط، ص: (٩٤)

حەزم" كە والی مەدینەبوو لەسەردەمی عومەری كوڕی عبدالعزیز داو هەر ئەوبوو كە عومەر داوای لێكرد كە سوننەت كۆبكاتەوە[1].

بێجگە لەمانەش چەندین نامەو نووسراو و كتێبی تر كە لە كتێبەكانی فەرموودەو سیرەو مێژوودا تۆماركراون، بە پێچەوانەی وتەی ڕۆژهەڵاتناسان و ئەوانەی كە لەژێر كاریگەری گوتاری ئەواندا دەنووسن و دەدوێن كە گوایە سوننەت هیچی لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) نەنووسراوەتەوە!

ئەم نووسراوانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دیاربوون و بەرچاوبوون و زانایان هەر لە كۆنەوە باسیان كردوەو هێناویانە، ئەو نووسراوانەش لەسەردەمی خۆیدابوون و تاوەكو ساڵی دەی كۆچی زۆربەیان نووسراون، هەروەكو لە لای تابعین(شوێنكەوتوانی هاوەڵان) شتێكی دیار و بڵاوبووە و لەو ڕوانگەیەوە پێشەوا **محمد ی كوڕی سیرین**(ساڵی ١١٠یكۆچی وەفاتی كردووە) دەفەرموێت: "**لو كنتُ مُتَّخِذاً كتاباً لاتَّخَذتُ رَسَائِلَ النَّبِـيِّ(ﷺ)**"[2]

واتە: ئەگەر من كتێبێكم دا بنایە، ئەوە كتێبی نامەكانی پێغەمبەرم(ﷺ) دەكردە كتێب.

زانایان لە كۆندا كتێبیان نەدەنووسی و پشتیان بە لەبەركردن ئەبەست بۆیە ئیبن سیرین فەرموویەتی كتێب دانانێم، تەنانەت ئەو خەونامەیەش كە ئەدرێتە پاڵی خۆی نەینوسیوەو هی ئەو نییە .

لێرە بۆمان بەدیار دەكەوێت كە نووسراوەكانی پێغەمبەر (ﷺ) لەناو شوێنكەوتواندا زۆر باو و بڵاوبووەو بینیویانەو سوودیان لێ بینیوەو شەریعەتیان لێوە هەڵێنجاوە.

دووەم: ئەو نووسینانەی كە لەسەردەمی خۆیدا نووسراونەتەوەو هاوەڵان مۆڵەتیان لێ وەرگرتووە، بە پێچەوانەی ئەوانەی كە دەڵێن پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری كردووە لە نووسینەوەی وەك دواتر باسی ئەكەین بە ویستی خوای گەورە، بەڵكو زۆرێك لە هاوەڵان فەرموودەیان نووسیوەتەوەو لای خۆیان تۆماریان كردووە نەوەك ئۆزۆن و بێجگە لەویش

---

[1] تهذيب الكمال للمزي (٣٣/١٤٠).

[2] طبقات ابن سعد (٧/١٤٥)، نصب الراية للزيلعي (٤/٤٢٠).

وا دەزانن تەنها چیرۆكی "ئەبوشاه" هەیە لەو بارەوە تەنها ڕێگە بەودراوە بنووسێتەوە، هەندێك لەو هاوەڵانە:

١ – عبدالله ی كوڕی عەمری كوڕی عاص، یەكێكە لە هاوەڵەكانی پێغەبەر و زۆربەی كات لەگەڵیابووەو یەكێكە لەوانەی كە قورئانی نووسیوەتەوە(كَتَبَةُ الوَحِي)، مۆڵەتی وەرگرت لە پێغەمبەر (ﷺ) كە هەر شتێكی بیست لێیەوە بینوسێتەوە ڕاستەوخۆ، ئەویش ڕێگەی پێدا[١].

ئەبو هورەیرەش خوای لێ ڕازیبێت شایەتی ئەوەی بۆ داوە كە هیچ هاوەڵێك لە هاوەڵان هێندەی خۆی فەرموودەی نەبیستووە بێجگە لە عبدالله ی كوڕی عەمر چونكە عبدالله ئەینووسیەوە بەڵام ئەو نەیدەنووسیەوە[٢].

لەم بارەیەوە مێژووناسی بەناوبانگ :" الذّهبي" دەفەرمویێت: ( كَتَبَ عنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسلَّمَ عِلماً كَثِيْراً)[٣].

واتە: زانست و زانیاریەكی زۆری لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) نووسیوە.

بەئەندازەیەك كە زانایان ئەفەرموون لەناو سندوقێكی گەورەدا هەڵێگرتبوو، ئەگەر فەرموودەی بگێڕایەتەوە ئەوا داوای ئەو سندوقەی ئەكرد و پاشان فەرموودەی ئەگێڕایەوە، وەكو لە چەندین سەرچاوەی متمانە پێكراو و جێی باوەڕدا هاتووە لە كتێبەكانی فەرموودە[٤].

ئەوانەی كە فەرموودەكانی ئەو سندوقەیان لێ بیستوەو گێڕاوەتەوە زیاتر لە(١٠٠) زانا بوون[٥]، ئەو پەڕاوەی ئەویش مایەوەو كەس و كارو نەوەكانی ئەیانپاراست تاوەكو

---

[١] الاصابة (٢/٣٥١)، والاستيعاب بحاشية الاصابة (٢/٣٤٧).

[٢] أبـو داود بـرقم: (٣٦٤٦)، ابـن أبـي شـيبة في المصـنف: (٥/٣١٣)، أحمـد (٢/١٦٢،١٩٢،٢٠٧،٢١٥) وغيرهم.

[٣] تذكرة الحفاظ(١/٤٢)، سير أعلام النبلاء (٣/٨٠).

[٤] مسند أحمد (٢/١٧٦)، الدارمي في السنن برقم: (٤٩٢)، مستدرك الحاكم: (٣/٤٢٢)، و (٤/٥٠٨)، تقييد العلم للبغدادي، ص:(٨٤–٨٥).

[٥] سير أعلام النبلاء (٣/٨١)، تهذيب الكمال (١٥/٣٥٩).

گەیشتە دەستی "عەمری كوڕی شوعەیب ی كوڕی محمد ی كوڕی عبدالله ی كوڕی عەمر و ئەویش ئەیگێڕایەوە تاوەكو وەفاتی فەرموو لە ساڵی(١١٦) كۆچی[١].

زانای مێژووناس و فەرمووده‌ناس(ابن الأثير)(ﷺ) دەفەرموێت: ژمارە فەرموودەكانی ئەو پەڕاوە(١٠٠٠) فەرموودەبووە[٢].

٢ – ئەنەسی كوڕی مالیك خوای لێ ڕازیبێت، خزمەتی پێغەمبەری خوای كردوەو لەگەڵێیدابووە بۆ ماوەی دە ساڵ، ژمارەی ئەو زانایانەی كە فەرموودەیان لێ وەرگرتووە چوەتە سەرووی(٢٠٠) كەس لە گشت ناوچە جیاجیاكانەوە هاتوونەتە خزمەتی[٣]، پەڕاوێكی هەبوو لێیەوە فەرموودەی ئەگێڕایەوە[٤]، زۆر هانی منداڵەكانی ئەدا كە فەرموودەكان بنووسنەوە لەگەڵ ئەو شتانەی كە فێری ئەبن[٥]، بەردەوام فەرموودەی ئەنووسیەوە تاوەكو وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) هەر وەكو لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە.

كاتێك فەرموودەیەكی ئەبیست لە یەكێك لە هاوەڵانی ترەوەو لای خۆی نەبووە فرمانی بە كوڕەكەی دەكرد بینووسێتەوە[٦]، پەڕاوەكەشی مایەوە لای نەوەكەی بەناوی(ثمامة) و ئەیوبی سختیانی دیویەتی و سوودی لێ بینیوە[٧].

٣ – جابری كوڕی عبدالله ی ئەنصاری، فەرموودەگەلێكی لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستوەو هەر لەسەردەمی خۆشیدا نووسیویەتیەوە و پاشان قوتابیەكی بەناوی سلیمان ی كوڕی قەیس ی یەشكری نوسخەیەكی لەبەرگرتوەتەوەو زیاتر لە(١٠٠) زانا فەرموودەیان لێوە

---

(١) حاشية أحمد شاكر على سنن الترمذي (٢/١٤١-١٤٤).
(٢) أسد الغابة (٣/٢٣٣)، طبعة ١٢٨٦هـ القاهرة.
(٣) الاصابة (١/٧١)، سير أعلام النبلاء (٣/٣٩٥).
(٤) تقييد العلم، ص: (٩٤).
(٥) الدارمي برقم: (٤٩٧)، وابن سعد في الطبقات (٧/١٦)
(٦) رواه مسلم برقم: (٣٣)، والخطيب في تقييد العلم، ص: (٩٤).
(٧) علل الدارقطني (١/٢٣٠).

بیستوەو لەبەریان كردوەو لە مزگەوتی نەبەوی لە مەدینە كۆڕێكی هەبوو فەرموودەی تیادا دەگێڕایەوە[1].

دیارترینی ئەوانەشی كە ئەو كتێبەی جابریان گێڕاوەتەوە بریتیبوون لە، سلیمان ی یەشكری[2]، حەسەنی بەصری[3]، قەتادەی كوڕی دەعامە[4]، موجاهیدی كوڕی جەبر[5]، چەندین كەڵەزانای تر كە ناوی هەموویان تۆماركراوە.

---

[1] تذكرة الحفاظ للذهبي (٤٣/١)، تهذيب الكمال (٤٤٤/٤-٤٤٨)، سير أعلام النبلاء (١٨٩/٣-١٩٤)، تهذيب التهذيب (٤٢/٢)، الاصابة (٢١٣/١).

[2] تهذيب التهذيب (٢١٥/٤)، الجرح والتعديل (١٣٦/٤).، العلل -أحمد بن حنبل (٢٤٨/٢)، تقييد العلم، ص: (١٠٨).

[3] سنن الترمذي (٦٠٤/٣) برقم: (١٣١٢).

[4] الترمذي (٦٠٤/٣) برقم: (١٣١٢)، التأريخ الكبير (١٨٢/٤).

[5] طبقات ابن سعد (٢٠/٦).

٤ – سەعدی كوڕی عوبادە ی ئەنصاری، پەڕاوێكی دوای خۆی جێهێشتبوو كە ژمارەیەكی زۆر فەرموودەی تێدابوو، دوای خۆشی لەناو نەوەكانیدا مایەوەو بەردەوام فەرموودەیان تێدا دەگێرایەوە[1].

ئەگەر بێت و سەیری كتێبەكانی فەرموودەو مێژوو بكەین ئەوا ئەبینین كە ڕێژەیەكی زۆر لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نووسراوەتەوە، بەپێچەوانەی بانگەشەی نەیارانی سوونەتەوە، بەلآم وەكو لە پێشدا باسمان لێوەكرد هەرگیز لە لۆژیكدا جێگەی نابێتەوە داوای نووسینەوەی هەموو فەرموودەكان بكرێت لە كەشێكی وەهادا.

هەروەها ئەوەی كە نووسراوەتەوە چوەتە سەرووی حەوت هەزار فەرموودەوە، كە تەنها ئەمەش بەسە بۆ زانینی تەواوی ئەحكام و ئاداب و سەرجەمی وردەكاریەكانی ئایین.

لەبارەی نەهیكردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە نووسینەوەی فەرموودە زانایان بۆچونیان جیاوازەو هەركامێكیان بێت شیفای دلآن ئەدات و دەكرێت بەم شێوەیەی خوارەوە دابەشیان بكەین:

١ – زۆرێك لەزانایان فەرموودەكانیان بە لاواز داناوەو دەلێن فەرموودەی صحیح نەهاتووە، ئەوەشی كە هاتوە لە صحیحی موسلیمدا لە ئەبوو سەعیدی خودریەوە كە پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: (لا تَكْتُبوا عَنِّي غيرَ القرآنِ)، پێشەوا بوخاری بە صەحیحی نەزانیوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بێجگە لەویش فەرموویانە: وتەی ئەبو سەعیدە نەك فەرموودە!

٢ – فەرموودەی نەهیكردن لە نووسینەوەی سوننەت لە پێشتردابوەو نەسخ بوەتەوە بە ڕێگەدانی پێغەمبەر(ﷺ) بە چەندین هاوەڵی بەرێز وەكو باسمان كرد.

---

[1] سنن الترمذي برقم: (١٣٤٣)، مسند أحمد: (٥/٢٨٥)، الدارقطني (٤/٢١٤)، معجم الطبراني (٦/١٧)، الطبقات(٧/٢٧٣)، تهذيب التهذيب (٣/٤٥٧).

**٣ – فەموودەی نەهیكردن موخالەفەی لە خۆی بەهێزتر دەكات وەكو كتێبەكەی ئیمامی عەلی و ئەوەی عبداللە ی كوڕی عەمر و ئەنەسی كوڕی مالیك و ئەبوو شاە و ... كە بە متەواتری هاتووە ئەوان فەرموودەیان نووسیوەتەوە، ئەگەر وامان دانا صحیح یش بێت و نەسخیش نەبوبێتەوە، ئەوا بەو فەرموودانەی تر حوكمی نەهی هەڵدەوەشێتەوە چونكە لە پلەی بەهێزیدا ناگات بەوان.**

**٤ – نەهیكردن تایبەت بووە بەوانەی كە ترسی تێكەڵكردنی فەرموودەیان هەبووە، چونكە گەورە زانایانی هاوەڵان فەرموودەیان نووسیوەتەوەو گێڕاویانەتەوە لە ناو كۆمەڵی بڕواداران و كەسیش نەیفەرمووە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لێكردووە.**

**٥ – نەهیكردن لەسەرەتاوەبووەو لە ترسی ئەوەی تێكەڵ بە قورئان نەبێت و دواتر نەسخ بوەتەوە.[1]**

**لەگەڵ چەندین وتەی تر كە زانایان فەرموویانەو باسیان كردووە[2].**

[1] بۆ وردەكاری ئەم بابەتانە بڕوانە زنجیرە وەڵامدانەوەی نەیارانی سوننەت كە (٢٢) ڤیدیۆی بەندەیە.

[2] تقييد العلم لا: (٦٤)، فتح الباري (١/٢٠٨)، فتاوى ابن تيمية (٢٠/٣٢٢).

## وەرگرتنی فەرموودە لای ئۆزۆن بە ئیشتهایە!!

ئەوەی کە سەرنجی ڕاکێشام وتەیەکی ئۆزۆن بوو لە پەراوێزی(٢)ی لاپەڕە(٢٩)دا و لە وەرگێڕانەکەش(لا: ١٥) دەڵێت: " پەیامبەر لە سەحیحی موسلیمدا نەهیی لە نووسینەوەی فەرموودە کردووە و لە ئەبی سەعیدی خدریەوە هاتووە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی: (لا تكتبوا عني شيئا الا القران ومن كتب عني شيئا غير القران فليمحه)، سەرباری ئەوەی کە ئەم فەرموودەیە سەحیحە، بەڵام من وەك بەڵگە پشتی پێ نابەستم".

نووسەر دەڵێت سەرەڕای ئەوەی فەرموودەکە صەحیحە بەڵام من وەکو بەڵگە پشتی پێ نابەستم، بەم وتەیە دەرگای هەواو ئارەزوو دەکاتەوە(جا ئەگەر مەبەستی بوبێت یاخود نا) چونکە بە ئاشکرا ئەوەی تێدایە هەرچەندە فەرموودە صحیح یش بێت ئەتوانی نەیکەیتە بەڵگە!!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی قسەی لەسەر کراوەو زۆر لەزانایان بە صحیح یان دانەناوە وەکو ئیبن حەجەر لە پێشەوا بوخاریەوە نەقڵی دەکات کە(موقوف)ە و پێشەوا "مِزِّي"یش لە ئەبو داودەوە نەقڵی ئەکات و هەروەها خەتیبی بەغدادیش لە(تقييد العلم)[1] بەهەمان شێوە وا دەفەرموێت، واتە وتەی ئەبو سەعیدە نەك پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەمە لە لایەك و لەلایەکی تریشەوە "هەممامی کوڕی یەحیا"ی تێدایە کە ئەگەر بەبێ کتێب فەرموودەی گێڕابێتەوە لێی وەرناگیرێت بەهۆی خراپی لەبەرکردنیەوە.

ئیتر چۆن ئۆزۆن هێندە سوورە لەسەرئەوەی کە صەحیحە و وەریشی ناگرێت، دیارە زۆری پەلەبووە لەوەی کە دەرکەوێت بۆیە ئەو ڕستەیە پێکهاتووە لە دوو بەش هەردوکیانی هەڵەیە.

پاشان باسی چیرۆکی ئەبوو شا ئەکات، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) فەتحی مەککەی کرد وتارێکی دا و پاشان کەسێك کە خەڵکی یەمەن بوو ناوی ئەبوو شاه بوو فەرمووی: بۆم

[1] تقييد العلم، ص: (٣١-٣٢)، انظر حاشية مسند الدارمي (١/٤١٢) ت: حسين الداراني، دار المغني، ط:١، ١٤٢١هـ

بنووسنەوە ئەی پێغەمەبەری خوا، ئەویش فەرمووی: (اكْتُبوا لأَبِي شَاه). واتە: بینووسنەوە بۆ ئەبوو شاه.

نووسەر دەڵێت: " ئەوەش لەسەر داوای ئەبوو شابوو بۆ ئەوەی بیكاتە بەڵگەنامەیەك لەسەر وەسێتی پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی مەككە و نیشانی خەڵكی یەمەنی بدات. جگە لەم قسەیە(ئەبوو شا) داوای نووسینەوەی هیچ قسەیەكی تری لە پێغەمبەر نەكردووە" ع: ١٥، ك: ١٦

ئەم وتەیە زۆر دوورە لە پێوەری زانستیەوە، چونكە ئەگەر نووسینەوەی سوننەت هەر دروست نەبوایەو نەهی لێبكرایە بەیەكجاری یان لەبەر ئەوەی كە وەحی نیەو شەریعەت نیە، ئەوا نە بۆ "ئەبوشا" و نە بۆ بێجگە لەویش دروست نەدەبوو بنووسرێتەوە با خۆشی داوا بكات!!

ئەی باشە ئەوەی ئەبوو شاه وەكو بەڵگەنامەیەك بووە بۆ ئەهلی یەمەن، ئەی ئەوەی عەلی كوڕی ئەبی تالب و عبدالله ی كوڕی عەمر و ئەنەس ی كوڕی مالیك و ... بۆ كێ بوەو بۆ چ شوێنێكیان بووە تا بیكەنە بەڵگە بەسەریانەوە؟!

ئەبوو شاه تەنها ماوەیەكی كەم لەوێ بووەو هێندەی گوێ لێبووە داوای نووسینەوەی كردووە، كەسێك نەزانێت ئەبوو شاه چەندین ساڵ لەمەدینەدابوەو تەنها داوای ئەم وتەیەی كردووە، ئەبوو شاه تەنها ڕێبوارێك بووە و نەك زیاتر، ئەگەر ئەویش داوای نەكردبێت خۆ عبدالله ی كوڕی عەمر داوای مۆڵەتی كرد لە هەموو بوارێكدا بنووسێتەوەو هەر وتەیەكی بیست بینووسێتەوە و پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ( اكْتُبْ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا خَرَجَ مِنِّي إِلَّا حَقٌّ"[١].

واتە: بنووسەوە سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە هیچ شتێك لە منەوە دەرناچێت لە بارەی دینەوە بێجگە لە حەق و ڕاستی.

ئایا كاتی ئەوە نەهاتووە ئۆزۆن دان بەوەدا بنێ سوننەت وەحیەو نووسراویشەتەوە؟

---

[١] مسند أحمد (٥٧/١١) برقم: (٦٥١٠)، مؤسسة الرسالة، ط:١، ١٤٢١هـ

## ڕیوایەتەكانی عبدالله ی كوڕی عەمر چی بەسەر هات؟

ئۆزۆن دیسانەوە بە گومانێكی ترەوە دێتە پێشەوە، بەڵام بەویستی خوای گەورە ئەویشی بۆ ناچێتە سەرو وەڵامی ئەدەینەوە، لە باسی بەراوردی نێوان فەرموودەكانی ئەبو هورەیرە و عبدالله ی كوڕی عەمر(خوایان لێ ڕازیبێت) دەڵێت:

بوخاری لە ئەبوهورەیرەئەگێڕێتەوە كە دەڵێ: (جگە لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرو كەسی تر لە هاوەڵان وەك من فەرموودەیان نەگێڕاوەتەوە، چونكە ئەو فەرموودەكانی دەنووسیەوەو من نەمدەنووسیەوە). لە ڕاستیدا ئەمە وای لێ كردم كە بەسەرچاوە و كتێبەكانی فەرمووده‌دا بگەڕێم تا بزانم ئەوەی كە(عەبدوڵڵای كوڕی عەمرو) گێڕاویەتەوە چەندە، بەڵام سەیر ئەوەبوو كە هەموو فەرموودە گێڕاوەكانی(عەبدوڵڵا) هەرچۆنبێت ناگەنە یەك لەسەر چواری ئەو فەرموودانەی(ئەبوو هورەیرە) گێڕاونیەتەوە، كە ئەمە وا لە هەر یەكێك لە ئێمە دەكات بپرسین: ئەی ئەو هەموو فەرموودە زۆرو زەبەندەی(عەبدوڵڵا) كە سرووشی خودایین، چیان بەسەر هاتووە و بۆ ئێستا دیارنین؟!). ع: ١٥-١٦، ك: ١٨

سەرەتا ئەمەوێ ئەوە بڵێم: ئۆزۆن نەگەڕاوە تاوەكو بزانێت ئەو بابەتە چۆنەو ڕاستیش ناكات و لە كتێبی(أضواء على السنة المحمدية)ی محمود ئەبو ڕیەی هێناوەو چەند شتێكی تریشی لێ نەقڵ كردوەو تەنها لەیەك دانەیان ئاماژەی بەسەرچاوەكەی كردووە، "ئەبو ڕیە"ی قوربەسەریش لە "گۆڵد تسەیهەر" و "شاخت" و بێجگە لەوان لە ڕۆژهەڵاتناسە قین لەدڵەكانی وەرگرتووە، جا بۆ دڵنیابوونەوە سەیرێكی كتێبەكەی ئۆزۆن و ئەوەی ئەبو ڕیەو كتێبی(العقيدة والشريعة)ی گۆڵد تسەیهەر بكەن و ئەوكات بڕیار بدەن[1]!!

[1] زانای گەورەو بەڕێز عبدالرحمن ی موعەلیمی یەمانی وەڵامی كتێبەكەی ئەبو ڕیەی داوەتەوە بـەناوی (الأنـوار الكاشفه) تا بلێی كتێبێكی باش و بە سوودەو خۆت بێبەش مەكە لە خوێندنەوەی.

ئێمە دەڵێین زانایان پێش نزیكەی هەزار ساڵ ئەو بابەتەیان باسكردووەو پێویست ناكات ئۆزۆن بێت و بیكاتە هەراو هەروەك ئەوەی هەنگوینی لەداردا دۆزیبێتەوە هاوار بكات.

بەڵێ ئێستا ئەو ڕیوایەتانەی گێڕدراوەتەوەو لەبەردەستایە هی ئەبو هورەیرە زیاترە، بەڵام ئەبێت ئۆزۆن كە گەڕاوە بیریشی كردبێتەوەو جوان تێڕامابێت ئەگینا تەنها بەگەڕان ناگەیتە ئەنجام!!

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەی ئۆزۆن كە دەڵێت فەرموودەكانی عبداللّٰه ی كوڕی عەمر چی بەسەرهات؟

پێش ئەوەی وەڵامی گومانەكە بدەینەوە پێویستە جیاوازی بكەین لە نێوان دوو شتدا لە كاتێكدا ئێمە باس لە فەرموودە ئەكەین، ئەوانیش(التَّحَمُّل) و(الأَدَاء):

دەستەواژەی یەكەم(التَّحَمُّل): واتە وەرگرتن و بیستن و لەبەركردنی فەرموودە.

دەستەواژەی دووەم(الأَدَاء): واتە گەیاندن و ڕیوایەت كردنی فەرموودە.

جا سەیر نییە كەسێك وەرگرتنی زیاتربێت بەڵام گێڕانەوەی كەمتربێت بەهۆی نەبوونی دەرفەت و نەبوونی هەلومەرجی لەبارەوە كە فەرموودەكانی تێدا بگێڕێتەوە، بەڵام لەولاشەوە كەسێكی تر هەبێت وەرگرتنی فەرموودەی كەمتربووبێت، بەڵام ئەوەی كە لایبووە توانیویەتی هەمووی بگەیەنێت و بڵاوی بكاتەوە، بەمەش دووەمیان گێڕانەوەی زیاتر دەبێت تاوەكو كەسی یەكەم.

بۆ نموونە: ئەگەر عبداللّٰه ی كوڕی عەمر ژمارەی ئەو فەرموودانەی وەری گرتبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) بریتیبێت لە(١٠٠٠) فەرموودە، بەڵام تەنها دەرفەتی گەیاندنی نیوەی هەبوبێت ئەوا ژمارەی ڕیوایەتەكانی(٥٠٠) فەرموودەیە بەتەنها.

لەولاشەوە ئەبو هورەیرەمان هەیە و ژمارەی ئەو فەرموودانەی وەریگرتووە(٨٠٠) فەرموودەیە و بەڵام هەلی بۆ ڕەخساوەو(٧٠٠)یانی گەیاندووە[١]!!

---

[١] ئەو ژمارانە تەنها وەكو نموونەیەك بۆ تێگەیشتنی تۆی بەڕێزە نەك لە ڕاستیدا ژمارەكان وابێت، دواتر دێنە سەر ژمارەی ڕیوایەتەكانیان و وەڵامی ئۆزۆن بە ویستی خوای گەورە.

لە ئەنجامدا دەڵێین: عبداللە ی كوڕی عەمر فەرموودەی زیاتر بیستووە، بەڵام ئەبوو هورەیرە زیاتری گێڕاوەتەوە، ئەم وتەیەش وانەبێت لە خۆمانەوە بیلێین بەڵكو ئەگەر سەیری ژیانی هەردوو هاوەڵە بەرێزەكە بكەین ئەوا ئەبینین كە ئەبو هورەیرە توانیویەتی فەرموودەی زیاتر بگێڕێتەوە لەبەر چەندین هۆكار، لەوانە[١]:

١ – عبداللە خوای لێ ڕازیبێت زیاتر خەریكی خواپەرستی بووە وەك لەوەی كە فەرموودە بگێڕێتەوەو كەمتر تێكەڵی خەڵكی بووە.

٢ – عبداللە زۆربەی كات لە دوای فەتح لە ناوچەكانی میصر و طائف و .. خەریكی گەڕان بووەو لە شوێنێك جێگیر نەبوبێت.

٣ – ئەبو هورەیرە لە مەدینە نیشتەجێ بوەو خەڵكیش ڕوویان لەوێ كردووە بۆ وەرگرتنی فەرموودە، تەنانەت ئەو ژمارە زۆرەی كە لە شوێنكەوتوان(تابعین) فەرموودەیان لەو وەرگرتوە، هیچ هاوەڵێك ئەوەی بۆ نەرەخساوە هێندە لە خوازیارانی فەرموودە لێیانەوە وەرگرن، هەروەكو پێشەوا بوخاری دەڵێت تێپەڕیوە لە(٨٠٠) كەس ئەوانەی كە فەرموودەیان لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوەتەوە.

٤ – ئەبوو هورەیرە تایبەتمەندیەكی تری هەیە كە پێغەمبەر(ﷺ) دووعای بۆ كردوە كە شتی بیر نەچێتەوەو كاریگەری ئەو دووعایەش زۆر دیار و ئاشكرایەو توانیویەتی ئەوەی كە بیستویەتی بیگێڕێتەوە.

٥ – عبداللە كاتێك لە شام بوو هەندێك لە كتێبەكانی ئەهلی كتابی دەستكەوت و لەو پەڕاوانەشی ئەگێڕایەوە، جا ئەمەش هۆكارێك بوو كە زۆرێك لە زانایان وازی لێ بێنن و فەرموودەی لێوە نەگێڕنەوە.

---

[١] بگەڕێوە ئەم سەرچاوانە: فتح الباري لابن حجر (٢٠٧/١)، الناشر: دار المعرفة – بيروت، ١٣٧٩، و تحفة الأحوزي للمباركفوري (٣٥٩/٧)، دار الكتب العلمية – بيروت، و كوثر المَعَاني الدَّرَارِي لمحمَّد الخَضِر الشنقيطي (٣٠/٤)، الناشر: مؤسسة الرسالة، بيروت ،الطبعة: الأولى، ١٤١٥ هـ.

پاشان ئۆزۆن ژمارەی فەرموودەی هەردوكیان نەقڵ ئەكات لە پێشەوا "ئیبن جەوزی"یەوە و دەڵێت: "بەپێی ئیبن جەوزی ژمارەی فەرموودەكانی ئەبوو هورەیرە(٥٣٧٤) فەرموودەن و لای عەبدوڵڵای كوڕی عەمروش لە(٧٠٠) فەرموودە تێناپەڕێت". ع: لا٢٩، ك: پەراوێزی(٥)، لا: ١٨

ئۆزۆن ئەم ژمارەیەی نەقڵ كردووە بەبێ ئەوەی بەدواداچوون بكات و هەموو وتەكانیشی لە لە "ئەبوریە" دزیوە بەبێ ئەوەی ناویشی بەرێت[١]، بەڵام ئەگەر وردبوینەوە لە بابەتەكە ئەوا ئەبینین كە ئەم ژمارەیەی كە پێشەوا "ئیبن جەوزی" نەقڵی كردووە بەو شێوەیە نییە كە ئۆزۆن و پێش ئەویش ئەبو ریە تێی گەیشتوون، چونكە ئێستا گەورەترین مەوسوعەیەك كە فەرموودەی تێدابێت بریتییە لە موسنەدەكەی ئیمامی ئەحمەد كە نزیكەی(٤٠) هەزار فەرموودەی تێدایە و نزیكی(١٠) هەزاری دووبارەیە فەرموودەكان.

جا ئەگەر بڕوانینە بەشی ئەبو هورەیرە لە "موسنەد"ەكەیدا، ئەوا دەبینین ژمارەی فەرموودكانی بریتییە لە(٣٨٤٨) فەرموودە بە دووبارەكانیشەوە، جا ئەگەر فەرموودە دووبارەكانمان لادا ئەوا(١٥٧٩) فەرموودە ئەمێنێتەوە، جا سەیر بكە(١٥٧٩) لەكوێ و (٥٣٧٤) فەرموودەكەی ئیبن جەوزی لە كوێ وا ئۆزۆن نەقڵی كردووە بە بێ گەڕان و شەرمیش ناكات ئەلێ گەڕاوم[٢]!!

پێویستە باسی ئەوەش بكەم كە ئەو ژمارەیە هەمووی ڕاست و سەحیح نییە بۆ لای ئەبو هورەیرە، بەڵكو لاوازیشیان تێدایە.

زانای فەرموودەناس ئەحمەد شاكر ڕەحمەتی خوای لێبێت لە ڕاڤەی ئەم چەند بەیتەی پێشەوا "السیوطي"(ﷺ) كە دەفەرموێت:

وَالْمُكثِـــرونَ فِــي رِوَايَــةِ الأَثَــرْ　　أَبُــوْ هُــورَيرَةٍ يَلِيْــهِ ابــنُ عُمَــرْ
وَأَنَــــسٌ وَالبَحْــــرُ كالْخُــــدْرِيِّ　　وَجَــــابِرٍ وَزَوْجَــــةِ النَّبِــــيِّ

---

[١] سەیری كتێبی (أضواء على السنة المحمدية) بكە لا: ١٧٣، مكتبة المعارف

[٢] شەیخ محمد علی مەتەری بەدواداچوونێكی هەیە ئەتوانن بگەڕێنەوە سەری لەبارەی فەرموودەكانی ئەبو هورەیرەوەو شتی باشی تێدایە.

واته:

ئەوانـــــــەی گێڕاویانەتـــــــەوە زۆرتـــــــرین ئەســــــەر

ئـــــەبو هـــــــورەیرەو لەپاشـــــان ئـــــیبن عومـــــەر

ئەنـــــــەس و حـــــــەبری ئومـــــــــە[1] و خـــــــودری

جـــــــابرو عائشـــــــــه خێزانـــــــی پێغەمبـــــــەری

دەڵێت: كتێبێك كە زۆرترین فەرموودەی تێدابێت و لەبەردەستمانابێت: موسنەدی ئەحمەدی كوڕی حەنبەلە و ئەو جیاوازیەش زۆر زۆرە لە نێوان ئەوەی كە ئیبن جەوزی باسی ئەكات لەبارەی ڕیوایەتەكانی ئەبو هورەیرە لە(موسنەدی بەقی كوڕی مەخلەد) و موسنەدی ئەحمەد، هەرگیز نابێت ئەحمەد ئەو گشتە فەرموودەی لەكیس چووبێت، بە بیرووباوەڕی من ئەو جیاوازیە لە زۆری ڕێگاكانەوە سەرچاوەی گرتووە[2]، هەروەكو ئیمامی ئەحمەد لەبارەی موسنەدەكەیەوە دەفەرموێت: ئەم موسنەدەم هەڵێنجاوە لە زیاتر لە حەوت سەد و پەنجا هەزار فەرموودە، جا هەر شتێك كە مسوڵمانان ناكۆك بوون لەسەری لەبارەی فەرموودەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ئەوا بگەڕێنەوە بۆی ئەگەر تێیدا بوو ئەوا باشە، ئەگینا بەڵگە نیە"[3].

---

[1] لەقەبی ئیبن عەبباسە خوای لیَ ڕازیبێت.

[2] وەكو لە پێشەوە باسمان كرد زیاتر لە ٨٠٠ كەس فەرموودەیان گێڕاوەتەوە لـە ئـەبو هـورەیرەوە، جـا بـەقی كوڕی مەخلەد ڕەنگە ریوایەتی ١٠٠ كەسیانی هێنابێت، ئەوكات ئەمەی بە (١٠٠) فـەرموودە دانـاوە لـە ئـەبو هورەیرەوە لە كاتێكدا پێشەوا ئەحمەد ڕەنگە هی (١٠) كەسیانی هێنابێت، بەلاَم خۆی لە ڕاستیا بە یەك فەرموودە حسێب ئەكرێت و ڕێگای گێڕانەوەكانی جیاوازە. بەداخەوە ئـەمڕۆ موسـنەدی بـەقی لـە بەردەسـتا نیـە تـاوەكو بگەڕێینەوە بۆی.

[3] تعليق أحمد شاكر على ألفية السيوطي، ص، (١٠٨)،

پاشان شەیخ ئەحمەد شاكر دەفەرموێت: ئەو فەرموودانەی كە ئیبن جەوزی لە موسنەدەكەی "بەقی" دا داویەتیە پاڵ هاوەڵان ژماردوومە ئەكاتە(٣١٠٦٤) فەرموودە، كە كەمترە لە موسنەدی ئیمام ئەحمەد و نزیكی ئەوە[١].

لێرەوە بە دیار ئەكەوێت كە ئەو فەرموودە زۆرەی دراوەتە پاڵ ئەبو هورەیرە سەرچاوەكەی بریتییە لە موسنەدەكەی بەقی كوڕی مەخلەد، جا ڕەچاوی ئەم چەند خاڵە بكە:

١ – بەقی كوڕی مەخلەد وەكو وتمان دەكرێت هەموو ڕێگەكانی هێنابێت و وەكو ئیمامی ئەحمەد یەك دانە یاخود چەند دانەیەكی كەمی نەهێنابێت.

٢ – وەكو پێشەوا ئیبن حەزم دەفەرموێت موسنەدی بەقی، بە گوێرەی ئەبوابی فیقهی دایناوە، جا فەرموودەش هەیە كە لە چەندین بابی فیقهیدا جێی ئەبێتەوەو بەمەش جاری واهەیە فەرموودەیەك زیاتر لە ١٠ جار دووبارە ئەبێتەوە.

٣ – هەندێك فەرموودە هەیە درێژەو هەر ڕاویەك و هەندێكی گێڕاوەتەوەو هەندێكیشیان هەموویان گێڕاوەتەوە و بەمەش ژمارەی فەرموودەكان چەند هێندەیان لێ دێت.

٤ – هیچ كام لەو زانایانە باسی ئەوەیان نەكردووە، كە هەموو ئەو فەرموودانەی ئەدرێتە پاڵ ئەبو هورەیرە صەحیحە، چونكە جاری واهەیە فەرموودەی بەناوە هەڵبەستراوەو هیچ بنچینەیەكی نیەو ژمارەی فەرموودە لاوازو هەڵبەستراوەكانیش شاردراوە نییە ژمارەیان لای تۆی بەڕێز.

هەروەكو پێشەوا خەزرەجی دەفەرموێت: (اتفقَا على ثلثمِائة وَخَمْسَة وَعشْرين وَانْفَرَدَ(خ) بِتِسْعَة وَسبعين و(م) بِثَلَاثَة وَتِسْعين وَعنهُ)[٢].

---

[١] ص: ١٠٩

[٢] خلاصة تذهيب التهذيب للخزرجي، ص: (٤٦٢)، حققه: عبد الفتاح أبـو غـدة ،الناشـر: مكتـب المطبوعـات الإسلامية/دار البشائر – حلب / بيروت/الطبعة: الخامسة، ١٤١٦ هـ. (خ) ئاماژەیە بۆ ئیمامی بوخاری و (م) بـۆ ئیمامی موسلیم.

واتە: پێشەوا بوخاری و موسلیم پێكەوە(٣٢٥) فەرمووودەیان هێناوەو، و بوخاریش بە جیا(٧٩) و موسلیم یش بە جیا(٩٣) فەرمووودەی هێناوە لە ئەبو هورەیرەوە.

جا كۆی ئەو فەرمووودانەی كە لە بوخاری و موسلیمدایە(٤٩٧) فەرمووودەیە بەتەنها، هەرچەندە كۆمەڵێك فەرموودەی صەحیحیان واز لێ هێناوەو ئەوان بەدوای صەحیحترینیدا گەڕاون، هەروەها سەرەڕای ئەو هۆكارانەی كە باسمانكرد لەوەوپێشدا هۆكارێكی تریش هەیە بۆ زۆری فەرمووودەكانی ئەبو هورەیرە، ئەویش ئەوەیە كۆمەڵێكی زۆر فەرمووودەی دراوەتە پاڵ و ئەو نە ئاگای لێیەتی و نە گێڕاویەتیەوەو لە كتێبەكانی تەخریجی فەرمووودە دەبینرێت[١].

---

[١] تەنانەت ستەمی نەیارانی سوننەت گەیشتوەتە ئەو ڕادەیەی كە "ئەبو ریە" هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە بەوە تاوانبار دەكات كە فەرمووودەیان داوەتە پاڵ! باشە هیچ مرۆڤێكی ژیر هەیە لۆمەی كەسێك بكات لەسەر ئەوەی كە بۆچی درۆیان بۆت هەڵبەستووە؟! ئەم وتەیە زۆر بێ مانایە چونكە فەرمووودەكە دراوەتە پاڵ پێغەمبەریش(صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ) ئایا ئەبو ریە ئەویش تۆمەتبار دەكات ؟!

## ئایا هاوەڵان بۆخۆیان ڕاجیاوازبوون لەبارەی نووسینەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ)؟

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: (أخيرا فإن الصحابة أنفسهم اختلفوا في جواز كتابة الحديث النبوي حيث كرهها عمر بن الخطاب وعبدالله بن مسعود وزيد بن ثابت وأبو موسى وأبو سعيد وآخرون غيرهم) لا: ١٦

واتە: بە دڵنیاییەوە هاوەڵان بۆخۆیان ڕاجیاوازبوون لەبارەی نووسینەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەرەوە، هەرچی عومەری كوڕی خەتتاب و عبداللەی كوڕی مەسعود... و بێجگە لەمانیش پێیان باش نەبووە[١]!!

دەڵێم: ئەگەر ئۆزۆن ئەیەوێ وا نیشان بدات كە هاوەڵان لەبەر ئەوە ناكۆكبوون لەسەر نووسینەوەی چونكە فەرموودە وەحیی نیەو نابێ شوێنی بكەویت و تەنها كرداری ئاسایی ڕۆژانەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوا خەیاڵی خاوەو هەرگیز بۆی ناچێتە سەر لەبەر ئەو هەموو بەڵگەیەی كە باسمان كرد لەسەر نووسینەوەی فەرموودە لەلایەن هاوەڵان و گێڕانەوەشیان لەو پەڕاوەی كە تیایدا نووسیویانەتەوە.

لەلایەكی تریشەوە هاوەڵان تەنانەت بۆ نووسینەوەی قورئانیش ناكۆكبوون و هەندێكیان پێیان باش نەبوو چونكە بەكارێكی داهێنراویان ئەزانی و ترسی ئەوەیان هەبوو كە كارەكە خراپ بێت، تەنانەت زەید خوای لێ ڕازیبێت ئەیفەرموو گواستنەوەی شاخ و كێوەكانم لەلا ئاسانتربوو لەوەی داوای نووسینەوەی قورئانم لێ بكرێت، ئایا ئۆزۆن ئەتوانێ بڵێ قورئانیش وەحیی نیە؟!

بەڵكو ڕای هەر هاوەڵێك هەبوبێت لەسەرەتای دابەزینی وەحیەوەبووەو ترساوە تێكەڵی بێت نەوەك شتێكی تر، تەنانەت هەندێكیشیان غەمباریان نیشانداوە لەوەی كە هەندێك پەڕاویان لەناو داوە كە فەرموودەی تیابووە، هەروەكو عوروە دەفەرمویێت:

---

[١] باسی خیانەتی وەرگێڕمان كرد لێرەو لە وەرگێڕانی ئەم دەقە.

(كُنَّا نَقُوْلُ لاَ نَتَّخِذُ كِتَاباً مَعَ كِتَابِ اللهِ، فَمَحَوْتُ كُتُبِي، فَوَاللهِ لَوَدِدْتُ أَنَّ كُتُبِي عِنْدِي، إِنَّ كِتَابَ اللهِ قَدِ اسْتَمَرَّتْ مَرِيْرَتُهُ)[1].

واتە: ئێمە ئەمانوت لـەگەڵ قورئاندا هیچ كتێبێكی تر دانانێین و ئیتر كتێبەكانم سڕیەوەو لەناوم دا، سوێند بەخوا ئێستا حەزم ئەكرد كتێبەكانم لـە لام بوایە، چونكە قورئان جێگیر بوو.

[1] سیر أعلام النبلاء، (٤/٤٣٦)، تهذیب التهذیب لابن حجر (٧/١٨٣)، مطبعة دائرة المعارف النظامیة، الهند الطبعة: الطبعة الأولی، ١٣٢٦هـ.

پاشان ئۆزۆن بەردەوام دەبێت لە یاریكرنەكەی بە ئاگرو دیسانەوە دەیەوێت حەقیقەتی خۆی دەربخات بۆ خەڵكی و نەزانی خۆی جێگیر بكات و دەڵێت: (زۆربەی فەرموودەكانی پێغەمبەر سەرچاوەی یاسادانان نین، چونكە زۆرێك لەوانەی كە بە ئێمە گەیشتوون كە گوایە پێغەمبەروای كردووە، ئەوەنەبێ كە تەنهاو تەنها پێغەمبەر بووە كە شتی وای كردووەو كەسانی تر نەیانزانیوە، یان نەیانكردووە، تا لەدوای خۆی ئەم كارانە بكەینە سەرچاوە، بۆ نموونە: پێغەمبەر تاكە كەس نەبووە كە بەدەستی ڕاست شت بخوات، یان خورما بخوات...، یان بۆ منداڵی گریانی هاتبێ، یان ژنی ماچ كردبێت...)!! ع: ١٦، ك: ١٩

بەڕاستی سەیرم دێ لە نووسەر ئایا خۆی هەر ئەوە ئاستێتی یاخود كەسێك بیەوێ ئاین بشێوێنێ ئابەو شێوەیە خوای گەورە بەڵگەكانی لاواز دەكات!!

بەهەر حاڵ دەڵێم: ئێمە ئەبێت جیاوازی بكەین لە نێوان دوو شتدا: ئەوەی كە ژیانی ئاسایی ڕۆژانەی پێغەمبەرە(ﷺ)، یەك زانا نەیفەرمووە سوننەتەو بە تێكڕا فەرموویانە ئەوە ئاین و تەشریع نیە، ئیتر ئەم هەرایەی ئۆزۆن لە پەنای چیەو تۆ بڵێی چی دۆزیبێتەوە ئەم كەڵە زانا هەڵكەوتەی سەردەم؟!

بەڵام ئەوەی تریان كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێكردوە یاخود ڕێگری لێ كردووە ئەوەیان بریتییە لە تەشریع و یاساو نابێت پێچەوانەی بكرێت.

كەس نەیوتوە یەكەم كەس بووە لەوەی بەدەستی ڕاستی شتی خواردووە، بەڵام گشت مسوڵمانان لەسەر ئەوەن ئەگەر واجب نەبێت سوننەتە بەدەستی ڕاست نانخواردن، چونكە فەرمانی خۆشەویستی لەسەرەو گوێ نادەن بە وتەی ئۆزۆن گەر فوو بكاتە خۆی هێندەی باڵۆن!!

هەرچی بابەتی گریانیشە بۆ مردنی منداڵی نازانم ئۆزۆن هەر بەڕاستیەتی ئەو ڕەخنەیە یاخود نا، چونكە هیچ كەسێكی عاقڵ نەیوتوە گریان سوننەتە بۆ منداڵ تا بگاتە كەسێك كە زانستیشی هەبێت وەك زانایان و پێشەوایانی ئوممەت، بەڵام ئەوەی لە فەرموودەكە

وەردەگیرێ ئەوەیە: كە گریان بۆ منداڵ بەتەنهاو بەبێ ناسوپاسگوزاری ڕێگەی پێدراوەو نابێتە هۆی نەمانی ئەو ئارامگرتنەی كە فەرمانی پێكراوە لەكاتی بەڵاو نەهامەتی كە لەچەندین ئایەتی قورئاندا هاتووە، وەكو: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦ ﴾البقرة

هەرچی بابەتی ماچكردنی خێزانەكانیەتی ئەوەی كە لێی وەرگیراوە كە ماچی خێزانەكانی كردوەو بەڕۆژوو بوە، یانی ماچكردنیان ڕۆژوو ناشكێنێت، یاخود ئەوەی لێ خوێنراوەتەوە لە هەندێك حاڵەتدا كە دەستنوێژ ناشكێنێت، جا ئەگەر هەركردارێك لە كردارەكانی بەم شێوەیە بوو ئەوا تەشریع و یاساداناەو ئەگەر هەر شتێكی ئاساییش بێت و شتێكی لەم بابەتە لە پشتەوە نەبێت هیچ پێویستمان بە دەنگ بەرزكردنەوەی ئۆزۆن نیەو زانایان لەدێر زەمانەوە باسی ئەوەیان كردووە.

ئەوەشی كە ئۆزۆن دەڵێت: زۆربەی سوونەت تەشریع نیە، هەر نەقڵی كردوە لە زانایانەوە و زانایان پێش هەزار و سێسەد ساڵ لەمەوبەر باسیان فەرمووە، هەروەكو ئیمامی شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت هەروەكو قوتابی خۆشەویستی "بوەیتی"[1] لێوەی ئەگێڕێتەوە: (أُصُوْلُ الأَحكَامِ نَيِّفٌ وَخَمْسُ مائَةِ حَدِيْثٍ، كُلُّهَا عِنْدَ مَالِكٍ، إِلاَّ ثَلاَثِيْنَ حَدِيْثاً، وَكُلُّهَا عِنْدَ ابْنِ عُيَيْنَةَ، إِلاَّ سِتَّةَ أَحَادِيْثَ)[2].

واتە: بنچینەی حوكمە شەرعیەكان پێنج سەد و ئەوەندە فەرموودەیە، هەمووی لای مالیكە تەنها سی فەرموودە نەبێت، و هەمووی لای سوفیانی كوڕی عویەینەیە تەنها شەش فەرموودە نەبێت.

جا هەر لەم ڕوانگەیەوە هەندێك لە زانایان فەرموویانە كەسێك تەنها سونەنی ئەبوداودی لابێت لەگەڵ قورئاندا ئیتر پێویستی بە هیچی تر نییە.

---

[1] بخوێنەوە دەربارەی ئارامگرتنی ئەم زانا خۆشەویستەو مردنی لە ژێر ئەشكەنجەو سزای سەرانی موعتەزیلە، بەڕاستی شاخێك بوو لە زانست و ئارامگری و گیانفیدایی، ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت.

[2] سير أعلام النبلاء (٨/٤٥٩)، ط: مؤسسة الرسالة

هەر پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت فەرموودەكانی ئەحكام(٥٠٠) دانەی لە بنچینەو(٥٠٠) شیان لە فەرعی شەریعەت، ئیتر كەسی فەقیە پێویستی بە فەرموودەی تر نیە.

جا بۆیە هەندێك لە زانایان ئەم فەرموودانەیان كۆ كردوەتەوەو هەر ئەوانەشیان بە قوتابیەكانیان وتووەتەو مۆڵەتیان پێداون وەكو پێشەوا شەعبی ڕەحمەتی خوای لێبێت[1].

ئیتر ئەوەی ئەمێنێتەوە لە فەرموودە لە ئاداب و ڕەوشت و هەواڵی قیامەت و نیشانەكانی و قەبر و بەرزەخ و بەهەشت و جەهەننەم و ...

پاشان دواتر ئۆزۆن ئەو چەند وتەیەی وەك پێشەكیەك دادەنێت بۆ ڕشتنی ژەهری كوشندەی و دەڵێت: (لەوانەیە كەسێك بپرسێت: دەی خۆ پێغەمبەر یەكەم كەسێك بووە كە نوێژی بەم جۆر و شێوازەی كە ئێستا دەیبینین كردووە و ژمارەی ڕكاتەكانی و كاتەكانی دیاری كردووە. ئەو یەكەم كەس بووە یەكەم جار ڕێژەی زەكاتی بە(٪٢,٥) دیاری كردووە. بەڵێ دەڵێین هەر وایە ئەم دوو قسەیە ڕاستن، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت(وَأَقِيمُوا الصّلاةَ وَآتُوا الزّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرّسُولَ...)، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە تەنها ئەم دوو بوارەی لێ وەردەگیرێت و ئەمەش لە ڕێگەی سوننەتە كرداریەكانەوە پێمان گەیشتووە و بۆمان ڕوون بوەتەوە، نەك سوننەتە گوفتاریەكانی). ع: ١٦، ك: ١٩

**دەڵێم:** ئەوەی لەم وتەیەی ئۆزۆن بەدیار ئەكەوێ، تەنها بڕوای بەو فەرموودانەیە كە لەبارەی نوێژ و زەكاتەوە هاتوون، من نایەم لێرە هەزارەها شتی بۆ باس بكەم كە بە فەرموودە بوون بە شەرع و یاسا، بەڵكو ئەم گفتو گۆیە هەڵدەگرم بۆ بابەتی داهاتوو و لەوێ دەمەتەقێیەك ئەكەین لەسەر ئەوەی ئایا فەرموودە تەشریعی لێ وەردەگیرێت یاخود نا؟

---

[1] البحر المحيط للزركشي (٢٣٢/٨)، الناشر: دار الكتبي، الطبعة: الأولى، ١٤١٤هـ - ١٩٩٤م.

بەڵام ئەوەی ئەمەوێ لێرە باسی بکەم ئەوەیە ئۆزۆن و هاوبیرانی کاتێك باسی سوننەتی کرداری ئەکەن و دەڵێت: بریتییە لەو سوننەتەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بە کرداری کردویەتی و لە کتێبەوە بۆ ئێمە نەهاتووە بەڵکو هەر پشتاوپشت هەبوەو کەسمان لە کتێب فێری نەبووین.

ئەبێ باش ئەوەش بزانن هەر یەك لە ئێمە بابەتی ڕەجمی زیناکاریشمان هەروا پێ گەیشتوەو پشتاو پشت و هەموو ئوممەت لەسەر ئەوە کۆك بووە و جیل لەدوای جیل هاتوەو، زۆربەی زۆری ئەو خەڵکەش ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕەنگە نە کتێبێکی دیبێت لەبارەیەوە و نە بەڵگەیەکیشی لەسەر بزانێت، بەڵام چاك ئەزانێ کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)بە کرداریی کردویەتی.

ئەی باشە ئۆزۆن و ئەوانەشی کە فەرموودە ڕەت دەکەنەوە بۆچی ئینکاری ڕەجم ئەکەن لەکاتێکدا سوننەتێکی کرداریە؟!

ئەمە هیچت پێ ناڵێت بێجگە لەوەی کە ئەوان هەواو ئارەزووی خۆیانیان کردوەتە حاکم بەسەر گشت شتێکەوەو ئەوانن دین دائەتاشن و شەریعەت دائەنێن نەوەك خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی!!

## جیاوازی نێوان(النبـي) و(الرَّسُوْل)

ئۆزۆن جیاوازی دەكات لە نێوان نەبی و ڕەسول وەك دوو سیفەت بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)و دەڵێت: (جا لە پایەی(نبوەت)دا محمد بە پێی داب و بارو زروفی گونجاو ئیجتیهاد دەكات لەم پلەو مەقامەدا هەڵەكانی بۆ ڕاست دەكرێتەوە بۆیە لە قورئانی پیرۆزدا دەبینین كە ڕاستكردنەوەی هەڵەكانی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەقامی(نبوەت) بووە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ..)، (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ..) چەند ئایەتێكی تریش دێنێ..) ع: ١٦–١٧، ك: ٢٠

من پێش ئەوەی بچمە سەر وەڵامی ئەو جیاوازیە بێ بنەماو نازانستییە، ئەمەوێ ئەوە بڵێم نووسەر خۆی ئەخاتەوە بە درۆوە بە بەراوردكردن لەگەڵ ئەم وتەیەو وتەكانی پێشووی چونكە ئۆزۆن ڕای وایە كاتێك ئەوترێت(ڕەسول) پەیامێكی پێیەو ئەو پەیامەش تەنها بریتییە لە قورئان بەتەنها، جا ئەگەر ئەم وتەیە بەراورد بكەی لەگەڵ ئەو وتەیەی پێشووی كە وەڵاممان دایەوەو وتی: (ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت(وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ...)، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە تەنها ئەم دوو بوارەی لێ وەردەگیرێت و ئەمەش لە ڕێگەی سوننەتە كرداریەكانەوە پێمان گەیشتووە و بۆمان ڕوون بوەتەوە، نەك سوننەتە گوفتاریەكانی). ع: ١٦، ك: ١٩

ئایا ئەگەر وردبیتەوە لە وتەكەی ئۆزۆن هەر خۆی خۆی ناخاتەوە بە درۆوە؟!

باشە خۆ ئەوە تەشریعەو دراوەتە پاڵ ڕەسول و ئۆزۆن خۆشی دانی پێدا دەنێ بە سوننەت بڕیاری لەسەر دراوە، ئەگەر بەپێی بۆچوونی ئۆزۆن بێت ئەبوو بدرێتە پاڵ نەبی نەوەك ڕەسول، ئەگەریش بدرێتە پاڵ نەبی ئەوا بریتییە لە ئیجتهاد و عیبادەت و پەرستشەكانیش لەسەر ئیجتهاد دانامەزرێن و بەڵگوو ئەبێت لەلای خوای گەورەوەبێت جا ئیتر بەڵگەی قورئان بێت یاخود سوننەت!!

ئێستا دێمە سەر ئەوەی ئایا جیاوازی نێوان ڕەسول و نەبی چییە؟!

ئەم دوو دەستەواژەیە مانای تایبەتی خۆیانیان هەیەو پێش ئەوەی باسی بكەم ئەمەوێ وەڵامی وەرگێڕ بدەمەوە كاتێك لە پەراوێزی(٨) ی لاپەڕە(٢١)دا دەڵێت: "(رسول) لە

زمانی عەرەبیدا بە مانای پەیامبەر دێت(ئەو كەسەی لە كەسێكی دیكەوە پەیامێك دێنێت و ئەو تەنها گەیەنەری ئەو پەیامەیە، بەڵام نەبی(بەواتای كەسێك دێت كە پێگەیەكی ئاینی دیاریكراوی هەیەو زیاتر مانای كەسێك دەگەیەنێت، كە پەیوەندیەكی بەخوداوە هەیە، بەڵام خاوەنی پەیامێك نییە كە لەلایەن خوداوە داوای لێكرابێت ئەو پەیامە ڕابگەیەنێت".

دەڵێم: ئەم پێناسەیەی وەرگێڕ زۆر هەڵەیە لە چەند ڕوویەكەوە:

١ – ڕەسول لەلای ئەو تەنها ئەو پەیامە ئەگەیەنێت كە بۆی هاتووە، بەم واتایە یانی ئەو ڕەسولە تەنها وەكو خوێنەرێك وایەو هیچ كارێكی تری نییە و بۆی نییە ئەو پەیامە ڕاڤە بكات و ڕوونی بكاتەوەو تەشریعی ئەحكام بكات، ئەمە پێچەوانەی چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزە كە تێیدا ئەوە هاتووە پێغەمبەری خوا ئایەتەكانی قورئان شرۆڤە دەكات و ڕوونی دەكاتەوە:﴿بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٤٤﴾النحل

٢ – جیاوازی نێوان نەبی و زانایەك چیە بەپێی ئەو پێناسەی ئەو؟ جگە لەوەی دەڵێت پەیوەندیەكی بە خواوە هەیە، جا ئەگەر زانایانیش ڕاستگۆبن لەگەڵ خوای گەورەو كار بەزانستەكەیان بكەن بەهەمان شێوە پەیوەندییان بەخوای گەورەوە ئەبێت.

٣ – هەڵەیە بوترێت نەبی داوای لێ نەكراوە پەیام بگەیەنێت، چونكە زانایەك ئەگە ربێت و زانستەكەی بشارێتەوە سزای قیامەتی بۆ هەبێت و هەڕەشەی لێكرابێت هەروەكو خوای گەورە دەفەرمویت : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ١٥٩ ﴾البقرة

ئەی چۆن نەبی داوای گەیاندنی لێ نەكراوە؟!

بۆیە ڕاستترین پێناسە ئەوەیە بوترێت:

ڕەسول: پەیامی بۆ هاتووەو فەرمانی پێكراوە بە گەیاندن و ڕوونكردنەوەی.

نەبی: پەیامی بۆ نەهاتووەو لەسەر پەیامی پێغەمبەرێكی ترەو فەرمانی پێكراوە بە گەیاندنی.

جا لێرەوە بۆمان بەدیار دەكەوێ هەموو ڕەسولێك نەبیە بەلام هەموو نەبیەك ڕەسول نییە.

ئێستا كاتی ئەوەیە باسی سیفەتی ڕەسولێتی پێغەمبەر(ﷺ) بكەین:

ئۆزۆن هەستاوە بە دابەشكردنێك كە هیچ بەلگەیەكی پێ نییە بۆ ئەو جۆرە دابەشكردنەو دەلێت سیفەتی ڕەسولێتی تەنها لە قورئانەوە وەرگیراوەو پێغەمبەریش بێجگە لە قورئان پەیامێكی تری نەبووە نییە.

**دەلێم:** سەرەڕای ئەوەی كە وتەكانی خۆی هەلوەشاندەوە، سیفەتی ڕەسولێتی پێغەمبەر(ﷺ) هەم بە قورئانە هەم بە بڕیارەكانی خۆشی لە بارەی شەریعەت و ئەحكامەكانی حەلال و حەرامەوە، نەك بەوشێوەی كە ئۆزۆن ئەیلێت و بە تەنها ئایەتێك هەموو هەول و چەواشەكاریەكانی ئۆزۆن پووچەل ئەبێتەوە، ئەویش وتەی خوای گەورەیە كەدەفەرموێت: ﴿ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾التوبة

ئەگەر بڕوانینە ئایەتەكە خوای گەورە دەستەواژەی حەرامكردنی داوەتە پال خۆی كە قورئانەو داویەتیە پال پێغەمبەریش(ﷺ)كە سوننەتە، دیارە كە زمانی قورئان بریتییە لە زمانی عەرەبی و بۆیە پێویستە لە كاتی ڕاڤەكردنی هەردەقێكیدا پشت بەو زمانە ببەستێت و بەلاوە نەنرێت.

جا لە زمانی عەرەبیدا ڕێسایەكمان هەیە دەلێ: (الْعَطْفُ يَقتَضِي الْمُغَايَرَةَ)[1].

واتە: عەتف جودایی ئەخوازێت.

---

[1] فتح القدير، كمال الدين محمد بن عبد الواحد السيواسي المعروف بابن الهمام (١٠/٢٢٠)، والكوكب الدري للإسنوي، ص:(٣٩٧)، والبحر المحيط للزركشي (٣/٣٢٤)، و إرشاد الفحول (١/٣٤٤)، وحاشية العطار على شرح المحلي على جمع الجوامع (١/٤٩٥).

بۆ زیاتر تێگەیشتن لە ڕێساكەو جیبەجێكردنی لەسەر ئایەتەكە نمونەیەك دەهێنینەوەو دەڵێین: (جَاءَ مُعلِّمٌ وَمُهَنْدِسٌ). واتە: مامۆستایەك و ئەندازیارێك هاتن.

كاتێك ئەندازیارەكە عەتف كراوەتە سەر مامۆستاكەو پێوەی گرێدراوەو ئیشێكی داوەتە پاڵ هەردووكیان، ئەم عەتفە وا ئەخوازێت كە ئەو دوو سیفەتەی باسكراوە بۆ دوو كەسی جیاوازبێت و یەك كەس نەبن مەگەر لەهەندێك حاڵەتی تایبەتدا نەبێت وەكو عەتفی خاص لەسەر عام.

لێرەوە زانیمان كە مامۆستاكە كەسێكەو ئەندازیارەكەش كەسێكی تر، دەی كەواتە تەشریع و حەرام و حەلاڵ كە خوای گەورە دەیكات لە قورئاندایەو شتێكی تریشمان هەیە كە سوننەتەو خوای گەورە ڕێگەی پێداوەو جیایە لەو قورئانە.

كەواتە ئێمە لێرەدا ئەبینین خوای گەورە باسی دەستەواژەی حەرامكردنی داوەتە پاڵ زاتی پاكی خۆی لەگەڵ پێغەمبەرەكەی(ﷺ)، وەك دیارە كاتێك كە خۆی شتێك حەرام دەكات قورئانە و لەوێدا باسكراوە، ئەی باشە ڕەسول چی ئەگەیەنێت؟ بێگومان لە سوونەت زیاتر شتێك نییە و بەمەش وتەی ئۆزۆن لەسەر ڕەسول و پێناسەكردنی هەڵدەوەشێتەوە، چونكە ئەو پێی وایە كە ڕەسول تەنها ئەو پەیامەی پێیەو ئەیگەیەنێت بەبێ زیادە، بەڵام ئەبینین ئایەتەكە باسی تەشریعی كردووە بێجگە لە قورئان و داویەتیە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)[1].

هەر لەسەر ئەو بابەتە ئۆزۆن دژی خۆی دەوەستێتەوەو دەڵێت: "دەبێت جیاوازی بكەین لە نێوان وشەی(النبـي) و(الرسول) كە بە نەزانی یان بە ئەنقەست تێكەڵكراوە" ع: ١٦، ك: ٢٠

لەو وتەیە ورد بەرەوەو پاشان سەیری ئەم وتەیەی تری بكە كاتێك بۆ شەرعیەت دان بەو جۆرە دابەشكردنە بێ بەڵگەیەی باخەڵی خۆی پەنا ئەباتە بەر ئەم بەڵگەیەو دەڵێت:

---

[1] شایەنی باسە پێش ئۆزۆن "شەحرور" یش هەمان هەڵەی كردووەو بەنەزانانە ئۆزۆنیش شوێنی كەوتووە، مـن هۆكاری نەزانیان دەگێڕمەوە بۆ نەزانی و لاوازی ئاستیان لە زمانی عەرەبیدا سەرەڕای نەزانی بە تەواوی شەریعەت.

"هەربۆیە دەستەواژەی(الأحادیث الرسولیة)مان نییە و بەكارنایەت پەیامی محمەد(د.خ) بریتییە لە قورئان" ع: ١٨، ك: ٢٢

دەڵێم: ئەمە پێچەوانەی وتەی پێشویەتی كە دەڵێت تێكەڵكراوە بە نەزانی یاخود بە ئەنقسەت، چونكە دەستەواژەی(الأحادیث النبویة) خۆ ئۆزۆن نەیهێناوە تاوەكو بڵێ شتێكم دۆزیوەتەوەو ئەوان شاردویانەتەوە نابێ(الأحادیث الرسولیة) بەكاربێت، بەڵكو زانایانی ئەم ئومەتی ئیسلامە خۆیان دەستەواژەی(الأحادیث النبویة)یان داناوە، ئیتر ئەم وتەیە لەپەنای چی؟!

ئەوەشی كە دەڵێت پەیامی پێغەمبەر(ﷺ) تەنها بریتی بووە لە قورئان لە بانگەشەیەكی بێ بنەما زیاتر نیەو هەرگیزاو هەرگیز بۆی ناچێتە سەر و تەنها ئەو ئایەتەی پێشوو كە هێنامانەوە بەسە بۆ كەسێك حەقی بوێ و شوێنی بكەوێت، بەلاَم بڵێین چی لەگەڵ كەسێكدا كە خۆی دەمی تاڵەو هەر شتێك بخوات هەر چەندە زۆریش شیرین بێت هەر بەتاڵی ئەبینێت[١]، هەر وەكو موتەنەببی دەڵێت:

وَمَـــنْ يَـــكُ ذا فَـــمٍ مُـــرٍّ مَـــرِيضٍ     يَجِـــدْ مُـــرّاً بِـــهِ المَـــاءَ الـــزُلالا

واتە:

ئـــــەو كەســـــەی دەمـــــی تــــاڵ و نەخۆشبــــــێ

ئـــــاوی ڕوون و سازگاریشــــــی لا تــــــاڵ دەبـــــێ

پاشان نووسەر گومانێكی تر دێنێت و دەڵێت: "لەسەردەمەرگدا پێغەمبەر دەیەوێت شتێكیان بۆ بنووسێ، قایل نابن، چونكە پێیان وابووە كە پەیامی پێغەمبەر تەنها قورئانە" ع: ١٨، ك: ٢٢

---

[١] ئەگەر بەڵگەی زیاتریشت ئەوێ ئەتوانی بگەڕێیتەوە سەر زنجیرە ڤیدیۆی نەیارانی سوننە و لەوێ بەڵگەمان زۆر هێناوە لەسەر ئەوەی سوننەت شەریعەتەو بڕیارەكانی وەرگیراوە.

ئەم بەڵگەیەی نووسەر وامان لێ دەكات بڵێین نووسەر هەر شتێكی حەز لێبوو ئەیكاتە بەڵگە مادام پاڵپشتی بۆچوونی بكات، چونكە هەر بۆخۆی بڕوای بە فەرموودە نییە و ئێستا لەبەرژەوەندی خۆی واهاتووە فەرموودە دێنێتەوە!!

ئەمە لەلایەك و لێكدانەوەكەشی لەلایەكی ترەوە زۆر دوورە لە ڕاستیەوە، چونكە ئەگەر بەوشێوەبوایەو هاوەڵان پێیان وابوبێ كە فەرموودە بەڵگە نیە، ئەی بۆچی ڕێگر نەبون لەو هەموو هاوەڵەی فەرموودەیان لەلابوو نەیگێڕنەوەو نووسینەوەكانیان لەناو بدەن؟ یاخود شوێنكەوتوان ئاگادار بكەنەوەو پێیان بڵێن ئەمان فەرموودە وەرنەگرن و قورئان بەسە؟

## ئایا فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) پیرۆزن؟

ئۆزۆن ئەم پرسیارە دەكات و لەوەڵامدا دەڵێت: "لەوەی ڕابورد دەردەكەوێت كە نەخێر پیرۆز نین، بۆ نموونە زۆربەی هەرە زۆری ئەو فەرموودانەی لای سوننە هەیەو بە(صحیح) دا دەنرێت شیعە باوەڕی پێی نیە" ع: ١٨، ك: ٢٢

دەڵێم: ئەگەر ئۆزۆن لە پیرۆز نەبوونی سوننەت مەبەستی ئەوەیە كە ناگاتە پلەی قورئانی پیرۆز ئەوا كەس لاری لەوە نیە، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوەیە كە سوننەت كاری پێناكرێ و توانای یاسادانانی نیە، ئەوا بەهەڵەداچووەو بۆی ڕاست دەكەینەوە، هەرچەندە لەوەی ڕابورد لە بەڵگەی لاواز و بێ بنەما زیاتر شتێكمان نەدی و وەڵامیشمان دایتەوە و خاڵ بە خاڵ و هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵت هاتین بەس ڕەنگە زۆر دڵت پێیان خۆشبێت و وابزانیت هیچت نەهێشتوەتەوە بۆ قیامەتت؟!

بۆ ئەو بابەتەش كە ئایا شتێك پیرۆزە یاخود پیرۆز نییە ئەبێت سەیری حەقیقەتی ئەو شتە بكرێت نەك لە نەیارەكانیەوە بۆی بڕوانیت، بۆ نموونە ئەگەر تۆ بتەوێ كەسێك بناسیت ئەبێ بچیت لە ڕێگەی خۆیەوە بیناسیت و بزانیت كێیەو خاوەن چی وتەیەكەو بەهای چەندە، نەوەك بچیت وەڵامی كەسێك وەرگریت كە دژایەتی و ڕق و كینەیەك هەیە لە نێوانیانداو ناسراون بە دژایەتی یەكتر.

جا ئۆزۆنیش نەهاتووە حەقیقەتی سوننە بناسێت بەڵكو سەیری دژەكانی كردوە و ئەیەوێت مەقام و گرنگیەكەی بە دژەكەیدا بناسێت و ئەمەش خستویەتیە هەڵدێرەوە، ئێستا من پرسیارەكە پێچەوانە ئەكەمەوە بۆ زەكەریا ئۆزۆن و لێی دەپرسم:

ئایا ئەو قورئانەی كە مسوڵمانان بڕوایان پێیەتی پیرۆزە؟

لەكاتێكدا خاچپەرستان و جووەكان بڕوایان پێی نییە و بە پیرۆزی نازانن؟!

بێگومان ئەم جۆرە وتانە زۆر نازانستین و هەرگیز پشتیان پێ نابەسترێت لە مەیدانی بەڵگەداو بەڵكو ئەبێت سەیری ناوەڕۆكەكەی بكەیت و باس لەوە بكەیت ئایا ئەمە وتەی پێغەمبەرە(ﷺ) یاخود نا و چۆن ئەیسەلمێنیت و داوای بەڵگە بكەیت؟ پاشان ئەتوانی بگەیتە ئەنجامێك نەوەك بەو هەڵەشەییەی ئۆزۆن!!

كاتێك باسی شیعە ئەكات بەو تێكەڵكردن و پەلەكردنە نابێت بەڵكو ئەبێت باسی ئەوە بكات كە مەبەستی لە كام جۆری شیعەیە، بۆ نموونە زەیدیەكان تەنانەت بڕوایان بۆ سونەنی ئەبو داود و "موەتەئی ئیمام مالیك" هەیە هەر وەكو پێشەوای زەیدیەكان ئیبن وەزیر باسی دەفەرموێت[١]، چ جای بگاتە سەحیحی بوخاری و موسلیم؟!

ئەگەر ئۆزۆن مەبەستیشی لە زیادڕەوەكانی شیعەیە، خۆ هەندێكیان بڕوایان وایە قورئانیش زیاد و كەمی لێكراوە، تۆ بڵێی ئەویش لای ئۆزۆن هەر پیرۆز نەبێت؟!

جا لەهەمووشی خۆشتر ئۆزۆن دەڵێی تازە فێری زمان بووە دەڵێت(أهل الشيعة) لەبری(الشيعة) و ڕەخنەش لە ئیمامی عەرەبی "سيبويه" دەگرێت!!

---

[١] الرَّوضُ البَاسِمْ في الذَّبِّ عَنْ سُنَّةِ أبي القَاسِمِ لابن الوزير (١/١٥١)، اعتنى به: علي بن محمد العمران، الناشر: دار عالم الفوائد للنشر والتوزيع.

## ئایا فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) قورئان شرۆڤە دەكەن؟

ئەم ناونیشانە پرسیارێكی ئۆزۆنەو ئەیەوێت بپرسێت ئایا فەرموودە ڕاڤەی قورئانی پیرۆز دەكات یاخود نا؟

ئەگەر مەبەستیەتی بگاتە حەقیقەت ئەوا هێندەی باسمان كرد بەسە بۆ كەسێك حەقی بوێ و ئەگەر شوێن هەوای خۆشی كەوتبێت بەهەزاران بەڵگەش نایەتە بارا بۆ ئێمە،

ئۆزۆن دەڵێت: " زانا بەڕێزەكان و كەسانی دیكەش دەڵێن فەرموودەكانی پێغەمبەر زۆربەی قورئانی پیرۆز شرۆڤە ناكەن" ع: ١٨، ك: ٢٣

**دەڵێم:** ئێمە لە پێشدا لە ئۆزۆن دەپرسین ئەو زانا بەڕێزانەی كە ئەو باسیان دەكات كێن و لە كوێدا وا دەڵێن لایەنی كەم وەكو سیفەتی هەمیشەیی خۆی كە تەنها ناوی كتێبەكە دەڵێت بەبێ خانەی چاپ و ساڵی چاپ و ژمارەی بەرگ و لاپەڕە، كە جاری وا هەیە كتێبەكە زیاتر لە(١٥) بەرگە!!

ئەگەر هەر واش بیهێنایە خراپ نەبوو، بەڵام ئەوەی كە ئۆزۆن ئەیلێ مەبەستی پێی تانەدانەو هیچ زانایەكی بەڕێزیش بێئەدەبیەكی وای نەكردووە لە ئاست فەرموودەكانی خۆشەویستدا(ﷺ)، ئەگەر مەبەستیشی ئەوەیە كە زۆربەی ئایەتەكانی قورئان ڕوونن و ئەوەی كە پێویستی بە ڕاڤەكردن بێت ئەوا ڕاڤەكراوەو ئەوەشی كە خوای گەورە مەبەستی بووە كە حەقیقەتەكەی بەیان نەكرێت لەبەرخاتری حیكمەتێك-كە ئەمە زۆر دەگمەنە- ئەوا پێغەمبەریش(ﷺ)لێی نەدواوە.

بەڵام ئۆزۆن مەبەستی ئەوە نیەو لای وایە كە شتانێك لە قورئاندا هەن و پێویستیان بە ڕوونكردنەوە هەبووە بەڵام سوننەت ڕوونی نەكردوەتەوەو ئەگەر ڕاڤەكاری قورئانە بۆ ڕاڤەی ئەو ئایەتانەی تێدا نیە!!

هەروەكو داوایەكی زۆر منداڵانە ئەكات و دەڵێت:

"من تەنها یەك سورەتم ئەوێ كە نزیكەی(١٠٠) ئایەت بێت و لە سەرەتاوە تاوەكو كۆتایی لەلایەن پێغەمبەرەوە شرۆڤەكرابێت ئایەت ئایەت" ع: ١٨، ك: ٢٣

نازانم ئۆزۆن بەچی لەقورئان تێگەیشتووە، ئایا قورئان ئاڤێستای زەردەشتیەكانە تاوەكو ڕەمزو كۆدبێت و پێویستی بەشكاندنیبێت و پێغەمبەر(ﷺ)بۆ ئەوە هاتبێت؟!

تۆ بڵێی قورئان وەكو كتێبی جادووبازان وابێت و كەس لێی تێنەگات بەبێ ڕاڤەو وردەكاری و ڕوونكردنەوە؟!

نەخێر قورئانی پیرۆز بە زمانێكی عەرەبی ساناو ساكار هاتووەو بۆ تێكڕای خەڵكی هاتووەو بۆ ئەوە هاتووە خەڵكی لێی تێبگات و كاری پێ بكات، هەروەكو خوای گەورە لەباسی ئاسانكردنی تێگەیشتن ولەبەركردن و كارپێكردنی قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ٢٢﴾القمر

هەروەها لەبارەی ڕوونی ئایەتەكانی و زمانەكە دەفەرموێت: ﴿الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ١ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٢﴾يوسف

جا ئەگەر بە زمانێكی ڕوون و ئاسان نەبێت چۆن بە تێكڕای خەڵكی دەفەرمویت(لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ)؟!

پاشان ئۆزۆن بۆ سەلماندنی وتەكەی بەڵگەیەك دەهێنێتەوەو دەڵێت: "ئەبو بەكر لەم ئایەتەدا(وَفَاكِهَةً وَأَبًّا) مانای(وَأَبًّا)ی نەزانیوە" ع: ١٩، ك: ٢٣

دەڵێم: كاتێك لە سوننەتدا نەهاتوە كە بفەرموێ(وَأَبًّا) ماناكەی ئەوەیە ئەوە ناگەیەنێت ئیتر فەرموودە بەیانی قورئانی پیرۆز ناكات، چونكە ئەگەر مانای ئەم وشەیەشی بكردایە بە دڵنیاییەوە ئۆزۆن وشەیەكی تری دەهێناو ئەیوت ئەی ئەمەی بۆ تیا نیە، وشە وشە تاوەكو ناچار هەموو وشەكانی قورئان ئەبوایە لە فەرموودەدا باسبكرایە لەبەر خاتری چاوی كاڵی ئۆزۆن، ئیتر بێ گوێدانە ئەوەی كە ئەمە تەنها درێژدادڕیەو پێغەمبەریش(ﷺ) بۆ ئەمە نەهاتووە، بەڵكو كاری زۆر لەپێشەو ئەبێت پێیان ڕابگات نەوەك دانیشێت، (٧٧٤٣٩) وشەی قورئان ڕوون بكاتەوەو ئەوكات ئۆزۆن ئەهاتەوەو ئەیوت باشە ئەم هەموو فەرموودەیە چۆن گەیشتە ئێمەو كێ دەڵێت ڕاست و دروستە؟!

ئەم وشەیە شتێك نییە كە هێندە شاراوەبێت و پێویست بە ڕاڤەو لێكدانەوە بكات، بەڵكو لەناو عەرەبدا بەكارهاتووەو زانیویانە، ئیتر پێشەوا ئەبوبەكر ڕەزای خوای لێبێت

كاتێك وەڵامی نەداوەتەوە، ئەوە عادەتی ئەوان بووەو بە پێچەوانەی خەڵكی ترەوە بوون و حەزیان بە قسە نەكردوەو نەیانوێراوە لـە كەلامی خوای گەورە قسە بكەن و هەموو شتێكیان نەوتووە سەرەڕای بوونی زانستیشیان پێی، نەك وەكو خەڵكی ئەمڕۆ ڕاست و ناڕاست تێكەڵ ئەكات لـەبەرخاتری ئافەرینێك و بۆ ئەوەی پێی بوترێت نووسەرێكی چاكە گوێی لـیّ نییە ئەگەر ئاینەكەشی بفرۆشێت.

ئەگەر نووسەر بگەڕایەتەوە سەر سەرچاوەكان و چاوێكی پێدا بگێڕایە ئەوا مانای وشەی(وَأَبّا)ی زۆر بەباشی ئەزانی و ئەیبینی كە پێشەوا ئیبن عەبباس خوای لـیّ ڕازیبێت فەرموویەتی:

"مَا تُنبِتُ الأَرضُ مِمَّا تَأْكُلُ النَّاسُ والأَنْعَامُ"[1]. واتە: هەر شتێك كە زەوی دەیڕوێنێت و مرۆڤ و ئاژەڵ دەیخوات.

هەروەها لـە شیعری عەرەبیشدا زۆر بەكارهاتووە، بۆ نمونە[2]:

لَــهُ دَعْــوَةٌ مَيْمُونَــةٌ رِيحُهَــا الصَّــبَا     بِهَــا يُنْبِــتُ اللَّــهُ الْحَصِــيدَةَ وَالْأَبَّــا

هەروەها:

جِـــذْمُنَا قَـــيْسٌ وَنَجْـــدٌ دَارُنَـــا     وَلَنَـــا الأَبُّ بِـــهِ وَالْمَكْـــرَعُ

---

[1] عمدة الحفاظ للسمين الحلبي (٤٦/١)، ت: د.محمد التنوجي، دار عالم الكتب، ط:١، ١٤١٤هـ.

[2] البحر المحيط لأبي حيان (٤٠٥/١٠)، ت:صدقي محمد جميل، الناشر: دار الفكر – بيروت الطبعة: ١٤٢٠ ه.، والكشاف للزمخشري (٧٠٥/٤)، دار الكتاب العربي – بيروت–، الطبعة: الثالثة – ١٤٠٧ هـ. والدر المصون للسمين الحلبي (٦٩٤/١٠)، ت:الدكتور أحمد محمد الخراط، الناشر: دار القلم، دمشق.،

## ئایا تەنها گرنگی بەسەنەد دراوەو مەتن پشتگوێ خراوە؟

ئۆزۆن دەڵێت: "لەفەرموودەدا تەنها گرنگی بە ڕیوایەت دراوە(فلان لە فلانەوە...) كە پشت بە گواستنەوە دەبەستن نەك بەكارخستنی عەقڵ[١]، پشت بەوە دەبەستێ كە وتویەتی نەك ئەو شتەی كە وتویەتی" ع: ١٩، ك: ٢٤

دەڵێم: ئەم وتەیە زۆر وتەیەكی بێ بنەمایە و زۆر لە ڕاستیەوە دوورە ئەگەر بێت و نووسەر بگەڕایەتەوە بۆ موقەدیمەكەی ئیبن خەلدون زۆر بەجوانی ئەو ڕاستیەی بۆ بەدیار ئەكەوت، كە زانایان گرنگیان بە مەتنی فەرموودەش داوەو لێكۆڵینەوەی زۆر وردیان كردووە لەوبارەیەوە[٢].

هەموو زانایان لەسەر ئەوە كۆكن ئەگەر بێت و كەسێكی بیدعەچی فەرموودەیەك بگێڕێتەوەو پاڵپشتی بیدعەكەی خۆی بێت ئەوا فەرموودەكەی لێ وەرناگیرێت[٣]، ئایا ئەمە گرنگیدان نییە بە مەتنی فەرموودەكان و ماناو مەبەست تێیدا؟!

بۆ نموونە ئەگەر كەسێك شیعەبوو بێت و فەرموودەیەك بگێڕێتەوە لەبارەی ئالی بەیت یاخود لە زەمی معاویە و هاوەڵان ئەوا فەرموودەكەیان وەرنەگرتووە، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر ناصبی بوبێت و لە دژی ئالو بەیت شتێكی وتبێت لێیان وەرنەگرتووە.

---

[١] ئەمەبوو وەرگێڕی بەستەزمان لێی بوبو بە كارەكانی عەقڵ وەكو لە هەڵەكانیدا باسمان كرد!!

[٢] مقدمة ابن خلدون، ص: (٤٨٠)، اعتنى به : أحمد الزعبي، شركة الأرقم بن أبي الأرقم للطباعة والنشر – بيروت–

[٣] مقدمة ابن الصلاح، ص:(١١٤)، ت: نور الدين عتر، الناشر: دار الفكر– سوريا، دار الفكر المعاصر – بيروت–، سنة النشر: ١٤٠٦هـ – ١٩٨٦، وسؤالات الترمذي للبخاري ليوسف بن محمد الدّخيل النجدي ،(٤٧٨/١) ،الناشر: الجامعة الإسلامية، المدينة المنورة، الطبعة: الأولى ١٤٢٤هـ، الاقتراح في بيان الاصطلاح لابن دقيق العيد، ص: (٥٩)، دار الكتب العلمية –بيروت–، و فتح الباقي بشرح ألفية العراقي للقاضي زكريا الأنصاري السُّنَيْكِي (٣٢٧/١)، المحقق: عبد اللطيف هميم – ماهر الفحل، الناشر: دار الكتب العلمية، الطبعة: الطبعة الأولى، ١٤٢٢هـ.والمستصفى للغزالي، ص:(١٢٥)، ت:محمد عبد السلام عبد الشافي، دار الكتب العلمية، الطبعة: الأولى، ١٤١٣ه. و كشف الأسرار شرح أصول البزدوي لعلاء الدين الحنفي (٢٧/٣)، دار الكتاب الإسلامي.

فەرموون لەگەڵ چەند نمونەیەك لەسەر ڕەخنەی زانایان لە مەتنی فەرموودەی لاوازو هەڵبەستراو:

١ – ئەبو وائیل گێڕایەوە: ئیبن مەسعود(رضي الله عنه) لە "صەفین" لەگەڵیاندابوو.

ئەبو نوعەیم فەرمووی: "أتَراهُ بُعِث بعدَ المَوْتِ"[1]. واتە: تۆ بڵێی دوای مردنی زیندوو بوبێتەوە؟ ئەمە زۆر بە ڕوونی بەدیاری ئەخات كە ڕەخنەیان لە مەتنەكەی گرتووەو عەقڵیان بەگەڕ خستووەو خێرا ئەوە دەڵێت كە ئیبن مەسعود پێش ئەوە مردووە هەروەكو پێشەوا بوخاری دەفەرموێت پێش عوسمان مردووەو بە چەندین ساڵ پێش صفین.

٢– ئەو فەرموودە لاوازەی كە دەڵێت: ئەگەر كەسێك پژمی لەكاتی فەرموودەیەكدا ئەوا صحیحە.

ئیبن قەییم دەفەرموێت: (وَهَذَا وَإِنْ صَحَّحَ بَعْضُ النَّاسِ سَنَدَهُ فَالْحِسُّ يَشْهَدُ بِوَضْعِهِ لِأَنَّا نُشَاهِدُ الْعُطَاسَ وَالْكَذِبُ يَعْمَلُ عَمَلَهُ وَلَوْ عَطَسَ مِائَةُ أَلْفِ رَجُلٍ عِنْدَ حَدِيثٍ يُرْوَى عَنِ النَّبِيِّ "صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لَمْ يُحْكَمْ بِصَحَّتِهِ بِالْعُطَاسِ وَلَوْ عَطَسُوا عِنْدَ شَهَادَةِ رَجُلٍ لَمْ يُحْكَمْ بِصِدْقِهِ)

واتە: ئەگەرچی هەندێك سەنەدەكەیان بەڕاست داناوە بەڵام هەستی مرۆڤ شایەتی لاوازی بۆ ئەدات چونكە ئێمە ئەبینین خەڵكی ئەپژمێ و درۆی خۆشی ئەكات، جا ئەگەر سەد هەزار كەس لەكاتی فەرموودەیەكدا بپژمێت بڕیاری صحیح بوونی نادەین[2].

٣ – پێشەوا ئیبن جەوزی(رحمه الله) لەبارەی ئەم فەرموودەوە كە باس لە چوونی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەكات بۆ حەمام: حَدَّثَ الْوَزِيرُ بْنُ قَاسِمٍ قَالَ: " دَخَلْتُ فَرَأَيْتُ عَمْرَو بْنَ هَاشِمٍ الْبَيْرُوتِيَّ فِي الْوَرَقِ، فَقُلْتُ لَهُ: تَدْخُلُ الْحَمَّامَ، فَقَالَ: دَخَلْتُ الْحَمَّامُ، فَرَأَيْت الزُّهْرِيّ جَالِسًا فِي الْوَزْنِ فَقُلْتُ لَهُ: تَدْخُلُ الْحَمَّامَ؟ فَقَالَ: دَخَلْتُ الْحَمَّامُ فَرَأَيْتُ أَنَسَ بْنَ

---

[1] شرح مسلم للنووي (١/١١٨)، تأريخ الثقات للعجلي (١/١٩)، فتح المغيث للسخاوي، (٤/٣٠٨) ت: علي بن حسين، مكتبة السنة – مصر، الطبعة: الأولى، ١٤٢٤هـ.

[2] الأسرار المرفوعة في الأخبار الموضوعة للملا علي القاري، ص: (٤٢٦) ،المحقق: محمد الصباغ، الناشر: دار الأمانة / مؤسسة الرسالة – بيروت

مَالِكٍ فِي الْوَزْنِ فَقُلْتُ لَهُ: تَدْخُلُ الْحَمَّامَ؟ رَأَيْتُ صَاحِبَ رَسُول اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: دَخَلْتُ الْحَمَّامَ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسًا فِي الْوَزْنِ وَعَلَيْهِ مِئْزَرٌ فَهَمَمْتُ أَنْ أُكَلِّمَهُ فَقَالَ يَا أَنَسُ إِنَّمَا حُرِمْتُ دَخُولَ الْحَمَّامِ بِغَيْرِ مِئْزَر ".

لەبارەی فەرموودەكەوە دەفەرموێت: "هَذَا حَدِيثٌ مَوْضُوعٌ بلاشَكٍّ ... وَلم يدْخُلْ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَماماً قَطٌّ وَلا كَانَ عِنْدهُمْ حمامٌ"[١].

واته: ئەمە فەرموودەیەكی هەڵبەستراوە بەبێ گومان... وپێغەمبەری خواش (ﷺ) هەرگیز نەچوەتە حەمام و لەسەردەمیشیاندا حەمام نەبووە.

ئەم نمونانەو چەندین نمونەی تریش كە بەجوانی ئەومان بۆ دەردەخات كە زانایان گرنگیان بە دەق و مەتنی فەرموودەكان داوە، بەڵام زیاتر گرنگیەكە بەسەنەد بووە لەبەر خاتری چەند هۆكارێك، كە ئەتوانن لە زنجیرە وەڵامی نەیارانی سوننەت بیانبینن و بە درێژی باسمان كردووەو لێرە نامانەوێ هێندە درێژ بێتەوە بابەتەكە.

نووسەر بەس مەبەستی بووە گومان بڵاو بكاتەوە چونكە باسەكانی هەمووی تێكەڵ كردووە، بۆ نموونە لەبری ئەوەی ئێمە وەڵامی ئەوەمان بدایەتەوە كە هاوەڵان دادپەروەربوون یاخود نا چونكە ناونیشانی بابەتەكەی لەسەر ئەوەبوو، ناچاری كردین بچینە بابەتی سەنەد و مەتنی فەرموودە، چونكە ئەو لەهەرشوێنێكدا بۆی ڕێككەوتبێت گومانێكی داناوە بێ گوێدانە ئەوەی كە شوێنی خۆیەتی یاخود نا!!

---

[١] الموضوعات لابن الجوزي (٢/٨١)، المكتبة السلفية بالمدينة المنورة، الطبعة: الأولى جـ ١، ٢: ١٣٨٦ هـ.

## ئایا گێڕەرەوەی فەرموودەكان لەهاوەڵان دادپەروەرن؟

ئەمە پرسیارێكی تری ئۆزۆنە كە دەكاتە پرسیاری پێنجەمی و ئەپرسێت ئایا هاوەڵان دادپەروەرن[١]؟

پاشان خۆی دێتە وەڵام و لەبارەیانەوە دەڵێت: "تاوانباریان تێدابووەو چەندین ئایەتیان لەسەر دابەزیوە" ع: ١٩، ك: ٢٤

نووسەر ئەیەوێ ڕاستیەكان بشێوێنێت و ئەو ئایەتانەی كە لەسەر دوو ڕووو مونافیقەكان هاتوەتە خوارەوە جێگیری بكات لەسەر هاوەڵان و هاوەڵانی پێ ناشرین بكات، یەكێك نەزانێت ئەو ئایەتانەی كەلەسەر عبدالله ی كوڕی سەلول هاتووە، بۆ ئەبوبەكری صدیق و عومەری فاروق هاتووە، ئایا كەسێك هێندە چەواشەكاربێت متمانەی پێ دەكرێت لە هیچ شتێكیدا؟!

پاشان بەردەوام ئەبێت لە خیانەت و چەواشەكاریی و دەڵێت: " یەكێك لەناوەكانی سورەتی "التوبة" بریتییە لە "الفاضحة" واتە هەڵماڵەر، چونكە ڕووی ڕاستی زۆرێك لەوانی هەڵماڵیوە"[٢] ع: ١٩، ك: ٢٤

بۆ ئەم زانیاریە پڕ لە درۆو خیانەتەشی سەرچاوەیەكی نووسیوە(صحيح البخاري باب التفسير) من تەحەدای نووسەر و وەرگێڕ و ئەوەشی پێشەكی بۆ نووسیوە ئەكەم ئەگەر توانیان ئەو درۆیە پشت ڕاستبكەنەوە ئەوا من هەرچی نوسخەی ئەم كتێبە هەیە لەبازاڕدا ئەیكێشمەوە.

تۆش ئەی خوێنەری بەڕێز سەرچاوەكە شتێك نییە دەست نەكەوێت و هەموو كتێبخانەكان صەحیحی پێشەوا بوخاری لێیەو ئەتوانی بەگەڕێیت و بۆخۆت بگەیتە ئەنجام و نە لە من و نە لە ئۆزۆنیشی وەرنەگریت!!

---

[١] مەبەست لە دادپەروەری دووركەوتنەوەیە لە تاوانی گەورەو نەكردنی تاوانی بچوكە بە ئاشكرا.

[٢] وەرگێڕ بەویستی خۆی دایڕشتوەتەوە بێ گوێدانە كتێبەكەو وتەی نووسەر.

هەموو زانایان كۆكن لـەسەر ئەوەی كە سورەتی تەوبە بۆیە پێی وتراوە هەڵـماڵەر چونكە پەردەی لـەسەر مونافیقەكان لابردوەو هەموو نهێنیەكانیانی ئاشكرا كردوەو تەنانەت كەسێك سورەتی تەوبەی خوێندبێتەوە پەی بەو ڕاستیە دەبات وچاك دەزانێت كە مەبەست پێی مونافیق و دووڕووەكانەو با ئۆزۆنیش بترسێت لـەوەی كە خۆشی بگرێتەوە!!

ئەگەر ئۆزۆن و هەوادارانی توانیان ئەم ئایەتانەی سورەتی تەوبە بەسەر ئیمانداران و هاوەڵاندا بسەپێنن ئەوكات مافی قسەیان هەیە:

١ – قَالَ تَعَالَى: ﴿ لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أَن يُجَٰهِدُوا۟
بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ
وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ ۞ وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ
لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوْ
خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ
سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ
حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّى وَلَا
تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ إِن تُصِبْكَ
حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ۖ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا۟ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّوا۟
وَّهُمْ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ
فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ
أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ
﴿٥٢﴾ قُلْ أَنفِقُوا۟ طَوْعًا أَوْ كَرْهًا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمْ ۖ إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمًا
فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ
وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ

كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾ فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ
وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ
يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُوا۟ مِنْهَا رَضُوا۟ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا۟
مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ
سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾التوبة: ٤٤ - ٥٩

٢ - قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ۚ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ
لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ ۚ وَٱلَّذِينَ
يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ
أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ
لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدًا فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْخِزْىُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ يَحْذَرُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ أَن
تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلِ ٱسْتَهْزِءُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا
تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ
وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن
طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ
بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ
نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ
وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ هِىَ حَسْبُهُمْ ۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ
مُّقِيمٌ ﴿٦٨﴾ ﴾التوبة: ٦١ - ٦٨

٣- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ
جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ

إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٧٤﴾ ۞ وَمِنۡهُم مَّنۡ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنۡ ءَاتَىٰنَا مِن فَضۡلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضۡلِهِۦ بَخِلُواْ بِهِۦ وَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقٗا فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ﴿٧٧﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ سِرَّهُمۡ وَنَجۡوَىٰهُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿٧٨﴾ ﴾التوبة

تەفسیری ئایەتەكانیش نەقڵ ناكەین بۆ ئەوەی لـەوە درێژتر نەبێتەوە، بەڵام ئێستا زۆر بەڕوونی دیارە هەر ئەو دووڕوانەی كە سوڕەتی تەوبە فەزحی كردن و لـەسەریان وەدەنگ هات، لـەئەمڕۆشدا وێنەیان زۆرەو هەمان ڕێبازی ئەوانیان گرتووە، وەك چۆن ئەیانویست پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان لـە جیهاد سارد بكەنەوە ئەمڕۆش خەڵكانێك هەن بەهەمان چەشن هاتوون و چەندین درووشمی جیا جیایان بەرزكردوەتەوەو پێی لـە ئاین ئەدەن، ئەوان بوون لـە دوێنێدا گاڵتەو سووكایەتیان بە پێغەمبەر (ﷺ) دەكرد، ئەمڕۆش كوڕ و كوڕەزاكانیان گاڵتە بەڕێباز و سوننەتی دەكەن، ئەوان بوون هەرگیز حەزیان بە هەوڵ و تێكۆشان نەدەكرد، ئەمڕۆش هاوچەشنیان زۆرە .

لـە كۆتاییدا دەڵێین: بەڵێ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دادپەروەربوون و جێی متمانەبوون و باشترینی ئەم ئوممەتەبوون، هەرچەندە ئۆزۆن پێی قەڵس بێت و وەرگێڕ دڵی ژان بكات، سەردەمی ئەوان ئەو سەردەمە زێڕینەبوو كە دووبارە نابێتەوە.

ئەوان بە شایەتی خوای گەورە باشترینی ئیمانداارانن هەروەك دەفەرموێت:

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٧٤﴾ ﴾الأنفال

دیسانەوە خوای گەورە لەباسی گەورەیی هاوەڵاندا دەفەرموێت: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ٢٩ ﴾الفتح

لەگەڵ چەندین ئایەتی تری قورئانی پیرۆز كە باسی گەورەیی و ڕێزی هاوەڵان دەكات، ئەگەربێت و ئۆزۆن لەگەڵ ئەو ئایەتانەش كێشەی نەبێت!!

خەڵكانێكی بە ئەمەك و بۆ خوا سوڵحاو ڕاستگۆو دەستپاك و دەمپاك و داوێنپاك

خەڵكانێكی بە ویژدان و دڵسۆز و دادپەروەر و حەق بێژ.

ئەوان گەیەنەری ئەم ئاینەن، ئەوان بوون قورئانیان گەیاندە ئێمە بە خوێن و ماڵ و گیان و سامانیان، گومان خستنە سەر كەسایەتی هاوەڵان بە تێكڕا گومان خستنە سەر قورئانە ڕاستەوخۆ، چونكە هەر ئەوان بوون قورئانیان گەیاند!!

گومان خستنە سەر ئەوان گومان خستنە سەر كەسایەتی پێغەمبەر (ﷺ)، چونكە تا كۆتایی تەمەنی لەگەڵ ئەواندا ژیاو هەموو تەمەنی لەگەڵ ئەواندابوو، ناكرێت ئەو بەوپەڕی چاكی و میهرەبانیەوە لەگەڵ خەڵكانێكی خراپدا ئەو ماوە زۆرە پێكەوە هەڵكەن و گوزەر بكەن.

ئەمانە هەمووی سەرەڕای بوونی هەندێك كەم و كورتی چونكە پارێزراوی لە هەڵە بۆ كەسێك نییە بێجگە لە پێغەمبەران(عليهم السلام) .

لەدوای ئەمە ئۆزۆن دێت و ئەیەوێ بە كۆمەڵێك درۆی شاخدار گومان بخاتە سەر گەورە هاوەڵان و گێڕەرەوەی فەرموودەكان لە ڕێگەی گومانخستنە سەر كەسایەتی سێ

لەگەورە زاناكانی ئیسلام و سێ كەسایەتی گرنگ لە مێژووی ئیسلامی و گێڕەرەوەی فەرموودەكان، بەڵام بەڵێنمان بەخوای گەورە داوە لە تەنها دێڕێكی خۆش نەبین و نەیەڵێن بچێتە سەر بۆی و بە بەڵگەوە هەموو چەواشەكاری و خیانەت و بێ شەرمیەكانی دەربخەین و ئەوەی كە حەشاری داوەو لە ژێر بەرەیە بیهێنینە سەر بەرەو ناخی سیای بەرامبەر ئیسلام بۆ خەڵكی بەدیار بخەین!!

## هاوەڵی بەڕێز ئەبو هورەیرە و ستەمی ئۆزۆن!

دوای ئەوەی ئۆزۆن زۆربەی گومانەكانەكانی محمود ئەبو ریە ئەدزێت و بە ناوی خۆیەوە بلاَوی دەكاتەوەو ئاماژەش ناكات بە كتێبەكەی ئەبو ریە، ئەگەربێت و ئۆزۆن وەلاَمەكەی موعەلیمی یەمانی بخوێندایەتەوە بۆ ئەبو ریە یاخود ئەوەی دكتۆر مستەفا سوباعی و ...

هەرگیز ئۆزۆن ڕووی نەئەهات ئەو گومانانە نەقڵ بكاتەوە، بەلاَم نەخوێندەواری دەردێكی كوشندەیە!!

### ماوەی چەنێك هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بووە؟

بەهەر حاڵ هەروەكو چۆن ئەبو ریە باسی ژیانێكی كورتی ئەبو هورەیرەی كردووە لەسەرەتاوە، ئۆزۆنیش هەمان شێوەی كردووە بەلاَم ئۆزۆن دڵڕەقتر و بێویژدانترەو دەڵێت: "التقى أبو هريرة بالرسول لفترة لم تزد على السنة وتسعة أشهر بأية حال من الأحوال ومع ذلك فقد كان أكثر الصحابة رواية عن الرسول مما جعل الصحابة –وعلى رأسهم السيدة عائشة – يتهمونه وينكرون عليه ذلك. هكذا وكان أبو هريرة أول راوية اتهم في الإسلام" ع: ٢٠، ك: ٢٦

واتە: ئەبوهورەیرە گەیشتە پێغەمبەر بۆ ماوەیەك كە بە هیچ شێوەیەك نەچوەتە سەرروو ساڵێك و نۆ مانگ و لەگەڵ ئەوەشدا لە گشت هاوەلاَن فەرموودەی زیاتر گێڕاوەتەوەو هەر ئەمەش وایكردووە كە هاوەلاَن –لەسەری هەمووشیانەوە خاتوو عائشە – گومانی لێبكەن و ڕەتی بكەنەوە. بەوشێوەیە ئەبوهورەیرە بووە یەكەم ڕاوی كە گومانی لێكرابێت و تۆمەتباركرابێت.

بۆیە خۆمان وەرمانگێڕاو دەقی وەرگێردراومان نەهێنا لەبەر خاڵی یەكەمی ئەم چەند هەڵوێستەیە:

١ – ئۆزۆن دەڵێت(التقى) یەكێك نەزانێت لە ڕێگاو هەرلەخۆوە بەیەك گەیشتوون و ئەبو هورەیرە هیجرەتی نەكردووە لە داری كوفرەوە بۆ داری ئیسلام و ئەیەوێ ئەو

ڕاستییە بشێوێنێت و ئەو فەزیلەتە لە ئەبو هورەیرە وەربگرێتەوە كە هیجرەتە بۆ مەدینە، لەبری ئەوەی بڵێ: (هاجر)(كۆچی كرد) نووسیویەتی(التقی)!!

وەرگێڕیش لەبری ئەوەی بنووسێت بەیەك گەیشتن، نووسیویەتی(لەخزمەتیدابووە)!

٢ –دەڵێت: بەهیچ شێوەیەك زیاتر نەبووە لە ساڵێك و نۆ مانگ ماوەی بینین و لەگەڵابوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ)،

دەڵێم: ئۆزۆن بۆیە هێندە بەدڵنیاییەوە قسە ئەكات چونكە خۆی شارەزایی بە سەرچاوەكان نیەو تەنها پشتی بە ئەبو ڕیە بەستووەو كاتێك دیویەتی ئەبو ریە بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێت: "هەموو پیاوەكانی فەرموودە كۆكن لەسەر ئەوەی ئەبو هورەیرە تەنها یەك ساڵ و نۆ مانگ لەگەڵ پێغەمبەر دابووە"[1].

ئیتر ئەویش بەستەزمانە وایزانیوە كۆتایی هەموو زانستەكان لای ئەبو ڕیەیەو كەسێكی دڵسۆز و دیندارەو زۆر بەئەمەكە –ڕەنگە زانیبێتی كەسێكی تەڵەكەبازیشە بەڵام هەر بۆ پشێوی و شێواندنی ڕاستیەكان نەقڵی كردبێت– ئەم وتانەی نەقڵ كردوەو نەیزانیوە كە هاوەڵی خۆشەویست و بەڕێز ئەبو هورەیرە(٤) ساڵ هاوەڵی پێغەمبەر بووە(ﷺ) و لەخزمەتیدا فەرمودەی وەرگرتووە!!

ئەبو هورەیرە دەفەرموێت: (صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلاَثَ سِنِينَ لَمْ أَكُنْ فِي سِنِيَّ أَحْرَصَ عَلَى أَنْ أَعِيَ الحَدِيثَ مِنِّي فِيهِنَّ...)[2].

واتە: سێ ساڵ هاوەڵی پێغەمبەری خوابووم (ﷺ) و هیچ كاتێكی تەمەنم هێندەی ئەو سێ ساڵە بەشوێن وەرگرتنی فەرمودەوە نەبووم.

---

[1] أضواء علی السنة، ص: (١٧٣)، پێم خۆشە ئاماژە بەوەش بكەم ئۆزۆن و ئەبو ریە كاریگەری ڕۆژهەڵاتناسەكانیان بەشێوەیەك لەسەرە، تەنانەت لەكاتی داڕشتنی وتەكانیشیان ناتوانن لێی دەربازبن، بە خوێنەری خۆشەویست دەڵێم: كێیە وشەی پیاوانی ئاینی و پیاوانی فەرموودەو ... بەكاردێنێ؟!

[2] البخاري مع الفتح، (٦٠٨/٦).

بەلآم ئەوەی كە دەفەرموێت سێ ساڵ، ئەو سێ ساڵە بەردەوام لە خزمەتیدابووە لێی دانەبڕاوەو لە هەموو سەفەرو گەشت و چوون و هاتنێك لەگەڵیدابووە و تەنها هەندێك كاتی دیاریكراو نەبێت كە پێغەمبەر(ﷺ)ی جێهێشتووە.

ئەگینا ئەو ماوەیەی كە هاتوەتە خزمەتی و لێوەی فێربووە(٤) ساڵە هەروەكو پێشەوا ئیبن حەجەری عەسقەلانی لەبارەی هیجرەتی بۆ داری ئیسلام دەفەرموێت: (قَدِمَ فِي خَيْبَرَ سَنَةَ سَبْعٍ وَكَانَتْ خَيْبَرُ فِي صَفَرٍ وَمَاتَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَبِيعٍ الْأَوَّلِ سَنَةَ إِحْدَى عَشَرَةَ فَتَكُونُ الْمُدَّةُ أَرْبَعُ سِنِينَ وَزِيَادَةٌ)[1].

واتە: لەكاتی خەیبەردا هات كە ئەیكردە صەفەری ساڵی حەوت و پێغەمبەریش (ﷺ) لە رەبیعی یەكەمی ساڵی یانزە وەفاتی كرد و بەمەش ئەكاتە زیاتر لە(٤) ساڵ.

وەكو دیارە هەر لەدەقی فەرموودەكەدا باس لەوە دەكات كە هیچ كاتێك وەكو ئەو سێ ساڵەو لە مەدینە فەرموودەی وەرنەگرتووە، چونكە لەكاتێكدا لە مەدینەبووە ئاسانتربووە وەك لەوەی لەسەفەربوبێتن بۆ وەرگرتنی فەرموودە، هەروەكو ئەبینین كەمێك لە فەرموودەكان لەسەفەردا وەرگیراون و گێڕدراونەتەوە، مەگەر شتێك لەوكاتا تایبەت بوبێت و ڕووداوێك هاتبێتە پێشەوەو پێغەمبەریش (ﷺ) قسەی تیا فەرموبێت، بەلآم مانای وا نییە كە لەو ساڵەدا هیچ فەرموودەی وەرنەگرتووە، بەڵكو وەرگرتنەكەی لەچاو وەرگرتنی ئەو سێ ساڵەی تردا زۆر نەبوەو پێشەوا ئیبن حەجەر جوان ڕوونی ئەكاتەوە لەهەمان لاپەڕەی كتێبەكەی بۆ كەسێك ویستی بچێتەوە سەری.

بەمەش چەواشەكاریەكی تری ئۆزۆن بەدیاردەكەوێت و ڕوون ئەبێتەوە كە بەردەوام خەریكی شێواندنی ڕاستیەكانە!!

جا خۆشەویستانم ئەگەر بێت و بەراورد بكەین لە نێوان ژمارەی فەرموودەكانی ئەبوهورەیرەو ئەو چوار ساڵەی كە تیایدا فەرموودەی وەرگرتووە ئەوا بەشی زۆر زیاتر لەو فەرمودانەی دەكرد كە وەریگرتوەوگێڕاویەتیەوە چونكە فەرموودە صەحیحەكانی ئەبو

---

[1] فتح الباري لابن حجر (٦٠٨/٦)، دار المعرفة – بيروت، ١٣٧٩هـ.

هورەیرە ئەگاتە نزیكی(١٠٠٠) فەرمووده لەهەموو كتێبەكانی فەرموودەدا بەبێ دووبارەبووەكان، ئەو چوار ساڵەش ئەگەر لێكی بدەینەوە كاتێكی زۆر زۆرەو ئەكاتە هەزار و چوارسەد و شەست ڕۆژ(١٤٦٠)!!

لەو ماوە زۆرەدا ئەگەر ڕۆژانە یەك وتەی بیستبێت لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) یان كردارێكی ئەوی گێڕابێتەوە، زۆر زیاترە لەوەی كە ئێستا لەبەردەستمانایە لە فەرموودەكانی ئەبوهورەیرە!!

هەروەها لەو چوار ساڵەدا زیاتر لە(٢١٠) وتاری هەینی تێ ئەكەوێت، چونكە هەر ساڵێك(٥٢.١٧٧) حەفتەی تێدایە بەگوێرەی ڕۆژمێری میلادی، جا ئەگەر لە هەر وتارێكی هەینیدا تەنها(٥) فەرموودەی وەرگرتبێت ئەكاتە(١٠٥٠) فەرموودەو زیاترە لەوەی كە ئێستا لەبەردەستمانە لەفەرموودەكانی هاوەڵی خۆشەویست و بێزاركەری دووڕوان ئەبو هورەیرە(ﷺ)!!

دكتۆر حاكم دەڵێت: ئەگەر ڕۆژی(١٨) سەعات لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بوبێت ئەوا ژمارەی سەعاتەكانی ئەو چوار ساڵە ئەكاتە(٢٦٢٨٠) سەعات كە لەبەرامبەر خوێندنی سەرەتایی تاوەكو بەدەستهێنانی بڕوانامەی دكتۆرایە لەهەر بوارێكدا[1].

---

[1] جناية أوزون، ص:(٦٢).

## ئایا ئەبو هورەیرە جێگەی گومانی هاوەڵان بووە ؟!

٣ – بابەتی گومانی هاوەڵان لە ئەبو هورەیرە لە درۆیەك زیاتر نییە كە ئۆزۆن ئەیكات یان نەقڵی كردووە بە نەزانی، چونكە كەسێك سەیری وتەی هاوەڵان بكات دەربارەی ئەبوهورەیرە زۆر پێچەوانەی وتەكەی ئۆزۆن ئەبینێت، بۆ نموونە:

هاوەڵی بەڕێز عبداللە ی كوڕی عومەر(رضي الله عنهما) دەفەرموێت: "ئەبو هورەیرە لە من باشترەو باش ئاگاداری ئەوەشە كە ئەیگێڕێتەوە"[١].

ئەبو هورەیرە(رضي الله عنه) ئەگەر جێگەی گومان بوبێت هەرگیز فەتوا نەئەدرایە دەستی هەروەكو پێشەوا زەهەبی دەگێڕێتەوە: " كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ، وَابْنُ عُمَرَ، وَأَبُو سَعِيْدٍ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ، وَجَابِرٌ مَعَ أَشْبَاهٍ لَهُم، يُفْتُوْنَ بِالمَدِيْنَةِ، وَيُحَدِّثُوْنَ عَنْ رَسُوْلِ اللهِ –صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ– مِنْ لَدُنْ تُوُفِّيَ عُثْمَانُ إِلَى أَنْ تُوُفُّوا.قَالَ: وَهَؤُلاَءِ الخَمْسَةُ إِلَيْهِمْ صَارَتِ الفَتْوَى "[٢].

واتە: ئیبن عەبباس و ئیبن عومەر و ئەبو سەعید و ئەبوهورەیرە و جابر و هاو وێنەی ئەمان فەتوایان ئەدا لە مەدینە دوای مردنی عوسمان هەتاوەكو وەفاتیان كرد. فەتواش بۆ لای ئەو پێنجە ئەگەڕایەوە.

## ئایا ئەبو هورەیرە درۆزنترین كەس بووە؟!

وتەی هاوەڵان زۆر زۆرە لەبارەی ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) بۆ كەسێك بیەوێ بگاتە ڕاستیەكان، نەك وەكو ئۆزۆن ڕاستیەكان بشێوێنێ چونكە ئەو كتێبەی كە ئەم وتەیەی لێ نەقڵ كردووە ئەبو ڕیەیەو ئەویش لە كتێبەكەی ڕافیعی وەرگرتووە كە لە ئەدەبە!!

ئاخر بۆ هەڵسەنگاندنی بابەتێكی مێژوویی پشت بە كتێبی ئەدەب دەبەسترێت؟! ئەمە دەی بەهەرحاڵ ڕافیعیش لە كتێبی شەرحی "نَهْجُ البَلاغَةِ"ی وەرگرتووە كە نووسەرەكەی شیعەیەكی موعتەزیلیە!! ئاخر تۆ ئەتەوێ لە كتێبكی واوە حەقیقەت بەیان بكەیت كە

---

[١] الاصابة في تمييز الصحابة لابن حجر العسقلاني (٣٥٧/٧)، تحقيق: عادل أحمد عبد الموجود وعلى محمد معوض، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت–، الطبعة: الأولى – ١٤١٥ هـ.

[٢] سير أعلام النبلاء للذهبي (٦٠٦/٢)، ط: مؤسسة الرسالة.

كتێبەكە پڕیەتی لە درۆو پاشان كتێبێك نییە بە سەنەدەوە قسە بكات و هەمووی وتی و وتیانە و ئەمەش لە لێكۆڵینەوەی زانستیدا هیچ نرخ و بەهایەكی نییە.

هەر لێرەشەوە دەمەوێت خیانەتێكی تری ئۆزۆنت بۆ ڕوون بكەمەوە كە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەبو هورەیرە، وتەیەكی هێناوەو دەڵێت: ئیمامی عەلی فەرموویەتی: (أَكذبُ النَّاسِ أَبو هُرَيْرَةَ الدَّوْسِيُّ)، واتە: درۆزنترین كەس ئەبو هورەیرەی دەوسییە. بۆ سەرچاوەش تەنها نووسیویەتی: (شرح النهج)!! پ: ١٢، لا: ٢٦

دەڵێم: لە سەرچاوەكانی ئۆزۆندا باسی ئەم كتێبەمان كرد كە پڕیەتی لە درۆو وتەی بێ بنەماو ڕووداوەكانی بە هیچ شێوەیەك ناكرێتە بەڵگە، بە تایبەت لەكاتێكدا كە زانراوە نووسەرەكەی ئیبن ئەبی حەدیدە كە بە هەردوو بارەكەدا ڕقی لە ئەهلی سوننەبوە بەو بارەی كە لە شیعەبوەو بەو بارەكەی تریشیدا كە موعتەزیلەبووە، خۆی شیعەو ڕیوایەتەكەشی بە لاوازی هێناوەو دەڵێت: "وَقَدْ رُوْيَ عَنْ عَلِيّ عَلَيْهِ السَّلامُ أَنَّهُ قَالَ: أَلا إِنَّ أَكْذَبَ النَّاسِ – أَوْ قَالَ: أَكْذَبُ الأَحْيَاءِ – عَلَى رَسُوْلِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَآلِه أَبُوْ هُرَيْرَةَ الدَّوْسِيُّ"[١].

دەبینین لە ڕیوایەتەكەدا دەڵێت: (رُوِيَ) واتە: دەگێڕنەوە، ئەم جۆرە ڕیوایەتەش وەكو باسمانكرد لاوازە لای هەموو زانایان و وەرناگیرێت، چونكە نازانرێت كێ گێڕاویەتیەوەو لە نێوان خاوەنی كتێبەكەو ئیمامی عەلیدا نزیكەی(٦٠٠) ساڵە چونكە ساڵی(٦٥٦) مردووە!! چۆن ڕیوایەتێكی وەها وەردەگیرێت كە نەیداوەتە پاڵ كەس و ئەو ماوە دوورودرێژەش هەیە لەو نێوانیاندا؟ بەڕاستی ئەمە تەنها لە مەزهەبی ئۆزۆندا جێگەی دەبێتەوە!

ئیبن ئەبی حەدید لە لاپەڕەی پێشتردا كۆمەڵێك ڕیوایەت لە ئەبی جەعفەری ئیسكافی دەگێڕێتەوەو ئەگەر مەبەستیشی پێی ئەوەبێت كە ئەمیشی هەر لە ئەبو جەعفەرەوە گێڕاوەتەوە ئەوا پێی دەڵێین: دیسانەوە لاوازە لەبەر چەند هۆكارێك:

---

[١] شرح نهج البلاغة لابن أبي الحديد (٦٨/٤)، ت: محمد أبو الفضل ابراهيم، الناشر : دار احياء الكتب العربية عيسى البابي الحلبـي وشركاه.

١ – ئیسكافی شیعەبوەو موعتەزیلەبووەو زانایان فەرموودەیان لـێ وەرنەگرتووە[١].

٢ – سەنەدەكەی پچڕانی تێدایە، ئیسكافی ساڵی(٢٤٠) وەفاتی كردووەو پێشەوا عەلی نەدیوەو لە كێ بیستووە چونكە زیاتر لە(١٠٠) ساڵ دوای وەفاتی پێشەوا عەلی لەدایك بووە؟

٣ – كێ بۆ ئیبن ئەبی حەدیدی گێڕاوەتەوە، چونكە نێوان ئەو لەگەڵ ئیسكافی زیاتر لە(٤٠٠) ساڵە!

لەبارەی ئەوەشەوە كە دایكی ئیمانداران عائشە(رضي الله عنها) تۆمەتباری كردووە وتەیەكی زۆر بێ مانایەو هەر ئەوەندە دەڵێم: خۆزگە ئەو چیرۆكەشی كە ئەبو ریە هێناویەتی ئەویش بیهێنایە وەك بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی عائشە(رضي الله عنها) تۆمەتباری كردووە تاوەكو پوچەڵمان بكردایەتەوە، بەڵام ئەوەندە دەڵێم ئەگەر دایكی ئیمانداران(رضي الله عنها) ئەبوهورەیرەی(رضي الله عنه) بەكەسێكی خراپ بزانیایە ئەوا هەرگیز لە مەجلیسی خۆی نزیكی نەدەكردەوەو كاتی مردنیشی هاوەڵان ڕازی نەدەبوون ئەبو هورەیرە(رضي الله عنه) نوێژی لەسەر بكات[٢].

٤– ئەوەشی كە دەڵێت یەكەم ڕاوی بووە تۆمەتباركرابێت، هی خۆی نیەو دزراوەو زۆریش بێ ئاگایە، ئەو لە ئەبو ریەی دزیوە[٣] و ئەبو ریەش داویەتیە پاڵ ئبن و قوتەیبەی دینەوەری لە كتێبی(مُخْتَلِفُ الْحَدِيْثِ)، جا نەیزانیوەو بە نەزانی داویەتیە پاڵی و لە كەسێكی تری نەقڵ كردووە بێ ئەوەی گوێبداتە ئەوەی ڕاستە یاخود نا، یان زانیویەتی و ویستویەتی چەواشەكاری بكات چونكە كەسێك كتێبەكەی ئیبن قوتەیبەی خوێندبێتەوە لەسەرەتاوە وتەی پێشەوایانی موعتەزیلە دێنێت و پاشان وەڵامی دەداتەوە، جا ئەم وتەیەش كە دێنێت هی ئیبراهیمی كوڕی سەییاری موعتەزیلیە كە ناسراوە بە(النَّظام)، وتەكەی دێنێت و پاشان وەڵامی ئەداتەوە، نەوەك وتەی پێشەوا ئیبن قوتەیبەبێت، ئەمەش

---

[١] سير أعلام النبلاء للذهبي (١٠/٥٥١)

[٢] بۆ زیاترزانین لەسەر ئەو بابەتانە ئەتوانن بگەڕێنەوە زنجیرە وەڵامی نەیارانی سوننەت.

[٣] أضواء على السنة المحمدية لأبي رية، ص: (١٧٧)!!

گەورەترین خیانەت و نەپاراستنی ئەمانەتی عیلمیە كە لە باوو باپیرانیان(ڕۆژهەڵاتناس)ەكانەوە بۆیان ماوەتەوە[1].

## ئایا ئەبو هورەیرە خیانەتی كرد لە بەحرەین؟

پاشان ئۆززۆن گومانێكی تر دێنێتەوەو دەڵێت: "لەدوای وەفاتی پێغەمبەر(د.خ) عومەر بووە جێنشینی، لە ساڵی ٢٠ ی كۆچیدا، لەدوای مردنی عەلای كوڕی حەزرەمی دەیكاتە والی بەحرەین، هەرزوو عومەر ئەبوهورەیرە لا دەبات و عوسمانی كوڕی ئەبولعاسی سەقەفی دەخاتە شوێنەكەی، هۆی لابردنەكەشی ئەوەبوو، كەوەڵامی لێپرسینەوەی خەلیفە عومەری بەوە دایەوە كە بوەتە خاوەنی بیست هەزار درهەم لە دارایی گشتی بەحرەین لە ڕێگەی بازرگانیەوە نەك گەندەڵی(خەریكی بازرگانی بووم) .

وەڵامی خەلیفە عومەریش بەم جۆرەبوو: ئەی دووژمنی خواو ئیسلام، ئەی دوژمنی خواو قورئان،ماڵی خوات دزیوە!!(كە من تۆم كردە والی بەحرەین جوتێك نەعلیشت نەبوو، دایكۆڵەكەت هەر بۆ شوانی گوێدرێژ هێناویتی)[2].

تەنانەت بە گۆپاڵەكەی لێی دەدەات تاوەكو خوێناویی دەكات، تا عومەر لە ژیاندابوو نەیدەهێشت ئەبوهورەیرە فەرموودە بگێڕێتەوەو پێی گووت: واز لە فەرموودە گێڕانەوە دێنی باشە دەنا ڕەوانەی زەوی مەیمونەكان یان دەوست دەكەمەوە". ع: ٢٠-٢١، ك:٢٧

**دەڵێم**: سوێند بەخوای گەورە لەوكاتەی ئەم چیرۆكەم خوێندەوە گریانم هات بۆ ئەوكەسانەی كە ئەم چیرۆكە تێكدراوەیان خوێندوەتەوەو بڕوایان پێكردووە بەبێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەكەی، ئێستا من چیرۆكەكە وەكو خۆی ئەخەمە بەردەستان:

---

[1] وتەكەی لە لا: (١٦٧-١٦٨) دا نەقڵ ئەكات و پاشان، لە لاپەڕە: ٢٠٢-٢٠٧) وەڵامیان ئەداتەوە، تأویل مختلف الحدیث لابن قتیبة، ت: نور الله شوكت بیكر، مؤسسة الرسالة –بیروت–، ط:١، ١٤٢٩هـ.

[2] لە كتێبی العقد الفرید هاتووە بەبێ سەنەد (٤٤/١)، ط: دار الكتب العلمیة.

(أَنَّ عُمَرَ اسْتَعْمَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ عَلَى البَحْرَيْنِ، فَقَدِمَ بِعَشْرَةِ آلاَفٍ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: اسْتَأْثَرْتَ بِهَذِهِ الأَمْوَالِ يَا عَدُوَّ اللهِ وَعَدُوَّ كِتَابِهِ.

فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقُلْتُ: لَسْتُ بِعَدُوِّ اللهِ وَعَدُوِّ كِتَابِهِ، وَلَكِنِّي عَدُوٌّ مَنْ عَادَاهُمَا.

قَالَ: فَمِنْ أَيْنَ هِيَ لَكَ؟

قُلْتُ: خَيْلٌ نُتِجَتْ، وَغَلَّةُ رَقِيْقٍ لِي، وَأُعْطِيَةٌ تَتَابَعَتْ.

فَنَظَرُوا: فَوَجَدُوْهُ كَمَا قَالَ.

فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ، دَعَاهُ عُمَرُ لِيُوَلِّيَهُ، فَأَبَى)[١].

واتە: عومەر ئەبوهورەیرەی(ﷺ)كردە كاربەدەستی یەمەن، دواتر ئەبوهورەیرە بە دەهەزار درهەمەوە گەڕایەوە و عومەر(ﷺ) پێی وت: ئەم هەموو پارەت وەلا ناوە ئەی دوژمنی خواو قورئان.

ئەبو هورەیرەش(ﷺ) دەڵێت وتم: نە دوژمنی خواو نە دوژمنی قورئانیشم، بەڵكو دوژمنی ئەو كەسەم كە دژیان بێت.

پێی وت: ئەی ئەم سەروەتەت لـە كوێ بوو؟

وتم: ئەسپەكانم زان و بەرووبومی كشتوكاڵم زیادبوو، دیاریشیان تێدایە.

سەیریان كرد بینیان بەو شێوەیە كە وتی.

دوای ئەوە عومەر(ﷺ) داوای لـێكردەوە كە ببێتە كاربەدەست و ئەویش ڕەتی كردەوە.

خوێنەری خۆشەویست بینیت چۆن وتەكەی عومەر كە لـەسەرەتاوە فەرمووی، ئۆزۆن ئەیخاتە كۆتاییەوەو بۆ ئەوەی وای نیشان بدات كە عومەر پۆزشی ئەبوهورەیرەی(ﷺ) قەبوڵ نەكردووەو سەرەڕای زیادە خستنە سەرو لادانی بەشی كۆتایی كە عومەر(ﷺ) داوای لـێ دەكاتەوە ببێتە كاربەدەست و ئەویش ڕەتی دەكاتەوە، باشە ئەگەر كەسێكی

[١] تأريخ الاسلام للذهبي (٢/٥٦٠)، ت: الدكتور بشار عوّاد معروف ،الناشر: دار الغرب الإسلامي ،الطبعة: الأولى، ٢٠٠٣ م، وسير أعلام النبلاء (٢/٦١٢)، ط: مؤسسة الرسالة.

پاك و ڕاستگۆ نەبێت عومەر چۆن داوای لێ دەكاتەوە بۆ جارێكی تریش ببێتەوە كاربەدەست؟!

## پێشەوا عومەر لێی دەدات و رِێگری رِیوایەتی فەرموودەی لێ دەكات!!

دواتر دەڵێت: "تەنانەت بە گۆپاڵەكەی لێی دەدات تاوەكو خوێناویی دەكات "

ئەوەی كە دەڵێ عومەر(رضي الله عنه) لێی داوەو خوێناویی كردوە درۆیەكی ترەو ئۆزۆن نەقڵی ئەكات، لە(العقد الفريد) هاتووە بەبێ سەنەد و ماوەی نێوان خاوەنی ئەو كتێبەو چیرۆكەكە زیاتر لە(٣٠٠) ساڵە، ئیتر ئۆزۆن چۆن بە رِەوای ئەبینێ شتی وا بگێرِێتەوە؟!

هەروەها سەبارەت بەو وتەیەی تریشی كە دەڵێت: " تا عومەر لە ژیاندابوو نەیدەهێشت ئەبوهورەیرە فەرموودە بگێرِێتەوەو پێی گوت: واز لە فەرموودە گێرِانەوە دێنی یاشە دەنا رِەوانەی زەوی مەیمونەكان یان دەوست دەكەمەوە "

خیانەتێكی گەورەی تێدا كردوەو ناوی كەعبی لاداوە چونكە ئەوەی كە ئەو هێناویەتی لە كتێبـی(البداية والنهاية) بەم شێوەیە: (وَقَالَ أَبُو زُرْعَةَ الدِّمَشْقِيُّ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ زُرْعَةَ الرُّعَيْنِيُّ، ثَنَا مَرْوَانُ بْنُ مُحَمَّدٍ، ثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَقُولُ لِأَبِي هُرَيْرَةَ: لَتَتْرُكَنَّ الْحَدِيثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ لَأُلْحِقَنَّكَ بِأَرْضِ دَوْسٍ. وَقَالَ لِكَعْبِ الْأَحْبَارِ: لَتَتْرُكَنَّ الْحَدِيثَ "عَنِ الْأُوَلِ"[1] أَوْ لَأُلْحِقَنَّكَ بِأَرْضِ الْقِرَدَةِ)[2].

واتە: ئەبو زورعەی دیمەشقی وتی: محمدی كورِی زورعەی روعەینی هەواڵی پێداین، مەروانی كورِی سەعیدی كورِی عبدالعزیز هەواڵی پێداین، لە ئیسماعیلی كورِی عبیدالله وە، لە سائیبی كورِی یەزیدەوە وتی: گوێم لە عومەری كورِی خەتتاب بوو بە ئەبو هورەیرەی وت(رضي الله عنه) : واز لە فەرموودە دێنیت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) باشە ئەگینا رِەوانەی زەوی "دەوس"ت دەكەم .

---

[1] ئەم زیادەیە لە چاپەكەی (هجر) نەهاتووە، (١١/٣٧٠).

[2] البداية والنهاية لابن كثير (٨/١١٥)، ط: دار إحياء التراث، ت: علي شيري، الطبعـة: الأولى ١٤٠٨، هــ – ١٩٨٨ م، البداية والنهاية (٨/١٠٦)، عام النشر: ١٤٠٧ هـ – ١٩٨٦ م.

بە كەعبی ئەحباریشی وت: واز لە گێڕانەوە دەهێنیت لە ئومەتانی پێشوو باشە ئەگینا ڕەوانەی زەوی "القردة"[1]ت دەكەم.

لێرەوە سەرەڕای خیانەتی ئۆزۆن كە هەردوكیانی داوەتە پاڵ ئەبو هورەیرە، ئەوەشمان بۆ دەردەكەوێ كە خیانەتێكی تریش لە ئارایەو هاتووە تێكەڵی كردووە

بۆ ئەوەی خوێنەر وا گومان بەرێت كە پێشەوا عومەر(ﷺ) لەبەر ئەم ڕووداوەی بەحرەین و نەبوونی متمانەی ئەبو هورەیرە(ﷺ) ڕێگری كردووە لەوەی فەرموودە بگێڕێتەوە، بەڵام ئەگەر ئۆزۆن توانی ئەمە بسەلمێنێت ئەگەر بە ڕیوایەتێكی زۆر لاوازیش بێت كە ڕێگری لە ڕیوایەت پەیوەندی بە چیرۆكی بەحرەینەوە هەیە و هەر كاتەكەشیان لێكەوە نزیكە، ئەوا خەڵاتێكی ئۆزۆن ئەكەین هێندەی گەورەیی چەواشەو خیانەتەكانی.

ئەوەی كە دەڵێت تا مردنی عومەر ئەبو هورەیرە(ﷺ) نەیوێرا فەرموودە بگێڕێتەوە.

دەڵێم: هیچ بنەمایەكی نییە و بەڵكو لە مزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) فەرموودەی ئەگێڕایەوەو زیاتر لە(٨٠٠) كەس فەرموودەیان لێوەی گێڕاوەتەوە وەكو باسمان كرد، ئۆزۆن ئەم وتەیە ئەداتە پاڵ ئەبو ڕیە و دەڵێت لە كتێبـی(أضواء على السنة المحمدية)دایە، بەڵام دڵنیاتان دەكەمەوە ئەگەر ئەبو ڕیە سەرچاوەیەكی بنووسیایە ئەوا خێرا ئۆزۆن ئەیدزی و ئەو سەرچاوەیەی ئەنووسی لەبری كتێبەكەی ئەبوو ڕیە وەكو لە پێشتر پەردەمان لەسەر هەڵماڵی لە چەند شوێنێكدا، بەڵام ئەبو ڕیە ئاماژەی بەسەرچاوە نەكردووە[2].

جا ئۆزۆن وای وێنا ئەكات كە لەبەر ئەوەی جێی متمانە نەبوو لە بەحرەین بۆیە عومەری فاروق پێی فەرموو فەرموودە مەگێڕەوە، دیارە ئەم شێوازی درۆو هەڵخەڵەتاندنە لە مامۆستاكەی خۆی ئەبو ڕیە فێر بووە، چونكە ئەویش وای وێنا ئەكات كە لەبەر زۆری ڕیوایەتەكانیەتی و دوابەدوای زۆری ڕیوایەتەكانی عومەر(ﷺ) ئەكەوێتە گومانەوەو پێی

---

[1] ناوچەیەكە لە نەجد. الجبال والأمكنة والمياه، للزمخشري، ص: (١٤٤)، دار الفضيلة للنشر والتوزيع – القاهرة، عام النشر: ١٣١٩ هـ. ومعجم البلدان لياقوت الحموي (٣٢٢/٤)، دار صادر، بيروت، الطبعة: الثانية، ١٩٩٥ م.

[2] أضواء على السنة المحمدية، ص:(١٧٤)، دار المعارف، ط: السادسة.

دەڵێت فەرموودە مەگێڕەوە و هەر یەكێكیان و بە شێوەیەك خەریكی تێكدانی ڕاستیەكانن و یەكتریش دەخەنەوە بە درۆوە[1].

عومەری كوڕی خەتتاب(ﷺ) ئەترسا لەوەی خەڵكانێكی تریش وەكو ئەبو هورەیرە بكەن و شتانێك كە نەیانبیستووە و نەبووە بیدەنە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوان لەوە تێنەگەن كە ئەمەی ئەبو هورەیرە دەیكات ئاینەو لە پێغەمبەری خۆشەویستی(ﷺ) بیستووە، ئیتر دەست بكەنە فەرموودە گێڕانەوەو بە كارێكی سادەی بزانن، ئیتر پێشەوا عومەر فەرمانی كرد كە فەرموودە كەم بكەنەوەو و تەنها ڕێگری لەویش نەكردووە بەڵكو ئەبوو موسای ئەشعەری و كەعبی ئەحبار و بێجگە لەمانیش هەر عومەر ئاگاداری كردوون، ئەگینا لەدوای نەمانی ترس ڕێگەی پێداون هەروەكو پێشەوا ئیبن كەسیر و ئیبن حەجەر دەڵێن: (وَقَدْ جَاءَ أَنَّ عُمَرَ أَذِنَ لَهُ)[2].

واتە: ڕیوایەت هاتووە كە عومەر ڕێگەی پێداوە.

پێم خۆشە پێش ئەوەی ئەم باسە تەواو بكەم ئاماژەش بەوە بكەم كە زانای خۆشەویست موعەلیمی یەمانی ئەو چیرۆكەی لەلا لاوازە لەبەر دوو هۆكار:

١ – محمد ی كوڕی زورعەی لەلا نەناسراوە"مجهول" بەڵام ئیبن عەساكر دەفەرموێت جێی متمانەیە .

٢ – دڵنیا نیە لەوەی كە ئیسماعیلی كوڕی عبیدالله لە سائیبی بیستووە یاخود نا، بەڵێ بیستوویەتی.[3]

بۆیە صحیحە و لاواز نیە، وەكو ئەمانەتێكی زانستی كە پێویستە بەیانی بكەین.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو: لا:(١٧٤).

[2] البداية والنهاية لابن كثير (٣٧١/١١)، ط: هجر، الاصابة لابن حجر (٦٩/١) .

[3] الأنوار الكاشفة للمعلمي، ص: (١٥٤)، المطبعة السلفية ومكتبتها / عالم الكتب – بيروت– سنة النشر: ١٤٠٦ هـ / ١٩٨٦ م.

پاشان دەڵێت: " ئەوەتا ئەبو هورەیرە خۆی دەڵێ: تا عومەر نەمرد نەمدەوێرا بڵێم پێغەمبەر(د.خ) وای دەفەرموو"[1]. ع: ٢١، ك: ٢٧

پاشان شتێکی تریش نەقڵ ئەکات و دەڵێت: " ئەیوت: ئەگەر ئەم قسانەی ئێستا بۆ ئێوەی دەکەم ئەگەر لەسەردەمی عومەردا بمکردایە بە گۆپاڵەکەی فەلاقەی دەکردم " ع: ٢١، ك: ٢٧

پێش ئەوەی باسی سەنەدەکەیان بکەم ئەپرسم: توخوا ئەگەر بەو شێوەیەبێت و ئەبوهورەیرە ڕاستگۆ نەبوبێت یاخود شتانێکی هەڵبەستێ، چۆن خۆی ئەم وتانە دەڵێت و خۆی عەیبدار ئەکات؟!، باشە کەسێك وێنەی ئەم وتانە ببیستێت دوایی ئامادەیە شت لە ئەبوهورەیرە(ﷺ) وەرگرێت؟!، وابزانم ئۆزۆن ئەیەوێ بڵێ ڕاویەکان هەموو گێل و گەمژەبوون پەنا بەخوای گەورە!!

ئەم ڕیوایەتەی نەداوەتە پاڵ هیچ کتێبێك بێجگە لەوەی ئەبو ریەی بەستەزمان لەکاتێکدا هیچیان ڕاست و دروست و بێ پەڵە نین.

ریوایەتی یەکەم کەسێك لە زوهری گێڕاوەتەوە کە لاوازەو ناوی ساڵحی کوڕی ئەبی ئەخزەرەو زانایان ئەفەرموون لاوازەو ڕیوایەتی دووەمیش ئیبن عجلان لە ئەبو هورەیرەی ئەگێڕێتەوەو، وەك زانراویشە ئەبو هورەیرەی(ﷺ) نەدیوەو ریوایەتەکە پچڕانی تێدایەو بەمەش وەرناگیرێت[2].

سەبارەت بەوەی کە لەگەڵ کەعبی ئەحبار یەکیان دیوەو زانیاریەکانیان تێکەڵ بووەهەروەکو لە(ع: ٢١، ك: ٢٨) دا هاتووە، ئەوپەڕی بوهتان و درۆیەو هیچ شتێکی وا لە ئارادا نیە، ئەوەشی دەڵێت لە بوسری کوڕی سەعدەوە، ناوی باوکی سەعد نییە و سەعیدە و دەفەرموێت: ئێمە خەڵکیمان ئەدی تێکەڵیان ئەکرد نەوەك ئەبو هورەیرە زانیاریەکانی لەگەڵ کەعب تێکەڵ بوبێت!!،

---

[1] ئاماژەمان بە هەڵەی وەرگێر کرد و وتمان ئەبێ بڵێت: وای فەرموو، خاڵی (٨) لە هەڵەکانی.

[2] الأنوار الكاشفة، ص: (١٥٥).

هەروەكو لە ڕیوایەتەكەدا دیارە: " قَالَ لَنَا بُسْرُ بْنُ سَعِيدٍ: اتَّقُوا اللَّهَ وَتَحَفَّظُوا مِنَ الْحَدِيثِ، فَوَاللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتَنَا نُجَالِسُ أَبَا هُرَيْرَةَ، فَيُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيُحَدِّثُنَا عَنْ كَعْبِ الْأَحْبَارِ، ثُمَّ يَقُومُ فَأَسْمَعُ بَعْضَ مَنْ كَانَ مَعَنَا يَجْعَلُ حَدِيثَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كَعْبٍ، وَحَدِيثَ كَعْبٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"[1].

جا كاتێك خەڵكی تێكەڵیان كردووە تاوانی ئەبو هورەیرە چیە؟!

وەك ئەوە وایە وتاربێژێك بەوپەڕی جوانی و ڕازاوەیی وتارێك ئامادە بكات و پێشكەشی بكات و چەند ئایەتێكی قورئان بهێنێتەوەو پاشان هەندێك شیعریش بێنێت كە پەیوەندی بە بابەتەكەوە هەیەو كەسێكیش لەوێوە بڕوات تێكەڵیان بكات و دوایی وتاربێژ تاوانبار بكرێت!!

بێ ئەدەبی ئۆزۆن گەیشتوەتە ئەو ڕادەیەی كە بڵێ پێشەوا عومەر بە ئەبوهورەیرەی(ﷺ) وتووە : (رجعت بك أميمة إلا لرعاية الحمير).

واتە: ئومەیمە –دایكت– نەیهێناویی مەگەر بۆ شوانی گوێدرێژ نەبێت .

ئەم چیرۆكە سەرەڕای ئەوەی سەنەدی نیەو پشتی پێ نابەسترێتو ئەتوانن خۆتان بگەڕێنەوە بۆ(العقد الفريد) و ببینن كە چی شتی خراپ و نەشیاوی تێدایە، چونكە كتێبی مێژوو هەروایە ئەگەر بێ سەنەد بوو، پاشان لێرەش دیسانەوە تیایەتی كە عومەری كوڕی خەتتاب ئەزانێ ئەبو هورەیرە لەسەر حەق بوەو داوای لێ ئەكات پۆستێك وەرگرێت و ئەویش ڕازی نابێت[2]، بەڵام ئۆزۆن نەیبینیوە!!

دیسانەوە ئەوەی كە زۆر ئازار بەخشە ئۆزۆن(ما رجعت بك أميمة)ی بە ئارەزووی خۆی لێك داوەتەوەو وشەیەكی زۆر نەشیاوی هێناوەو دەڵێت: (ما تغوطت بك أمك)، واتە: دایكت وەكو پیسایی(پاشەڕۆ) هێناویتی. ع: ه(١١)، لا: ٢٩، ك: پ(١٤) لا:٢٧

[1] البداية والنهاية (٣٧٧/١١)، ط: هجر، سير أعلام النبلاء، (٦٠٦/٢)، ط: مؤسسة الرسالة.

[2] العقد الفريد لابن عبد ربه (٤٥/١)، دار الكتب العلمية – بيروت –، الطبعة: الأولى، ١٤٠٤ هـ.

من لێرەوە تەحەددای نووسەر و وەرگێڕو ئەوكەسەشی پێیدا چوەتەوە ئەكەم ئەگەر توانیان بیسەلمێنن كە لە زمانی عەرەبیدا جێی ئەبێتەوە ئەوا دیاریەكیان ئەدەمێ هێندەی ناشرینی وتەكەیان گەورەبێت!!

پاشان ئۆزۆن دوای ئەو هەموو چەواشەو خیانەتە شەرم ناكات و ڕوو دەكاتە ئیمامی بوخاری و دەڵێت: "بەوەندە كۆتایی بە باسی ئەبو هورەیرە دێنم و دەپرسم: ئایا پێش ئێمە ئەم زانیاریانە نەگەیشتوون بە ئیمامی بوخاری ئەی چۆن ئەو هەموو فەرموودەی ئەوی لە كتێبەكەیدا هێناوە". ع: ۲۱، ك: ۲۸

دەڵێم نەخێر ئۆزۆن گیان چونكە لەسەردەمی ئەبو هورەیرە(ﷺ) تاوەكو پێشەوا بوخاری(ﷺ) خەڵكی هێندە زۆر نەبوون ڕاستیەكان بشێوێنن، خەڵكی هەبوون درۆیان دەكرد بەڵام هەموو ژیانیان درۆ نەبوو!!

لەسەردەمی ئەودا هێندە درۆو بوهتان بۆ هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە(ﷺ) نەكرابوو!!

هەروەها لەحاڵەتێكدا ئەگەر كرابێت پێشەوا بوخاری هێندە گێل نەبووە كە بە هەموو وتەیەك بڕوا بكات و بەدواداچوونی بۆ نەكات، نەوەك وتەیەك كە ئەبو جەهل و ئەبو لەهەب كردبێتیان لەسەر ئەبو هورەیرە بڕوای پێ بكات و بیكاتە بەڵگەو ئەو هاوەڵە شیرینەی پێ لەكەدار بكات!

ئێستا ئێمە مافی خۆمانە بپرسین: ئایا ئۆزۆن لەم كتێبەی ئەمین بوو؟!

ئایا ئۆزۆن مەبەستی خوای گەورەو قیامەتە لەو هەموو درۆیە؟!

ئایا ئۆزۆن دڵسۆزی هاوەڵان و ئاین و فەرموودەیە بەو هەموو چەواشەیە؟!

## بوهتانەكانی ئۆزۆن بۆ دایكی ئیمانداران عائشە(ﷺ)

سنووری بێ ئەدەبیەكانی ئۆزۆن زۆر زیاترە لەوەی تۆ بیرت لێی كردوەتەوە، نەك ئەبو هورەیرە(ﷺ) بەڵكو دایكی ئیمانداران(ﷺ) و خێزانی پێغەمبەر یش(ﷺ)كەوتوەتە بەر هێرشی تانەو تەشەر و بوهتانی ئۆزۆن، لەكاتێكدا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ ﴾الأحزاب: ٦

واته: پێغەمبەر(ﷺ)لە پێشترە بۆ ئیماندارەكان تەنانەت لە نەفسی خۆشیان و خێزانەكانیشی دایكانی ئەوانن.

من دەلێم دایكی ئۆزۆن كە حەدی نییە لەگەڵ دایكی هەموومان بە نیوەی دایكی ئیمانداران عائشە(رضي الله عنها) بێت، بەڵام ئەگەر ئۆزۆن ڕاست دەكات و ئایەتەكانی قورئانی قەبوڵەو عائشە بە دایكی خۆی دەزانێت بۆ نایەت نیو هێندە بەدایكی خۆی بلێیت؟!

ئەوەشی كە جێی داخە ئۆزۆن، دەڵێت هاوەڵی بەڕێز، خاتوو عائشە(رضي الله عنها) ، زانا بەڕێزەكان...بەڵام هەر جارەو دانەیكیان بۆ ئاگر ئەنێرێ و بە دووڕوو لەقەڵەمیان ئەداو، سورەتی تەوبە بۆ فەزحكردنی ئەوان هاتوەو...

ئایا ئەم دوو وتەیە پێك دێنەوە، یان ئۆزۆن ئەیەوێ بەم شێوە فێڵاویە ژەهری خۆی برێژێت و فیكری نابووتی بڵاوبكاتەوە؟!

لەو وتە ناشرینانەی ویستویەتی دایكمانی پێ ناشرین بكات:

١ – "ژیانی عائیشە پڕیەتی لە ململانێ لەگەڵ بەرامبەرەكانیدا" ع: ٢١، ك: ٢٩

بۆ ئەم مەبەستەش هەندێك بابەتی غیرەكردن دێنێتەوە كە هەیبووە بەرامبەر خێزانەكانی تری پێغەمبەر (ﷺ).

ئەم وتەیە زۆر منداڵانەیەو یەكێك نەزانێ دایكی ئیمانداران هەمیشە لە شەڕو ناكۆكی و جوێن و ئەو بابەتانەدابووە و ئەتوانم بلێم یەكێكە لە هەرە بەڵگە لاوازەكانی ئەم كتێبە چونكە هەموو مرۆڤێكی خاوەن عەقڵ و ژیریی ئەزانێت كە بابەتی غیرە لەلای ئافرەتان شتێكی زۆر سادەیەو هەموو ئافرەتێك ئەوەی هەیەو ناتوانێت لێی دەربازبێت.

بەڵام من ئەمەوێ سەرنجی ئێوەی خۆشەویست بۆ ئەوە ڕابكێشم: ئۆزۆن داوا لە ئێمە ئەكات كە هاوەڵان بە معصوم دانەنێین و ئەوان مرۆڤن و هەڵە دەكەن، بەڵام وا ئێستا خۆی لێپێچینەوە لە دایكی ئیمانداران دەكات كە بۆچی غیرەی هەبووە!!

ململانێی نێوان عائشەو عوسمانو كافركردنی عوسمان لەلایەن عائشەوە!

پاشان ئۆزۆن چیرۆكێكی پڕوپووچ و هەڵبەستراو دێنێ و ئەیەوێ وا نیشان بدات كە دایكی ئیمانداران و دووژمنی دووڕوان عائشەی(رضي الله عنها) پێ ناشرین بكات و دەڵێت لەدوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ عوسمان(رضي الله عنه) ناكۆكبوون و تیایدا هاتووە كە

هەندێك لە خەڵكی كوفە دێنە مەدینەو لای عائشە(رضي الله عنها) داڵدە دەدرێن، و دواتر عوسمان دەڵێت: فاسق و بەرەڵاكانی كوفە شوێنێكیان دەست نەكەوت بێجگە لە ماڵی عائشە(رضي الله عنها) ، دوای ئەوەی كە عائشە(رضي الله عنها) ئەمە ئەبیستێ نەعلەكانی پێغەمبەر(ﷺ) بەرز دەكاتەوە بە ڕووی عوسمانداو(رضي الله عنه) پێی دەڵێت: تۆ لە سوننەتی خاوەنی ئەم نەعلە بەریت.

لەپاش دەنگەدەنگ خەڵكەكە بەرەو مزگەوت دێن و هەندێكیان دەڵێت كارێكی باشت كرد و هەندێكیش دەڵێت ئەمە كەی كاری ژنە و ئیتر ئەبێتە شەرە بەرد و شەرە نەعل. ع: ٢٢، ك: ٣٠

دەقی چیرۆكەكە لە كتێبی "الأغاني"دا هاتووە بەم شێوەیە": (أخبرنا أَحْمَدُ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَرُ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْمَدَائِنِيُّ، عَنِ الْوَقَّاصِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: " خَرَجَ رَهْطٌ مِنْ أَهْلِ الْكُوفَةِ إِلَى عُثْمَانَ فِي أَمْرِ الْوَلِيدِ، فَقَالَ: أَكُلَّمَا غَضِبَ رَجُلٌ مِنْكُمْ عَلَى أَمِيرِهِ رَمَاهُ بِالْبَاطِلِ، لَئِنْ أَصْبَحْتُ لَكُمْ لَأُنَكِّلَنَّ بِكُمْ، فَاسْتَجَارُوا بِعائشة((رضي الله عنها)) وَأَصْبَحَ عُثْمَانُ، فَسَمِعَ مِنْ حُجْرَتِهَا صَوْتًا وَكَلامًا فِيهِ بَعْضُ الْغِلْظَةِ، فَقَالَ: أَمَا يَجِدُ مُرَّاقُ أَهْلِ الْعِرَاقِ وَفُسَّاقُهُمْ مَلْجَأً إِلا بَيْتَ عائشة((رضي الله عنها))، فسمعت فَرَفَعَتْ نَعْلَ رَسُولِ اللَّهِ وَقَالَتْ: تَرَكْتَ سُنَّةَ رَسُولِ اللَّهِ صَاحِبِ هَذِهِ النَّعْلِ، فَتَسَامَعَ النَّاسُ، فَجَاءُوا حَتَّى مَلَئُوا الْمَسْجِدَ، فَمِنْ قَائِلٍ: أَحْسَنَتْ، وَمِنْ قَائِلٍ: مَا لِلنِّسَاءِ وَلِهَذَا حَتَّى تَحَاصَبُوا وَتَضَارَبُوا بِالنِّعَالِ).

ئەم چیرۆكە هۆكارگەلێكی تیایە ئەبێتە هۆی بەلاوەنان و كارپێنەكردنی، لەوانە:

١ – ئەبولفەرەجی ئەسفەهانی، باسمانكرد كە چ كەسێكی درۆزن و خورافیەو كتێبەكەشی بۆ بابەتی زانستی پشتی پێ نابەسترێ و خۆی ئەم چیرۆكەی گێڕاوەتەوە.

٢ – ئەو(ئەحمەد ناوەی كە هەواڵی داوە بە ئەبولفەرەج و بۆی گێڕاوەتەوە كە بە حساب مامۆستایەتی و لە زۆر شوێنی تریش ناوی ئەبات، كەسێكی دیار نیەو نەناسراوەو نازانرێ كێیە.

٣ – وەقاصی كە ئەكاتە عوسمانی كوری عبدالرحمن، زانایان زۆریان لە بارەوە فەرمووە كە كەسێكی زۆر لاوازەو ڕیوایەتەكانی هیچ نین لەوانەش:

پێشەوا بوخاری دەفەرموێت: فەرموودەیان لێی وەرنەگرتووە[١]، وئبن حیببان دەفەرموێت: كەسێكی هیچە[٢]، ئەبو حاتەمی ڕازی دەفەرموێت: فەرموودەیان لێ وەرنەگرتوەو كەسێكی زۆر درۆزن بووە[٣]، ئیبن مەعین دەفەرموێت: فەرموودەكانی نانووسرێتەوە چونكە درۆی ئەكرد[٤]، عەلی مەدینی دەفەرموێت: زۆر لاوازە[٥]، ئەبوداود دەفەرموێت: هیچ نیە[٦]، لەگەڵ چەندین زانای تر كە لەسەری قسەیان كردووە.

٤ – ڕیوایەتەكەش مورسەلەو زوهری خۆی ئەو چیرۆكەی نەدیوەو نەشیوتووە لە كێی بیستووە لە هاوەڵان.

كارەساتەكانی ئەم چیرۆكە هەڵبەستراو و درۆیە:

---

[١] التأريخ الكبير للبخاري (٢٣٨/٦)، دائرة المعارف العثمانية، حيدر آباد – الدكن، طبع تحت مراقبة: محمد عبد المعيد خان.

[٢] المجروحين لابن حبان (٣٩٨/١) برقم: (١٠٢٧)، ت: حمدي السلفي، دار الصميعي للنشر والتوزيع، الرياض الطبعة: الأولى، ١٤١٥ هـ.

[٣] الجرح والتعديل لأبي حاتم الرازي (١٥٧/١)، طبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية – بحيدر آباد، الدكن – الهند–، دار إحياء التراث العربي – بيروت – الطبعة: الأولى، ١٢٧١ هـ.

[٤] تهذيب الكمال للمزي (٤٢٦/١٩)، ت:د. بشار عواد معروف، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت–، الطبعة: الأولى، ١٤٠٠ – ١٩٨٠.

[٥] تهذيب الكمال للمزي (٤٢٦/١٩)

[٦] تهذيب الكمال للمزي (٤٢٧/١٩)

١ – سەرەڕای ئەوەی تەواوی چیرۆکەکە ئەوەی تیایە کە عوسمان(رضي الله عنه) و عائشە(رضي الله عنها) ناکۆك بوون و نێوانیان باش نەبووە، لەکاتێکدا بە متەواتری لە مێژوو هاتووە کە یەکەم کەس داوای خوێنی عوسمانی ئەکرد عاشەبوو.

٢ – چۆن پێشەوا عوسمان(رضي الله عنه) بەخەڵکانێك دەڵێت فاسق و بەرەڵا کە بۆ شەکوای حاڵی خۆیان هاتوون؟

٣ – تۆمەتێکی گەورەی تیایە بۆ پێشەوا عوسمان(رضي الله عنه) و ئەویش پەکخستنی حوکم و یاسای خوای گەورە بەسەر خزمەکانیدا .

٤ – ئۆزۆن بە پچڕاویی هێناویەتی بۆ ئەوەی خەڵکی شتێك لە دڵیا بچینێتەوە بەرامبەر دایکمان عائشە(رضي الله عنها) و بلێ: ئەم خەڵکە فاسق و بەرەڵا چییان ئەکرد لەوێ؟!

٥ – باشە دایکمان عائشە(رضي الله عنها) شتێکی تری دەست نەکەوت بەرزی بکاتەوە جگە لە نەعلەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

ئۆزۆن بەلایەوە گرنگ نییە کە چیرۆکەکە ئەو هەموو هۆکارەی تێدایە کە وەرنەگیرێت، چونکە ئەو بەڵگەی پێ نیەو بەدوای لاوازترین بەڵگەش ئەگەڕێت کە بابەتە بێ سەرچاوەکەی سەرچاوەدار بکات.

ئەی بەدبەختی بۆ کەسێك متمانەت پێ ئەکات ئۆزۆن، نەگبەتی بۆ ئەو کەسەشی لەدوای ئەم چیرۆکەوە ئیتر هیچ ئەرزشێك بۆ کتێبەکەت دائەنێ!!

پاش ئەم درۆیە درۆیەکی گەورەتر لەو نەقڵ ئەکات و دەڵێت: " یەکەم کەسبووە کە ناتۆرەی "نەعسەل" بە عوسمان دەڵێت –نەعسەل جوولەکەیەك بوو لە عوسمان دەچوو، تەنانەت عائشە دەڵێت: ئەو نەعسەلە بکوژن چونکە بێباوەڕ بووە" ع: ٢٢، ك: ٣٠

زۆر ئاسانە بۆ کەسێك ئەگەر درۆیەکی کرد چەندین درۆی تریش بکات بۆ پتەوکردنی درۆی پێشووی و لاشت سەیر نەبێت کە شتێکی وا هەبوو.

جا ئۆزۆنیش ئەمە یەکەم درۆی نیەو کۆتا درۆش نابێت، چونکە ئەو دڵی پڕ لە غەم و مەراقە دەرهەق بە هاوەڵان خوایان لێ ڕازیبێت.

ئەم وتەیەش كە دەڵێت: ئەو یەكەم كەسبووە بە عوسمان بڵێت نەعسەل بێ بنەماو بێ بەڵگەیەو ئەگەر ئۆزۆن بەڵگەیەكی هەبوایە بەدڵنیاییەوە باسی ئەكرد، بەلاٌم وەك سیفەتی هەمیشەیی خۆی چەند بابەتێك باس ئەكات و لە كۆتاییدا پەراوێزێك دائەنێت و تەنها سەرچاوەیە بۆ یەك بابەتیان!!

نازانم ئۆزۆن چۆن هێندە دڵنیایە كە عائشە(ﷺ) یەكەم كەس بووە وای بە عوسمان وتووە، تەنانەت كەسێك خۆشی بەچاوی خۆی بینیبێتی هێندەی ئۆزۆن دڵنیا نیە!!

چیرۆكی بانگەشەكردن بۆ كوشتنی ئیمامی عوسمان و حەلاٌڵكردنی خوێنی و فەتوای تەكفیركردنی تەنها لەلای كەسێك ڕەواجی هەیە كە نازانێت هەواڵی ڕاست و ناڕاست لێك جیاكاتەوە.

ئەم چیرۆكە بەم شێوەی خوارەوە هاتووە لەلای پێشەوا تەبەری: (كَتَبَ إِلَيَّ عَلِيُّ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ الْحَسَنِ الْعِجْلِيُّ أَنَّ الْحُسَيْنَ بْنَ نَصْرٍ الْعَطَّارَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي نَصْرُ بْنُ مُزَاحِمٍ الْعَطَّارُ، قَالَ: حَدَّثَنَا سَيْفِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ نُوَيْرَةَ وَطَلْحَةَ بْنِ الأَعْلَمِ الْحَنَفِيِّ قَالَ: وَحَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَمَّنْ أَدْرَكَ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، إِنَّ عائشة((ﷺ)) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا لَمَّا انْتَهَتْ إِلَى سَرِفَ رَاجِعَةً فِي طَرِيقِهَا الى مكة، لقيها عبد بن أُمِّ كِلابٍ- وَهُوَ عَبْدُ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، يُنْسَبُ إِلَى أُمِّهِ- فَقَالَتْ لَهُ: مَهْيَمْ؟ قَالَ: قَتَلُوا عُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَمَكَثُوا ثَمَانِيًا، قَالَتْ: ثُمَّ صَنَعُوا مَاذَا؟ قَالَ: أَخَذَهَا أَهْلُ الْمَدِينَةِ بِالاجْتِمَاعِ، فَجَازَتْ بِهِمُ الأُمُورُ إِلَى خَيْرِ مُجَازٍ، اجْتَمَعُوا عَلَى عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ فَقَالَتْ: وَاللَّهِ لَيْتَ أَنَّ هَذِهِ انْطَبَقَتْ عَلَى هَذِهِ إِنْ تَمَّ الأَمْرُ لِصَاحِبِكَ! رُدُّونِي رُدُّونِي، فَانْصَرَفَتْ إِلَى مَكَّةَ وَهِيَ تَقُولُ: قُتِلَ وَاللَّهِ عُثْمَانُ مَظْلُومًا، وَاللَّهِ لأَطْلُبَنَّ بِدَمِهِ، فَقَالَ لَهَا ابْنُ أُمِّ كِلابٍ: ولِمَ؟ فو الله إِنَّ أَوَّلَ مَنْ أَمَالَ حَرْفَهُ لأَنْتِ! وَلَقَدْ كُنْتِ تَقُولِينَ: اقْتُلُوا نَعْثَلا فَقَدْ كَفَرَ)[1].

ئەم چیرۆكە چەند هۆكارێكی تیایە بۆ ڕەتكردنەوەی:

---

[1] تأريخ الطبري (٤/٤٥٩)، الناشر: دار التراث – بيروت –، الطبعة: الثانية – ١٣٨٧ هـ. والكامل لابن الأثير (٢/٥٧٠)، تحقيق: عمر عبد السلام تدمري، الناشر: دار الكتاب العربي، بيروت – لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤١٧هـ / ١٩٩٧م.

١ – لە سەنەدەكەی نەصری كوڕی موزاحیم هەیە، كە ئەبوحاتەمی رازی دەفەرموێت فەرموودەكانی لاوازن و نانووسرێنەوە[١]، ئەبوخەیسەمە دەفەرموێت: زۆر درۆزن بووە، ئیبن مەعین دەفەرموێت: هیچ نەبووە، جەوزەجانی دەفەرموێت: لە حەق لایداوە و خەتیبی بەغدادی لە ڕاڤەی وتەكەی جەوزەجانی دەفەرموێت: واتە شیعەی رافیزە بووە، عوقەیلی دەفەرموێت: فەرموودەكانی تێكەڵ و پێكەڵن، ئەزدی دەفەرموێت: زۆر زیادڕەو بووە لە مەزهەبەكەی(مەزهەبی شیعە)، فەرموودەكانیشی سوپاسكراو نین، دارەقوتنی دەفەرموێت: لاوازبووە، زەهەبی دەفەرموێت: تۆمەتباركراوە. و بێجگە لەمانیش زانایانی تریش قسەیان لەبارەوە كردووە[٢].

٢ – سەیفی كوڕی عومەری "الضبي" ئیبن ئەبی حاتەم دەفەرموێت: فەرموودەكانی لاوازن[٣]، ئیبن حیبان دەفەرموێت: شتی هەڵبەستراو ئەداتە پاڵ كەسی متمانە پێكراو[٤]، ئیبن عەدی دەفەرموێت: لاوازە[٥]، بێجگە لەمانیش زانایانی دی قسەیان لەسەر كردوەو بە لاوازیان داناوە[٦]

٣– محمد ی كوڕی نوەیرەی تێدایە كە نەناسراوەو نازانرێ كێیە.

---

[١] الجرح والتعديل لابن أبي حاتم الرازي (٨/٤٦٨).

[٢] التكميل لابن كثير (١/٣٥٤)، ت: د. شادي بن محمد بن سالم آل نعمان، الناشر: مركز النعمان، اليمن ،الطبعة: الأولى، ١٤٣٢ هـ.، و الجرح والتعديل لابن أبي حاتم الرازي (٨/٤٦٨).وميزان الاعتدال للذهبي (٤/٣٣)، ت: علي محمد البجاوي ، الناشر: دار المعرفة للطباعة والنشر، بيروت – لبنان –، الطبعة: الأولى، ١٣٨٢ ه. لسان الميزان لابن حجر (٦/١٥٧)، دائرة المعرف النظامية – الهند، الناشر: مؤسسة الأعلمي للمطبوعات بيروت – لبنان –، الطبعة: الثانية، ١٣٩٠هـ.

[٣] الجرح والتعديل لابن أبي حاتم (٤/٢٧٨).

[٤] المجروحين لابن حبان (١/٣٤٥)، برقم: (٤٤٢).

[٥] الكامل في ضعفاء الرجال لابن عدي (٤/٥٠٧)، عادل أحمد عبد الموجود–علي محمد معوضشارك في تحقيقه: عبد الفتاح أبو سنة، الناشر: الكتب العلمية – بيروت–لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤١٨ه

[٦] تهذيب الكمال للمزي (١٢/٣٢٦–٣٢٧)، ط: مؤسسة الرسالة.

٤ – عومەری كوڕی سەعد ی ئەسدی، ئیبن ئەبی حاتم دەفەرموێت: فەرموودەكانی وەرناگیرێت و شیعەبووە[١].

٥ – پچڕان لەسەنەدەكەدا هەیە وەكو ئەبینن كە ئەسدی كوڕی عبدالله هەواڵەكە ئەداتە پاڵ خەڵكانێك لە ئەهلی عیلم و ئەوانیش بۆ لای عائشە(رضي الله عنها)!!

باشە ئەو خەڵكانە لە ئەهلی عیلم كێن و بۆچی ناویان نەهاتووە؟!

ئێستا خوێنەری بەڕێز وا حەقیقەتی ئەم چیرۆكەش ئاشكرابوو بۆت و ئێستا كاتی ئەوەیە كە كتێبەكەی ئۆزۆن هەڵسەنگێنیت و بزانیت چۆن گەڕاوە لە هەر شوێنێك شتێكی دەستكەوێت كە هاوەڵانی پێ ناشرین بكات هێناویەتی و گوێی بەوە نەداوە ڕاستە یاخود درۆ، چونكە ئەو ئامانجێكی هەیەو ئەیەوێ بەهەر نرخێك بێت ئەو ئامانجە بێتە دی و گوێی بە هیچ شتێك نەداوە لە پێناویدا!!

[١] الجرح والتعديل لابن أبي حاتم (١١٢/٦)، برقم: (٥٩٥).

## بۆچی جەنازەكەی عوسمان چۆڵ بوو؟!

پاشان ئۆزۆن ئەیەوێ گومانێكی تر دروست بكات و بڵێ كێشە هەبووە لە نێوان عائشە(رضي الله عنها) و عوسماندا(رضي الله عنه) بۆیە كاتێك شەهید ئەكرێ تەنها خەڵكێكی كەم لەسەر جەنازەكەیەتی(ع: ٢٢، ك: ٣١)

ئۆزۆن نایەوێ دان بەو ڕاستیەدا بنێت كە كەسە پشێوەكان لە جوولەكەو مونافیقەكان و ئەو كەسە دڵنەخۆشانەی تریش كە حەزیان بە مانگی درەوشاوەی ئیسلام نەدەكرد، پێكەوە هەموو كۆ بوونەوەو گەمارۆی ماڵی ئەو هاوەڵە بەڕێزەیان دا كە فریشتەكان شەرمیان لێی دەكرد، ئەو هاوەڵە بەڕێزەی كە چەندین جار لە ژیانی خۆیدا بەهەشتی كڕیبوو ...

بەڵێ بە چەكەوە هاتن و ماڵەكەیان تەنیبوو لە گشت لایەكەوەو ئەویش حەزی بەوە نەبوو كە لەشاری پێغەمبەری خوادا(ﷺ) خوێن بڕژێت و دڵی مونافیقان و دوژمنانی ئەم دینە خۆشبێت.

بۆیە بە ئیماندارانی فەرموو چەكەكانیان دابنێن و شەڕ نەكەن، ئەوانیش ئەم هەلەیان قۆستەوەو ئەمیری ئیماندارانیان شەهید كرد و دەستیان گرت بەسەر مەدینەداو ئەوەندەی توانیان پشێویی و كاولكاریان كرد.

باشە پێم نالێی لە بارو زروفێكی وادا كە تەرمی پێشەوای بڕواداران لەدەستی ئەو گورگە برسیانەدایەو هێزو تواناش لەلایانە ئایا بە چ عەقڵ و لۆژیكێك داوای هەزاران كەس دەكرێت لەسەر جەنازەكەی كۆ ببنەوە؟!

پاشان ئۆزۆن دەڵێت عائشە(رضي الله عنها) داوای كوشتنی عوسمانی(رضي الله عنه) كرد و دواییش داوای خوێنەكەی دەكرد هەر بۆیە(ابن أم كلاب) ئەم شیعرەی وتووە لەسەری:

فَمِنْـــكِ الْبَـــدَاءُ وَمِنْـــكِ الْغِيَـــرْ    وَمِنْـــكِ الرِّيَـــاحُ وَمِنْـــكِ الْمَطَـــرْ
وَأَنْـــتِ أَمَـــرْتِ بِقَتْـــلِ الإِمَـــامِ    وَقُلْـــتِ لَنَـــا إِنَّـــهُ قَـــدْ كَفَـــرْ

واته:

لەتۆیـــــە دەســــــتپێك لــــــە تۆیــــە غـــــیرە
لەتۆیــــــە بـــــاو هــــــەر لـــــە تــــــۆش بـــــۆران
هـــــەر تـــــۆ دات برِیــــار بــــە كوشــــتنی ئیمـــام
وتــــــت كەوتوەتــــــە نــــــاو جەرگــــــەی كــــــوفران

سەرەرای ئەوەی باسمان كرد كە لە درۆیەك زیاتر نییە داوای كوشتنی عوسمان لەلایەن عائشەوە(ﭭ) خوای گەورە لە هەردووكیان ڕازیبێت و دوژمنەكانیشیان خەجاڵەت بكات.

ئەم چەند بەیتە شیعرەش هەر لەگەڵ چیرۆكی نەعسەلەكەدایەو بە یەك سەنەد هاتوون و لە درۆیەك زیاتر نیەو دوای ئەوە ئەگەر ئەو شیعرەش هەبێت پێمان ناڵێ كێیە لەسەر عائشە(ﭭ) دەنووسێت لەناو زیاتری نیەو كەس نازانێت كێیە، دەكرێت هەركەسێك هات و لەسەر كەسێك چەند بەیتە شیعرێكی نووسی ئیتر ئەو كەسە خراپ بێت؟!

جا منیش بەهەمان وەزن و قافیە كە لە "بەحری موتەقاریب"ە ئەم دوو بەیتە شیعرە دەڵێم لە داشۆرینی "ئۆزۆن" هیوام وایە دڵی نەیەشێت چونكە تەنها بەیانی حاڵیەتی نەك زیاتر:

فَمِنْــكَ الجَهَالَـــةُ أَنْـــتَ الهَـــدَرْ      وَمِنْــكَ الشَّـنَاعَةُ أَنْــتَ العُجَــرْ
وَ أَنْــتَ أَتَيْــتَ بِقَــولٍ عَظِـيْمٍ      وَقُلْــتَ بِــأنَّ الأَمِــيْنَ فَجَــرْ

واته:

لەتۆیــــــە جــــــەهل و هــــــەرتۆی زمــــان پــــیس
لەتۆیـــــــە خــــــواری و ئــــــەتۆی زۆر نــــــەگریس
هــــەر ئــــەتۆی هــــاتووی بـــە گفتـــی گـــەورەت
وتـــــــت ئەمینـــــــدار ئـــــــەیكا خیانـــــــەت

هەرچەندەئەو دوو بەیتەی كە ئۆزۆن هێنای لە"تأريخ الطبري"دا هاتووەو دوابە دوای ڕووداوی(اقْتُلُوا نَعْثَلا فَقَدْ كَفَرَ) بەلاٌم ئۆزۆن ئەیداتە پاڵ كتێبی(الامامة والسياسة) كە درواتە پاڵ ئیبن قوتەیبەو ئەو كتێبە هی ئەو نییە وەكو باسمان كرد.

ئەمەش ئەوە دەردەخات ئۆزۆن تەنها لە شوێنێكی تری وەرگرتووەو نەچوەتەوە سەر سەرچاوە سەرەكیەكە و ئەگینا لەبری ئەوەی بیداتە پاڵ ئەم كتێبە هەڵبەستراوە دەیدایە پاڵ تەبەری و تەبەریش ناسراوترە بۆ مێژوو تاوەكو ئیبن قوتەیبە!!

دوای ئەو هەموو بوهتان و درۆیە ناوەستێ و دیسانەوە هەر درێژە ئەدات بە یاریكردن بە عەقڵی ئەو كەسانەی كە بڕوای پێ دەكەنو قسەكانی بەڕاست دەزانن، دەڵێت:

"دواتر عائشە لەشەڕی جەمەلی بەناوبانگا، دژ بە خەلیفە عەلی دەجەنگێ .

لەوانەیە جوانترین وشەو ڕستە لەوبارەیەوە ئەو دەربڕینەبێت كە لە كتێبی(العقد الفريد)داهاتووە: كاتێك ئوم ئەوفای عەبدی لەدوای ڕووداوەكە دەچێت بۆ لای عائشەو پێی دەڵێت: ئەی دایكی ئیمانداران گەر ژنێك كوڕی بچووكی خۆی بكوژێت حوكمی چیە؟!

عائشە دەڵێت: دەچێتە دۆزەخ.

ئافرەتەكەش دەڵێ: ئەی حوكمی ئەو ئافرەتە چیە كە لەیەك ئاقاردا بیست هەزار لە ڕۆڵە گەورەكانی خۆی دەكوژێت.

عائشەش دەڵێ: دەستی ئەو دوژمنی خوایە بگرن و بیكەنە دەرەوە. "ع: ٢٣، ك: ٣١

دەڵێم: ئەم وتەیەی ئۆزۆن سەرەڕای تۆمەتباركردنی دایكی ئیمانداران بەوەی هۆكاری شەڕی جەمەل بووە، كە ئەمە وتەیەكی زۆر نابوتەو تەنها ئەمە بەسە بۆ ناشرینكردنی ئۆزۆن، چونكە ڕۆڵی دایكە عائشە(رضي الله عنها) لە چاكسازێك زیاتر نەبوەو ئەو هەرگیز حەزی بەخوێن ڕشتن نەبوەو بەڵكو ئەو داوای خوێنی عوسمانی(رضي الله عنه) ئەكرد و لەتاو كوشتنی ناحەقی پێشەوای ئیمانداران هاتبوە دەرەوەو ئۆزۆنیش وا تاوانباری ئەكات!!

دایكە عائشە(رضي الله عنها) هێشتا هێندە سووربووە لە وەرگرتنی تۆڵە لە بكوژانی پێشەوا عوسمان.

ئۆزۆن بوهتانی پێ ئەكات و وەسفی ئەكات بەوەی ڕقی لە عوسمان(رضي الله عنه) بووە، ئەی ئەگەر بێت و لەماڵەكەی خۆی دانیشتباو بێدەنگبوایەو داوای خوێنەكەی نەكردایە؟!

بە دڵنیاییەوە ئەوكات سەدان ئۆزۆنی ترمان لێ ڕاست دەبویەوەو ئەیانوت ئەگەر پێی خۆش نەبووە شەهید بووە بۆچی داوای خوێنەكەی نەكردووە، لە كاتێكدا ئەو دایكی ئیماندارانبوو گوێی بۆ دەگیرا!

ئەم چیرۆكە لە(العقد الفريد)دا هاتوەو هیچ بنەوایەكی نیەو تەنها لە كتێبەكانی نوكتەدا هەن و هەموویان بێ سەنەدن و ئەگەر ئۆزۆنیش دەڵێت وانیە بابێتە مەیدانی حوججەو بەڵگەوەو قسە بكات یان وەرگێڕ یان ئەو كەسەی پێیدا چووەتەوە.

پاشان ژمارەی كوژراوانی شەڕی جەمەل نەچوەتە سەد كەسیش بە گوێرەی ریوایەتی ڕاست و دروست هەروەكو خەلیفە خەیات دەڵێت، ماوەی شەڕەكەش ڕۆژێك بوەو هەرگیز لە شەڕێكدا لەو سەردەمەدا كە چەكی پێشكەوتوو نەبوە ناگاتە ئەو ڕێژەیەی كە نووسەر هێناویەتی و لەكاتێكدا هەموو بۆ سوڵح و سازان هاتبوون و كەس نیازی شەڕی نەبوو، بێجگە لە كۆمەڵێك دەسی مردوو كە هەر زوو لەناوبران و شەڕەكەش وەستێنرا.

دایە عائشەش ئەوپەڕی ڕێزی لێگیرا لەلایەن پێشەوا عەلیەوەو كەسێك وتی دایكێكی خراپی پێشەوا عەلی یش لەوەڵامدا پێی فەرموو:

(وَكَذَبَ وَاللَّهِ، إِنَّكِ لأَبَرُّ أُمّ نَعْلَمُ)[1]. واتە: درۆی كرد سوێند بەخوا تۆ باشترین دایكی!!

بەڵام بڵێم چی كاتێك ئۆزۆن و هاو وێنەكانی ئۆزۆن كوێرن بەرامبەر ئەم وتانە؟!

پاشان باسی تەوبەكردنی دایە عائشە(رضي الله عنها) ئەكات و دەڵێت پەشیمان بوەتەوەو وتویەتی خۆزگە پێش جەمەل بمردمایە!! ع: ٢٣، ك: ٣١-٣٢

---

[1] تأريخ الطبري (٤/٥٣٧).

**دەڵێم:** بابەتی پەشیمان بوونەوە، ئەو خۆ تاوانێكی نەكردووە تاوەكو پەشیمان بێتەوە، بەڵكو ئاوات خواستنە بەوەی ئەو ڕۆژەی نەبینیایەو پێش ئەوە بمردایەو خوێنی مسوڵمان بە پێشچاویەوە نەڕژایە و ئەمەش دەری دەخات چەندە خوێنی مسوڵمانانی لەلا گرنگ بووەو چەندە خاوەن هەستێكی زیندوو بووە.

ئایا ئۆزۆن ئامادەیە هەمان شت بڵێ بە پێشەوا عەلیش(رضي الله عنه) كاتێك كە شەڕ كۆتایی هات و بینی خوێنی مسوڵمانان وا ڕژاوە بەهۆی فیتنەو ئاشووب و خراپەكاری هەندێك تێكدەرەوە فەرمووی: "وَاللَّهِ لَوَدَدْتُ أَنِّي مِتُّ قَبْلَ هَذَا الْيَوْمِ بِعِشْرِينَ سَنَةً"[1].

واتە: سوێند بەخوا پێم خۆشبوو پێش ئەمە بە بیست ساڵ مردبوبێتم.

پاشان ئۆزۆن ئەم وتەیەی دایكمان عائشە (رضي الله عنها) دێنێت: "إِنِّي قَدْ أَحْدَثْتُ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ، صَلَّى الله عليه وآله وَسَلَّمَ، فَادْفِنُونِي مَعَ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ، صَلَّى اللَّهُ عليه وآله وَسَلَّمَ"[2]. لا: ٢٣

واتە: من بوومە هۆی ڕوودانی زۆر شت لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە بەخاكم بسپێرن لەگەڵ خێزانەكانی تری پێغەمبەر (ﷺ).

وەرگێڕ لە مانای(أحدثت) دەڵێت: زۆر شتی ناباشم كردووەو داهێناوە" لا: ٣٢

ئەمە ئەوپەڕی خیانەتە لە سیاق و لە ماناكەی چونكە كامە شتی خراپ و ناباش دایكمان عائشە(رضي الله عنها) كردویەتی بەڵكو ئەو بە نیێتی چاكەو وەرگرتنەوەی خوێنێكی بەناحەق ڕژاو لەماڵەكەی خۆی دەرچوو، بەڵام كۆمەڵێك خەڵكی ئاژاوەگێڕ فیتنەكەیان هەڵگیرساند و ئاگرەكەیان خۆشكرد.

جا ئەوەشی كە دایكمان عائشە(رضي الله عنها) ئەیداتە پاڵ خۆی، دەری ئەخات چ كەسێكی هەست زیندوو و خاكی و خۆبەكەمزان بووە لەكاتێكدا كە ئەو هۆكاری تاوانەكەش نەبووە، بەڵام خۆی بە كەمتەرخەم ئەزانێت لەبەرامبەر ئەو خوێنەی ڕژاوە .

---

[1] تأريخ الطبري (٤/٥٣٧).

[2] طبقات ابن سعد (٨/٥٩)، ت: محمد عبد القادر عطـا، الناشـر: دار الكتـب العلميـة – بـيروت –، الطبعـة: الأولى، ١٤١٠ هـ – ١٩٩٠ م.

لێكدانەوەكەی بەو شێوەیە نەوەك بەوشێوەی وەرگێڕ وێنای ئەكات، باشە ئەگەر وەرگێڕ ئەم وتەیەی پێشەوا عەلی كوڕی ئەبی تالیبیش وەرگێڕێت هەر وای لێ دەكات كاتێك دەفەرموێت: "عَنْ أَبِي حَيَّةَ الْهَمْدَانِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ خَيْرٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ يَقُولُ: كَانَ أَفْضَلَ هَذِهِ الْأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَا أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ عُمَرُ، ثُمَّ أَحْدَثْنَا بَعْدَهُمْ أَحْدَاثًا يَفْعَلُ اللَّهُ فِيهَا مَا يَشَاءُ."[1]

واتە: گوێم لە عەلی كوڕی ئەبی تالب بوو ئەیفەرموو: باشترینی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەكەی(ﷺ) ئەبوبەكرەو دوای ئەویش عومەر(رضي الله عنهم) پاشان ئێمەش كۆمەڵە ڕووداوێكمان خولقاند كە خوای گەورە خۆی بەوشێوەی بیەوێ بەرێی دەكات.

تۆ بلێی پێشەوا "عەلی"ش(رضي الله عنه) بەهەمان شێوە كاری بەد و خراپی داهێنابێت بۆیە وا دەڵێت؟!

حاشا لەو تەفسیرە بێ ماناو دوورە لەگەڵ واقیع و ڕۆحی دەقەكەدا، كە خزمەت بەمەرامی بۆگەنی خەڵكانێكی دڵ نەخۆش دەكات، كەسێك ئەگەر كەمێك دادگەربێت و بڕوانێتە ڕووداوەكان باش لە تەفسیر و شیكاری دەقەكانی ئەو سەردەمەش تێ دەگات و ئەوە بۆی هەیە تەفسیر بكات، نەك خەڵكانێك لەدووری ئەو واقیعەوەو فەرهەنگێكی كوردی عەرەبی لەبەردەستایەو ئەچێت بەدوای وشەی(حدث) ئەگەڕێت و پرسێكی گەورەی مێژوویی پێ یەكلایی ئەكاتەوە!!

جا خۆشەویستانم لێرەوە بۆمان بەدیاركەوت كە چی لە ژێر كڵاوی ئۆزۆنداوو، ئۆزۆن چی ئەویست لێمان و لە چی ڕێگەیەكەوە هاتبوو كە گومان بخاتە سەر هاودەم و هاسەری پێغەمبەر(ﷺ)، بەلام پێی دەڵێین دانیشە، دایكمان زۆر لەوە پاكترو خاوێنترە كە كەسێكی وەكو تۆ باسی بكات!!

---

[1] فضائل الصحابة لأحمد بن حنبل (١/٣٠٥)، ت: د. وصي الله محمد عباس، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت –، الطبعة: الأولى، ١٤٠٣هـ. وفي المسند (٢/٢٤٧) برقم (٩٢٦): "يَقْضِي اللَّهُ تَعَالَى فِيهَا مَا شَاءَ". صححه الشيخ أحمد شاكر رحمه الله تعالى.

یەكێكی تر لەو پێشاوایانەی كە لەدەست زمانی ئۆزۆن ڕزگاری نەبووە، ئەم هاوەڵە خۆشەویستەیەو جۆرەهای درۆ ئەداتە پاڵی و ئەیەوێ ناشرینی بكات وسەرەتای وتەكانی بەوە دەست پێ دەكاتو دەڵێ: "پێش كۆچ بۆ مەدینە بە ساڵێك یان دوو ساڵ، لەدایك بووە، كاتێكیش كە پێغەمبەر ماڵئاوایی لە دنیا كرد، تەمەنی یازدە ساڵی تێنەپەڕاندبوو"
ع: ٢٣، ك: ٣٢

دەڵێم: ئەم وتەیەی ئۆزۆن زانایانی فەرموودەو مێژوو بەدرۆی دەخەنەوەو بەوشێوەیە نییە بەڵكو ئیبن عەبباس(رضي الله عنه) لەدایك بووە پێش كۆچ بەسێ ساڵ و لە كاتی وەفاتی پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم) تەمەنی سیانزە ساڵ بووە[1]، و هەندێك لەزانایان بە پشت بەستن بە كۆمەڵێك بەڵگە لایان وایە لە ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)(١٥) ساڵ بووە لەوانە ئیمامی ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێبێت[2].

ئەبینین كە ئۆزۆن لەگەڵ هەر وشەیەكدا خیانەتێكی كردووە بۆ زیاتر ڕازاندنەوەی درۆكانی و بێ ئەوەی شەرم بكات، چۆن شەرم دەكات لەكاتێكدا ئەو لەو شێواندنە مەبەستێكی هەیەو ئەویەوێ بڵێ ئیبن عەبباس تەمەنی كەم بوەو چۆن(١٦٦٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە!! ڕاستەوخۆش دەڵێت: "لەگەڵ ئەم تەمەنە منداڵیەیدا، نزیكەی(١٦٦٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوە، كە بوخاری و موسلیم لە سەحیحەكانیاندا تۆماریان كردووە"
ع: ٢٤، ك: ٣٢

---

[1] سير أعلام النبلاء (٣٣٢/٣)، وفتح الباري لابن حجر(٩٠/١١)، والطبقات لابن سعد (١١٤/١)، مكتبة الصديق – لطائف، الطبعة: الأولى، ١٤١٤ هـ. ئیبن حەجر زۆر بە ڕوونی باسی ئەو بابەتە دەكات طرنطة طةرِانةوة بؤي.

[2] تهذيب الكمال للمزي (١٦١/١٥)، مؤسسة الرسالة – بيروت -، الطبعة: الأولى، ١٤٠٠

دەلّێم:

١ – تەمەنی سیانزە یان پانزە ساڵ بوەو نەك یانزە سالّی ئۆززۆن، ئەو تەمەنەش تەمەنێكی كەم نیەو بەلّكو زۆر لە زانایان لە پێش(١٠) سالّی هەموو قورئانی پیرۆزیان لەبەر كردوەو، ئێستاش ئەوە ئەبینین و بەرچاوە كە خەلّكانێكی بەو شێوە ماون و هەن و خەلّكانێكی زۆر هەن كە بوخاری و موسلیمیشیان لەگەلّ هەموو قورئان لەبەرەو تەمەنیشیان نەگەیشتوەتە(١٥) سالّ.

ئەمەش شتێك نییە كە زۆر سەیربێت و ڕوو نەدات، كەسێك تەنها سەیری ئەو پێشبڕكێیانە بكات كە سالاّنە دەكرێت و ڕاستەوخۆش پەخش دەكرێت ئیتر بەسیەتی بۆ بڕوابوون بەوەی كە دەیلّێین و كەسیش ئینكاری ناكات مەگەر خەلّكانێكی تەمەلّ و تەوەزەل كە لەخۆیانەوە بروانن و وابزانن كەسی زیرەك ئەفسانەیە!!

٢ – بۆ پێشەوا ئیبن عەبباس هەرچەندە فەرموودەش بگێڕێتەوە زۆر شتێكی ئاساییە، چونكە ئەو ئەگەر قەسیدەیەكی عومەری كوڕی ڕەبیعەی بەیەك جار بیستن لەبەر كردبێت كە(٧٥) بەیتە ئیتر ئەو ژمارە كەمە فەرموودە چیە؟!

٣ – ئەو ژمارەیەی ئۆززۆن باسی كردووە بەو شێوەیە نیەو بەلّكو بە فەرموودە لاواز و دووبارەو هەلّبەستراوەكانیشەوە هێندەیە و ئەوەی كە خۆی گێڕاویەتیەوەو ڕاستە لێیەوە ناچێتە سەروو(٥٠٠) فەرموودەش، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ژمارەكەی پێشوتریش ئەگەر ڕاستبوایە ئەوا هیچ كێشەیەكی تێدا نەبوو!!

٤ – ئۆززۆن هەم دیسانەوە دەستی داوەتەوە شێواندن و چەواشەكاری و دەلّێ ئەو ژمارەیە بوخاری و موسلیم لە سەحیحەكەیاندا تۆماریان كردووە، لەكاتێكدا ئەوەی كە ئەوان گێڕاویانەتەوە لە فەرموودەكانی هەر وەكو ئیمامی خەزرەجی دەفەرموێت: "اتفقَا على خَمْسَة وَسبعين وَانفَرَدَ(خَ) بِثمَانِيَة وَعشْرين و(م) بِتِسْعَة وَأَرْبَعين"[١]

---

[١] خلاصة تذهيب تهذيب الكمال في أسماء الرجال للخزرجي، ص: (٢٠٢–٢٠٣)، حققه: عبد الفتاح أبو غدة، الناشر: مكتب المطبوعات الإسلامية/دار البشائر – حلب / بيروت، الطبعة: الخامسة، ١٤١٦ هـ.

واته: پێشەوا بوخاریو موسلیم كۆكن لەسەر(٧٥) فەرموودەی و، بوخاری(٢٨) فەرموودەی بە جیا هێناوەو موسلیم یش(٤٩) فەرموودە .

هەر ئەوەندە دەڵێمكاتی ئەوە نەهاتووە ئۆزۆن خەجاڵەت بێت؟!

٥ – ئەو فەرموودانەی كە گێڕاویەتیەوە هەمووی لە پێغەمبەر(ﷺ) نەگێڕاوەتەوە، بەڵكو لە هاوەڵە گەورەكانیشی گێڕاوەتەوە لەكاتێكدا ڕووداوێك ئەو بەبیری نایەت یاخود لەوێ نەبووە، هەر وەكو پێشەوا زەهەبی دەفەرموێت:

" وَعَنْ عُمَرَ، وَعَلِيّ، وَمُعَاذٍ، وَوَالِدِهِ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَأَبِي سُفْيَانَ صَخْرِ بْنِ حَرْبٍ، وَأَبِي ذَرّ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ وَخَلْقٍ. "[١]

واته: لە عومەر و عەلی و موعاز و باوكی خۆی و عبدالرحمن ی كوڕی عەوف و ئەبو سوفیان و ئەبو زەڕ و ئوبەی كوڕی كەعب و زەیدی كوڕی سابت و خەڵكانێكی تریشی گێڕاوەتەوە.

دوای ئەم وتانە ئۆزۆن بە درۆیەكی زۆر گەورەو شاخدارەوە دێت و گەورەترین خیانەت ئەكات و ڕیوایەتێك دێنێت كە گفتوگۆی نێوان پێشەوا عەلی و هاوەڵی خۆشەویست عبدالله ی كوڕی عەبباسدایە كاتێك پێشەوا عەلی ئەیكاتە كاربەدەستی بەصرە و ئەم شتانەی هەموو لەخۆ گرتووە:

دەڵێت: ( لەوانەیە دیارترین و گرنگترین تانەیەك بەسەریەوە ئەو ململانێ فیكری و شەڕە دەنوكەی بێ لەگەڵ عەلی كوڕی ئەبو تالیبی ئامۆزای، لەو بارەیەوە لە تەبەڕی بەرگی(٤)دا كە باسی هۆكاری ئەو جیاوازی و ململانێیەمان بۆ دەكات هاتووە:

سەرەتای كێشەكە بەنامەیەكی ئەبو ئەسوەدی دوئەلی بەرپرسی بەیتولمالی بەسرە دەست پێ ئەكات كە بۆ عەلی دەنووسێ و تێیدا هاتووە: كار بەدەست و ئامۆزاكەت بەناحەق ئەو ماڵەی لە ژێر دەستیدایە دەیخوات .

---

[١] سير أعلام النبلاء للذهبي (٣/٣٣٢)، ط: مؤسسة الرسالة.

عەلیش دەستبەجێ نامەیەك بۆ ئیبن عەباس دەنوسێ و داوای ڕوونكردنەوەو ئاشكراكردنی دارایی و ئاستی دروستی ئەو نامەیەی لێ دەكات.

وەڵامی ئیبن عەبباسیش بەم جۆرە دەبێت: ئەوەی بیستووتە دەربارەی من بێ بنەمایەو من زۆر بە وردی و چاكی ئاگاداریی ئەو ماڵ و داراییەم كە پێم سپێردراوەو داوات لێ دەكەم باوەڕ بە گومان و قسەو قسەڵۆك نەكەیت ڕەحمەتی خوات لێبێت.

بەڵام دیارە عەلی دڵی بەمە ئاو ناخواتەوەو داوای لێ دەكات كەچی داهات و خەرجی خۆی هەیە لە خەراج بۆی بنووسێت.

ئیبن عەبباس وەڵامی دەداتەوەو دەنووسێت: قسەم بەخوا بە تاڵانی و سەرمایەی هەموو سەر زەوی و ژێر زەوییەوە كە باركرابێت لەسەر شانم بچمە حزووری خوا پێم خۆشترو باشترە لەوەی بۆ دەسەڵات و ئیمارەت خوێنی ئوممەتی ئیسلامم ڕشتبێ و ئاوا بچمە حزووری ئەو[1]، كێ بەباش دەزانیت بینێرە بۆ ئەم كارەت.

پاشان عەلی كوڕی ئەبو تالیب دەبیسێت كە ئیبن عەباس تەواوی دارایی گشتیی(بیت المال) بڕی(شەش ملیۆن) درهەمی كۆكردوەتەوەو چوەتە پەنای خاڵۆانی(بەنی هیلال) لە بەسرە كە پەنای دەدەن و پاش دەمەقاڵەو هەرایەك لەگەڵ خەڵكی بەسرە دەیگەیەننەوە شوێنی بێ مەترسی خۆی لە مەككە( ئەو جێیەی لێی لەدایك بووە)

لەوێ زۆر بەخۆشی دەژی و بێ دڵی خۆی ناكات و بە سێ هەزار دینار(سێ) كەنیزەكی جوانی لاوی مێرد منداڵ[2] دەكڕێت.

عەلی ناچار دەبێت نامەیەكی بۆ بنووسێت كەتەنها ئەمەندەی دەگێڕینەوە:

كە توانیت هەڵبێیت غارت دا قەڵەم بازت هاوت فرسەتت قۆستەوەو ئەوەی توانیت لەماڵ و سامانی خەڵك وەك گورگی لەڕی قولباریكی باسك درێژ كە تاو بداتە بزنە لاتێك

---

[1] واتە ها عەلی تۆ خەڵكت كوشتوەو هەر كارێك بكرێت هێندەی كوشتارەكانی تۆ زیانی بۆ قیامەت نیە!!

[2] كەنیزەكی مێردمنداڵ یانی چی؟! تەنها ئەم پرسیارە لە وەرگێڕ دەكەین: كابرا تۆ كوردی نازانی لە عەرەبیت چی داماوە؟! (د.عادل).

تاوت دایەو بەرەو حیجاز فڕاندت، به دڵگوشادییەوەو بێ ئەوەی هەست به تاوان بكەیت.

وەك ئەوەی كەس باوكی نەبێت و تۆ میراتی باوكی خۆت بۆ خێزانی خۆت تاودابێتێ، نازانم باوەڕت به دوارۆژ و خراپی لێپرسینەوە نیەو نازانیت كه حەرام دەخۆیی و دەخۆیەوە، ئەرێ بەلاتەوە گران و تاوان نییه تۆ كچەتیوان گران دەكەیت و ژنان دەخوازی و بەماڵی هەتیوان و بێوەژنان و موجاهیدان(كەخوا دەرووی دونیای لێ كردوونەوە) ڕادەبوێریی؟!

لەخوا بترسەو ماڵی ئەو خەڵكە بگێڕەوە ئەگینا قەسەم بەخوا گەر وانەكەیت و دەستم پێت بگات ڕوخسەتی خۆم لەخودا وەردەگرم تاماف و ماڵی ئەو خەڵكەت لێ وەردەگرم و دەیگێڕمەوەو ستەمكار سەركوت دەكەم و حەقی مەزلومان دەگێڕمەوەو خوات لەگەڵ.

ئیبن عەباس وەڵامی توندی خەلیفه بەم جۆره دەداتەوە:

ئەی عەلی! گەر واز لەم ئەفسانانەت نەهێنی ئەم ماڵ و داراییه دەبەم بۆ معاویه تا بیكاتە خەرجی شەڕ له دژت). ع: ٢٤-٢٥، ك: ٣٣-٣٥

دەڵێم: ئۆزۆن بەڕاستی لێزانه له فریودانی كەسی گێل و چاكیش بۆی ئەچێتە سەر!!

بەڵام ئەگەر كەسێك بڕواتەوە سەر ئەو سەرچاوانەی كه ئۆزۆن شتی لێوە ئەگێڕێتەوە شتێكی تر ئەبینێت و پێچەوانەی ئەوەی بۆ دەردەكەوێت كه نەقڵی كردووە .

ئۆزۆن ئەم چیرۆكەی داوەتە پاڵ تەبەری و دەڵێت لەبەرگی(٤) ئەبێت خوێنەر هەر بەوەندەی كه دەڵێت بەرگی ئەوەندەو لاپەڕەكەی ناڵێ، هەست بەوە بكات كه درۆیەكی ئۆزۆنی و خیانەتێكی ڕۆژهەڵاتناسانه له ژێر پێنووسەكەیدایە!!

هەروەها ئەیداتە پاڵ پێشەوا ئیبن ئەسیر یش له كتێبـی "الكامل"، جا ئێستا ئێمە ڕیوایەتەكەی هەردووكیان دێنین و ئێوەش بەراوردی بكەن لەگەڵ ئەوەی ئۆزۆندا:

لای پێشەوا تەبەری: (حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ شَبَّةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي جَمَاعَةٌ، عَنْ أَبِي مِخْنَفٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي رَاشِدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُبَيْدٍ أَبِي الْكَنُودِ، قَالَ: مَرَّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ عَلَى أَبِي الأَسْوَدِ الدُّؤَلِيِّ، فَقَالَ: " لَوْ كُنْتَ مِنَ الْبَهَائِمِ كُنْتَ جَمَلا، وَلَوْ كُنْتَ رَاعِيًا مَا

بَلَغْتَ مِنَ الْمَرْعَى وَلا أَحْسَنْتَ مِهْنَتَهُ فِي الْمَشْيِ، قَالَ: فَكَتَبَ أَبُو الأَسْوَدِ إِلَى عَلِيٍّ: أَمَّا بَعْدُ " فَإِنَّ اللَّهَ، جَلَّ وَعَلا، جَعَلَكَ وَالِيًا مُؤْتَمَنًا، وَرَاعِيًا مُسْتَوْلِيًا، وَقَدْ بَلَوْنَاكَ فَوَجَدْنَاكَ عَظِيمَ الأَمَانَةِ، نَاصِحًا لِلرَّعِيَّةِ، تُوَفِّرُ لَهُمْ فَيْأَهُمْ، وَتُظَلِّفُ نَفْسَكَ عَنْ دُنْيَاهُمْ " فَلا تَأْكُلْ أَمْوَالَهُمْ، وَلا تَرْتَشِي فِي أَحْكَامِهِمْ، وَإِنَّ ابْنَ عَمِّكَ قَدْ أَكَلَ مَا تَحْتَ يَدَيْهِ بِغَيْرِ عِلْمِكَ فَلَمْ يَسَعَنِي كِتْمَانَكَ ذَلِكَ، فَانْظُرْ، رَحِمَكَ اللَّهُ، فِيمَا هُنَاكَ، وَاكْتُبْ إِلَيَّ بِرَأْيِكَ فِيمَا أَحْبَبْتُ أَنْتَهِ إِلَيْكَ، وَالسَّلامُ.

فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَلِيٌّ: أَمَّا بَعْدُ " فَمِثْلُكَ نَصَحَ الإِمَامَ وَالأُمَّةَ، وَأَدَّى الأَمَانَةَ، وَدَلَّ عَلَى الْحَقِّ، وَقَدْ كَتَبْتَ إِلَى صَاحِبِكَ فِيمَا كَتَبْتَ إِلَيَّ فِيهِ مِنْ أَمْرِهِ وَلَمْ أَعْلَمْهُ أَنَّكَ كَتَبْتَ، فَلا تَدَعْ أَعْلامِي بِمَا يَكُونُ بِحَضْرَتِكَ مِمَّا النَّظَرُ فِيهِ لِلأُمَّةِ صَلاحٌ، فَإِنَّكَ بِذَلِكَ جَدِيرٌ وَهُوَ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَيْكَ، وَالسَّلامُ.

وَكَتَبَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فِي ذَلِكَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَّا بَعْدُ " فَإِنَّ الَّذِي بَلَغَكَ بَاطِلٌ، وَإِنِّي لِمَا تَحْتَ يَدِي ضَابِطٌ، قَائِمٌ لَهُ، وَلَهُ حَافِظٌ، فَلا تُصَدِّق الظُّنُونَ، وَالسَّلامُ. قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَلِيٌّ: أَمَّا بَعْدُ " فَأَعْلِمْنِي مَا أَخَذْتَ مِنَ الْجِزْيَةِ، وَمِنْ أَيْنَ أَخَذْتَ وَفِيمَ وَضَعْتَ؟ قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيْهِ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَّا بَعْدُ " فَقَدْ فَهِمْتُ تَعْظِيمَكَ مَرْزَأَةَ مَا بَلَغَكَ أَنِّي رَزَأْتُهُ مِنْ مَالِ أَهْلِ هَذَا الْبَلَدِ، فَابْعَثْ إِلَى عَمَلِكَ مَنْ أَحْبَبْتَ فَإِنِّي ظَاعِنٌ عَنْهُ، وَالسَّلامُ " ثُمَّ دعا ابن عَبَّاس أخواله بني هلال بن عَامِر، فجاءه الضحاك بن عَبْدِ اللَّهِ وعبد اللَّه بن رزين بن أبي عَمْرو والهلاليان، ثُمَّ اجتمعت مَعَهُ قيس كلها فحمل مالا، قَالَ أَبُو زَيْد: قَالَ أَبُو عبيدة: كَانَتْ أرزاقا قَدِ اجتمعت، فحمل مَعَهُ مقدار مَا اجتمع لَهُ، فبعث الأخماس كلها فلحقوه بالطف فتواقفوا يريدون أخذ المال، فَقَالَتْ قيس: وَاللَّهِ لا يوصل إِلَى ذَلِكَ وفينا عين تطرف، وَقَالَ صبرة بن شيمان الحداني: يَا معشر الأزد، وَاللَّهِ إن قيسا لإخواننا فِي الإِسْلام، وجيراننا فِي الدار، وأعواننا عَلَى العدو، وإن الَّذِي يصيبكم من هَذَا المال لو رد عَلَيْكُمْ لقليل، وهم غدا خير لكم من المال، قَالُوا: فما ترى؟ قَالَ: انصرفوا عَنْهُمْ ودعوهم، فأطاعوه فانصرفوا، فَقَالَتْ بكر وعبد القيس: نعم الرأي رأي صبرة لقومه، فاعتزلوا أَيْضًا، فَقَالَتْ بنو تميم: وَاللَّهِ لا نفارقهم نقاتلهم عَلَيْهِ، فَقَالَ الأحنف: قَدْ ترك

قتالهم من هُوَ أبعد مِنْكُمْ رحما، فَقَالُوا: وَاللَّهِ لنقاتلنهم، فَقَالَ: إذا لا أساعدكم عَلَيْهِم، فاعتزلهم، قَالَ: فرأسوا عَلَيْهِم ابن المجاعة، من بني تميم، فقاتلوهم وحمل الضحاك عَلَى ابن المجاعة فطعنه، واعتنقه عَبْد اللَّهِ بن رزين فسقطا إِلَى الأرض يعتركان، وكثرت الجراح فِيهِمْ، ولم يكن بينهم قتيل، فَقَالَتِ الأخماس: مَا صنعنا شَيْئًا، اعتزلناهم وتركناهم يتحاربون، فضربوا وجوه بعضهم عن بعض، وَقَالُوا لبني تميم: فنحن أسخى مِنْكُمْ أنفسا حين تركنا هَذَا المال لبني عمكم وَأَنْتُمْ تقاتلونهم عَلَيْهِ، إن القوم قَدْ حملوا وحموا فخلوهم، وإن أحببتم فانصرفوا، ومضى ابن عَبَّاس وَمَعَهُ نحو من عشرين رجلا حَتَّى قدم مكة.)[١]

چەند هەڵوێستەیەكمان ئەبێت لەسەری بەلاّم با ئەوەی ئیبن ئەسیر یش نەقڵ بكەین كە هێناویەتی و دەفەرموێت: (ذِكْرُ فِرَاقِ ابْنِ عَبَّاسٍ الْبَصْرَةَ: وَكَانَ سَبَبُ خُرُوجِهِ أَنَّهُ مَرَّ بِأَبِي الْأَسْوَدِ فَقَالَ: لَوْ كُنْتَ مِنَ الْبَهَائِمِ لَكُنْتَ جَمَلًا، وَلَوْ كُنْتَ رَاعِيًا لَمَا بَلَغْتَ الْمَرْعَى. فَكَتَبَ أَبُو الْأَسْوَدِ إِلَى عَلِيٍّ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ اللَّهَ - عَزَّ وَجَلَّ - جَعَلَكَ وَالِيًا مُؤْتَمَنًا، وَرَاعِيًا مُسْتَوْلِيًا، وَقَدْ بَلَوْنَاكَ فَوَجَدْنَاكَ عَظِيمَ الْأَمَانَةِ، نَاصِحًا لِلرَّعِيَّةِ، تُوَفِّرُ لَهُمْ فَيْئَهُمْ، وَتَكُفُّ نَفْسَكَ عَنْ دُنْيَاهُمْ، وَلَا تَأْكُلُ أَمْوَالَهُمْ، وَلَا تَرْتَشِي فِي أَحْكَامِهِمْ، وَإِنَّ ابْنَ عَمِّكَ قَدْ أَكَلَ مَا تَحْتَ يَدَيْهِ بِغَيْرِ عِلْمِكَ، وَلَمْ يَسَعْنِي كِتْمَانُكَ - رَحِمَكَ اللَّهُ - فَانْظُرْ فِيمَا هُنَاكَ، وَاكْتُبْ إِلَيَّ بِرَأْيِكَ فِيمَا أَحْبَبْتَ، وَالسَّلَامُ.

فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَلِيٌّ: أَمَّا بَعْدُ فَمِثْلُكَ نَصَحَ الْإِمَامَ وَالْأُمَّةَ، وَوَالَى عَلَى الْحَقِّ، وَقَدْ كَتَبْتُ إِلَى صَاحِبِكَ فِيمَا كَتَبْتَ إِلَيَّ، وَلَمْ أُعْلِمْهُ بِكِتَابِكَ، فَلَا تَدَعْ إِعْلَامِي بِمَا يَكُونُ بِحَضْرَتِكَ مِمَّا النَّظَرُ فِيهِ صَلَاحٌ لِلْأُمَّةِ، فَإِنَّكَ بِذَلِكَ جَدِيرٌ، وَهُوَ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَيْكَ، وَالسَّلَامُ.

وَكَتَبَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فِي ذَلِكَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ الَّذِي بَلَغَكَ بَاطِلٌ، وَإِنِّي لِمَا تَحْتَ يَدَيَّ لَضَابِطٌ وَلَهُ حَافِظٌ، فَلَا تُصَدِّقِ الظُّنُونَ وَالسَّلَامُ. فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَلِيٌّ: أَمَّا بَعْدُ، فَأَعْلِمْنِي مَا أَخَذْتَ مِنَ الْجِزْيَةِ، وَمِنْ أَيْنَ أَخَذْتَ، وَفِيمَا وَضَعْتَ. فَكَتَبَ إِلَيْهِ ابْنُ

[١] تأريخ الطبري (٥/١٤١-١٤٢)، دار التراث – بيروت –، الطبعة: الثانية – ١٣٨٧ هـ.

عَبَّاسٍ: أَمَّا بَعْدُ، فَقَدْ فَهِمْتُ تَعْظِيمَكَ مَرْزَأَةَ مَا بَلَغَكَ، (إِنِّي رَزَأْتُهُ مِنْ أَهْلِ هَذِهِ الْبِلَادِ)، فَابْعَثْ إِلَى عَمَلِكَ مَنْ أَحْبَبْتَ فَإِنِّي ظَاعِنٌ عَنْهُ، وَالسَّلَامُ.

وَاسْتَدْعَى أَخْوَالَهُ مِنْ بَنِي هِلَالِ بْنِ عَامِرٍ، فَاجْتَمَعَتْ مَعَهُ(قَيْسٌ كُلِّهَا) فَحَمَلَ مَالًا وَقَالَ: هَذِهِ أَرْزَاقُنَا(اجْتَمَعَتْ)، فَتَبِعَهُ أَهْلُ الْبَصْرَةِ) فَلَحِقُوهُ بِالطَّفِّ يُرِيدُونَ أَخْذَ الْمَالِ، فَقَالَتْ قَيْسٌ: وَاللَّهِ لَا يُوصَلُ إِلَيْهِ وَفِينَا عَيْنٌ تَطْرِفُ! فَقَالَ صَبْرَةُ بْنُ شَيْمَانَ الْحُدَّانِيُّ: يَا مَعْشَرَ الْأَزْدِ، إِنَّ قَيْسًا إِخْوَانُنَا وَجِيرَانُنَا وَأَعْوَانُنَا عَلَى الْعَدُوِّ، وَإِنَّ الَّذِي يُصِيبُكُمْ مِنْ هَذَا الْمَالِ لَقَلِيلٌ، وَهُمْ لَكُمْ خَيْرٌ مِنَ الْمَالِ. فَأَطَاعُوهُ فَانْصَرَفُوا(وَانْصَرَفَتْ مَعَهُمْ بَكْرٌ وَعَبْدُ الْقَيْسِ) وَقَاتَلَهُمْ بَنُو تَمِيمٍ، (فَنَهَاهُمُ الْأَحْنَفُ، فَلَمْ يَسْمَعُوا مِنْهُ، فَاعْتَزَلَهُمْ) وَحَجَزَ النَّاسُ بَيْنَهُمْ، وَمَضَى ابْنُ عَبَّاسٍ إِلَى مَكَّةَ)[1].

ئەم ڕیوایەتە كۆمەڵێك هۆكاری تێدایە بۆ ئەوەی وەرنەگیرێت و ڕەت بكرێتەوە، ئەوانیش:

١ – ئەبو "میخنەف" گێڕاویەتیەوە كە "لوط"ی كوڕی "یەحیای"ە و بە یەكدەنگی زانایان قسەی لێ وەرناگیرێت، لەوانەش: یەحیای كوڕی مەعین دەفەرموێت: كەسێكی متمانە پێكراو نییە وجارێكی تریش فەرمووی: فەرموودەكانی هیچ نین، ئیبن ئەبی حاتەم دەفەرموێت: وتەكانی وەرناگیرێ، دارەقوتنی دەفەرموێت: كەسێكی لاوازە، زەهەبی دەفەرموێت: ڕافیزەیە.[2]

٢ – ئەبو میخنەف لە كەسی نەناسراو و نادیارەوە ڕیوایەت زۆر دەكات هەروەكو زەهەبی دەفەرموێت: " رَوَى عَنْ: جَابِرٍ الجُعْفِيِّ، وَمُجَالِدِ بنِ سَعِيْدٍ، وَصَقْعَبِ بنِ زُهَيْرٍ، وَطَائِفَةٍ مِنَ المَجْهُوْلِيْنَ."[3]

---

[1] الكامل لابن الأثير (٢/٧٣٥-٧٣٦).

[2] الجرح والتعديل لابن أبي حاتم (١٨٢/٧)، تأريخ أسماء الضفاء والكذابين لابن شاهين، ص: (١٦٢)، ت: عبد الرحيم القشقري، الطبعة: الأولى، ١٤٠٩هـ/١٩٨٩م.،والضعفاء والمتروكين للدارقطني(١٢٨/٣)، =

= الناشر: مجلة الجامعة الإسلامية بالمدينة المنورة، والمغني في الضعفاء للذهبي، (٥٣٥/٢)، برقم: (٥١١٧)، ت: د.نورالدين عتر، تأريخ الاسلام للذهبي (١٨٩/٤)

٣ – ئەبو میخنەف لە" سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي رَاشِدٍ "ی گێڕاوەتەوە، کەسێکی نەناسراو "مجهول"ە و ڕیوایەتی کەسی نەناسراو و نادیاریش قەبوڵ نییە لەسەر ڕای تێکڕای زانایان.

٤ – ئەویش دیسانەوە لە نەناسراوێکی تری گێڕاوەتەوە، کە " عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُبَيْدٍ أَبِي الْكَنُودِ "ە، تەنانەت ئەم دوانە لەلای شیعەکانیش نەناسراون و ڕیوایەتیان لێ وەرناگیرێت.

جا من پێم سەیر نییە کە ئۆززۆن سەرەڕای ئەم هەموو عەیب و عارە کە تیایەتی ئەم ڕیوایەتەی گێڕاوەتەوەو ئەیەوێ ئەم زانا بەڕێزەی پێ ناشرین بکات کە لای هەموو ئوممەت وێنەیەکی جوانی هەیە[١]، بەڵام ئەوەی پێم سەیرە لە ڕیوایەتانەدا ئەم هەموو شتە کە ئۆززۆن باسی دەکات تیایا نیە، ئەوانیش:

١ – ئۆززۆن باسی ململانێی فیکری و سیاسی نێوانیانی کرد، باشە هەر لە ڕیوایەتەکەی خۆشیدا ئێوە شتی واتان بەرچاو کەوت، تاوەکو لەمەی تر دەستان بکەوێت؟!

٢ – ئەم وتەیەی ئۆززۆن " بەڵام دیارە عەلی دڵی بەمە ئاو ناخواتەوەو داوای لێ دەکات کەچی داهات و خەرجی خۆی هەیە لە خەراج بۆی بنووسێت" لە کوێی ڕیوایەتەکەی تەبەری و ئیبن ئەسیردا شتی وا هەیە؟!

٣ – ئەی باشە ئەم درۆیەی تری ئۆززۆن کە دەڵێ: "پاشان عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەبیستێت کە ئیبن عەباس تەواوی دارایی گشتیی(بیت المال) بری(شەش ملیۆن) درهەمی کۆکردوەتەوەو چوەتە پەنای خاڵوانی(بەنی هیلال) لە بەسرە کە پەنای دەدەن و پاش دەمەقاڵەو هەرایەك لەگەڵ خەڵکی بەسرە دەیگەیەننەوە شوێنی بێ مەترسی خۆی لە مەککە( ئەو جێیەی لێی لەدایك بووە)

لەوێ زۆر بەخۆشی دەژی و بێ دڵی خۆی ناکات و بە سێ هەزار دینار(سێ) کەنیزەکی جوانی لاوی مێرد منداڵ دەکڕێت." لە کوێدا بوونی هەیە؟!

---

[٣] سیر أعلام النبلاء (٣٠١/٧)، ط: الرسالة

[١] لەبەر ئەوەی ڕیوایەتەکە لاوازەو وەرنەگیراوە بۆیە بە پێویستمان نەزانی بیکەینەوە کوردی.

٤ – ئەی ئەم درۆیەی تری ئۆزۆن كە دەڵێت: " عەلی ناچار دەبێت نامەیەكی بۆ بنووسێت كەتەنها ئەمەندەی دەگێرینەوە:

كە توانیت هەڵبێیت غارت دا قەڵەم بازت هاوت فڕسەتت قۆستەوەو ئەوەی توانیت لەماڵ و سامانی خەڵك وەك گورگی لەڕی قولباریكی باسك درێژ كە تاو بداتە بزنە لاتێك تاوت دایەو بەرەو حیجاز فڕاندت، بە دڵگۆشادییەوەو بێ ئەوەی هەست بە تاوان بكەیت.

وەك ئەوەی كەس باوكی نەبێت و تۆ میراتی باوكی خۆت بۆ خێزانی خۆت تاودابێێ، نازانم باوەڕت بە دوارۆژ و خراپی لێپرسینەوە نیەو نازانیت كە حەرام دەخۆیی و دەخۆیەوە، ئەرێ بەلاتەوە گران و تاوان نییە تۆ كچەتیوان گران دەكەیت و ژنان دەخوازی و بەماڵی هەتیوان و بێوەژنان و موجاهیدان(كەخوا دەرووی دونیای لێ كردوونەوە) ڕادەبوێریی؟!

لەخوا بترسەو ماڵی ئەو خەڵكە بگێڕەوە ئەگینا قەسەم بەخوا گەر وانەكەیت و دەستم پێت بگات ڕوخسەتی خۆم لەخودا وەردەگرم تاماف و ماڵی ئەو خەڵكەت لێ وەردەگرم و دەیگێڕمەوەو ستەمكار سەركوت دەكەم و حەقی مەزلومان دەگێڕمەوەو خوات لەگەڵ"

پێمان نالێت: لە كوێی هێناوەو چۆن ئەیداتە پاڵ ئەو دوو پێشەوا بەرێزە لە كاتێكدا بە دەقێكی لاوازیش تێیدا نیە، چ جای بەو شێوەی كە ئۆزۆن ئەیكاتە حەقیقەتێكی حاشا هەڵنەگر لە ئێمەو دەڵێت ئەمە دیارترین شتە!!

٥ – ئەی ئەم نوكتەیەی تری ئۆزۆن كە دەڵێت: " ئیبن عەباس وەلامی توندی خەلیفە بەم جۆرە دەداتەوە:

ئەی عەلی! گەر واز لەم ئەفسانانەت نەهێنی ئەم ماڵ و داراییە دەبەم بۆ معاویە تا بیكاتە خەرجی شەڕ لە دژت" لەكوێی هێناوە بێجگە لە باخەڵی بەتاڵی خۆی؟!

جا خۆشەویستانم ئەبینن كە ئۆزۆن ئەو هەمووە درۆیەی هەڵچنیوەو داویەتیە پاڵ دوو پێشەوای مێژوو نووس بێ ئەوەی ترسی قیامەتی هەبێت.

من دڵنیام كە ئۆزۆن لە ماڵپەڕەكانی شیعەی وەرگرتووە، چونكە ڕێك هەمان ڕیوایەت ئەوان نووسیویانە لە بەرگی(٤)ی تەبەری هاتووە و ئۆزۆنیش خێراو گێلانە بێ ئەوەی بگەڕێتەوە سەرچاوەكان نەقڵی كردوەو زۆر لێیان ئەمین بووە، وابزانم ئۆزۆن هەموو سەرچاوەیەكی لا ڕاستە تەنها سەحیحەكەی پێشەوا بوخاری نەبێت!!

جا ئەگەر ئۆزۆن بگەڕایەتەوە بۆ ئەو دوو سەرچاوەیە ئەوا ئەیبینی كە هەر خۆی ڕیوایەتی تری تێدایە ئەمە هەڵەوەشێنێتەوە لە تەبەریدا دوا بەدوای ڕیوایەتی یەكەم ئەیهێنێ و دەڵێت:

"إِنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ لَمْ يبرحْ مِنَ البَصْرَةِ حَتَّى قُتِلَ عَلِيٌّ "ع"، فَشَخَصَ إِلَى الْحَسَنِ، فَشَهِدَ الصُّلْحَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ مُعَاوِيَةَ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الْبَصْرَةِ وَثِقْلُهُ بِهَا، فَحَمَلَهُ وَمَالا مِنْ بَيْتِ الْمَالِ قَلِيلا، وَقَالَ: هِيَ أَرْزَاقِي"[1].

واتە: ئیبن عەبباس هەر لەبەسرەدابوو تاوەكو پێشەوا عەلی كوژرا و دواتر بەرەو لای حەسەن ڕۆشت، هەروەها ئامادەی ئاشتەوایی نێوان ئەو و معاویە بوو، پاشان گەڕایەوە بۆ بەسرەو كەلوپەلەكەی هەڵگرت كە لەوێ بوون، لەگەڵ ماڵێكی كەمدا و وتی: ئەمە قوتی منە.

هەرچەندە ئەم ڕیوایەتەش لاوازە بەڵام لاوازیەكەی لەو كەمترەو لەپێشتربوو ئۆزۆن ئەمە بكاتە بەڵگە و ئەگەر ئەمەی بهێنایە ئەوەی پێشووتر هەڵەوەشایەوە لە چەند ڕوویەكەوە:

١ – دەڵێت ئیبن عەبباس(رضي الله عنه) هەر لەبەسرەبوەو نەڕۆشتووە تاوەكو شەهیدبوونی پێشەوا عەلی(رضي الله عنه) ، بەپێچەوانەی ڕیوایەتەكەی تر كە دەڵێت ڕای كردووەو خۆی حەشارداوە.

٢ – دەڵێت دواتر بۆ لای حەسەن ڕۆشتووە، باشە تۆ بڵێی حەسەنیش هەر وەكو ئەم خراپ بوبێت بۆیە لێی بێدەنگ بووە؟ یان ترسنۆك بوەو بە ئیبن عەبباسی نەوێراوە؟ یان ئاگای لەو خیانەتەی ئیبن عەبباس نەبوە و نەیزانیوە كە لە پەنایابووە لەكاتێكدا ئۆزۆن

[1] تأريخ الطبري (١٤٣/٥).

دوای هەزار و چوارسەد ساڵ زانیویەتی؟ یان ئیبن عەبباس ﵁ بەوشێوەیە نەبووەو ئۆزۆن درۆی گێڕاوەتەوە؟!

٣ – دەڵێت ئەو ماڵەی هەڵیگرت ماڵێکی کەم بووەو تەنها بەشێکی کەمی خۆیبووە نەك ئەو درۆیەی کە ئۆزۆن دەڵێت: شەش ملیۆن دینار، بەڵکو دەڵێت: ئەوە قوتی منە!!

چەند هەڵوێستەیەك لەسەر ڕیوایەتەکەی ئۆزۆن:

ئەوپەڕی تۆمەتی تیایە بۆ پێشەوا عەلی(﵁) و وەسفکردنیەتی بەبێ ئاگایی لە کاربەدەستەکانی، چونکە تاوەکو ئەبو ئەسوەد ئاگاداری ناکاتەوە پێی نازانێت، باشە ئەمە حاڵی بێت لەکاتێکدا ئیبن عەبباس(﵁) لە بن دەستیدا بووە، تۆ بڵێی گەندەڵی لەشوێنە دوورەکان گەشتبێتە چ ئاستێك؟!

باشە عەلی(﵁) تۆ بڵێی بەو تەمەنە درێژەی کوڕی مامی خۆی نەناسیبێت و نەزانێ شیاوە بۆ ئەو پۆستە یاخود نا؟!

وەکو بینیتان سەرتاپا ئۆزۆن چیرۆکەکەی داڕێژاوەتەوەو داویەتیە پاڵ زانایانی مێژوو بێ ئەوەی بە سەنەدێکی لاوازیش هەبێت لەو کتێبانەی کە ئاماژەی پێدا، ڕەنگە وای گومان بردبێت کەسێك نییە بەدواداچوون بکات و خیانەتەکانی ئاشکرا بکات و بۆی دەچێتە سەر بەڵام ئەفسوس!

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: "دەپرسین: کەسێك ئەمە حاڵی بوبێت چۆن پێی وتراوە: خواناس و زانای ئەم ئوممەتەو دەریای زانست و زمانحاڵی قورئان؟! کە هاوزەمان و سەردەمی خۆی عەلی ئەمیری ئیمانداران لەبارەیەوە دەڵێت: بەحەرام دەخواو دەخواتەوەو ئەمانەتی خودای بەجێ نەگەیاندووە)" ع: ٢٧، ك: ٣٥

**دەڵێم:** بەڵێ هاوەڵی بەڕێز ئیبن عەبباس(﵁) پێشەواو ڕابەر و زانای ئوممەتە هەرچەندە کەسە دووڕووەکانیش پێیان ناخۆشبێت، هەر ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) نزای بۆ دەکات کە

خوای گەورە فێری تەفسیری بكات و شارەزای بكات لە ئاینەكەی: «اللهُمَّ عَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ، وَفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ»[1]. هەروەها ئەیفەرموو: «اللهُمَّ عَلِّمْهُ الْحِكْمَةَ»[2].

بەڵام ئێستا ئێمە حەقی خۆمانە پرسیارەكەی ئۆزۆن پێچەوانە بكەینەوەو بپرسین:

ئایا كەسێك ئەوە حاڵی بێت شت نەقڵ بكات بەبێ دڵنیابوونەوەو و درۆ بداتە پاڵ سەرچاوەكان و تۆمەت ببەخشێتەوە، شیاوی ئەوەیە كە متمانەی پێ بكرێت و شتی لێ وەربگیرێت؟!

---

[1] المعجم الكبير للطبراني (١٠/٢٣٨)، برقم: (١٠٥٨٧)، ت: الشيخ حمدي السلفي، دار النشر: مكتبة ابن تيمية – القاهرة –، الطبعة: الثانية.

[2] المعجم، (١٠/٢٣٨)، برقم: (١٠٥٨٨).

## فەرموودەو زانستی سەردەم[1]

نووسەر دوای ئەو هەموو تۆمەت بەخشینەوەو گومان و قسە ناڕاستانەی کە هێنای و وەڵاممان دایەوە، ئێستا وا دەم لە بابەتێکی تر ئەکوتێ و ئەیەوێ لە ڕێگەیەکی ترەوە ئیشی خۆی بکات، ئەویش بانگەشەی یەك نەهاتنەوەی فەرموودەکان و زانستی سەردەمەو ئەپرسێت:

"ئایا هەموو ئەو فەرموودانەی پێمان گەیشتوون، لەگەڵ نەریت و سیستم و پێدراوە زانستیەکانی ئەمڕۆماندا دەگونجێت؟"

پاشان وەڵام ئەداتەوەو دەڵێت: "وەڵامەکە لێرەدا نەخێرە، چونکە وەك دواتر دەبینین، زۆرێك لەو فەرموودانەی باس لە شتە گەردوونیەکان دەکات لەگەڵ شتە جێگیر و پێدراوە زانستیەکاندا وێك نایەنەوە"

پاشان هەندێك بەڵگە دێنێتەوە و قسە لەسەر هەموویان ئەکەین بە ویستی خوای گەورە[2].

سەرەتا ئەمەوێ بڵێم: ئۆزۆن پێش نووسینی ئەم کتێبە بڕیارەکەی هەرنەخێربووەو ویستوویەتی نەخێریی ئەم بابەتە بسەلمێنێت و بەڵگەی بۆ کۆبکاتەوە گەر چی بەڵگەکانیش لەبەرژەوەندی نەبن و هەرگیز بەکەڵکی ئەوە نەیەت بیانکات بە بەڵگە.

بەڵام من پێش ئەوەی کە وەڵامی ئۆززۆن بدەمەوە پێم خۆشە چەند دێڕێك بخەمە بەر دیدەی تۆی بەڕێز لەبارەی زانستی سەردەم[3]:

---

[1] ڕەنگە ئەم باسەت کەمێك لەلا زۆربێت، بەڵام بەهۆی گرنگیەکەی و بێئاگایی زۆربەمان بەپێویستم زانـی کـە لێرەدا شوێنێکی بۆ بکەمەوەو باسی لێوە بکەم، بۆیە تکایە تۆش گرنگی پێ بدەو بەدواداچوون بکە.!!

[2] ع:٢٥، ك:٣٥-٣٧.

[3] لێرەدا بەیاشی دەزانم جارێکی تر بگەڕێیتەوە باسی عەقڵ و نەقڵەکەو بیخوێنیتەوە بەجوانی و لێـی وردبیتـەوە، چونکە جۆرێك لە جۆرەکان هەماهەنگی هەیە لە نێوانیاندا.

زانستی مرۆڤ هەرچەندە بەرەو پێشەوە بچێت و هەرچەندە شت بدۆزێتەوە، هێشتا ئەو شتانەی كە نەیدۆزیوەتەوەو هێشتا پەی پێ نەبردووە چەندین قاتی ئەوەن كە دۆزراونەتەوەو شتێكی لەبارەوە ئەزانرێ!!

هەروەكو چۆن وتمان عەقڵ و ژیریی مرۆڤ سنووردارە زانست زۆر لەپێشترە بەو سنووردارییەو زۆرێك لەوبابەتانەی كە ئەمڕۆ دەمەقاڵێی لەسەر دەكرێت و شەڕو كێشمەكێشمی لەسەر دەكرێت، سبەی هەڵدەوەشێنرێتەوەو كەسێكی تر بە بیردۆزێكی ترەوە دێت و شوێن پێی كەسی پێش خۆی لێژ و لەق دەكات، ڕەنگە هەر خۆشی بڕوای بگۆڕێت و شتێكی نامۆ نیەو دیویشمانە كە زۆر بابەت بە ڕاستی زانستی نیشان دەدرا، بەڵام لە درۆیەك زیاتر نەبوون و دواتر هەر خۆیان خاوەن ئەو بۆچوونانەیان دایە بەر تانەو تەشەر.

## بیردۆزەكان لە گۆڕاندان!!

ئایا بیرمان چوو ساڵانی زوو چیان پێ نەدەكردین لەسەر بیردۆزی داروین[1] و چەندە ئێمەیان بە كۆنەپەرست و دواكەوتوو دادەنا لەبەرئەوەی بڕوامان بە بیردۆزی پەرەسەندن نەبوو؟!

باشە هەر دوایی خۆیان نەبوون كە بیردۆزەكەیان سووك كرد و بە خورافەت و درۆیان لەقەڵەم داو هیچ حورمەتێكی زانستییان بۆی نەهێشتەوە؟!

تەنانەت وایان كردبوو لەخەڵكی نەیاندەزانی سەر بە كوێدابكەن و وتەی كێ وەرگرن، ئایا بە گوێی كاردیناڵ هینری بكەن كە ئەیوت: "دیدگای داروین فەلسەفەیەكی وەحشیگەرییە"!! یان بە گوێی زانای بایەلۆجی بەریتانی تۆماس هێنری هاكسلی بكەن كە هێندەی بەرگری لە داروین دەكرد ناوی خۆی نابوو "سەگی پاسەوانی داروین"[2]؟!

(1) Charles Robert Darwin

(2) Darwin's Bulldog

ئەو زانستەی ئەوان پێی گەیشتوون و ئەمڕۆ بوە بە حەقیقەت و نابێت ئینكاری بكرێت، زادەی بۆچوونی خەڵكانێكە كە هەر كۆمەڵێك و چۆنی پێ خۆشبووە بەو شێوەیە لێدوانی داوەو ئاقاری كۆمەڵگەشیان پێ گۆڕیوە!!

ئەوەتا ژیانی خەڵكیان تێكدا بە بۆچوونە خراپ و نەرێیەكانیان، و هەروەكو زانای گەورەو فەیلەسوفی ئیسلامی مستەفا سەبری[1] فەرمووی ئەگەر بۆمبی نەوەویشیان بەجیهانەوە بنایە هێندەی بۆچوونەكانی ئەوان خراپ نەبوو، بۆ نموونە:

**مارکس[2]( ١٨١٨ ـ ١٨٨٣):**

هەموو شتێك لای ئەو هەر مادەیەو هیچ بەهایەك بۆ مرۆڤ و خوود و ناخ و ویژدان و ڕۆح نایەلێتەوەو مامەڵەكردن لەلای ئەو لەگەڵ مرۆڤدا مامەڵەكردنە لەگەڵ بەرد یاخود دار یان ئەتوانی وەك ڕۆبۆتێك چۆنت ویست سوودی لێ ببینیت و بەكاری بێنیت.

**نیچە[3]( ١٨٤٤ـ ١٩٠٠):**

بڕوای بە مانەوەیە بۆ كەسی بەهێزو بیردۆزی پیاوی سۆپەرمانیی هێنایە ئاراوە!! كە بوە هۆی نەمانی هەموو جۆرە ئاكارێكی بەرزو جوان و پێی وایە نابێت یارمەتی هەژار و لێقەوماو پیر و پەككەوتە بدرێت، بڕوای بە كوشت و بڕە تامانەوە بەڵام خۆی كاتێك خوێنی بینیوە بوراوەتەوەو خۆی پێ نەگیراوە!!

---

[1] بەداخەوە مسوڵمانان بێ خەبەرن لە كتێبە بەنرخ و بە پێزەكانی ئەم زانا گەورەیە، كە پەردەی لەسەر فەلاسفەی ڕۆژئاوا هەڵماڵیوە.

[2] Karl Heinrich Marx

[3] Friedrich Nietzsche

**هێربێت سبنسەر[١](١٨٢٠-١٩٠٣):**

ئەو دەسەڵاتێكی تەواو بێ ئەندازەو ڕەهای دابوو بە سروشت و تەنانەت وای ئەبینی سرووشت چۆنبوو با وابێت و كەس مافی ئەوەی نییە كە هەوڵی چاككردن و تەربیەكردن و ئاراستەكردنی كەس بكات و لەگەڵیدا خەریكبێت، هەموو دەستەوسان دانیشین و چاوەڕوانی سرووشتبین و بزانین ئەو هێزەی كە پێی دەوترێت سرووشت و ئەوان بڕوایان پێیەتی چیمان بەسەردێنێ!!

**فرۆید(١٨٥٦-١٩٣٩)[٢]:**

كە هەموو شتێك لای ئەو هەر شەهوەتو ئارەزووەو تەنانەت منداڵ لەبەر شەهوەت مەمكی دایكی دەگرێت و تەنانەت پێغەمبەران(عليهم السلام) لە دیدی ئەودا كەسانێكی ئارەزو بازن و كاتێك لای پیاوان دادەنیشن مەیلیان هەیە بۆیان بۆیە دادەنیشن لەلایان!!

ئەمڕۆ لە دنیای سیاسەت و فەلسەفەی سیاسی زۆر باس و خواسی ماكیاڤێلی دەكرێت و ڕەنگە دیارترین كەسی ئیتاڵیابێت و زۆرترین باسی هەبێت.

**ماكیاڤێلی(١٤٦٩-١٥٢٧)[٣]:**

ئەو ڕای وابوو كە كاربەدەست دوو جۆر خەسڵەتی هەیە، یەكێكیان كاری باش و مرۆڤدۆستانەیەو ئەوی تریان بەكارهێنانی هێزەو ئەمەش خەسڵەتێكی ئاژەڵیانەیە لای ئەو، بەڵام پێی وابوو كاربەدەستی سەركەوتوو ئەوەیە كە هەم خەسڵەتی مرۆڤ و هەم خەسڵەتی ئاژەڵیشی تێدابێت.

---

(١) Herbert Spencer

(٢) Sigmund Freud

(٣) Niccolò di Bernardo dei Machiavelli

ئەو پێی وابوو هەرچیەك ئەتوانی بیكەیت لە درۆو غەش و فێل بۆ مانەوەی دەسەڵاتت زۆر شتێكی ئاساییە و بڕوای بەوە هەبوو "ئامانج هیچ شتێك ناخوێنێتەوە"!!

ئەو بڕوای بەوەبوو كە درۆكردن زۆر شتێكی سادەیەو ئەتوانی تاوەكو بڕوات پێ دەكەن هەر درۆ بكەیت و بۆ پینەكردنی درۆیەك پێویستت بە درۆیەكی دیكە هەیە بۆیە ئەیوت: "درۆبكە درۆ بكە تاوەكو خەڵكی بەڕاستت دەخەنەوە"!!

ئەو پێی وابوو كاربەدەست ئەبێت هەندێك جار فێڵبازبێت وەكو ڕێوی و هەندێكجاریش بەشەهامەت بێت وەكو شێر و ئەگەر ئەو دەست بداتە چاكەكردن ئەوا دەسەڵاتەكەی لەناو دەچێت، هەندێك جاریش ئەگەر بینی خەڵكی حەزیان بە ئاینە پێویستە وەك كەسێكی ئاینی دەركەوێت!!

دیسانەوە ئەگەڕێینەوەو دەڵێین: ئەگەر باسی هۆكاری زانیاری و زانست دەكەیت كە سەرچاوەكەیان چیەو لەچیەوە بەدەست دێت ئەوا پێت دەڵێم: لە قوتابخانەی ئیغریقی كۆندا چەندین تەیار هەبوون و هەریەكەو خاوەن بۆچوونی خۆیان بوون:

تەیاری هەستیەكان:

كە هەستی مرۆڤیان دەكردە حاكم و وەرگری زانیاری.

تەیاری گومانییەكان:

كە گومانیان دەكردە پێوەری گشت شتێك و تەنانەت گومان لە بوونی خۆشت!!

تەیاری میسالیی(نمونەخوازەكان):

ئەمانیش هەرچی دەوری هەستەكانە بەلایانەوە ناو ڕۆڵی تەواوەتیان دا بەعەقڵ و ژیریی و سەرەتای ئەم قوتابخانەیەش بۆ فیساگۆرس دەگەڕێتەوەو، تەنانەت ئەفلاتون دەڵێت: ژیریی بەتەنها بەسەو هەستەكان نەك پێویست نین بەڵكو سەر لە عەقڵیش ئەشێوێنن.

تەیاری ئەرستی:

ئەم تەیارە ئەرستوتالیس دایهێناو ڕێك پێچەوانەی میسالیەكانن و سەرداریێتیان داوە بە هەستەكان و ڕۆڵی گرنگیان بەم داوەو لەدوای ئەویش عەقڵ دێت.

## سۆفستاییەكان:

لەسەر ڕای بڵاو لێیانەوە: بڕوایان نە بەهەست و نە بەعەقڵ و ژیرییش هەیە بۆ ڕاستیەكان و كار گەیشتوەتە ئەوەی بڕوایان بە مەوجوداتیش نەمێنێت!!

لە یۆنان تاوەكو دەركەوتنی سۆقرات بەردەوام لە كێشمەكێشمی فیكری و جەدەلی بێمانادابوون و تەواو لە سنوور دەرچووبوون، بەڵام سۆقرات هات و هەر یەكێك لە عەقڵ و هەست مافی خۆی دایەو سنووریشی بۆ دانان دوابەدوای خۆشی ئەفلاتون ئەرستۆ هاتنە مەیدانەوە.

## قوتابخانەی شەك و گومان:

چەند جۆرێك بوون:

### گومانی ڕەها:

كە گومانیان لە عەقڵ و هەستیش پێكەوە دەكرد و حەقیقەتیان بۆ هیچ شتێك نەهێشتەوەو دیارترین كەسێكیشیان بریتییە لە بیرون(بیررو) كە نزیكی(٢٧٥) ساڵ پێش زاین مردووە، وەك هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن: خۆی لە هیچ شتێكی ترسناك نەدەپاراست چونكە نەبڕوای بە عەقڵی هەبوو نە بە هەستیشی، بە پێچەوانەوە هەندێك دەڵێت نەخێر زۆر خۆی دەپاراست، بەهەرحاڵ لەكاتێكدا ئەمە حاڵی بوو كاریگەریەكی تەواوی بەجێهێشتبوو لەسەر هەریەكە لە:

ئەریكسلاوس:

كە بەداهێنەری ئەكادیمیای ناوەند دادەنرێت.

ئەبیقۆر:

كەخاوەن قوتابخانەیەكی سەربەخۆیەو هەر بەناوی خۆیەوە ناونراوەو، ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیمیش زۆر بۆچوونیان پووچەڵ كردوەتەوە.

زۆرێكی تر لە یۆنانیەكان كە لەژێر كاریگەری بۆچوونەكانیدابوون، هەروەها "داڤید هیۆم" یش زۆر پێی كاریگەربووە.

داڤید هیۆم(١٧١١-١٧٧٦)[١]:

چونكە كاریگەرییەكی تەواوی جێ هێشتووە بەسەر هەردوو قوتابخانەی فەلسەفی ئەورووپیەوە: (قوتابخانەی شەك) و(قوتابخانەی تەجریبی)!!

داڤید هیۆم تەواو لە ژێر كاریگەری فەلسەفەی جۆن لۆكدابوو، پێی وابوو كە عەقل و ژیریی كۆیلەیەو دەبێت كۆیلەی عاتیفەو سۆزبێت، هەرگیز وەها گومانێكیش نەبەیت كارێكی تری هەیە بێ لەخزمەتكردنی عاتیفەو گوێڕایەڵیكردنی، هەروەها لای وابوو هەرگیز عەقڵ و ژیریی ناتوانێت جیاوازی بكات لە نێوان باش و خراپدا!!

---

[١] David Hume

## گومان بە ئەندازەگیری:

ئەمانیش دوو بەش بوون بەشێکیان گومانەکانیان ئاڕاستەی هەستەکان دەکرد و بڕیاری هەستیان وەرنەدەگرت، هەندێکیشیان ئاڕاستەی عەقڵ و ژیرییان دەکرد و بڕیارەکانیان وەرنەدەگرت!!

جا ئەمڕۆ هەموو ئەو زانستانەی کە ئۆزۆن باسی دەکات بەدەر نییە لەو هەموو کێشمەکێشم و ناکۆکیەو هەرگیز ناتوانرێت یەقینیان لێوە وەدەستبێت، چونکە علومە تەبیعیەکان لە ڕێگەی تەجروبەوە بەدەست دێن و تەجروبەو تاقیکردنەوەش پشت بەهەست دەبەستن و بەردەوام لە ئەگەری هەڵەکردندایە، ئێمە نایەین لێرە بچینە وردەکاریەکانی ئەم بابەتەو هەموو نەنگیەکانی بە تۆی خوێنەر بناسێنین بەڵام ئەمەی باسمان کرد وەکو

## بیردۆز شتێکەو حەقیقەت شتێکی تر!

پێشەکیەك بوو، بۆ ئەو شتانەی کە ئۆزۆن بە حەقیقەتی عیلمی ناو دەبات و لێمانی دەکەن بە حەقیقەتی عیلمی[1]!!

دێمەوەو دەڵێم: ئەوەی کە ئەمڕۆ هەیەو پێی ئەوترێت زانست ئەگەر سەلمێنرابێت و سەد لە سەد بێت، بەتەحەدداوە یەك دەقی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەریش(ﷺ) پێچەوانەی ئەو حەقیقەتە نیە، بەڵام ئەمڕۆ خەڵکانێك جیاوازی ناکەن لەنێوان بیردۆز و حەقیقەت!

بیردۆز هێشتا هەر دید و بۆچوون و قسەیەو جاریٚ یەکلا نەبوەتەوەو نەسەلمێنراوەو دانی پێدا نەنراوە.

بەڵام کاتێك ئەوترێت ئەو شتە حەقیقەتە: ئەوە لای زانایانی ئەو زانستە جێی متمانەو باوەڕەو دانیان پێدا ناوەو لە بیردۆز هاتوەتە دەرەوە.

---

[1] بەڵکو خوای گەورە دەرفەت بدات ئەو شەڕەقۆچەی کە هەیە لەنێوان فەلسەفەو ئایدیا مادیەکان، هەمووی بخەینە ژێر باس و خواس و تاوتوێی زۆر بابەت بکەین کە لەلای زۆرێك لە خوێنەران شاراوەیەو ئەوە بەدیار بخەین کە چیان بە مرۆڤایەتی کرد بەناوی زانست و عەقڵەوەو خۆشیان گەیشتنە کویٚ!!

جا بەهۆی تێكەڵكردنی ئەم دوو بابەتەوە زۆر جار ڕەخنەی گەورەو بیٚ مانا دەگیرێت و ئەوتریێت دەقە پیرۆزەكانتان پێچەوانەی ڕاستیە زانستیەكانە.

## زانستی سەردەمو شەڕی مەرامە جیا جیاكان!

ئەمە تەنها وەكو ئاشناكردنی تۆی خوێنەری بەڕێز بەو بابەتە، ئەگینا وەكو دانان بە هەموو ئەو شتانەی كە ئەوان دەڵێن: حەقیقەتی زانستیەو تەواو گومان هەڵناگرێت، لەهەموو شتێكدا ڕاست ناكەن لەگەڵ خەڵكیداو بەردەوام ئەوان زانستەكەیان بەكارهێناوە لە پێناو بەرژەوەندی خۆیان و باكیشیان بەوە نییە كە درۆ بەدەم زانستەوە بكەن یاخود نا، چۆن ئەوان درۆكردن بەدەم زانستەوە بە گەورە دادەنێن لەكاتێكدا باو وباپیرانیان كتێبەكانی خوای گەورەیان گۆڕی و دەستكاریان كرد و زیادیان كرد و لێیان خستە سەری و لێیان كەمكردەوە!!

ئەوان لەبەر بەرژەوەندی و مەرامی سیاسی و ئاینی خۆیان هەموو شتێك دەكەن، من تەنها یەك نمونەت بدەمیٚ: پرسی چوونە سەرمانگ و نەچوونە سەر مانگ، تا ئێستاش یەكلا نەبوەتەوە ئایا كەس چووە یاخود نا؟!

ئەمریكا بۆ گەورەكردنی شان و باڵ و دروستكردنی هەیمەنە بۆ خۆی، سوورە لەسەر ئەوەی چوونەتە سەر مانگ و یەكەم كەس بوون و وێنەیەكیشیان بە ئاڵای ئەمریكاوە لەویٚ گرتووە بە گومانی خۆیان!

بەڵام لەولاشەوە ڕوسیا ئەوەی بڕوای پێی نەبێت چوونە سەرمانگە بۆ یەكەمجار لەلایەن ئەمریكاوەو بەڵكو دەڵێت: بۆخۆی چوەتە سەر مانگ بۆ یەكەمجار!

لەولاشەوە كۆمەڵێكی زۆری خەڵك چوونە سەرمانگی هەردوكیان بە درۆیەكی شاخدار دەبینن و پێیان وایە تاوەكو ئێستا كەس نەچوەتە سەرمانگ و ئەوەی تاوەكو ئێستا وتراوە تەنها درۆیەكی سیاسی بوە لەخزمەت بەرژەوەندیەكانیان!

پاشان بۆ ناپرسن ئەمڕۆ دۆزینەوە زانستیەكان و ڕاگەیاندنیان لە چنگی كێدایەو و كێیە بەڕێوەی دەبات و "ناسا" لەدەستی كێدایە؟!

ئایا تۆ بڵێی  تەنها ڕاستیەكان وەكو خۆی بەیان بكرێت یاخود بۆ مەرامی تر بەكار هێنراوە؟!

ئەمڕۆ هەموو سەرچاوە زانستیەكان –زانستی تەجریبی– لەژێردەستی جولەكەدایەو ئەوانەشی كاری تێدا دەكەن و باڵادەستن یان خاچ پەرستن یاخود جوولەكە[1].

باشە بە درێژایی مێژووی دروستبوونی بزوتنەوە تەبشیریەكان هەوڵی لەناوبردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان داوەو تەنانەت یەك ساتیش لەوە سارد نەبونەتەوە،  تۆ بڵێی ئەوان ئەم ڕێگەیەشیان بەكار نەهێنابێت لە دژی ئیسلام؟!

هەر ئەوان بوون هەموو ڕێگایەكیان ئاسان كرد بۆ ڕۆژهەڵاتناسەكانی خۆیان و هەستان بە تێكدانی حەقیقەت و ڕاستیەكان و دەستكاری كردنی حەقیقەتەكانی ئەم ئیسلامە و ئەمڕۆ ئەو ڕێگەیان لەبەردەستە تۆ بڵێی بەكاریان نەهێنابێت؟!

ئەوان هیچ ڕێگەیەك نەماوە هەر لە ڕێكخراوە خێرخوازی و كۆمەڵە پزیشكی و ڕێكخراوە تەبشیری و هۆكارەكانی ڕاگەیاندن و ... هەموویان بەكارهێناوە دژی ئیسلام جا ئەگەر وا گومان بەریت كە ئەمەیان وازلێهێناوەو لێرەشەوە هەوڵی شێواندنی ئیسلام و گومان خستنە سەر دەقە پیرۆزەكانی نەداوە ئەوا ئەوپەڕی گێلێتیە!!

كاتێك ئەوان ئامادە نەبن گفتوگۆی نامەی دكتۆرایەك بكەن لەزانكۆكانیاندا لەسەر ئەوەی كە ئافرەت مافی هەیە لە ئیسلامدا،  تۆ بڵێی ئەوان ئامادەی خیانەت نەبن ئێستا بەوەی كە لەبەردەستیانایە[2]؟!

---

[1] جا لێرەوە بۆت دەردەكەوێ ئەوەی كە بێ دینەكانی خۆمان بانگەشەی بۆ دەكەن كە ئاین هۆكاری دواكەوتنی پیشەسازی و تەكنەلۆژییە، لە درۆیەك زیاتر نیە، چونكە بێ دینەكان لە ٠,٥٪ ی داهێنانە زانستیەكانیشیان بەرناكەوێت و هیچ بەرهەمێكیان نەبوەو نیە لە قسە زیاتر بە ئێستاشەوە.

[2] دكتۆر موستەفا سوباعی دەڵێت: پرۆفیسۆر "ئەندرسۆن" ی سەرۆك بەشی "یاساو باری كەسێتی" لە "پەیمانگای خوێندنە ڕۆژهەڵاتیەكان" لە "لەندەن" خۆی پێی وتم كە خوێندكارێكیان لەسەر ئەوە ڕەت كردوەتەوە، دواتر باسی گفتوگۆی خۆیان دەكات لەسەر ئەو بابەتەو زۆر بابەتی تر!!

كاتێك ئەوان ڕێگە نەدەن دكتۆر محمد ئەمین بڕوانامەی دكتۆرا بەدەست بێنێت لەساڵی ١٩٥٨ لە زانكۆی "لەندەن" لەبەر ئەوەی ڕەخنەبوو لە گەورە ڕۆژهەڵاتناس "شاخت"[١]، ناچاربوو ڕوویكردە زانكۆی " كامبردج" و لەوێش ڕازی نەبوون و ڕاستەوخۆ پێیان وت كە دەبێت واز لە ڕەخنەگرتن لە شاخت بهێنیت گەر دەتەوێ دكتۆرا بخوێنیت!!

جا تۆ بڵێی ئەوان كە بەردەوام لە پیلانگێڕیدابوبێتن، وا ئێستا ئەوەی لەبەردەستیانە بەكاری نەهێنن لە مەرامی خۆیان؟!

باشە چۆن مسوڵمان بیری ئەكات كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾الأنفال

هەروەها ئەفەموێ: ﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾الصف

شەڕو خراپەی ئەوان بەردەوامەو هەمیشە لەسەنگەردان بۆ لێدانی ئیسلام و لاوازكردنی بەڵام مسوڵمان بێ خەبەرە لەوەی كە ئەوان پیلانی بۆ دەگێڕن.

بۆ ئەم مەبەستەش تەنها ئەوەی كە لە پرۆتۆكۆڵی دانایانی جولەكەدا هاتووە بەسە بۆ كەسێك بیەوێت پەی بە ڕاستیەكان بەرێت، بۆ نموونە تێیدا هاتووە: "لا تتصوروا أن

[١] جۆزێف شاخت(١٩٠٢-١٩٦٩): ڕۆژهەڵاتناسێكی زۆر دڵڕەق و كینـاویی ئـەڵمانی بـوو، كـە بـەردەوام حەقیقەتی ئیسلامی ئەشێواند و خیانەتەكانیشی نەژمێردراون بەتایبەت لە كتێبـی "بدايـة الفقـه المحمـدي". دكتـۆر حاكم موتێری وەڵامی زۆرێك لە گومانـەكانی داوەتـەوە لـە نامـەی دكتۆراكـەی و، هـەروەها "الـشيـخ خالـد الـدريس" لە كتێبـی "العيوب المنهجيـة في كتابـات المستشـرق شـاخت" زۆر بـەڕوونی باسـی مەنهـەجی شـاختی كردوەو ڕەخنەی لـێ گرتـووە ،هـەروەها دكتـۆر مسـتەفا سـباعیش زۆر بـە وردی باسـی دەكـات لـە كتێبـی "المستشرقون"، هەروەها لە كتێبی "السنة"شدا.

تصريحاتنا كلمات جوفاء، ولاحظوا هنا أن نجاح داروِن وماركس ونيتشه، قد رتبناه من قبل"[1]

واتە: هەرگیز وا مەڕوانن كە لێدوانەكانی ئێمە وتەی بەتاڵن، جوان وردببنەوە كە سەركەوتنی داروین و ماركس و نیتچە، ئێمە لە پێشتر ڕێكمان خستبوو!

تۆ ئەگەر بڕوانیت هەرچەندە ماركس و نیتچە بڕوایان بە پەرەسەندنەكەی داروین هەبووە، بەڵام هەرسێكیان پێچەوانەی بۆچوونی ئاینی جوولەكەیەو ئەوان ئامادەن كاریان لەسەر بكەن و هاوكاریانبن و بۆچوونەكانیان برازێننەوە، بەس بۆ ئەوەی خەڵكی بەرەو مادەو پشتكردنە ئاین بڕوات و بەتایبەتیش واز لە ئیسلام و مەسیحیەت بێنن و كاریش لەسەر ئەوە ناكەن خەڵكی بكەنە جوولەكە چونكە ئاینەكەیان داخراوەو خەڵكی وەرناگرن، جا باشترین ڕێگە بێباوەڕكردنیانە لە ڕێگەی زانستەوەو بەرەو مادە بردنیانەو لەم ڕێگەیەشەوە دوایی ئەتوانن بیانكرن و بیانكەنە كۆیلەی بۆچوونەكانیان و ببنە بەندەی گوێ لەمشتی جوولەكە!!

هەروەها لە پرۆتۆكۆڵی(٩)دا هاتووە: "ولقد خدعنا الجيل الناشئ من الأميين، وجعلناه فاسدا متعفنا بما علمناه من مبادئ ونظريات معروف لدينا زيفها التام، ولكننا نحن أنفسنا الملقنون لها"[2].

واتە: ئێمە ئەو جیلە تازە پێگەیشتووەی نەخوێندەوارەكانمان[3]هەڵخەڵەتاند، وامان لێكردوون زۆر خراپ و بێكەڵكبن بەوەی فێرمان كردوون لەكۆمەڵێك بنچینەو بیردۆز كە ساختەییان لای ئێمە زانراوە، بەڵام ئێمە هەر دووبارەی ئەكەینەوەو تەڵقینیان ئەكەین.

هەروەها تێیدا هاتووە: "سنمضي القوانين التي سنحتاج إليها، وسنضعها أمام الجمهور على أنها حقائق ناجزة، ولن يجرؤ أحد على طلب استئناف النظر فيما تقرر امضاؤه، فضلا عن استئناف النظر"[1].

---

[1] پرۆتۆكۆڵی (٢) لا: ١٢٣- ١٢٤)، چاپی چوارەم، دار الكتاب العربي، بەیروت –لوبنان–

[2] پرۆتۆكۆڵی (٩) لاپەڕە (١٤٧).

[3] جوولەكە بە بێجگە لەخۆی دەڵێت: (جويم) واتە: نەخوێندەوار!!

واتە: ئەو یاسایانەی كە پێویستمان پێی ئەبێت بەرێی دەكەین، واشی دائەنێین لە پێشچاوی خەڵكی كە وابزانن هەمووی حەقیقەتی بەرێكراوە، هیچ كەسێكیش ناوێرێت داوای چاوخشاندنەوە بكات بەوەی كە بڕیاری لەسەر دەدەین، چ جای بگاتە چاوپیاخشاندنەوەی سەرتاسەری.

هەروەها: "سيفضح فلاسفتنا كل مساوئ الديانات الأممية(غير اليهودية)"[٢].

واتە: فەیلەسوفەكانی ئێمە پەردە هەڵەماڵن لەسەر تێكڕای خراپەی ئاینەكانی تر(بێجگە لە ئاینی جولەكە).

جا سەیر بكەن ئەمڕۆ شەڕەكە بەس لە دژی ئیسلامەو ڕوو لە خۆمانە چونكە تاكە ئاینە كە بەوشێوەیە گەشە دەكات و شوێنكەوتەی دڵسۆزی هەیەو ئامادەی هەموو جۆرێكی قوربانین لە پێناویدا.

ئایا ئێستا وای لێهاتووە دۆزینەوە زانستیەكان و تیۆرە بێ بنەماكانیان یاخود نا؟ بەڵێ بێگومان ئەمڕۆ هەر شتێك ئەوان بیڵێن، لای زۆرینەی خەڵكی دەبێتە یەقین و كەس ڕەتی ناكاتەوە.

## واقیع بەڵگەیە!!

ئەوەی كە وا لە ئێمە ئەكات وا بڵێین كە ئەم زانستانەیان بەكارهێناوە بۆ مەرامی سیاسی و ئاینی خۆیان و بەهێزكردنی پێگەیان، ڕەنگە هێندە بەسبێت بەلاَم تەنها دوو باسی تر دێنمە كایەوە ئەوانیش:

یەكەم: من هەر كاتێك كە مێژووم خوێندەوەو سەیری لەشكركێشی فەرەنسام كرد بۆ سەر میسر و بینیم یەكەم شوێن كە ناپلیۆن پەلاماریدا بریتی بوو لە ئەزهەر و دوایی كردیە تەویلەو شوێنی مانەوەی ئەسپەكانیان و، ئەزهەریان خاڵی كرد لە زانستەكانی فیزیا و كیمیاو زانستە مرۆییەكان و ... بردنی زاناكانمان بەرەو ڕۆژئاواو ناچاركردنیان بە خزمەت

---

[١] پرۆتۆكۆڵی (١٣) لاپەڕە (١٦٦-١٦٧).

[٢] پرۆتۆكۆڵی (١٤) لاپەڕە (١٧٠).

یان مردن، ئیتر گومانێكم بۆ دروست بوو باشە بۆچی ئەوان هەوڵی ئەوە ئەدەن زانستی مسوڵمانەكان ببەن و جیهانی ئیسلامی خاڵی بكەن لەو زانستانە؟!

دووەم: كوشتنی ئەو هەموو زاناو كەسە دیارانەی كە مسوڵمان بوون و ئامادە نەبوون بەو شێوەی ئەوان داوای دەكەن كار بكەن كە هەموویان ژێربەژێر نەمان و لەناوچوون و دوای ماوەیەكی زۆر هۆكاری مردنەكەیان ئاشكرا دەبوون، لەوانە:

١ – دكتۆر عەلی مستەفا مشرفە(ئەنیشتاینی عەرەب)[١]: من لە وەسفی ئەم زانا دیندارەی میسر هیچ ناڵێم و باسی ئەوە ناكەم كە لەسەردەمی خۆی بەتواناترین كەسبوو لە زەررەو هەر ئەوبوو یەكەمجار دۆزیەوە كە لە هایدرۆجینیش قومبلە دروست دەكرێت، بەڵام ئەو هەرگیز ئامادەی ئەوە نەبوو كە كەڵكی لیَ وەرگیرێت چونكە مسوڵمان بوو بڕوای بە كاولكاریی نەبوو، لەپاش مردنی ئەو بەچەند ساڵێك ڕوسیا توانی پەی بەوە بەرێت و دروستی بكات، ئەم زانایە من باسی هیچ لە داهێنانەكانی ناكەم و خۆتان بگەڕێن و ببینن كە خاوەن چی سامانێكی زانستی بووە!! بەڵام باسی ئەوە ئەكەم كە مۆساد دەرمانخواردیان كرد و دوای چەند ساڵێك خۆیان دانیان بەوەش نا كە كوشتویانە و "ئەلبێرت دتشینی" خۆی دانی بەوەدا نا كە لەرێگەی نزیكێكی مشرفەوە ژەهریان دەرخوارد داوە، هەروەك چۆن یەكێك لە خوێندكارە زیرەكەكانیشی كە دكتۆرە سەمیرە موسابوو یەكێك بوو لەو كەسانەی پسپۆریەكی تەواوی لە نەوەوی هەبوو، لەساڵی ١٩٥٢لەكالیفۆرنیا بە دەستی غەدری ئەوان گیانی سپارد.

٢ – دكتۆر یحیى المشد: یەكێك بوو لەكەڵەزاناكانی بواری یۆرانیۆم و زەررەو چەندین بواری تر، دوای ئەوەی لەفەڕەنسا كوژراو لە ساڵی ١٩٨٠ پاش ئەوەی چەند ڕۆژێك بەسەر كوشتنی تێپەڕبوو پۆلیسی فەڕەنسی هەواڵەكەی پشت ڕاست كردەوەو وای وێناكرد كە پەیوەندی خۆشەویستی هەبوەو لەبەر ئەوە لێی دراوەو كوژراوە!! دواتر هەموو شتێك ئاشكرابوو كە بە پیلانگێڕی دووژمنكارانە كوژراوە!

---

[١] لەگەڵ ئەلبێرت ئەنیشتایندا چەندین نامەیان گۆڕیوەتەوەو چەندین هەڵەشی بۆ ڕاستكردوەتەوەو دانی بەوپەڕی لێهاتویی موشرفەدا ناوە!

بەڵگەكان زۆر زۆرن و لەسەدان نموونە زیاترن كە بەوشێوەیە دەستی غەدر و ڕەشی ڕۆژئاوا و ئەمریكا لەناویان ئەبات و چەندین كەسیشیان تا ئێستا بیٚ سەرو شوێنن و بیٚ هەواڵن و تا ئێستاش ئەمە هەر بەردەوامەو وەك بینیمان خوێندكاری دكتۆرای سعودی حومەیدان توركی، كە لە ئەمریكا بڕیاری زیندانی هەتا هەتایی بەسەردا سەپاند و دواتر كەمیانكردەوە بۆ(٢٨) ساڵ، بۆ كارە بەدەكەشیان چیرۆكێكی ساختەیان دروستكر بۆ ئەوەی ئابڕووی كەسانی دیندار بروشێنن.

چەندین زانای تر كە لەدوای ئەوەی ڕێگەیان لێگرتن بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان و ئەوان ویستی گەڕانەوەیان هەبوو، بەڵام هەمووشیان لەلایەن كەسانی نەناسراوەوە دەكوژران وەكو لەهەواڵەكانیاندا دەهات[١]!!

من كە ئەمەم دی هەستم بەوەكرد كە پیلانێكی زۆر گەورە هەیەو ئومەتی ئیسلامی چاوەڕوانی كارەساتێكی زۆر گەورەیەو لێی دەكرێت گەر بەئاگا نەیەتەوە، بەڵیٚ وا بینیمان و ئەو فێڵە هاتە ئاراوە!!

گشت دۆزینەوە زانستیەكانیان خستە ژێر ڕكێفی خۆیانەوەو چۆنیان بویٚ وای لیٚ دەكەن و هەر شتێكیان بویٚ ئەیكەنە زانست و هەرچیشیان ویست ئەیكەنە نەزانی.

بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو پیلان و شەڕو خراپەیەی كە بەرامبەر ئومەتی ئیسلامی كراوەو دەكرێت، سوێند بەخوای گەورە ئەگەر ئەم ئاینە ڕاست و دروست نەبوایە ئێستا كەمێكیشی نەمابوو لە واقیعدا!!

خوای گەورە خەڵكانێكی خوڵقاندووە كە ڕووی ڕاستی ئەوان نیشانی مرۆڤایەتی بدەن و بەیانی حاڵی چەوتی ئەوان و دڵی ڕەقیان بكەن، لەئێستاشدا چەندین سەنتەری گەورە هەیە بۆ بەرگریكردن لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و

---

[١] هەروەكو زانای بلیمەتی فیزیا سەعید بودێری و دكتۆرە سەمیرە موسا و دكتۆر سەمیر نەجیب و، سەدەها چیرۆكی تر كە هەموویان لەناوبران وەكو ئەدیسۆنی ڕۆژئاوا حەسەن كامیل سەباح كە خاوەنی چەندین داهێنان بوو لە ١٩٣٥ لە ئەمریكا دەرمانخواردكرا، هەروەها گەورە زانای جوگرافیا جەمال حەمدان لەسەر نووسینی =

ئەوەیان دەرخستووە کە ئەوەی لە زانستی ڕاست و دروستدا هەیە لەگەڵ فەرموودەکاندا یەك دێتەوە[1] و هیچ پێچەوانەو دژی یەکتر نین.

بەڵام بەداخەوە ئەگەرچی ئەمڕۆ خەڵکانێك هیچ بەهایەکیان بۆ دەقە پیرۆزەکان نەهێشتوەتەوەو ئەیانەوێت ئەو زانستەی کە زادەی بیری مرۆڤە بکەنە پێوەر بۆ سەلماندنی ڕاست و دروستی دەقە پیرۆزەکان!!

من نامەوێ لەبەهای سەنتەرەکانی ئیعجازی زانستی کەم بکەمەوە وکارە گەورەکانیان بەرز نەنرخێنم، بەڵکو تەنها ئەمەوێ ئەوە بڵێم: نەکەن ئەو زانستە بکەنە پێوەری هەڵسەنگاندنی دەقەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر ئەو هۆیانەی کە ڕابوورد و هەرگیز تیۆرە زانستیەکان و بگرە ئەوەشی پێی دەوترێت حەقیقەتی زانستی لە ئەمڕۆدا جێگیر نیەو لە گۆڕاندایە.

## زانستی تەجریبی یەقین نادات بە دەستەوە!!

سەرەڕای ئەم هەموو باس و خواسانەی کە کردمان هێشتا دۆزینەوە زانستیەکان یەقین نابەخشن، چونکە دوو جۆر بەدواداچوون و تاوتوێکردنمان هەیە لە فەلسەفەی زانست و لێکۆڵینەوە زانستیەکاندا، ئەوانیش:

١ – الإِسْتِقْرَاءُ التَّامُ: بریتییە لەو بەدواداچوونەی کە لەکاتی بڕیاردان لەسەر شتێك سەرجەم ئەو بابەتانەی پەیوەندی پێیەوە هەیەو سەرجەمی تاکەکانی ئەخەیتە ژێر لێکۆڵینەوەوە، پاشان بڕیارێکی لەسەر دەدەیت، بۆ نموونە ئەگەر بتەوێ ئاستی زانستی

---

= کتێبێك لەسەر یەهود تیرۆریان کرد . ئەتوانی بگەڕێیتەوە سەر کتێبی (الموساد واغتیال علماء العرب) د.یوسف حسن

[1] دەڵێم: ئەوەی کە دۆزراوەتەوە لە زانستدا لەگەڵ قورئان و فەرموودە یەك دێتەوە نەوەك بڵێی: قورئان و سوننەت لەگەڵ زانستی سەردەمدا یەکدێتەوە، چونکە زۆر بێ مانایە بێیت و بتەوێ قورئان و فەرموودە کە وەحین لەگەڵ زانستدا کە زادەی ئامانج و هەوڵی مرۆڤە بەراورد بکەیت یاخود ڕاستی وەحیەکە بە زانستەکەدا بسەلمێنیت لە هەموو بارێکدا.

دانیشتوانی شارێك بزانیت دێیت لێكۆڵینەوە لەسەر تاك تاكیان دەكەیت، بۆ بەدەست خستنی زانیاری درووست.

ئەم جۆرەیان لای زانایانی لۆژیك، بە یەقین دادەنرێت و وەردەگیرێت.

٢ – الإِسْتِقْرَاءُ النَّاقِصُ: ئەم جۆرە بەدواداچوونە بریتییە لەوەی هەندێك بە نموونە وەردەگیرێت و بڕیار لەسەر تێكڕای دەدرێت بە هۆی ئەو بڕەوە كە وەرگیراوە.

بەڵام ئەمەیان بە تێكڕای وتەی فەیلەسوف و زانایانی لۆژیك، تەنها گومانەو ناگاتە یەقین.

دەی ئێستا كاتی ئەوەیە بڵێم: دۆزینەوە زانستیەكانی ئەمڕۆ زۆرینەیان خاڵی دووەمی تێدا جێ بەجێ دەكرێت و بەو ڕێگەیە بڕیارەكانی تێدا دەدرێت، بۆیە لە گومانێك زیاتر نیە!!

ئێستاش لەگەڵم وەرە با بچینە لای ئۆزۆن و تاوتوێی ڕەخنەكانی و یەك بەیەك بیانهێنین و وەڵامی دروستیان بدەینەوە[١]:

---

[١] ع: (٢٥-٢٦)، ك: (٣٥-٣٧).

**یەكەم: خۆر هەموو ڕۆژێك ئەچێتە بن تەختی خوداو كڕنووش دەبات، بەڵام ئێستا ئەوە یەكلایی بوەتەوە كە ئەوە زەویە دەسوڕێتەوە!!**

**وەڵام**: بەڕاستی ئەم وتەیە تەنها لەكەسێكەوە دێتە دەرەوە كە دڵی پڕە لە مەراق و كینەو نازانێت چۆن گومان دروست بكات لەسەر حەقیقەتی ئەم ئیسلامە، بۆیە دەڵێم ئەم ئیسلامە چونكە ئەم وتەیەی ئۆزۆن كە دەڵێت "ئەوە زەویە دەسوڕێتەوە" مانای وایە نەفی جوڵان لە خۆر دەكاتەوەو وای نیشان ئەدا كە خۆر ناجوڵێتەوەو جێگیرە، جا ئەمە تەنها ڕووەو فەرموودە نییە بەڵكو سەر بۆ قورئانیش دەكێشێ و ڕاستەوخۆ گومانە لەسەر چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز كە باسی ئەوە دەكەن كە خۆر ئەجوڵێت و جێگیر نیە، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ ۝٢ ﴾الرعد

هەروەها دەفەرموێت :﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ۝٣٣ ﴾الأنبياء

هەروەها لەم ئایەتەدا زۆر بە ڕوونتر دەفەرموێت: ﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ۝٣٨ ﴾یس

جا خوێنەری خۆشەویست باش بزانە كە ئۆزۆن لەم نووسراوەو نووسراوەكانی تریشی كێشەی تەنها ئەم ناوانە نییە كە ڕەخنەیان لێ دەگرێت، بەڵكو كێشەی ئەو بریتییە لە ئیسلام!!

ئەم حەقیقەتە قورئانیە نەزانراوبوو لە دنیای زانسی سەردەم تا لەسەدەكانی دواتردا زانای فەلەكی ئینگلیزی "ڕیتشارد كارینگتۆن" لەساڵی(١٨٥٩)دا دانی پێدا نا كە خۆر دەجوڵێت و جێگیر نیە.

زانایانی فەلەك و فیزیاش تاوەكو ئێستا یەكدەنگ نین لەبارەی جوڵان و وەستانی خۆر و بەڵگەی یەكلا كەرەوەشیان نییە هیچ كام لەو دوو بۆچوونە تەنانەت ئەوانەشی كە پێیان

وایە كە خۆر وەستاوەو ناجوڵێتەوە زۆرێكیان ڕایان وایە كە ئەمە هێشتا نەگەیشتوەتە ئاستی بیردۆز و هێشتا شتێكی ڕێژەییو ئەوان دەڵێن جێگیرە لەولاشەوە كۆمەڵێكی تر دەڵێت جێگیر نیە، لەو زانایانەی كە دەڵێن شتێكی ڕێژەییە:

(فرید هویلّ، پول تشارلز ولیام داڤیس، بیرتراند ڕاسڵ و ....).

دەی كەوابوو كێ ئەتوانێ لەخۆیەوە بەناوی زانستەوە ڕەخنە لەم ئایەتانە یاخود ئەو فەرموودەیە بگرێت؟!

بەڵام كەسی ئیماندار كاتێك ئەبینێت خوای گەورەو پێغەمبەرەكەی(ﷺ) شتێك دەفەرموون و لێی تێگەیشتن وەكو خۆی خێرا شوێنی دەكەون و بڕوای تەواوی پێ دەهێنن.

سەبارەت بە كڕنووشی خۆریش دەڵێم: جارێ با ئۆزۆن پێمان بڵێت عەرش چیەو چۆنە؟! تاوەكو ئێمەش پێی بڵێین ئەو كڕنووشەی لە فەرموودەكەدا هاتووە چۆنە!!

ئێمە قسە لەسەر شتێكی غەیبی نادیار دەكەین و زانستمان بەو چۆنیەتیە نییە وەكو باقی شتە نادیار و غەیبیەكان، هەر وەكو زانایانی مەنتیق دەڵێن: نەبوونی زانست بە شتێك مانای نەبوونی ئەو شتە نیە!!

بەڕاستی وتەیەكی زۆر جوانە بۆ كەسێك بیەوێ تێبگات و توانای تێگەیشتنی هەبێت، چونكە ئێمە زۆر شت هەیە كە پێشتر زانستمان پێی نەبوەو ئەویش بوونی هەبوەو خەریكی ئیشی خۆی بووە، بەڵام دوای ئەوەی كە زانستمان لەلا دروست بوو ئەبێتە شتێكی زۆر سادەو ساكار.

ئەگەر نمونەیەكی گریمانەیی بێنمەوە بۆ زیاتر نزیك بوونەوەی فیكرەكە دەڵێم: هەروەكو كۆرپەیەك كە لەسكی دایكیایەتی و لە جیهانێكی تایبەت بە خۆیەتی و هیچ زانیاریەكی سەبارەت بەم جیهانەی ئێمە نیە، ئەگەر هات و كەسێك داوای لێ بكات باسی ئەم جیهانەی خۆمانی بۆبكات ئەگەر بێت و ئەو كۆرپەیە توانای وەڵامدانەوەشی هەبێت ناتوانێت هیچ بڵێت چونكە زانیاری نییە لەبارەیەوە، ئەم بێ وەڵامیەی ئەو و نەبوونی زانیاری نابێتە هۆی ئەوەی كە ئەم جیهانە بوونی نەبێت و حەقیقەتێكی نەبێت بەڵكو ئەو

نایزانێت و توانای وەڵامی نییە چونكە نەیدیوەو بۆی باسنەكراوەو زانیاری پیێ نییە لەبارەیەوە، ئەگەر هەر ئەو كۆرپەیە هاتە ئەم ژیانەو گەورەبوو پرسیاری ئەم جیهانەی لیێ بكەین؟!

بێگومان ئەو كاتە وەڵام ئەداتەوەو باسی وردەكاریەكانیشیت بۆ دەكات و ڕەنگە وەكو پسپۆڕێكی گەردوونیش وەڵام بداتەوە!!

جا بەهەمان شێوەش ئەو هەواڵە هەواڵێكی غەیبیەو بڕوامان پێیەتی بەو شێوەی كە هاتووەو نازانین حەقیقەتەكەی چۆنە هەروەكو چۆن بڕوامان بە عەرشەو نازانین حەقیقەتی چۆنە و قسەشی لێوە ناكەین، چونكە بابەتێكی غەیبیەو هەرچی بڵێین هەر وتەیەو بنەمایەكی نیە.

هەروەها خوای گەورە باسی كڕنووشی خۆر و مانگ و زۆر شتی تریشی كردووە:

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ ﴾الحج

خوێنەری خۆشەویست دڵنیابە لەوەی ئۆزۆن چاك ئەزانێت كە ئەمە لە قورئانیشدا هاتوە، بەڵام جاریێ لەبەر هەر هۆكارێك بێت نەگەیشتوەتە ئەو ڕادەیەی كە بە ئاشكرا ڕەخنە لە قورئان بگرێت، ئەگینا ئەوەتا لەم ئایەتەدا زۆر بە ڕوونی باسی ئەوە دەكات كە خۆرو بێجگە لەویش كڕنووش دەبات!!

ئەوانەی كە ڕەخنە لەوە دەگرن كە چۆن كڕنووش دەبات بۆ ئێمە نایبینین؟! چۆن ئەو دارانەی كە بە پێشچاومانەوەیە كڕنووش دەبەن و ئێمە نایبینین؟!

بێگومان ئەو كڕنووشبردنە بە شێوەیەكی تایبەت بەخۆیەتی كە خوای گەورە پێی داوەو جیاواز لەوەی كە بە ئێمەی داوە و تەنها لە ناودا ئەو دوو كڕنووشبردنە یەكێكن، چونكە حەقیقەتی شتەكان بە پێی جۆری ئەوانەی كە پێی هەڵدەستن و ئەیهێننە جیێ دەگۆڕێت با لە ناویشدا یەكێكبن.

من لێرە پرسیارێكی ئاڕاستە دەكەم و **دەڵێم**: باشە ئێمە چۆن هەموو بڕوامان بە هەناسەدانی دارەكان و زۆر كرداری تریان كە زانایانی ڕووەك باسی دەكەن، لەكاتێكدا هیچیان نابینین و ئەگەر چی بەدرێژایی ڕۆژیش تێڕامێین لێیان و بەشتێكی سەیریشی نابینیت، بەڵام ئەوەی كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی لەلات سەیرە؟!

ئەی باشە چۆن هەموو تەسلیمی زانستی سەردەم بوون كاتێك وتی زەوی دەسوڕێتەوە؟ ئەوەتا ئێمە لەسەری دەژین و ئەبینین وەستاوەو سوڕانەوەكەی نابینین!

جا بەو شێوەیە بڕۆ چەندین نمونەی تر دەبینیت كە خەڵكی تەسلیمی زانستی سەردەم بوون لەكاتێكدا چاو پێچەوانەی ئەو هەواڵانەی ئەوانە!!

**دووەم: درێژیی ئادەم سەلامی خوای لەسەربێت كە(٦٠) باڵە و زانستی سەردەم ئەوەی نەسەلماندووە:**

**دەڵێم:** زانستی سەردەم نەیسەلماندووە بەڵگەی نەبوونی نییە وەكو وتمان هەر شتێك كە زانست لەسەری نەبوو بەڵگەی نەبوونی نییە و نمونەشمان هێنایەوە لەسەری، مەگەر كەسێكی وەكو ئۆزۆن هەر ئینكاری بكات و نەیەوێ ملكەچی حەق بێت!!

ئەوكات زیاتر لەگەڵی دەدوێم و **دەڵێم:** دەكرێت تەفسیری فەرموودەكە بەو شێوەیە بكرێت وەكو موعەلیمی یەمانی دەفەرمویت: دەكرێت فەرموودەكە باس لەوە بكات باڵای ئادەم هێندەبووە لە بەهەشتداو پێش ئەوەی كە دابەزێنرێتە دونیاو لە دونیادا قەبارەیەكی پێدرابێت هێندەی قەبارەی خەڵكی دنیا.

باشە بەم تەفسیرەی موعەلیمی چی كێشەیەك لە گۆڕێیە بۆ كەسێك حەقی بوێت؟!

یان زەمەن كاریگەری هەبوبێت لەسەر باڵاو بەپێی تێپەڕبوونی ڕۆژگار باڵا كورت بوبێتەوە وەكو تەمەن، بۆنموونە خوای گەورە كە باسی پێغەمبەر نوح دەكات(عليه السلام) دەفەرموێت(٩٥٠) ساڵ لەناویاندابووە: ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامٗا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ١٤ ﴾العنكبوت

باشە خۆ تەمەنی پێغەمبەر "نوح" و باڵاكەی پێغەمبەر "ئادەم"(عليهما السلام) چییان جیاوازە؟!

ئەو تەمەنەش تەمەنی چەندین كەسی ئەمڕۆیە لەكاتێكدا زانایانی سیرە ئەفەرموون ئەو تەمەنە تەنها تەمەنی بانگەوازیەتی تاوەكو لافاوەكە و دوای ئەویش(١٠٠) ساڵی تر ژیاوە!! وابزانم قسەكانم ڕوونە بۆ كەسێك بیەوێ تێ بگات.

سەرەڕای ئەوەی كە زانان ئەفەرموون درێژیی و كورتی باڵا، هۆرمۆنەكان دیاری دەكەن ئامادەیە بۆ گۆڕانكاری هەروەكو لە(Wikipedia) لە ژێر ناونیشانی( Human height) بابەتێكی چڕو پڕی داناوە لەسەری!!

**سیٰ یەم: پێغەمبەر(ﷺ ) دەفەرموێت: ڕەشكە بۆ گشت نەخۆشیەك چاكە، ئەمە لە كاتێكدا نەسەلمێنراوەو، بەڵكو زیانیشی هەیە.**

لەوەڵامی ئەم وتەیەدا **دەڵێم**: كاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ڕەشكە بۆ گشت نەخۆشیەك چاكە، مانای وانیە كە هەرچی نەخۆشی دنیا هەیە دەیگریتەوە!!

كێشەی ئۆزۆن ئەوەیە نەزانە بە زمانی عەرەبی و ڕەوانبێژیی[1]، ئەگینا نەدەكەوتە ئەو هەڵەیەوە، كاتێك لە زمانی عەرەبیدا وشەی هەموو یان گشت بەكاردێت، زۆر جار مەبەست پێی ئەو ڕەهایی و گشتگیرییە نییە كە كەسانی سادە لێی تیٰ دەگەن بەڵكو مەبەست پێی گەورە نیشاندانی ئەو شتەیە هەروەكو خوای گەورە لەبارەی لەناوچوونی گەلی عادەوە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا رَأَوۡهُ عَارِضٗا مُّسۡتَقۡبِلَ أَوۡدِيَتِهِمۡ قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٞ مُّمۡطِرُنَاۚ بَلۡ هُوَ مَا ٱسۡتَعۡجَلۡتُم بِهِۦۖ رِيحٞ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ٢٤ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيۡءِۭ بِأَمۡرِ رَبِّهَا فَأَصۡبَحُواْ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٢٥ ﴾الأحقاف

مانای وانییە ئەو بایە كە لەناوی بردوون هەرچی شت هەیە لەناوی بردبێت وەك لە واژەی(إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡۚ) دەردەكەوێت خۆ ئەگەر خانووەكان مابێتنەوە لەپێشتر وایە شاخەكان مابێتنەوە!!

كەواتە مەبەست پێی ئەوەیە سزاكە زۆر توندبووەو كەس لێی دەرباز نەبوو نەك هەموو شتێك وێران بكات.

جا بەهەمان شێوە لەباسی ڕەشكەدا بێگومان بەهۆی زۆری سوودەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وای فەرمووەو ڕووی وتەكانیشی بۆ كەسانێك بووە كە ئاگاداری ڕێساكانی عەرەبی بوون، نەك كەسێكی نەشارەزا بە زمانی عەرەبی!!

---

[1] ئەمە لە كاتێكدا ئۆزۆن خۆشی وا نیشان ئەدات كە شارەزایە بە ڕەوانبێژی وەكو دواتر پێی دەگەین بە ویستی خوای گەورە.

ئەوەشی كە دەڵێت "نەسەلمێنراوە سوودی هەبێت" لە وتەیەكی بێ بنەما زیاتر نیەو زانستی پزیشكی سەردەم زیاتر لە(٢٠) سوودیان دۆزیوەتەوە تیایدا كە بۆ چەندین نەخۆشی جیا جیا دەرمانێكی باش و بە كەڵكە.

بەڵام چی بكەین لە كەسێك كە ڕق و كینە وای لێكردووە چاكیەكانی نەبینێت!!

كاتێك ئۆزۆن دەڵێت زەرەیشی هەیە بەڵێ بێگومان ئەو شتانەی كە تەنها دەرمانن و زەرەریان نییە هەندێك شتی زۆر سنووردارو دەگمەنن و هەر دەرمانێكە لەكاتێكدا ئەبێتە هۆی شیفای كەسێك و كەسێكی تری پێ ئەمرێت، هیچ كەسێكی عاقڵیش ئینكاری ئەوەی نەكردووە، تەنانەت زەهەبی باسی ڕەشكەی كردووە كە هەندێك جار زیانی هەیە بۆ هەندێك نەخۆشی تایبەت[١].

ئیتر پێویست ناكات ئۆزۆن بێت و ئەم هەرایە بنێتەوەو وای نیشان بدات شتێكی زۆر گەورەو گرنگی هێناوە!!

---

[١] لە باسی نەخۆشكەوتنی سالحی جەزەرە، سیر أعلام النبلاء (٢٩/١٤).

## چوارەم: خواردنی حەوت دەنك خورمای مەدینە بە بەیانیاندا ئەتپارێزێت لە ژەهر و جادوو.

پاشان ئۆزۆن دەڵێ: ئێمە ڕاستەوخۆ لە لایەنگرانی ئەو بیرۆكەیە داوا دەكەین كە پراكتیكی بكەن بزانین دەرەنجامەكان چۆن دەبن؟!

یەكێك نەزانێت ئەگەر كەسێك لە پێشچاوی ئۆزۆندا ئەمە تاقی بكاتەوە ئیتر بڕوا دێنێت كە ئەمە فەرموودەیەو ڕاستەو دروستە وا داوای تاقیكردنەوەی دەكات!!

ئەم فەرموودەیە تایبەتە بە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و خورمای عجوە هەر وەكو زۆربەی زانایان ئەفەرموون لە ڕاڤەیدا:

پێشەوا مازری دەفەرموێت: تایبەتە بەسەردەمی پێغەمبەرەوە(ﷺ)

پێشەوا خەتتابی(رحمه الله) دەفەرموێت: لەبەر بەرەكەتی دوعاكەی بووەو تایبەتە بە جۆرێك خورمای عجوە.

پێشەوا قورتبـی(رحمه الله) دەفەرموێت: ئەیگێڕینەوە بۆ لای تاقیكردنەوە، ئەگەر سوودی هەبوو ئەوا ئەزانین كە بەشێوەیەكی بەردەوامەو تەنها بۆ سەردەمی خۆی نەبووە، ئەگەر سوودیشی نەبوو ئەوا ئەزانین كە تایبەت بووە بەو سەردەمەوە.

هەندێكی تر لەزانایان ئەفەرموون: تایبەت بووە بە خورمایەكەوە لەو سەردەمەدا بەڵام ئێستا نەماوە[1].

كەواتە كەس نەیوتووە ئەمە سوننەتەو ئەبێت تاقی بكرێتەوە تاوەكو نووسەر داوای تاقیكردنەوەی بكات، ئەمەش ئەوپەڕی لاوازی بەڵگە دەردەخات لەلای ئۆزۆن.

هەروەها ئەمە بیرۆكەش نییە وەكو ئۆزۆن بانگەشەی دەكات بەڵكو فەرموودەیەكی ڕاست و دروستەو ئێمە بڕوامان پێیەتی، بەڵام ماناكەشی بەوشێوەیە كە باسمانكرد.

---

[1] سەرجەمی وتەكان لـەم سەرچـاوانە ببیـنن: فـتح البـاري لابـن حجـر (٢٣٩/١٠)., شـرح مسـلم للنـووي (٣/١٤)، عمدة القاري لبدر الدين العيني (٢٨٧/٢١)، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت، فيض القدير للمناوي (١٠٥/٦)، الناشر: المكتبة التجارية الكبرى – مصر–، الطبعة: الأولى، ١٣٥٦هـ.

ئیتر نازانم تێگەیشتن بەوشێوەیە لەفەرمووده‌كە كێشە دروست دەكات یاخود ئاستی تێگەیشتنی ئۆزۆن كێشەی تیایە؟!

## پێنجەم: ئێسك و پروسكەكان لەناودەچن جگە لە(كلێنچكە)[1]:

ئۆزۆن ڕەخنە لەم فەرموودەیە دەگرێت: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: «كُلُّ ابْنِ آدَمَ يَأْكُلُهُ التُّرَابُ، إِلَّا عَجْبَ الذَّنَبِ مِنْهُ، خُلِقَ وَفِيهِ يُرَكَّبُ»[2].

واتە: هەموو جەستەی نەوەی ئادەم خۆڵ ئەیخوات و لەناوی ئەبات تەنها "سیٚ بەندەی بربڕە" نەبێت كە لێی دروست بوە، هەر لەوەش دروست دەكرێتەوە.

دەڵێم: كێشەی ئۆزۆن ئەوەیە لەپیشەكەی خۆی بازی داوە بۆ زانستی شەرعی كە هەر لێی نازانێت و هیچ پەیوەندیەك پێكیانەوە نابەستێتەوە، لەوێشەوە بازیداوە بۆ زانستی پزیشكی كە ئەویش بەهەمان شێوە كاری خۆی نییە و لێی نازانێت، جا ئۆزۆن وەكو چۆن لە زۆر شوێندا دەستكاری نووسینەكانی كرد و خیانەتی كرد بەهەمان شێوەش بەناوی زانستی سەردەمەوە وتەی بیٚ بنەما بڵاو دەكاتەوە!!

ئەگینا ئەوە سەلمێنراوە كە وتەكەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاست و دروستەو بەڵكو وەكو موعجیزەیەك پێش هەزار و چوارسەد و ئەوەندە ساڵ ئەو هەواڵەی داوە و ئێستاش زانستی سەردەم پشت ڕاستی دەكاتەوە بۆ ئەو مەبەستەش ئەتوانن خۆتان بەدوای ڕاستیەكاندا بگەڕێن و بۆتان دەركەویٚ كە وتەكەی ئۆزۆن هیچ بنەمایەكی زانستیی نیە، ئەتوانن سەیری لێكۆڵینەوەكەی "عادل الصعدي" بكەن كە لە ماڵپەڕی جامیعەی ئیمان دانراوە لەسەر ئەو بابەتەو بە درێژیی لەسەر لایەنە زانستیەكەی ڕۆشتووە[3].

---

[1] وەرگێڕ زمانی ناوبازاری بەكارهێناوە لەبری زمانی زانستی ئەگینا لە لای پسپۆڕانی جەستە پێی ئەوترێت: (سیٚ بەندەی بربڕە).

[2] رواه مسلم (٤/٢٢٧١)، برقم: (٢٩٥٥). ت: محمد فؤاد عبد الباقي، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت

[3] http://www.jameataleman.org

## شەشەم: مەیمونێك زینا دەكات و مەیمونەكانی تر ڕەجمیان كردووە:

ئۆزۆن ئەیەوێت فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) ناشیرین بكات و وای نیشان بدات كە شتانێكی تێدایە كە لۆژیك نین! لەو وتەیەی سەرەوەش مەبەستی ئەم ڕیوایەتەیە: عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، قَالَ: «رَأَيْتُ فِي الجَاهِلِيَّةِ قِرْدَةً اجْتَمَعَ عَلَيْهَا قِرَدَةٌ، قَدْ زَنَتْ، فَرَجَمُوهَا، فَرَجَمْتُهَا مَعَهُمْ»[١].

واتە: عەمری كوڕی مەیمون ئەگێڕێتەوە: لەسەردەمی نەفامی مەیمونێكم بینی كە كۆمەڵێك مەیمونی تر لێی كۆ بوبونەوە، زینای كردبوو، بەردبارانیان كرد و منیش لەگەڵیان بەردبارانم كرد.

لەسەرەتاوە ئەمەوێ بڵێم ئەمە نەفەرموودەیە، نە وتەی هاوەڵانیشە بەڵكو وتەی كەسێكە كە بڕوای بە پێغەمبەر (ﷺ) هێناوەو نەیدیوە.

ئەو باس لە ڕووداوێك ئەكات كە خۆی بینیویەتی و كۆمەڵێك مەیمون دانەیەكی تریان بەردباران كردووە، جا تۆ بڕوای پێ ئەكەیت یاخود نا كەس نەیوتووە ئیمانت پێی زیاد دەكات یاخود كەم تاوەكو بیكەی بە مایەی ڕەخنە، ئەگەر بێت و پێشەوا بوخاری(ﷺ) بیدایەتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) ئەوكات بۆت هەبوو ڕەخنە بگریت و بپرسی ئایا ئەمە لۆژیكە یاخود نا؟! تەنانەت ئەگەر وتەی یەكێك لەهاوەڵانیش بێت و بڵێ شتێكی وام دیوە نابێتە ئاین و وا بخوازێت بڕوای تەواوت بەو وتەیە هەبێت!!

بەڵام كێشەی گەورەی ڕەخنەگران ئەوەیە كە وادەزانن هەر شتێك لە كتێبی فەرموودەدا هەبووە، ئیتر بەڵگەیەو كەسیان نەهاتوون پێشەكی كتێبەكە بخوێننەوەو ورد ببنەوە لە ناوەڕۆكی بابەتەكەش تاوەكو بزانن ئەوەی كە قسەی لەسەر دەكەن چۆنە!

ئەوەشی كە دەڵێت لەبەرئەوەی زینای كردبوو، ڕەنگە ئەو شتێكی دیبێت و لەبەر هۆكارێك كە ئەوەی لێ بخوێنرێتەوە كە لەبەر زینا بەردبارانیان كردوەو ئەو دیویەتی بەڵام

---

[١] رواه البخاري (٥/٤٤) برقم: (٣٨٤٩). ت: محمد زهير بن ناصر الناصر ،الناشر: دار طوق النجاة (مصورة عن السلطانية بإضافة ترقيم محمد فؤاد عبد الباقي)، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢هـ.

بۆ ئێمە باس نەكرابێت و نەیزانین، چونكە ئەو تەواوی وردەكاری چیرۆكەكەی باس نەكردووە!

مەیمونیش یەكێكە لەو ئاژەلاّنەی كە زۆر شەهوانیەو ئارەزویەكی زۆر لە ڕادەبەدەری هەیە ئەگەری هەیە شتێكی واش ڕوویدابێت و دوور نیە، تەنانەت عەرەب پەندێكی هەیە و دەڵێت: لە مەیمون زیناكارترە!! ئەمە بۆ كەسێك زۆر خەریكی زینابێت!

لە جیهانی ئاژەلاّنیشدا شتی زۆر سەیر هەیەو هەندێك جار شتانێك هەیە ئەگەر خۆمان بە ڤیدیۆ نەیبینین ڕەنگە كەسێكی تر بیگێڕێتەوە لامان سەیربێت و بڕوای پێ نەكەین، جا خۆ عەمری كوڕی مەیمون كامێرای لا نەبوە وێنەی ڕووداوەكە تۆمار بكات و ئێمەش لە یوتیوب دامانایە بۆ ئۆززۆن!!

پاشان لە پەراوێزی(٢٦) ی لاپەڕە(٣٦)، ئەمەی هێناوە: "وَيُرْوَى عَنْ يَحْيَى الْكِنْدِيِّ عَنْ الشَّعْبِيِّ وأَبِي جَعْفَرٍ: فِيمَنْ يَلْعَبُ بِالصَّبِيِّ إِنْ أَدْخَلَهُ فِيهِ فَلَا يَتَزَوَّجَنَّ أُمَّهُ"([1]).

واتە: لەبارەی كەسێكەوە گەمەو دەستبازی لەگەڵ منداڵدا دەكات و ئەگەر چووە ژورەوە نابێ دایكی بخوازێت.

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: داواكارم لەزانایان ئەمە بۆ خەڵك ڕوون بكەنەوە!!

دەڵێم: ڕوونیان كردوەتەوە بەلاّم كەسی لێكۆڵەر و شەیدای ڕاستی ئەیبینێت نەك كەسێكی دڵنەخۆشی تێكدەر!!

ئەمە بە فەرموودەی بوخاری دانانرێت بەڵكو هەر وەكو ئەوەی ئەوترێت: "قسە قسە دێنێ" پێشەوا بوخاریش باسی كردووە نەك بڕوای پێی هەبێت و بەڕاستی بزانێت .

دوای خۆشی كەس بڕوای پێی نەبووەو زانایان نەهاتوون كاری پێبكەن، تاوەكو ئۆززۆن بێت و بۆمان ڕاست بكاتەوەو لەم شەرم و ئابڕووچونە وەدەرمان بێنێ كە وێنای ئەكات و دەڵێت با زانایان ڕوونی بكەنەوە، یانی ئێمە وەكو مسوڵمانان و زانایانیشمان ناتوانین ڕوونی بكەینەوە بۆ خەڵك و ئەیشارینەوە!!

---

[1] رواه البخاري (٧/١١).

ڕەنگە ئۆزۆن ئاینەكەی ئێمە بە هەندێك ئاینی تر تێگەیشتبێت كە ساڵانە كتێبە پیرۆزەكەیان ئەگۆڕن و هەر پیاوێكی ئاینیان بڕێك لە هەوای خۆی تێدا جیٚ دەكاتەوە!!

هەروەها ئاینەكەی ئێمە تەواوی كتێبەكانی سەرچاوەی شەریعەتمان هەر لە قورئان و سوننەت و تەنانەت كتێبـی زانایانیشمان هەمووی بەردەستەو بە شێوەیەكی زۆر فراوان هەیەو دەستخستنیان زۆریش ئاسانە، ئیتر چی شتێك بشارینەوەو چی باس نەكەین؟!

بۆیە بە خوێنەری خۆشەویست دەڵێم: ئەم چەند خاڵەی خوارەوە ڕەچاو بكە ئیتر هیچ كێشەیەكت بۆ دروست نابێت سەبارەت بەم وتەیە:

١ – پێشەوا بوخاری(ﷺ) بە واژەی "يُرْوَى" هێناویێتی كە لای زانایانی فەرموودە پێی ئەوترێت "صِيْغَةُ التَّمْرِيْضِ" واتە لەفزو گۆی بەنەخۆش گرتن و متمانە سەندنەوە لە ڕیوایەتەكە و یەكێكە لە دەستەواژەكانی بە لاواز دانان، بەڵام ئۆزۆن ئەو وشەیەی لاداوەو، وا هێناویەتی كە خۆڵ بكاتە چاوی خوێنەران و وا گومان بەرن كە پێشەوا بوخاری بە سەحیحی هێناویەتی.

٢ – دوای ئەوە پێشەوا بوخاری دەفەرموێت: " وَيَحْيَى هَذَا غَيْرُ مَعْرُوفٍ وَلَمْ يُتَابَعْ عَلَيْهِ "[(١)]. واتە: ئەو یەحیایە كەسێكی نەناسراوەو فەرموودەكەشی بەهێز نەكراوە بە پاڵپشتی گێڕانەوەیەكی تر.

دەی كەواتە ئەمە وتەی ڕاستەوخۆی پێشەوا بوخارییە كە بە لاوازی دادەنیٚ، بەڵام كەسانی نەخۆش نایبینن!!

٣ – زانایانیش وەریان نەگرتووە بەڵكو پێشیان باشبووە كە پێشەوا بوخاری هەر خۆی بەدوور گرتباو نەیهێنایە باشتربوو مادام سەرچاوەیەكی باوەڕپێكراوی نیە، هەروەكو گەورە زانای فەرموودە "ئیبن مولەقین"(ﷺ) لەدوای ئەوەی باسی لاوازیەكەی ئەكات دەفەرموێت: "وَهَذِهِ مَقَالَةٌ عجيبةٌ، لو نزَّهَ البخاريُّ عَنْهَا كِتَابَهُ لَكَانَ أَوْلَى"[(٢)].

---

[(١)] رواه البخاري (١١/٧).

[(٢)] شرح القسطلاني على البخاري (٣٦/٨)، الناشر: المطبعة الكبرى الأميرية، مصـر، الطبعـة: السـابعة، ١٣٢٣ هـ.

واتە: بەڕاستی ئەمە وتەیەکی سەیرە، گەر بوخاری کتێبەکەی بەپاك ڕاگرتایە لەمە ئەوا زۆر لەپێشتربوو.

ئەبینین ئەم زانا بەرێزە ڕای وایە کە پێشەوا بوخاری هەر نەیهێنایە باشتربوو، ئەمەش پەڵەیەك نییە بە نێوچاومانەوە تاوەکو شەرمی لێ بکەین، بەڵکو هەر ماڵ نییە بەسەرمانەوە چونکە ڕاست نیەو نەسەلمێنراوە کە وتەی وا هەبێت، ئەگەر ڕاستیش بوایە خۆ فەرموودە نەبوو بەڵکو وتەی ئەبو جەعفەر و شەعبی بوو ئەویش دیسانەوە ئاین نیە!!

تەنها ئەوەندەیە گەر پێشەوا بوخاری نەیهێنایە باشتربوو سەرەڕای ئەوەی کە دەفەرموێت لاوازیشە، بەڵام خودای گەورە وای داناوە کەئەبێت بێ عەیبی تەنها بۆ قورئان بمێنێتەوە[1].

---

[1] کاتێك دەڵێین: (بێ عەیبی تەنها بۆ قورئان بمێنێتەوە) مەبەستمان ئەوە نیە فەرموودە دەستکاری کراوە، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە ئەوەتانێ لەپاڵ ڕاست و دروستەکاندا لاوازیش هێنراوەتە پاڵی و هاوشانی ئەو دانراوە، لەکاتێکدا قورئان بێجگە لە وتەی ڕاستی خوای گەورە هیچ وتەیەکی تری تێدا نیە!!

## حەوتەم: موسا پێغەمبەر(عليه السلام) چاوێكی فریشتەی گیانكێشانی كوێر كرد:

ئۆزۆن ڕەخنە لەو فەرموودەیە دەگرێت: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: " أُرْسِلَ مَلَكُ الْمَوْتِ إِلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَلَمَّا جَاءَهُ صَكَّهُ، فَفَقَأَ عَيْنَهُ، فَرَجَعَ إِلَى رَبِّهِ، فَقَالَ: أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لَا يُرِيدُ الْمَوْتَ، فَرَدَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَيْهِ عَيْنَهُ، وَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهِ، فَقُلْ لَهُ يَضَعُ يَدَهُ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ، فَلَهُ بِكُلِّ مَا غَطَّتْ يَدُهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ سَنَةٌ، قَالَ: أَيْ رَبِّ، ثُمَّ مَهْ؟ قَالَ: الْمَوْتُ، قَالَ: فَالْآنَ، فَسَأَلَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يُدْنِيَهُ مِنَ الْأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ "[1].

واتە: فریشتەی گیانكێشان نێردرا بۆ لای پێغەمبەر موسا(عليه السلام) كاتێك هات بۆ لای زللەیەكی لێداو چاوێكی كوێركرد، ئەویش گەڕایەوە لای خوای گەورەو فەرمووی منت ناردوەتە لای بەندەیەك كە نایەوێ بمرێت، خوای گەورە چاوی بۆ گێڕایەوەو پاشان پێی فەرموو: بگەڕێرەوە لای و پێی بڵێ دەستی دابنێ لەسەر پشتی گایەك و هەرچەندە دەستی گرتی ئەوا بەهێندەی هەر تاڵە مویەك ساڵێكی بۆ هەژمار دەكرێ، پاشان موسا(عليه السلام) فەرمووی: ئەی پەروەردگار پاشان چی؟ خوای گەورە فەرمووی: مردن، موسا فەرمووی: هەر ئێستا ئەمەوێ بمرم، پاشان داوای لەخوای گەورە كرد لە "زەوی پیرۆز"[2] نزیكی بكاتەوە بە هێندەی هاویشتنی بەردێك.

دەكرێت لەچەند ڕویەكەوە گومان دروست بكرێت و كراویشە:

١ – چۆن پێغەمبەر موسا(عليه السلام) چاوی فریشتەی گیانكێشان كوێر دەكات؟!

وەڵام: پێغەمبەر موسا(عليه السلام) شاردراوە نییە كە چی مەینەتی چەشت بەدەست جوولەكەوەو چی لاریی و بێ سەرو بەرەییان ئەنواند، جا ئەو زانیاری بەوە نەبێت كە ئەو كەسە فریشتەی گیانكێشانەو بێتە لای و بڵێ گیانت ئەكێشم، تۆ بڵێی پێغەمبەر موسا(عليه السلام) دابنیشێ و خۆیی تەسلیم بكات؟! لەكاتێكدا فرت و فێڵی جوولەكە بۆ

---

[1] رواه مسلم (١٨٤٢/٤)، برقم: (٢٣٧٢)، و أحمد (٨٤/١٣)، برقم: (٧٦٤٦)، النسائي (١١٨/٤)، برقم: (٢٠٨٩)، حققه: عبد الفتاح أبو غدة، الناشر: مكتب المطبوعات الإسلامية – حلب ،الطبعة: الثانيـة، ١٤٠٦ – ١٩٨٦

[2] مەبەستی پێی قودسی داگیركراوە خوای گەورە ئازادی بكاتەوە.

لەناوبردنی خۆیی و شەریعەتەكەیی و پێغەمبەر هارون(عليه السلام) و دروستكرنی مانگاو پەرستنی و ئەو هەموو خوارییەی هەیانبوو دەكرێت ئەمەش بە فێلێك تێگەیشتبێت!!

بەتایبەت تر كە هەموو پێغەمبەران(عليهم السلام) لەكاتی سەرەمەرگدا پرسیان پێكراوەو رایان وەرگیراوە هەروەكو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: عَنْ عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «مَا مِنْ نَبِيّ يَمْرَضُ إِلَّا خُيِّرَ بَيْنَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ»[1].

واتە: هیچ پێغەمبەرێك نییە كە لەنەخۆشی مەرگدابێت و سەرپشك نەكرابێت لە نێوان دونیاو قیامەت.

وەك زانیمان گشت پێغەمبەران(عليهم السلام) سەرپشك كراون، بەلام پێغەمبەر موسا(عليه السلام) كەسێك دەبینێت بەو شێوەیەو لەپڕ دێت و داوای ڕۆحی ئەكات، چۆن ئەبێت تەسلیمی بێت؟!

ئەم فەرموودەیە لە سەحیحی بوخاریشدایە بەلام دیارە ئۆزۆن نایەوێ لێكۆلێنەوە بكات بەلكو ئەیەوێت تەنها رەخنە بگرێت و هەلبوەشێنێتەوەو تێك بدات، نەك تێبگات و دروستكەربێت و بە شوێن راستیدا بگەڕێت!!

سەرەڕای ئەوەی كە ئەم پێغەمبەرە سەردارە هەموو ئاواتێكی ڕزگاركردنی زەوی قودس بوو، لەكاتێكدا بەهۆی خراپی جولەكەوە(٤٠)ساڵ لێیان قەدەغەكرا بچنە ناویەوە، وەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الْأَرْضِ فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾المائدة

پێغەمبەر موسا زۆر موشتاقی ئەوەبوو كە بچێتە ناو قودس و وای دانابوو كە ئەو ماوەیە تێپەڕ دەكات و ئەچێتە ناویەوەو ئەوجا ئەگەڕێتەوە لای خوای گەورە، بەلام وا كەسێك لە پڕ دەردەكەوێت و داوای گیانی دەكات!

٢ – چۆن بە لێدانێك چاوی كوێر ئەبێت؟!

---

[1] رواه البخاري (٦/٤٦)، برقم: (٤٥٨٦).

هێز و توانای پێغەمبەر موسا (عليه السلام) بە نموونە ئەهێنرێتەوەو تەنها ئەوەندە بەسە کە بەلێدانێك کابرای قیبتی ئەکوژێت کاتێك ستەم لەکەسێك ئەکات و ئەویش هاوار دەکات و داوای یارمەتی دەکات و پێغەمبەر موساش دەچێت بەهانایەوە، ئەمە لەکاتێکدا مەبەستی کوشتنیشی نەبووە و تەنها ویستویەتی لەکۆڵی بکاتەوە، بەڵام هێندە بەهێزبووە لەگەڵ لێدانی ئەیکوژێت و خوای گەورەش دەفەرمویێت لەوبارەیەوە: ﴿ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ۖ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ ﴾القصص

٣ – چۆن ئەتوانێ چاوی فریشتەی گیانکێشان کوێر بکات و زیان بە فریشتە بگەیەنێت؟!

فریشتەکانی خوای گەورە کاتێك دێنە لای بەندەکان لەسەر شێوەی خۆیان نایەن، بەڵکو لەسەر شێوەی مرۆڤ و حەقیقەتی مرۆڤ دێن، هەروەکو خوای گەورە لەبارەی هاتنی فریشتەکانی بۆ لای مەریەم دەفەرموێت: ﴿ فَٱتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾ قَالَتْ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا ﴿١٩﴾ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ﴿٢٠﴾ ﴾مريم

دەی کەواتە هاتنەکەیان لەشێوەی مرۆڤەو ئەو وێنەیەی خوای گەورە ئەیانداتێ لەوکاتەدا وێنەیەکی ترەو حەقیقەتی خۆیان نیە، جا بۆیە شتێکی ئاساییە ئەو وێنەیە شتێکی بەسەر بێت چونکە حەقیقەتی خۆیان شتێکی بەسەر نەهاتووەوکەسیش ناتوانێ هیچیان بەسەر بێنێت، بەڵام لە کاتێکدا کە لەسەر شێوەی مرۆڤ هاتووە ئیتر ئەوکاتە تایبەتمەندی مرۆڤ وەردەگرێت و لەکاتێکدا کە پێغەمبەر موسا(عليه السلام) بە لێدانێك مرۆڤێك بکوژێت ئەوا کوێرکردنی ئەم زۆر لە پێشترە!

## سوودی ئەم فەرموودە چیە؟

ڕەنگە ئەو ناونیشانە پرسیارێك بێت و بە مێشکی تۆی بەرێزدا بێت بۆیە بە باشم زانی هەڵوێستەیەکی لەسەر بکەم و هەرچەندە ئێمە تەنها باسی ئەو ڕووە ئەکەین کە لێمانەوە دیارە وەك هەر شتێکی تر و چەندین ڕووی تری هەیە کە لە ئێمە شاراوەیە چونکە هەر مادەیەکی چوارگۆشە کە لە پێشچاومانە تەنها یەك ڕووی لە ئێمەوە دیارەو پێنجی تری نادیار جا ئەگەر هات و بابەتەکەش غەیب بوو ئەوا زۆرتری نادیارەو پێویستە تەسلیمی حیکمەتی ئیلاهی بین، هەندێك لەو حیکمەتانەی لە ئێمەوە دیارە:

١ – ڕەنگە گرنگترین سوودی ئەوەبێت زیادڕەوی لە کەسدا نەکرێت و ئەوە پێغەمبەرێکە کە خوای گەورە قەسەی لەگەڵدا کردوەو لەوپەڕی گەورەییدایەو لەگەڵ ئەوەشدا غەیب نازانێت و لای زانراو نییە کە ئەو کەسە فریشتەی گیانکێشانە.

٢ – بەدیارخستنی زوڵم و ستەمی زۆری بەنیئ ئیسرائیل بەرامبەر ئەو پێغەمبەرە، لەکاتێکدا ئەمە وا نیشان ئەدات کە پێغەمبەر موسا(عليه السلام) هەمیشە لەحاڵەتی ئامادە باشیدابوبێت بۆ هەر هێرش و خراپەیەکی ئەوان، ئەمەش وانەیەکی زۆر نمونەییە بۆ بانگخوازان کە فێری ئارامگرتن و مەشەقەتی دەعوە بن و خۆڕاگربن لەسەری!!

٣ – دنیا نەویستی پێغەمبەران(عليهم السلام) و ئالودە نەبوونیان پێوەی لە کاتێکدا ئەوان سەرپشکن لەوەی ئەمێننەوە تیایدا یان ئەگەڕێنەوە لای خوای گەورە، بێگومان هەڵبژاردەی ڕاست و دروست گەڕانەوەیە بۆ لای خوای گەورە بە ڕووی سوورەوە.

٤ – تامەزۆریی پێغەمبەر (عليه السلام) بۆ ئازادکردنی قودس، زەنگێکە بۆ هۆشیارکردنەوەی تاکی مسوڵمان کە خولیای هەوڵدانبێت بۆ گەڕانەوەی قودس و ئازادکردنەوەی جارێکی تر و ئەوەی هەیەتی بیدات لەو ڕێگەیە.

چەندین وردەکاری تر ئەگەر سەرنجی زیاتری بدەیت...

هەشتەم: بەرد جلەكانی پێغەمبەر موسای(عليه السلام) ڕفاندووە.

ئەم وتەیە لەوپەڕی لاوازیدایە و تەنها ئەوەندە بەسە بۆ ئۆززۆن كە پێی بڵێم: خوایەك كە وشترێك لە شاخ و كێو دروست بكاو بێنێتە دەرەوە وەك موعجیزەیەك بۆ پێغەمبەر ساڵەح (عليه السلام) ، هەروەها لەبەرد ئاو بێنێتە دەرەوە بە لێدانێكی پێغەمبەر موسا(عليه السلام) و پاشان نیلی بۆ بكاتە دوو بەشەوە و[1]...تاد، ئایا زۆر شتێكی گەورەو سەیرە ئەگەر بەردێك بجولێت و جل بەرێت؟! ئەمە لەكاتێكدا ئێستا زانایانی جیۆلۆجی باسی ئەوە دەكەن كە بەردی گەورە هەیە چەندین كیلۆمەتر ڕۆشتووە لە شوێنی خۆی دووركەوتوەتەوە، ئەوەش ڕەت دەكەنەوە كە بەهۆی باوە جولاَبێت چونكە قەبارەو قورسیەكەی زۆر لەوە زیاترە با كەریگەری لەسەر دروست بكات!!

تەنانەت لە ناوچەی ڕەیستراك پلایا(Racetrack Playa) لە كالیفۆرنیا باس لەوە دەكرێت كە دۆڵێكی تێدایە لەوێ بەردی جولاوی تێدایەو بەردەكان بۆ ماوەی دوور دەڕۆن و شوێنیش جێ دەهێڵن لە دوای خۆیان، ئەتوانن وێنەكانیشی ببینن لە ماڵپەڕی(Wikipedia) بەناوی(Moving rocks).

ئەمە ئۆزۆن تەنها هێندەی باس كردبوو بۆیە ئێمەش لەوە زیاتر باس ناكەین لەسەر ئەو بابەتە بۆ ئەوەی لەوە زیاتر درێژ نەبێتەوە، ئەگینا زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێ.

پاشان ئۆززۆن بە چەشنێكی تر دێتە پێشەوەو ئەیەوێت گومان دروست بكات لەسەر فەرموودەكان بەو بیانووەی كە: "چەندین فەرموودە هەیە كە پێچەوانەی نەریتی باو و زەوقی بەرزی مرۆڤن، وەك گۆڕینەوەی جل و بەرگ و بەكارهێنانی سیواكێك لەلایەن چەند كەسێكەوەو، فەرموودەی مێشەكەو، تف و بەڵغەم كردنە نێو جل و نوێژكردن دوای خواردنی گۆشت و چەوریی بێ دەستنوێژ یان دەم و دەست شۆردن...تاد" ع: ٢٦، ك: ٣٧

---

[1] ئەم ڕاستیانە و زۆر زیاتریش هەمووی لە قورئاندا باسكراون نەك كتێبەكانی فەرموودە!!

**دەڵێم:** بەڕاستی گریانم دێ لە دڵەوە بۆ ئۆزۆن و ئەوانەشی كە پێی هەڵخەڵەتاون و هەندێك شت ڕەت ئەكەنەوەو هەندێك ڕەخنە دەگرن و هیچ شتێكیش پاڵنەریان نییە بێجگە لە نەزانین:

أَتَانَـــا أَنَّ سَـــهْلاً ذَمّ جَهْـــلاً        عُلُوْمًـــا لَـــيْسَ يَعْـــرِفُهُنَّ سَـــهْلُ

عُلُوْمًـــا لَـــوْ دَرَاهَـــا مَـــا قَلاهَـــا        وَلَكِـــنَّ الرِّضَـــى بِالْجَهْـــلِ سَـــهْلُ[1]

واته:

بۆمـــان هـــات لۆمـــەی ســـەهل زانســـتانێك بـــە نـــەزانی

زانســـــــت گـــــــەلێك نەیـــــــدەزانی بـــــــەجوانی

زانســــــــتانێك گـــــــەر زانیبــــــــای نەیدەبوغزانـــــــد

بـــــــەڵام ســـــــانایە ڕەزایـــــــەت بـــــــە نـــــــەزانی

هەریەكێك لـەم شتانەی كە ئۆزۆن باسی دەكات هی نزیكەی(١٥٠٠) ساڵە لـەمەو پێشی ژیانی مرۆڤایەتیە ئاخۆ تۆ بڵێی لـەو ماوە زۆر و زەبەندەدا ژیانی مرۆڤایەتی چەندە پێشكەوتبێت و گوزەران چۆن گۆڕابێت؟!

گەورەترین هەڵەی ئۆزۆن و زۆر كەسی تریش كە ڕەخنە دەگرن ئەوەیە كە مێژوو بەو پێوەرەی كە ئەمڕۆ هەیە لێك دەدەنەوەو، ڕووداوە مێژووییەكان و گوزەرانی خەڵكی بەم حاڵەی كە ئێستای خۆیانی تێدایە لێك دەدەنەوە، كەئەمەش ئەوپەڕی بێ ئاگاییە لـە واقیع و بە دابڕانێكی تەواو هەژمار دەكرێت لێی!!

باهەر یەكێك لـە ئێمە(١٠٠) ساڵی چواردەوری خۆی و پێش ئێستا سەیر بكات و بە پێوەری ژیانی ئەمڕۆ هەڵیسەنگێنێت ئیتر ئەوكات بزانین دەرەنجامەكان چی ئەبن!!

---

[1] أدب الطلب للشوكاني، ص: ١٥٧، المحقق: عبد الله يحيى السريحي، الناشر: دار ابن حزم – لبنان / بيروت، الطبعة: الأولى، ١٤١٩هـ.

یەك نموونە بهێنینەوە: مامۆستا عەلائەدینی سجادی باسی ئەوە دەكات لەوكاتەی كە تازە پانكە هاتبووە ناوچەیەك، بەو بۆنەیەوە خاوەنی پانكە دەعوەتیەك ساز دەكات و خەڵكی پۆل پۆل دێنە ژوور، بەڵام وا سفرەو خوان ڕازاوەتەوەو كەس نایەت بە دەوری خواردناو سارد بویەوە، چونكە هەموو دانیشتوان دانیشتوون و واقیان وڕماوە لە دیاری ئەو پانكەیە وا دەسوڕێتەوەو فێنكیان دەكاتەوە!

هەر لە باسی پانكەدا دەگێڕنەوە: كەسێك بەرامبەر پانكەیەك دانیشتبوو پانكەكەش وەكو سیفەتی خۆی كاتێك دەسوڕێتەوە بەلای ڕاست و چەپدا، لە ناوەڕاستدا دەوەستێت و پاشان دەست دەكاتەوە بە جوڵان، كابراش وا بەرامبەریەتی بە سەرسوڕمانێكەوە دەڵێت: ئەها ئەو دەزانێت من لە هەمووتان زیاتر گەرمامە بۆیە لە بەرامبەر مندا دەوەستێت!

ئەم چیرۆكانە هیچ مایەی سەرسوڕمان نیە، چونكە ئەمانە سەرگوزشتەی پێش سەد ساڵێكەو پێی دەوترێت مێژوو، لە مێژووشدا خەڵك وەكو ئێستا نەبوون، هەروەكو چۆن سەد ساڵی تریش ئەمڕۆی پێ بپێورێت بە هەمان شێوەیە!

ئێستا ڕەنگە زیاتر تیشكمان خستبێتە سەر هەڵەی ئەو كەسانەی وا مێژووی هەزار ساڵ بە پێوەری ئەمڕۆ دەپێون!!

ئۆزۆن باسی چی دەكات بۆ ئێمە لەكاتێكدا ژیانی سەراپای خەڵكی وابووە و حاڵی ئەوروپا خراپتربووە لەوە، تەنانەت بە شایەتی خۆیان لەسەدەكانی ناوەڕاستدا كاتێك هەرماڵێكی مسوڵمان خاوەن ئاوەڕۆی خۆیان بوون، لە ئەورووپای خاچ پەرست تەختەی زۆر قایم و پتەویان لەپێ ئەكرد بۆ ئەوەی كاتێك بە سەر شەقامەكاندا ئەڕۆن میز و پاشەڕۆ كەبەسەر شەقامەكانەوەبوون پیسیان نەكەن!!

سەبارەت بەفەرموودەی مێشەكەش، تەنها ئەوەندە دەڵێم خوا ئەو كەسە بگرێت كە تانەی لێ ئەدات لەدوای ئەوەی كە زانستی سەردەم یش بەدەری خست ڕاستەو هێشتا هەر سوورە لەسەر ملهوڕی خۆیی و هەر تانە ئەدات لەو فەرموودەیە!

پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێش هەزاران ساڵ فەرموویەتی: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ ثُمَّ لِيَنْزِعْهُ، فَإِنَّ فِي إِحْدَى جَنَاحَيْهِ دَاءً وَالأُخْرَى شِفَاءً»[١].

واتە: ئەگەر مێش كەوتە ناو خواردنەوەی یەكێكتانەوە ئەوا با نوقمی بكات و پاشان دەری بكاتەوە، چونكە لە باڵێكیانی دەرد هەیەو لەوی تریشیان دەرمان.

بەڵێ ئێمە بڕوامان پێیەتی و بەوتەی پێغەمبەری خواشی دەزانین(ﷺ) و بڕوابوونیش پێی بە واجب دەزانین، ئەوەشی بڕوای بە فەرموودەكە نیەو داوای بەڵگەی زانستی دەكات، پێی دەڵێین زانستی پزیشكیش ئەوەی سەلماندووەو دانیان پێدا ناوەو تەنانەت زۆربەی ئەو لێكۆڵینەوانەش كە كراون لە وڵاتانی غەیرە مسوڵمان كراون!!

بۆ نموونە تەنها ئەو لێكۆڵینەوەیە بەسە كە تیمێكی پزیشكی كە پێكهاتوون لە كۆمەڵێك پسپۆڕی ئوسترالی هەستاون بە لێكۆڵینەوەیەك ورد لەسەر ئەو بابەتەو بۆیان دەركەوتووە كە بەشی دەرەوەی مێش سوودبەخشەو لێكۆڵینەوەیەكیان لە ژێر ناونیشانی " The new buzz on antibiotics"، واتە: جۆرێكی نوێی مێشی دژە بەكتریا، هەروەها لەم ماڵپەڕەش(www.abc.net.au/science) بڵاوكراوەتەوە كە ماڵپەڕێكی متمانەپێكراوی زانستییە!

بۆ نموونە ئەتوانن سەیری لێكۆڵینەوەكەی دكتۆر مستەفا ئیبراهیم بكەن كە پسپۆڕە لە بواری مێروو و بەڕێوەبەری سەنتەری لێكۆڵینەوەو بەدواداچوونی ئەو مێروانەی كە نەخۆشی ئەگوێزنەوە، خۆی پێی هەستاوە لەگەڵ چەندین لێكۆڵینەوەی تردا لە ژێر ناونیشانی "الداء والدواء في جناحي الذباب" بڵاوی كردوەتەوە لە دوتوێی(٢٠) پەڕەدا[٢].

جا بەڕاستی لەوێدا هێندەی بەڵگە تیایە كە بەسیێ بۆ كەسی حەق ویست!!

هەروەها لە عەقڵیشدا شتێكی ئاساییەو وەنەبێت تەنها ئەم نمونەیە هەبێت، ئەوەتا هەنگ بەو قەبارە بچوكەیەوە لەلایەكەوە هەنگوینی شیرین ئەدات و لەلاكەی تریشیەوە ژەهر

---

[١] رواه البخاري (٤/١٣٠)، برقم: (٣٣٢٠)

[٢] كتێبەكە لە ماڵپەری﴿www.eajaz.org﴾ بەردەستە.

ئەڕیێژێت و ئەگەزێ، هەروەها مار پێتەوە ئەدات و ژەهراویت دەكات، بەڵام گۆشتەكەی بەكاردێنن بۆ چارەسەری ئەو ژەهرەو لەناوبردنی!!

## ئایا فەرموودە ئوممەتی ئیسلامی یەكخست؟

ئۆزۆن دەپرسێت(بەڵام وەكو كەسێكی دڵسۆز نا بەڵكو وەكو كەسێكی كیناویی بەرامبەر ئیسلام): ئایا ئەو فەرموودانەی دەدرێنە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)، ئوممەتی ئیسلامی یەكخست و بەرەو پێشەوەی برد؟!

پاشان هەر خۆشی وەڵامی پێشوەختی لایەو بڕیاری داوە كە نەخێرەو دەڵێت: "فەرموودەی پێغەمبەر رۆڵێكی سەرەكی گێڕاوە لە ترازان و پارچە پارچەبوونی ئیسلام.." ع:٣٧، ك: ٢٦

ئەگەر كەسێك بە دادگەریەوە بڕوانێتە مێژووی فەرموودە بەدڵنیاییەوە ناڕاستی وتەكانی ئۆزۆنی بۆ دەردەكەوێت و پێچەوانەی بانگەشەكەی ئۆزۆن دەبینێت!!

بەس خۆزگە ئۆزۆن دیاری بكردایەو ئاماژەی بەو لێكترازان و پارچەپارچەبوونە بكردایە كە بەهۆی سوننەتەوە بەرجەستەبووە، تاوەكو ئێمەش وەڵامان بدایەتەوە.

بەڵام ئەگەر ئۆزۆن مەبەستی پێی ڕاڤەو لێكدانەوەی سوننەتە لە لایەن ڕێچكەو تاقمەكانەوە، ئەوە هیچ دەقێك نییە كە ئەوەی بەسەر نەهاتبێت و ئەوەش بەهۆی خرابی دەقەكەوە نییە بەڵكو بەهۆی هەواو ئارەزووی مرۆڤەكانەوەیە كە هەندێكیان حەزیان بە توندڕەویی و هەندێكیشیان شلڕەویی و ئەوەشی كە ئەمێنێتەوە دەستی پێوە دەگرێت بەشێوەی مامناوەند و دەقەكە هەر ئەو دەقەیە، بەڵام كەسەكان بەگوێرەی حەزی خۆیان لێكیان داوەتەوە، جا قورئانی پیرۆز و سەرجەم دەقەكانی تریش لە تەواوی ئاین و ئایدیاكاندا بەدەر نین لەوەو شتێكی وەها بەرچاویشە كە بێ پێویستە لە بەڵگەهێنانەوە.

بەڵام من مافی خۆمە بپرسم:

ئایا ئەم ژاوەژاو و تێكدان و خیانەتكردن و بڕیارە پێشوەختانەی ئۆزۆن ئوممەت یەك دەخات و تەبای دەكات یاخود ناكۆكی دەكات؟!

هەروەها ئۆزۆن مافی ئەوەی نییە ڕێگە بۆ ئیمانداران دابنێت، چونكە ئەو هەر بڕوای بە ئیسلام نییە لە بنەڕەتەوە ئیتر بۆ وا خۆی نیشان ئەدات خەمخۆری ئوممەتی ئیسلامیە، هەروەكو وتەبێژی ئیسلام قسە دەكات و خۆی دەنوێنێ بەڵام ئەمە تەنها كەسە سادەكان متمانەی پێ دەكەن و ئەبێتە جێی باوەڕیان!!

## دەكرێت فەرمووده پێچەوانەی عەقڵ و ژیریی بێت؟!

ئۆزۆن پرسیار دەكات و دەڵێ: "چی لەفەرموودەكانی پێغەمبەر وەرگرین؟ " پاشان خۆی دێتە وەڵام و دەڵێ: "ئەوەی ئامۆژگاری و دانایی تێدایەو دەكرێ هەموو مرۆڤێك پەسەندی بكات، وەك فەرموودەی: (لا ضرر ولا ضرار)، (خيركم خيركم لعياله)، (كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته)، بەڵام ئەو فەرموودانەی ناكۆكن لەگەڵ زانست و لۆژيك و هەستی دروست، بێ هیچ ڕووگیریەك دەكرێ بەلاوەنرێن" ع: ٢٧، ك:٣٨

دەڵێم: بەم وتەیە ئۆزۆن بەنەزانی خۆی هاتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەكارێكی پێویست نازانێت و بێ پێویستمان دەكات لەهاتنی، چونكە لەكاری سەرەكی خۆی لای دەدات كە ڕوونكردنەوەی شەریعەت و ئەو پەیامەی كە پێوەی هاتووە، بەمەش پێغەمبەر و حەكیم یان فەیلەسوف هیچ جیاوازیەكیان نامێنێت!!

چونكە تەنها هەندێك پەند و ئامۆژگاری و قسەی لەبارەی ئاداب و ئەخلاقەوە لێ وەردەگیرێت بەپێی وتەی ئۆزۆن، كە ئەمەش ڕێك پێچەوانەی ئەو هەموو بەڵگەیەبوو كە لەوەو پێش باسمان كرد لەسەر ئەوەی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) تەشریعەو فەرموودەكانی بریتین لە وەحیی دووەم.

ئەوەشی كە ئۆزۆن دەڵێت: "بەڵام ئەو فەرموودانەی ناكۆكن لەگەڵ زانست و لۆژیك و هەستی دروست، بێ هیچ ڕووگیریەك دەكرێ بەلاوەنرێن"

لە وتەیەكی بێ بنەما زیاتر نییە چونكە ئەو ناتوانێت تەنها بەڵگەیەكیش بێنێتەوە لەبارەیەوە، هەروەها هەوڵە فشەڵ و نەزۆكەكانیشیمان پووچەڵ كردەوە لەوەی كە ناتوانێت تاكە فەرموودەیەكی ڕاست و دروست بێنێت بەوشێوەیە بێت.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بە خاڵێكی زۆرگرنگ بكەم ئەویش:

## جیاوازی نێوان(الاسْتِغْرَابُ عَقْلاً) و(الاسْتِحَالَةُ عَقْلاً)!!

یەكەمیان(الاسْتِغْرَابُ عَقْلاً): بریتییە لەوەی كە عەقڵ هەندێك جار شتانێكی لەلا سەیرەو بە شتێكی نامۆی دەبینێت بەڵام ئەگەری ڕوودانی هەیەو هیچ بەربەستێكی لەبەردەمدا نییە بۆ ڕوودان و هاتنە پێشەوەی.

فەرموودە لەم جۆرەی تێدایەو ئەمەش شتێكی ئاساییەو لە قورئانی پیرۆزیشدا هەیە و لە عەقڵێشدا قابیلی قەبوڵكردنە، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ٣٨ قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ٣٩ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيّٞ كَرِيمٞ٤٠ ﴾النمل

بەڵێ هەروەكو ئەبینن ئەم ئایەتە شتێكی غەریبەو كاتێك ئەبیستیت كە عەرشێكی وەها گەورە لەچاوتروكانێكدا لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر گواستراوەتەوە بەلاتەوە شتێكی سەیرە، بەڵام كاتێك خوای گەورەت ناسی و تێگەیشیت لەدەسەڵاتی ڕەهای، ئەوكات ئەبێتە شتێكی سادەوساكار و زۆر بەلاتەوە ئاساییە!!

هەروەها وتەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١ ﴾الإسراء

بەدڵنیاییەوە ئەگەر بێت و یەكەمجارتبێت ئەم ئایەتە ببیستیت و هیچ دەربارەی موعجیزەی پێغەمبەران(عليهم السلام) نەزانیت بەلاتەوە زۆر سەیرە ڕوودانی وەها شتێك، بەڵام دوای تێڕامان و وردبوونەوە لە حەقیقەتی موعجیزە لەگەڵ دەسەڵاتی ڕەهای خوای گەورەو ویست و ئیرادەی ئەو زاتە باڵادەستە، ئیترئەوكات ئەبێتە شتێكی زۆر سادەو ساكار.

جا بەهەمان شێوەش بۆ فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەی كە تیایەتی بریتییە لەم جۆرەو ئەمەش شتێكی ئاساییە هەبوونی و هەرگیز مایەی ئەوە نییە ڕەت بكرێتەوەو ڕەتكردنەوەشی یاخود تانەدان لێی و لەبەها هێنانە خوارەوەشی لە نەزانین زیاتر هیچ تەفسیرێكی بۆ نیە!!

بەڵام جۆری دووەم: (الاسْتِحَالَةُ عَقْلاً)

ئەمەیان بریتییە لەو شتانەی كە هەرگیز نایەتە جێ و ئەگەری ڕوودانیان نیە، بۆ نموونە بابەتێكی نەگۆڕی عەقڵی كە خەڵكی هەموو كۆكن لەسەری و كەس تیایدا ناكۆك نیە، هەرگیز دەقێكی پیرۆزی وەكو قورئان یاخود فەرموودەی ڕاستت دەست ناكەوێت كە لێرەدا جێی بێتەوە، هەروەك چۆن نابینیت فەرموودەیەك هەبێت باسی ئەوە بكات كە نیوەی چوار بریتییە لە سێ بەهەمان شێوەش بۆ گشت ئەو بابەتانەی تر.

لێرەشەوە بۆت ڕوون ئەبێتەوە ئەو بانگەشەیەی ئۆزۆن و تەواوی نەیارانی سوننەت دەیكەن لە دژایەتی و ڕق ئەستوریەكی بێ بنەما زیاتر شتێكی تر نیە!!

## پێش نووسینەوەی فەرموودە خەڵكی چۆن ئاینیان وەردەگرت؟

ئۆزۆن پرسیارێك دەكات و دەڵێ: "ئایا پێشەوا بوخاری لە سەحیحەكەیدا سەركەوتوو بوو"

ئۆزۆن وەڵامی ئەم پرسیارە جێ دێڵێت بۆ خوێنەران بۆ ئەوەی وا نیشان بدات كە توێژینەوەكەی هێندە زانستیەو هێندەی متمانە بەخۆیەتی، ئەو بڕیار نادات بەڵكو هێندەت بەڵگە دەداتێ تاوەكو ناچارت دەكات تۆ بڵێی كە پێشەوا بوخاری سەركەوتوو نەبووە لە سەحیحەكەی!!

منیش تەنها پێت دەڵێم چۆن لەسەرەتاوە پەردەمان لەسەر هەڵماڵی هێشتا هەر لەخزمەتتان بەردەوامین و وەڵامی گومانەكانیشی تێكڕا دەدەینەوە بەویستی خوای گەورە!!

پاشان دەڵێت: "دواجار ئەم پرسیارە ڕەوایە لێرەدا دێتە پێش: گەر فەرموودەكانی پێغەمبەر دەربڕی شەرع و سروشیكی پیرۆزن، ئەی دەبێ حاڵ و گوزەرانی ئەو كەسانە چۆنبوبێت، لەپێش نووسینەوەو كۆكردنەوەی فەرموودەكان؟!" ع: ٢٧، ك: ٣٨

دەڵێم: ئەم وتەیە ئەوپەڕی نەزانی ئۆزۆن دەردەخات بە نووسینەوەی سوننەت و پێشتریش وەڵامی ئەم وتەیەمان دایەوە كە هەر لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) فەرموودەكان دەنووسرانەوەو بۆ ئەوەش بەڵگەی تەواومان خستە ڕوو

بەڵام من ئەوەندە دەڵێم نووسینەوەی سوننەت هیچی لەبابەتەكە نەگۆڕی و ئەگەر نەشنوسرابایەتەوە ئەوا هەر وەكو ئەو دەمە وابوو كە نووسرایەوە، چونكە هاوەڵان زۆر بەدەگمەن پشتیان بەو فەرموودانە بەستووە كە نووسراونەتەوە، بەڵكو لە كۆڕی فەرموودەكاندا ئەیانگێڕایەوەو ئەیانگەیاند بە جیلی دوای خۆیان و ئەگەر بابەتێكیش بهاتایەتە پێشەوە ئەوا ئەو گەورە هاوەڵانەی (رضي الله عنهم) كە دابەش بوبوون بەسەر هەموو ئەو ناوچانەی كە دەسەڵاتی ئیسلامیی لێبوو ئەوان فەتوایان دەداو بەوشێوەی كە لە پێغەمبەری خوایان بیستووە(ﷺ) فەتوایان بۆ دەدان.

هەروەها ئەمەوێ ئەوە بە ئۆزۆن بڵێم: قورئانی پیرۆزیش خۆ بە نووسراوەیی نەبوو لە هەموو وڵاتە ئیسلامییەكانداو بەڵكو تاكە موسحەفێك[1] هەبوو كە دوای وەفاتی پێشەوا عومەر(رضي الله عنه) لای دایكی ئیمانداران حەفسە مایەوە خوای لێ ڕازیبێت، ئەمەش ئەوە دەردەخات كە هاوەڵان بۆ وەرگرتنی شەرع و حەرام و حەڵاڵ پشتیان بە نووسراو نەبەستووە بەڵكو پشتیان بە ڕیوایەت بەستووە، چونكە هەموو ئەوانەی كە قورئانیان ئەگێڕایەوە لەگەڵ فەرموودەدا هەم ڕاستگۆبوون، هەم لەبەركردنیشیان باشبووە، بە دڵنیاییەوە ئەگەر پشتیان بەو موسحەفە نووسراوە ببەستایە بۆ وەرگرتنی شەریعەت ئەوا چەندین نوسخەی تریان لەبەری دەگرتەوەو دابەشیان دەكرد بەسەر وڵاتانی ئیسلامیدا.

بەمەش بۆت بەدیار دەكەوێت كە ئاستی زانستی ئۆزۆن چەندە!!

پاشان ئۆزۆن دەڵێ: "دیارە فەرموودە لەدوای كۆچی پێغەمبەربە نزیكەی(١٥٠) ساڵێك كۆكراونەتەوە، ئیمامی بوخاری لە نێوان ساڵانی(١٩٤-٢٥٦ ی كۆچی) ژیاوە، دەبێت خەڵك چۆن كاروباری دین و دنیایان زانیبێت، چۆن تابعیان لە غەیرە تابعی جیاكردبێتەوە، چۆن پلەبەندی و توێژەكانی هاوەڵانیان جیاكردبێتەوە..." ع: ٢٧، ك:٣٨

دەڵێم: ئەم وتەیەی ئۆزۆنیش بریتییە لە خیانەتە ئۆزۆنیەكان و دیسانەوە هاتوەتەوە كە ڕاستیەكان بشێوێنێ، ئەگینا كەسێك سەیری مێژووی كۆكردنەوەی سوننەت و ئەو كتێبانەی كە سوننەتی تێدا كۆكراوەتەوە بكات، ئەوا زۆر بە ڕوونی ئەبینێت كە ئەم وتەیەی ئۆزۆن هیچ بنەمایەكی زانستی نیەو زۆر پێچەوانەی ئەو وتەیە ئەبینێت، چونكە سوننەت بەفەرمانی پێشەوای بڕواداران عومەری كوڕی عبدالعزیز كۆكرایەوە لەسەر دەستی زانای خۆشەویست پێشەوا زوهری[2] لە پێش ساڵی(١٠٠)ی كۆچی و لەنێوان(٧٠-١٠٠)ی كۆچی قۆناغی كۆكردنەوەی سوننەت كۆتایی هات و لەپێش

---

[1] لە زمانی عەرەبیدا موسحەف و میسحەف و مەسحەف، هەرسێكەی دروستە.

[2] ئەم زانا خواناسە بێبەش نەبووە لە تانەو درۆی ڕۆژهەڵاتناسان و ئەوانەشی كە لەسەر هەمان پڕۆژەی ئەوان كاردەكەن چونكە ناشرینكردنی ئەم پێشەوایە واتە ناشرینكردنی سوننەت و ناشرینكردنی عومەری كوڕی =

ئیمامی بوخاری زیاتر لە(٣٠) كتێب هەبوون كە فەرموودەی تێدا كۆكراونەتەوە[١]، هەندێك لەوانە:

١ – ئەبو بەكری كوڕی محمد ی كوڕی عەمری كوڕی حەزم، لەسەر داوای پێشەوا عومەری كوڕی عبدالعزیز كە داوای لێكرد كە فەرموودە بنوسێتەوە و ترسی ئەوەی هەبوو ئەهلی زانست و فەرموودە لەناو بچن، جا ئەویش وەكو ئەمیری مەدینە دەستی دایە ئەوكارە لەكاتی فەرمانڕەوایی خۆیدا(٨٦ـ٩٣)ی كۆچی!!

٢ – پێشەوا زوهری(٥٠ ـ ١٢٣ ك)، لەتەمەنی(١٣) ساڵی دەستی كردووە بە وەرگرتنی فەرموودەو نووسینەوەیان تاوەكو دواتر فەرمانی ڕاستەوخۆی پێشەوا عومەری پێ دەگات و لە پەڕاوی تایبەتدا دەینوسێتەوە، ژمارەی فەرموودەكانی ئەگەنە(٢٠٠٠) فەرموودەو چەندین قوتابی خۆی لێیانەوە گێڕاوەتەوە جیل لەدوای جیل تاوەكو گەیشتووە بە زانایانی تری فەرموودەو ئەوانیش لە كتێبەكانی خۆیاندا تۆماریان كردووە.

ئەگەر بگەڕێیتەوە سەر كتێبەكەی دكتۆر حاكم هێندەی بەڵگە هێناوە ڕەنگە خوێنەر لەبری ئۆزۆن چین چین عارەقی خەجاڵەتی هەڵڕێژێت.

لێرەشەوە بۆت دەردەكەوێت كە ئۆزۆن چۆن بەنەزانی كەوتوەتە ناو بابەتە شەرعیەكان و قسەی لێ دەكات و وتەكانی ڕۆژهەڵاتناسان دێنێ و مۆركی خۆی لێ دەدات و واش نیشان دەدات زۆر شەفافانە ئەم كتێبەی نووسیوە!!

---

= عبدالعزیز چونكە ئەو كارەی پێ ڕاسپاردووە، زۆر وتەی ناڕاستیان داوەتە پاڵی و تۆمەتی زۆریان بۆ دروست كردووە، بۆ نمونە گۆڵد تسەیهەر(زیهەر) دەڵێ: زوهری فەرموودەی دروست كردووە بۆ عبدالملك ی كوڕی مەڕوان لە دژی عبدالله ی كوڕی زوبەیر!! بەڵام ئەگەر تۆ ئەچیتەوە سەر مێژوو ئەبینیت كە زوهری نەگەیشتووە بە عبدالملك و نەیدیووە تاوەكو چەند ساڵێكی زۆریش دوای كوژرانی عبدالله!!

[١] ئەتوانی بگەڕێیتەوە سەر وەڵامەكەی دكتۆر حاكم موتێری كە زۆر بە تێرو تەسەلی وەڵامی ئەم گومانەی داوەتەوە لە لا: (١٠٠–١٦٠)، وەكو باسمانكرد دكتۆر حاكم نامەی دكتۆراكەشی هەر لەسەر كۆكردنەوەی سوننەت و گومانی ڕۆژهەڵاتناسەكانەو زۆر بە وردی كاری لەسەر كردووە.

## با ئۆزۆن هەڵەیەكتان بۆ ڕاست بكاتەوە!!

ئۆزۆن سەبارەت بە هۆكارەكانی دابەزاندنی قورئان(أسباب النزول) دەڵێت: "پێویستە هەڵەیەك لە ڕووی زاراوەو زمانەوانیەوە ڕاست بكەینەوە، ئەویش زاراوەی(أسباب النزول) بۆ(مناسبات النزول) " ع: ٣٢، ك: ٤٢

دەڵێم: ئەمە هەڵە نیەو كەس ناتوانێ بەرامبەرەكەی بەهەڵە بخاتەوە و تەنها دوو بۆچوونە، هەر ئەو ڕەخنەیەی كە ئەگیرێت لە(أسباب النزول) ڕووبەڕووی(مناسبات النزول)یشی بكەیتەوە هەر دەرناچێت لێی، چونكە ئەویش جۆرێك لە تایبەتكردنی ئایەتەكەو پەی بردن بە حەقیقەتەكەی تێدایە وەك چۆن ئاڕاستەی زاراوەی یەكەم دەكرێت!!

هەروەها لە ڕوویەكی ترەوە ئۆزۆن چۆن مافی ئەوەی هەیە بڵێ بۆ خەڵكی ڕاست بكەینەوەو نەیداتە پاڵ خاوەنەكەی، كە چەندین ساڵ پێش ئەو "سەید قوتب"ی ڕەحمەتی ئاماژەی بەوە كردووە كە وشەی "مناسبات" باشترە، بەڵام ئەو بۆچوونەكەی تریشی ڕەفز نەكردوەتەوە وەكو ئۆزۆن كە پیشەی ئەو تەنها ڕووخاندنی بێ بنەمایە بێ بونیاد نان و دروستكردن!!

## یەكەم ئایەت و كۆتا ئایەت كە دابەزی!

ئۆزۆن ئەیەوێ وا نیشان بدات كە یەكەم ئایەتی قورئانی پیرۆز كە دابەزیوە لەلای پێشەوا بوخاری خیلافی لەسەرەو دیار نییە كە كام ئەیەتەیەو، ئەمەش ئەكاتە بیانویەك بۆ تانەدان لە پێشەوا بوخاری و بەوە وەسفی دەكات كە وردنەبوەتەوە لە بابەتەكان و بەدواداچوونی نەكردووە، بەڵام بەدیار دەكەوێ كێیە بەدواداچوونی نەكردوەو كارەكەی جێی ڕەخنەیە بە پێوانەی زانستی دروست!!

ئۆزۆن دوو فەرموودەی هێناوە كە لەوەرگێڕانەكەدا نزیكی(٦) لاپەڕەی پێ پڕكراوەتەوە، ڕەنگە مەبەست تیایدا تەنها ئەوەبێت ژمارەی لاپەڕەكانی زیاد بكات، چونكە ئەوەی ئەو مەبەستیەتی لەفەرموودەكەدا تەنها چەند دێڕێكەو ئەیتوانی تەنها ئەو بەشە بێنێت كە جێی سەرنجە نەوەك هەموو دەقەكە بێنێت وئەو هەموو لاپەڕەی پێ پڕ بكاتەوە، هەر ئەمەش پیشەیەتی و تا كۆتایی كتێبەكە لەچەندین شوێندا ئەمە دەبینیت!

دەقی فەرموودەی یەكەم باس لەوە دەكات كە یەكەم سورەت دابەزیوە "العلق" بووە:

قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَأَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا قَالَتْ: أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّادِقَةُ فِي النَّوْمِ...حَتَّى فَجِئَهُ الحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ المَلَكُ فِيهِ، فَقَالَ: اقْرَأْ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدُ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدُ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدُ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ ﴿العلق: ١﴾- حَتَّى بَلَغَ -﴿عَلَّمَ الإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ ﴿العلق: ٥﴾ " فَرَجَعَ بِهَا تَرْجُفُ بَوَادِرُهُ، حَتَّى دَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ، فَقَالَ: «زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي» فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ.... وَفَتَرَ الوَحْيُ فَتْرَةً"[١].

---

[١] رواه البخاري (٩/٢٩)، برقم: (٦٩٨٢).

لـەم فەرموودەیەدا ئەوە دەردەكەوێت كە یەكەم شتێك كە هاتووە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بریتی بووە لـە سەرەتای سورەتی(العلق)، بەڵام ئۆزۆن پرسیار ئەكات و دەڵێت:

ئەی چی ئەكەن لـەم فەرموودەیەی تر كە وا نیشان ئەدات كە یەكەم ئایەت دابەزیوە بریتی بووە لـە سورەتی "المدثر"؟!

دەقی فەرموودەكە: عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، سَأَلْتُ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَوَّلِ مَا نَزَلَ مِنَ القُرْآنِ، قَالَ: (يَا أَيُّهَا المُدَّثِّرُ) ﴿المدثر: ١﴾ قُلْتُ: يَقُولُونَ: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) ﴿العلق: ١﴾ فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ ذَلِكَ، وَقُلْتُ لَهُ مِثْلَ الَّذِي قُلْتَ: فَقَالَ جَابِرٌ: لاَ أُحَدِّثُكَ إِلَّا مَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: " جَاوَرْتُ بِحِرَاءٍ، فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي هَبَطْتُ فَنُودِيتُ، فَنَظَرْتُ ﴿ص:١٦٢﴾ عَنْ يَمِينِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ عَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ أَمَامِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، وَنَظَرْتُ خَلْفِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَرَأَيْتُ شَيْئًا، فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ: دَثِّرُونِي وَصُبُّوا عَلَيَّ مَاءً بَارِدًا، قَالَ: فَدَثَّرُونِي وَصَبُّوا عَلَيَّ مَاءً بَارِدًا، قَالَ: فَنَزَلَتْ: (يَا أَيُّهَا المُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنْذِرْ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ) ﴿المدثر: ٢﴾"[1]

بەپێی ئەمەبێت كە یەحیای كوڕی ئەبی كەسیر لـە ئەبو سەلـەمەی پرسیوە لـەسەر یەكەم ئایەت كە دابەزیوەو ئەویش وتویەتی منیش هەمان پرسیارم لـە جابر كردووە و وتویەتی "المدثر" بووە!!

دەڵێم: ئۆزۆن لـێرەدا تەنها لـەبەردەم دوو ئەگەردایە:

یان ئەزانیَ و خیانەت لـەخوێنەرانی دەكات، یان كەسێكە بەنەزانی خەڵكی بەرەو هەڵدێر ئەبات، ئەگینا بابەتەكە زۆر ڕوونەو هیچ دژیەكیەكی تێدا نیە، بەڵام ئەوەی كە من بۆی ئەچم ئەوەیە كە ئۆزۆن چاك ئەزانێت كە لـەم دوو دەقە پیرۆزەدا كێشە نیە، بەڵام ئەوەی كێشەكەی دروست كردووە دەستكاریكردنی ئۆزۆنە بۆ دەقی یەكەم و ئەو ڕستەیەی وا تۆخمان كردووەتەوە لایبردووەو تیایدا نیە، ئەویش:

---

[1] رواه البخاري (٦/١٦١)، برقم: (٤٩٢٢).

فەرموودەكە باسی ئەوە دەكات كە دوای ئەوەی وەحی كرا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بە سورەتی(العلق) دوای ماوەیەك وەحی وەستاو پێغەمبەر (ﷺ)وەحی بۆ نەدەهات لەلایەن خوای گەورەوە و بەمەش زۆر خەمی خوارد(وَفَتَرَ الوَحْيُ فَتْرَةً)!!

هەروەكو خوای گەورە دڵنەوایی دەكات بەم سورەتە: ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ① وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ② مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ③ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ④ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ⑤ ﴾الضحى

كەواتە هیچ گومانێك لەوەدا نییە كە ماوەیەك وەحیی خوای گەورە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) وەستاوەو هیچ پەیامێكی لەلایەن خوداوە بۆ نەهاتووە.

جا ئۆزۆن وای گومان بردووە یاخود ویستویەتی ڕاستیەكان بشێوێنێ، دەڵێت كە بوخاری فەرموودەی دژ بەیەكی هێناوە، بەڵام ئەگەر ئەو بچوایەتە سەر سەحیحەكەی پێشەوا بوخاری(رحمه الله) ئەوا ئەیبینی كە دوابەدوای ئەوەی كە باسی یەكەم ئایەت دەكات كە دابەزیوە بریتییە لە سەرەتای سورەتی(العلق) فەرموودەكەی دایكی ئیمانداران عائشە(رضي الله عنها) نەقڵ دەكات لە پێشەوا زوهریەوە، هەروەها دوابەدوای ئەو فەرموودەیەش ئەم وتەیەی كە ئۆزۆن هێناویەتی و ئەیكاتە ڕەخنە بەسەریەوە، هەر خۆی لە پێشەوا زوهریەوە ئەیهێنێت و دەفەرمویێت: "قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيَّ، قَالَ: وَهُوَ يُحَدِّثُ عَنْ فَتْرَةِ الوَحْيِ فَقَالَ فِي حَدِيثِهِ: " بَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي، فَإِذَا المَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَرُعِبْتُ مِنْهُ، فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي " فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (يَا أَيُّهَا المُدَّثِّرُ. قُمْ فَأَنْذِرْ) ﴿المدثر: ٢﴾ إِلَى قَوْلِهِ(وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ) ﴿المدثر: ٥﴾"[1]

واتە: ئیبن شیهاب(زوهری) فەرمووی: ئەبو سەلەمە ی كوڕی عبدالرحمن هەواڵی پێدام: كە جابری كوڕی عبدالله وتی: قسەی لەبارەی سەردەمەكانی وەحیی دەكرد و

[1] رواه البخاري (٤/١) برقم: (٧).

تیایدا وتی: من ئەڕۆیشتم لـەوكاتەدا دەنگێكم بیست سەرم بەرزكردەوە بۆ ئاسمان بینیم ئەو فریشتەیە بوو كە لـە حەرِا دەهاتە لام لـەنێوان ئاسمان و زەویدا دانیشتبوو لـەسەر كورسیەك، منیش ترسام لـێی و ڕۆشتمەوە ماڵەوە و وتم: داملپۆشن داملپۆشن: ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ. قُمْ فَأَنْذِرْ) تاوەكو وتەی خۆی: (وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ) ﴿المدثر: ٥﴾.

لـێرەدا زۆر بە ڕوونی باسی ئەكات و دەفەرموێت جابر باسی فەترەكانی وەحیی كردووەو فەرموویەتی سەرەتای ﴿المدثر﴾ یەكەم ئایەت بووە .

كەواتە كورتەی قسە لـێرەدا ئەوەیە یەكەم جار كە قورئان دادەبەزێت سورەتی﴿العلق﴾ دادەبەزێت و پاشان تاوەكو ماوەیەك دەوەستێت و كە دەست پێ دەكاتەوە یەكەم شتێك دێتە خوارەوە بریتییە لـە: ﴿المدثر﴾.

یانی ئەم یەكەمیەتیە یەكەمێتی ڕەها نییە بەڵكو یەكەمێتیە بە گوێرەی دابەزینی دووەم دوای پچڕانی وەحیی!! زانایانی بەرِێزیش باسی ئەمەیان كردووەو چەندین خاڵی تریان باس فەرمووەو ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆ كتێبەكانی(علوم القران) یان ڕاڤەی فەرموودە[1].

هەروەها ئەوەی كە ئۆزۆن بانگەشەی بۆ دەكات كە گوایە لـە نێوان ئەو دوو فەرموودەیا جیاوازی تر هەیە و دەڵێت:

" لـێرەدا جوبرائیل پێغەمبەری لـە خۆ نەگرتوەو نەیگوشیوە، یا هەر نەیبینیوە، بەڵكو تەنها دەنگێكی بیستووە " ع: ٣٥، ك: ٤٩ ـ ٥٠

دەڵێم: ئۆزۆن ئەگەر تێبگەیشتایە لـەوەی كە ئەم دوو ڕیوایەتە باس لـە دوو كاتی جیاواز دەكات و دانەیەكیان سەرەتای وەحیی بوەو یەكەم جارە كە وەحیی بۆ دێت و ئەوەی تریشیان هی دوای ئەوەیە كە ماوەیەك وەحیی پچڕاوەو پێغەمبەر(ﷺ) وەحیی بۆ نەهاتووە، ئیتر هەرگیز تووشی ئەم ڕەخنە لاواز و بێ بنەمایانە نەدەهات، بەڵام بڵێین چی هەر

---

[1] البرهان للزركشي، ص: (١٢٠– ١٢١)، ت: مصطفى عبد القادر عطا، دار الكتب العلمية –بيروت –، ط:٢/ ٢٠١١م. الاتقان للسيوطي، ص: (٦٢) ،اعتنى به: مصطفى شيخ مصطفى، مؤسسة الرسالة، ط: ١ /١٤٣٢هـ. مناهل العرفان للشيخ الزرقاني، ص: (٥٧)، دار الكتب العلمية –بيروت–، ط:٢، ٢٠٠٤م.

ئەوەندە چاوەڕوان دەكرێت لەكەسێك كە هەر بەنیازی ڕەخنەگرتن بێت و زۆری پەلەبێت بۆ ڕەخنەگرتن!!

پاشان لەهەمان لاپەڕەدا داوای ئەوە دەكات كە هەستین بە سڕینەوەی ڕیوایەتی دووەم و بەس یەكەم بهێلێنەوە.

دەلێم: با هێندە بە لێكۆلێنەوە منداڵانەكەی دڵخۆش نەبێت و وانەزانێت بە ڕەخنەی زانستیەوە هاتووە، چونكە ئەوەی كە ئەو هێنابووی هەتاوەكو ئەم شوێنەی كە وەلاَمی بۆ ئەنووسم ڕەنگە لە سێ شوێنیشدا پێویستی بەوە نەكردبێت بوەستم و بەدوای ڕاستیدا بگەڕێم و كەمێك وام لێ بكات بەدوایدا بگەڕێم، چونكە ئەوەی ئۆزۆن هێناویەتی یاخود هێندە لاوازە پێویست بە هیچ ماندووبونێك ناكات، یان هی خەڵكی ترەو ئەمیش تووتی ئاسا دووبارەی دەكاتەوەو ئێمەش ئەو نووسینانەی ترمان دەمێك پێش دەركەوتنی "زانای بەناو بانگ ئۆزۆن" بینیوەو خوێندوەتەوەو بەدواداچوونمان كردووە.

ئیتر نازانم بە چی ڕوویەكەوە داوای لابردن و سڕینەوەی فەرموودەی پێشەوا بوخاری دەكات؟!

ئەمجارەیان ئۆزۆن ئەیەوێ ئاست و تواناو بلیمەتی خۆیمان نیشان بدات لە زمانی عەرەبیدا و دەلێت: " هەندێ كەس پێیان وایە كە(اقرأ) مانای(ابلاغ) گەیاندنی تێدایە و واتە بیگەینە " ع: ٣٦، ك: ٥٠

دەلێم: گەر ئۆزۆن لەفەرموودەكە تێبگەیشتایە ئیتر بەسیبوو، ڕاستە(اقرأ) ئەو مانایەی تێدایە، بەلاَم لەم شوێنەدا بێجگە لەمانای خوێندنەوە هەڵناگرێت، چونكە پێغەمبەر(ﷺ) خوێندەواری نەبوو، لەوەلاَمی(اقرأ)دا فەرمووی: (ما أنا بقارئ): من خوێندەوار نیم!! نەك(ما أنا بمبلِّغ)، من گەیەنەر نیم!!

ڕەنگە ئیتر هێندە بەس بێت بۆ ئۆزۆن و وتەكانی، بەلاَم هێشتا هەر بەردەوام دەبین و دێینەوە لای گومانێكی تری.

كۆتا ئایەت كە دابەزی لە قورئانی پیرۆزدا:

ئۆزۆن پشت بە كۆمەڵێك بەڵگە دەبەستێ بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت كە كۆتا ئایەتی قورئان خیلافی لەسەرەو یەكەم بەڵگەشی ئەمەیە(ع: ٣٦، ك: ٥١):

عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، أَنَّ رَجُلًا، مِنَ اليَهُودِ قَالَ لَهُ: يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ، آيَةٌ فِي كِتَابِكُمْ تَقْرَءُونَهَا، لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ اليَهُودِ نَزَلَتْ، لاَتَّخَذْنَا ذَلِكَ اليَوْمَ عِيدًا. قَالَ: أَيُّ آيَةٍ؟ قَالَ: (اليَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا) ﴿المائدة: ٣﴾ قَالَ عُمَرُ: «قَدْ عَرَفْنَا ذَلِكَ اليَوْمَ، وَالمَكَانَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ قَائِمٌ بِعَرَفَةَ يَوْمَ جُمُعَةٍ»[١].

واتە: لە عومەری كوڕی خەتتابەوە: پیاوێك لە یەهود پێی وت: ئەی پێشەوای باوەڕداران، ئایەتێك هەیە لە كتێبەكەی ئێوەدا دەیخوێننەوە، ئەگەر بۆ ئێمەی جوو بهاتایە ئەوا ئەو ڕۆژەمان دەكردە جەژن، فەرمووی: كامە ئایەت؟ وتی: ﴿اليَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا﴾، پاشان عومەر فەرمووی: ئێمە ئەو ڕۆژە باش دەزانین و ئەو شوێنەش كە لێی دابەزیە سەر پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو بەپێوەبوو لە عەرەفەدا لە ڕۆژی هەینی.

ئاخر بۆ خاتری خوای گەورە لێتان دەپرسم: ئەمە چی بەڵگەیەكی تێدایەو ئەم چیرۆكە چی ئاماژەیەكی بۆ ئەوە تێدایە كە كۆتا ئایەت بێت لە قورئاندا؟!

یان ئۆزۆن ئاستی تێگەیشتنی مایەی هەڵوێستەكردن و پرسیاركردنە، یاخود ئاستە زانستیەكەی؟ یان تەنها ویستویەتی ژمارەی پەڕەكانی زیاد بكات ئەگەر بە شتێكیش بێت پەیوەندی بە باسەكەوە نەبێت!!

بەهەر حاڵ ئۆزۆن لە ڕاڤەی ئەم چیرۆكەدا دەڵێت: "ئەگەر ئەم ئایەتە بەس بێت بۆ گرووهی جوولەكە، ئەوە شتێكە پەیوەندی بەوانەوە هەیە نەك مسوڵمانان" ع: ٣٧، ك: ٥٢

ئۆزۆن زۆر بێ نرخ سەیری ئەم شایەتیە ئەكات، لەكاتێكدا ئەمە شایەتیە بۆ قورئان و لەلایەن كەسێكی دوژمنیشەوە هاتووە بڕوای بە قورئان نەبووەو ئەوەش شایەتیەكی بەپێزە

---

[١] رواه البخاري (١/١٨) برقم: (٤٥).

لای خەڵكی عاقڵ و ژیر، بەڵام نازانم ئۆززۆن بۆچی وا قەڵسە لە وەسفی ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزیش؟!

ئەوەی كە ئۆززۆن لەم چیرۆكەدا وەچنگی هێناوە كە بیكاتە بەڵگە بۆ ئەوەی ئەمە كۆتا ئایەتە تەنها ئەوەیە وەكو خۆی دەڵێت: "لۆژیك وایە كە ئیدی ئەمە كۆتایی قورئان بێت، چونكە مانای تەواوبوونی ئایین كۆتایی نیعمەتی خودا بەسەر باوەڕداراندا دەگەیەنێت، بۆیە عەقڵ ڕێگە بەوە نادات ئیدی دوای ئەم ئایەتە، ئایەتی ئەحكام یا ڕێنمایی، یا یاسای نوێ بێتە خوارەوە بۆ ئەوەی بیسڕێتەوە" ع: ٣٧، ك: ٥٢ ـ ٥٣

دەڵێم: پێویستی بەو هەموو درێژكردنەوەیەو باسكردنی چیرۆكەكە لەكاتێكدا هیچ پەیوەندی بەو باسەوە نیەو چەندین جار ناوهێنانی كەعبی ئەحبارو ئەو هەموو درێژدادڕیە نەبوو، تەنها ئایەتەكەی بهێنایەو ڕای خۆی دەربڕیایە و ئیتر بەسبوو!!

بۆ ئەوەشی كە ئۆززۆن باسی لۆژیك ئەكات، منیش هەر بە لۆژیك لەگەڵی ئەدوێم و دەڵێم: باشە ئەگەر ئایەتێكی تر دابەزیبێت و باسی كۆمەڵە شتێكی كردبێت وەكو ئاداب و ئەخلاق و یان حوكمێك كە درێژەپێدەری حوكمی پێشووبوبێت، وەكو باسكردنی حەرامێتی مردارەوەبوو وەكو دووپاتكردنەوە، خۆ لە ئایەتی تردا هاتووەو بەڵام جارێكی تر بۆ بەهێزیی دووپاتكردنەوە ئەم ئایەتە هاتووە ئەمە خۆ نە نەسخی تێدایەو نە هیچ شتێك، ئەو كات وەڵامی ئۆززۆن چی ئەبێت؟!

لەم وەڵامەدا دیارە هیچ زیادەیەك نەخراوەتە سەر دین، كە بەمانای شەریعەت دێت هەروەها دیسانەوە ئەپرسمەوە لە ئۆززۆن، ئەگەر دین مانای تریشی هەبوو، بێجگە لە شەریعەت و ئەحكام، ئەو كات وەڵامی چی ئەبێت؟!

درێژەی وەڵامەكە هەڵدەگرین بۆ دوای هێنانی هەردوو بەڵگەكەی تری ئۆززۆن، بە ویستی خوای گەورە.

دووەم: "حَدَّثَنَا مُغِيرَةُ بْنُ النُّعْمَان، قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْر، قَالَ: آيَةٌ اخْتَلَفَ فِيهَا أَهْلُ الكُوفَةِ، فَرَحَلْتُ فِيهَا إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَأَلْتُهُ عَنْهَا، فَقَالَ: " نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ) ﴿النساء: ٩٣﴾ هِيَ آخِرُ مَا نَزَلَ، وَمَا نَسَخَهَا شَيْءٌ"[١].

واته: موغیرەی كوڕی نوعمان هەواڵی پێداین و وتی: لە سەعیدی كوڕی جوبەیرم بیست وتی: ئایەتێك ناكۆكی هەبوو لەسەری لە نێوان خەڵكی كوفە، منیش ڕۆشتم و سەفەرم كرد لە پێناویدا بۆ لای ئیبن عەبباس و پرسیارم لێی كرد دەربارەی، ئەویش وتی: ئەم ئایەتە دابەزی: (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ) كۆتا ئایەتەو هیچ شتێك نەسخی نەكردوەوە.

سێیەم: "حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، سَمِعْتُ البَرَاءَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ:"آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ بَرَاءَةَ، وَآخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلْ: اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الكَلاَلَةِ)﴿النساء: ١٧٦﴾"[٢]

واته: شوعبە هەواڵی پێداین لە ئەبی ئیسحاقەوە: گوێم لە بەڕاء بوو خوای لێ ڕازیبێت فەرمووی: كۆتا سورەت كە دابەزی بەڕائەبوو، كۆتا ئایەتیش كە دابەزی: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلْ: اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الكَلاَلَةِ).

ئایا وەكو ئۆزۆن ئەیڵێت ئێمە ئەم وتانە بسڕینەوەو بەلایانەوە بنێین، یاخود تێگەیشتنی ئۆزۆن هەڵەیەو پێویستە بەشێوەیەكی تر لێكی بدەینەوەو لێ تێبگەین، ئەی چۆن لەم سێ بۆچوونە تێبگەین و كامیان پەسەندە؟!

دەڵێم: لەسەرەتاوە ئەوەی كە گرنگ بێت ئەم سێ وتەیەی كە ئۆزۆن هێناویەتی هەر سێكەیان وتەی هاوەڵانن و هیچیان فەرموودە نین!!

بۆ هەر یەكێكیشیان ئۆزۆن خیانەتی خۆی كردوەو نەوەستاوە لەوەی وەك و باوباپیرانی لە ڕۆژهەڵاتناسان هەرچی غەل و غەش و خیانەت هەیە بیكات بۆ شەرعیەت دان بە وتە بێ بنەماكانی، ئێستاش ئەچینە لای بەڵگەكانی ئۆزۆن:

---

[١] رواه البخاري (٦/٤٧) برقم: (٤٥٩٠).
[٢] رواه البخاري (٦/٥٠) برقم: (٤٦٠٥).

## بەڵگەی یەكەم:

﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا﴾

وەكو باسمان كرد ئۆزۆن تەنها بۆ گەورەكردنی قەبارەی كتێبەكەی هێنابووی، هەروەها ئەو پرسیارانەی كە لە ئۆزۆنمان كرد، ئێستا بەبەڵگەوە ڕێگەی لێ دەگرین و پێی دەڵێین:

ئەو ئایەتە كۆتا ئایەت نەبوو بەڵكو لەدوای ئەویش ئایەتی تر هاتە خوارەوە كە درێژەی حوكمی تێدابوو یاخود بۆ دووپاتكردنەوەو دڵنیاكردنەوەی حوكمێكی تر هاتبوون بە تێكڕای وتەی هاوەڵان، هەروەكو ئایەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ ﴾البقرة

بەڵام پێشتر ئایەت هاتبوە خوارەوە بۆ حەرامكردنی ڕیبا،

هەروەكو ئایەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوا۟ ٱلرِّبَوٰٓا۟ أَضْعَـٰفًا مُّضَـٰعَفَةً ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ ﴾آل عمران

لەگەڵ ئایەتی: ﴿ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ ﴾النساء

ئەمە وەكو دووپاتكردنەوەو زۆر دڵنیاكردنەوەو ئاگاداركردنەوەی بڕواداران لە ترسناكی ڕیبا لەدوای ئایەتی(الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ) هەم دیسانەوە جارێكی تر خوای گەورە باسی ئەكاتەوەو ئایەت دا دەبەزێنێتەوە.

لەبارەی دابەزینی فەرعێكیش لە بنەماو حوكمێكی گشتیش، خوای گەورە لەدوای ئایەتی(الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ) ئەم ئایەتەی تری ناردە خوارەوە كە دەكاتە كۆتایی سوڕەتی(النساء): ﴿ يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَـٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾ ﴾النساء

دیارە كە خوای گەورە بەسەرەتاكانی سورەتی "نساء" باسی میراتی كردووەو ئایەتی ناردە خوارەوە، ئەمەش كە لێرەدا هاتووە حوكمێكی لاوەكی و فەرعیە لە سەرجەمی حوكمەكانی میرات!!

ئەمەش لەلای هاوەڵان و زانایان جێگەی خیلاف نییە بەسەیركردنی مێژووی دابەزینی ئایەتەكان هەمووی ڕوون دەبێتەوەو بەیان دەبێت.

لە ڕوویەكی ترەوە وشەی(الدِّيْن) تەنها بەمانای ئەحكام نایەت، بەڵكو گرنگترین ڕووی بریتییە لە(التوحید) یەكتاكردنەوەی خوای گەورە و ملكەچی بۆی و فەرمانبەرداریی ئەو بەتەنها، هەروەكو پێشەوا ئیبن فارس دەفەرموێت:

"مِنَ الانْقِيَادِ،وَالذُّلِّ"[1]. واتە: لەگەڕانەوە لاو پەیوەستكردنی دڵ پێوەو گەردنكەچیەوەیە ماناكەی.

هەروەها زانایانی تری زمانەوانیش باسیان كردووە[2].

جا بۆیە بەم پێوەرە ئەكرێ ئایەتەكە بە مانای تەواوبوونی یەكتاپەرستی خوای گەورە(تَوْحِيدُ اللهِ تَعَالَى) و بیروباوەڕ(العَقِيْدَة) بێت، چونكە دوای ئەم ئایەتەش هیچ ئایەتێك نەهاتە خوارەوە لەم بارەیەوەو لەزمانیشدا جێی دەبێتەوە وشەی(الدِّيْن) بەو مانایەبێت.

هەروەها من سەرم لەوە سوڕماوە بۆچی ئۆززۆن خۆی لەو ڕیوایەتە سەرێحە لاداوە كە زانای موفەسیر(القُرْطُبِيّ)(رحمه الله) لە پێشەوا عومەرەوە(رضي الله عنه) ئەگێڕێتەوە بەسەنەدی خۆی

---

[1] معجم مقاييس اللغة لابن فارس (٣١٩/٢)، دار الفكر، عام النشر: ١٣٩٩هـ – ١٩٧٩م.

[2] مختار الصحاح لأبي بكر الرازي، ص: (١١٠)، ت: يوسف الشيخ محمد، الناشر: المكتبة العصرية – الدار النموذجية، بيروت – صيدا ،الطبعة: الخامسة، ١٤٢٠هـ / ١٩٩٩م. معجم مقاييس اللغة (٧٩١/١)، عالم الكتب، الطبعة: الأولى، ١٤٢٩ هـ – ٢٠٠٨ م.

كە دەفەرموێت لـە بارەی كۆتا ئایەتەوە دابەزیوە: عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، قَالَ: «كَانَ آخِرُ مَا نَزَلَ مِنَ الْقُرْآنِ آيَةُ الرِّبَا ...»[1].

پێشەوا عومەر دەفەرموێت(رضي الله عنه) كۆتا ئایەت كە دابەزیوە لـە قورئاندا بریتییە لـە ئایەتی ڕیبا، بەڵام ئۆزۆن نازانم لـەبەر خاتری چی نەیهێناوەو بۆچی ئەو ڕیوایەتی تری هێناوە كە هیچ ئاماژەیەكی بەوە تێدا نییە كە كۆتا ئایەتی قورئان بێت كە دابەزیوە!!

كەواتە بۆچوونی ڕاست و ڕەوان لـە پێشەوا عومەرەوە هەیە كە كۆتا ئایەت كە دابەزیوە بریتییە لـە ئایەتی ریبا لـە كۆتایی سورەتی بەقەرە.

---

[1] تفسير الطبري (٥/٦٦)، ت: التركي، دار هجر للطباعة والنشر والتوزيع والإعـلان، الطبعـة: الأولى، ١٤٢٢ هـ - ٢٠٠١ م.

## بەڵگەی دووەم:

ئەمە یەكێكە لەگەورەترین تاوانەكانی ئۆزۆن كە ئەنجامی داوە یان بەنەزانی یاخود بەوپەڕی زانین و بە مەبەستەوە ئەنجامی داوە، بەهەر بارێكدا لێكی بدەینەوە هەر ماڵوێرانیە بۆی و بەدبەختی دەكات!!

ئەم ڕیوایەتە هیچ پەیوەندیەكی بە باسەكەی ئۆزۆنەوە نییە لە دوورو نزیكەوە، چونكە ئەم ڕیوایەتە باس لەوە دەكات كە خەڵكی كوفە جیاوازی و ناكۆكی كەوتە نێوانیان لەسەر ئەو ئایەتەی كە لە سورەتی(الفرقان) هاتوەو دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ٦٨ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ٦٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٧٠ ﴾الفرقان

ئەبینین لەم ئایەتەدا خوای گەورە هەموو ئەو تاوانانە باس دەكات كە سزای دۆزەخی لەسەرەو مەگەر كەسێك تۆبەی لێ بكات.

كێشەیان بۆ دروست بوو لەگەڵ ئەم ئایەتەی تر كە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ٩٣ ﴾النساء

لە ڕووكەشی ئەم ئایەتەدا ئەوە بە دیار دەكەوێت كە بەهەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە كەسی بكوژ[1]، هەر لەبەر ئەمە زانای بەرێزی ئوممەت سەعیدی كوڕی جوبەیر هاتە لای هاوەڵی خۆشەویست ئیبن عەبباس(رضي الله عنه) و پرسیاری كرد كە كامیان كۆتا

---

[1] بەڵام بە جەمعكردن لەگەڵ ئایەتەكانی تردا بۆمان بەدیار دەكەوێت: كە كووشتن هەرچەندە تاوانێكی گەورەو ترسناكە بەڵام هۆكاری چوونە ئاگری دۆزەخ نیە بە هەمیشەیی، تەنها هاوبەشدانان بۆ خوای گەورە و كوفر هۆكاری چوونە دۆزەخە بە هەمیشەیی، ئەو خلودەش كە لەم ئایەتەدا هاتووە مەبەست پێی ماوەیەكی درێژ بەكارهاتووە لە زمانی عەرەبیدا.

ئایەتە؟ پێشەوا ئیبن عەبباسیش دەفەرموێت ئەوەی دووەمیان کۆتا ئایەتەو هیچ شتێك نەسخی نەکردوەتەوە[1].!!

جا سەیرکەن ئۆزۆن چۆن هەوڵی خیانەتی خۆی دەدات و هیچ پەیوەندیەکی بە کۆتا ئایەتی قورئانی پیرۆزەوە نییە و ئەوەی کە هاتووە باس لـە کۆتا ئایەتی بابەتی کوشتن دەکات لـە قورئاندا نەوەك کۆتا ئایەتی قورئان بە رەهایی!

ئیتر نازانم بۆچی ئۆزۆن هەر وەکو خیانەتی یەکەمی لێرەش ئەو خیانەتە دەکات و لـە وتەی ڕاست و دروست و ڕاستەوخۆی ئیبن عەبباس خۆی لایداوە کە لـە **"سەحیحی پێشەوا بوخاری"**یدا هەیە و دەفەرموێت: "(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ...) قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: «هَذِهِ آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"[2].

هەروەها دەفەرموێت: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ «آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ آيَةُ الرِّبَا»[3].

هەروەها پێشەوا قورتوبی(ﷺ) یش بەسەنەدی خۆی ئەیهێنێت: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: «آخِرُ مَا أُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ آيَةُ الرِّبَا...»[4].

وەك بینیمان هەردوو پێشەوا عومەر و ئیبن عەبباس(ﷺ) ، ئاماژەی ڕاستەوخۆیان کردووە بەوەی کۆتا ئایەت بریتییە لـە ئایەتی ڕیبا.

ئیتر نازانم ئۆزۆن بۆچی لایداوە لـەم هەموو وتە ڕاست و دروستەو هەندێك وتەی هێناوە کە هیچ ئاماژە بەو بابەتە ناکەن؟!

---

[1] فتح الباري (٨/٢٥٨).
[2] رواه البخاري (٣/٥٩).
[3] رواه البخاري (٦/٣٣). برقم: (٤٥٤٤).
[4] تفسير الطبري (٥/٦٧) .

نەك هەر ئەوە بەڵكو هاتووە بەشێوەیەكی گاڵتەجارِانەو ناشرین باسی پێشەوا ئیبن عەبباسی(ﷺ) كردوەو دەڵێت: "بۆچوونی هاوەڵی بچووك و منداڵكاری سەردەمی پێغەمبەر و پێداگری لەسەر دەكات" ع: **٣٧-٣٨**، ك: **٥٤**

ئۆزۆن ئەیەوێت وای نیشان بدات گوایە ئیبن عەبباس ئەمەی داوەتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) و لێشی نەبیستوەو ئەو منداڵ بووە، ئەم وتەیەمان پووچەڵكردەوە لەوەو پێش و لە باسی ئەو هاوەڵە بەرِێزەدا هێندەمان بەڵگە باس كردووە كە ئۆزۆن رِووی نەیەت قسە بكات.

بۆ ئەوەشی كە دەڵێت منداڵ بووە، **دەڵێم:** بەسە بۆ گەورەیی ئەم زانا بەرِێزە كە لە كوفەوە سەفەر بكەن بۆ لای بۆ مەدینە بۆ تەنها پرسیارێك!!

بەسە بۆ گەورەیی و فەزڵی ئەو هاوەڵە بەرِێزە كە لەدوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) پێشەوا عومەر(ﷺ) هەڵی دەبژێرێ بۆ فەتوا!!

## بەڵگەی سێیەم:

ئەم بەڵگەیەشی بەهەمان شێوە بەدەر نییە لەوەی كە لە بەڵگەی دووەمی پێی هەستا لە چەواشەو خیانەت، دەكرێت پرسیار لە "براء" كرابێت لەسەر كۆتا ئایەتی میرات و ئەویش فەرمووبێتی ئەوە كۆتا ئایەتە كە باسی حوكمی میرات بكات و بابەتی "كەلالە"یە.

ئەوەی كە زیاتر ئەمە ئەچەسپێنێ ئەوەیە، لەسەرەتاكەیەوە دەفەرموێت كۆتا سورەت بریتییە لە سورەتی "بەرائە" "تەوبە" لەكاتێكدا سورەتی "تەوبە" لە ساڵی(٩)ی كۆچی دابەزیوە، واتە زیاتر لە دوو ساڵ بەر لە وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)، لەكاتێكدا سورەتی "الفتح" لە كۆتایی تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) دابەزیی لە حەجی ماڵئاوایی لە "مینا" كە نزیكی سێ مانگ و شتێك ئەكات پێش وەفاتی[1].!!

ئەی چۆن دەفەرموێت تەوبە كۆتا سورەتە؟! دەكرێت پرسیاری لێ كرابێت كۆتا سورەت لە سورەتە درێژەكان چی سورەتێك بووە؟!

ئەویش فەرموبێتی: سورەتی تەوبە .

جا ئێستا مافی خۆمانە بپرسین ئەم هەموو وتە بێ ماناو خۆ هەڵكێشانانەی ئۆزۆن چی لێهات؟! ئایا شتێكی بۆ مایەوە لە خیانەت و وتەی بێ مانا زیاتر؟!

**پوختەی وتە:** یەكەم ئایەتی قورئانی پیرۆز دابەزیوە بریتی بووە لە(اقرأ) و دوای ئەوە تاوەكو ماوەیەك وەحیی دەوەستێ، پاشان كە دەست پێ دەكاتەوە یەكەم ئایەت كە دێتە خوارەوە لەم جارەدا بریتییە لە(يا أَيُّهَا الْمُدَثِّر).

كۆتا ئایەتی قورئانی پیرۆزیش بریتییە لە "ئایەتی ڕیبا تاوەكو باسی قەرز(الدَّيْن)" لە سورەتی "البقرة" و پێكەوە هاتونەتە خوارەوە، هەر ئەمەشە وای كردووە لە هەندێك لە هاوەڵان بفەرموون: كۆتا ئایەت بریتی بوو لە باسی قەرز، چونكە ئایەتەكانی ڕیباو قەرز لە سورەتی بەقەرە پێكەوە هاتوونەتە خوارەوە.

---

[1] روح المعاني للآلوسي (٢٩/٣٩١)، ت: مجموعة، مؤسسة الرسالة، ط:١/١٤٣١هـ.

ئیتر لێرەوە زۆر بەجوانی بۆت دەركەوت كە ئەو هەموو تانەو تەشەرەی بلیمەتی سەردەم "ئۆزۆن" تەنها وتەی بێ بەڵگەبوون! نەك تەنها وتەی بێ بەڵگە ئەگەر ئەوەبوایە هێندە لەسەری نەدەكەوت و ئەوترا كەسێكەو زانیاری نیەو قسە دەكات، بەڵام ئەوەی كە زیاتر كارەكەی ئۆزۆنی گەن كردووە بریتییە لە دەستكاری كردنی دەقەكان و بە ویست و ئیشتیهای خۆی نەقڵیان دەكات و ئەیانبڕێت و مانای تریان ئەداتێ كە لەگەڵ هەواو ئارەزووی خۆی بگونجێت، ئەمەش گەورەترین پەڵەیە بە ناوچاوانی ئۆزۆن و هەموو ئەوانەی كە تاوەكو ئێستا قسەیان لەسەر سوننەت و مێژووی ئیسلامی و هاوەڵان كردووە.

دوای ئەم باسانە ئۆزۆن رەخنە لە پێشەوا بوخاری دەگرێ بە گومانی خۆی ئەم ریوایەتانە دژی یەكن و دەڵێ: " پێویست بوو لەسەر ئیمامی بوخاری[1]، وردترین و راستترینی هەڵبژاردایە "ع: ٣٨، ك: ٥٥

ئەوەی كە ئیمامی بوخاری(ﷺ) هەڵیبژاردووە ئەوپەڕی ڕاست و دروستەو وردەكاریشی تێدایەو وردبینیشی كردووە، بەڵام ئەو وردبینیە كەسی ورد هەستی پێ دەكات و ئەیزانێت نەك هەر كەسێك كە خوێندەواربێت ئیتر بچێتە مەیدان و بیەوێ قسەی تێدا بكات، بەڵكو هەرزانستێك پێویستی بە بنچینەیە و بێ ئەو بنچینەیە نابێت قسەی تێدابكرێت، هەروەكو چۆن من بنچینەی زانستی ئەندازیاری نازانم بۆیە بە رەوای نابینم لە پیشەكەی ئۆزۆندا قسە بكەم، جا ئەبوو ئۆزۆنیش ڕێگەی بەخۆی نەدایە لە زانستی شەرعی قسە بكات بەبێ بوونی پێشەكی!!

پاشان باسی دەكات لەبەر چیە داوای سڕینەوەی هەندێك ریوایەتەكان دەكات و دەڵێت: " چونكە مرۆڤ هەمیشە شوێن ئاسانكاری دەكەوێ"ع: ٣٩، ك: ٥٥

[1] وەسفی ئیمامی بوخاری دەكـات و هەرچـی خراپەشـە ئەیداتـە پـاڵی و كتێبەكەشـی نـاوی (تاوانە)،سـیفەتی تاوانباری و ئیمامەت چۆن پێكەوە لە كەسێكدا كـۆ دەبنـەوە؟ دەبـوو ئـۆزۆن ڕاسـتگۆبوایە لەگـەڵ خوێنـەرانی خۆی!!

دەڵێین: هەر ئەوەندە بەسە بۆ كەسێك كە ئەو هەموو هەوڵ و كۆششەی ئیمامی بوخاری لەپێشچاو نەگرێت و ئەو هەموو ماندووبوونە نەبینێت كە ئەو تووشی بووە لە پێناو لەناونەچوونی فەرموودەكانداو لە بوخاراوە هاتووە بۆ عێراق و هەموو ئەو ناوچانە گەڕاوە كە فەرموودەی لێبووەو چەندین ڕێگەی دووری بڕیوە لەبەر فەرموودەیەك و كە بینویەتی ئەو كەسەی كە فەرموودەكەی لایە فێڵ لە ئاژەڵەكەی دەكات ئامادە نەبووە لێی بگێڕێتەوە!!

لە وڵاتی خۆی دەرچووەو غەریبی و دوور لەكەسی كاری لێ نەكردووە و تەنانەت پارەی لێبڕاوەو ناچار جلەكانی بەری فرۆشتووە لەو ڕێگەیەدا، لەبری پاداشت و سوپاس وا ئێستا ئۆزۆن هاتووە دەڵێت بۆ نەهاتووی ئاسانكاریی بكەی بۆ خەڵكی بەڕاستی ئیشێكی باشت نەكردووە!!

ئەو هەموو ماندوبوونەی دیوە و فەرموودەكانی خستوەتە بەردەستمان بەڵام خەڵكانێك كە بێ ئیش و كارن و توانای هەستان بە هیچیان نییە تەنانەت ناتوانن بە دوای ماناكەشیدا بگەڕێن ڕەخنە دەگرن، ئەبوو ئۆزۆن ئەمەی لەسەرەتاوە باسكردایەو بیوتایە بەڕاستی زانستی فەرموودە پیاوی ئەوێ و هەموو كەس شیاوی قسەكردن نییە تیایداو، ئەگەر كەسێك قسەی تیا بكات و مافی ئەوەی نەبێت قسە بكات ئەو كات پەردەی لەسەر لادەچێت و حەقیقەتی بەدیار دەكەوێ.

## پەیبردن بەسەر قورئانەوە!!

ئۆزۆن باسێكی داناوە بە ناونیشانی: (الاستدراك في الذكر الحكيم)[1] ع: ۳۹، ك:٥٦
واتە: پەی بردن بەسەر قورئانەوە.

ئۆزۆن ئەیەوێت وا نیشان بدات كە هەندێك ئایەت هەبوون لـەسەرەتاوە بە تەواوی نەهاتوون و دواتر بەهۆی هەندێك ڕووداو و وتەی هەندێك لـەهاوەڵانەوە(ﷺ) ئایەتەكە بەتەواوی هاتوەتە خوارەوەو، وەك شتێك بلێی ئەیەوێ ئەوەمان پێ بڵێ گوایە ئەم فەرموودانەی كە ئەو باسی دەكات گومان ئەخاتە سەر زانستی خوای گەورەو زانستی نەبووە بە ڕوودانی ئەو شتانە، بۆیە باسی نەكردووە تاوەكو ڕوویداوە!!

### بەڵگەی یەكەمی ئۆزۆن

گوایە خوای گەورە لـەسەرتاوە وشەی(الخَيْط)ی بەكار هێناوەو هەندێك لـەهاوەڵانیش دەزووی ڕەش و سپییان بەكارهێناوە بۆ جیاكردنەوەی شەو و ڕۆژ بۆ گرتن و شكاندنی ڕۆژوو، بەڵام دواتر خوای گەورە تەواوی كردوەو فەرمویەتی(مِنَ الفَجْرِ) هەروەكو لـەم فەرموودەیەدا هاتووە: عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ مُحَمَّدُ بْنُ مُطَرِّفٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: " أُنْزِلَتْ: (وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الخَيْطُ الأَبْيَضُ، مِنَ الخَيْطِ الأَسْوَدِ) ﴿البقرة: ١٨٧﴾ وَلَمْ يَنْزِلْ(مِنَ الفَجْرِ) ﴿البقرة: ١٨٧﴾، فَكَانَ رِجَالٌ إِذَا أَرَادُوا الصَّوْمَ رَبَطَ أَحَدُهُمْ فِي رِجْلِهِ الخَيْطَ الأَبْيَضَ وَالخَيْطَ الأَسْوَدَ، وَلَمْ يَزَلْ يَأْكُلُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُ رُؤْيَتُهُمَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ بَعْدُ: (مِنَ الفَجْرِ) ﴿البقرة: ١٨٧﴾ فَعَلِمُوا أَنَّهُ إِنَّمَا يَعْنِي اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ "[2]

دەڵێم: ئەوەی ئۆزۆن هەوڵی بۆ ئەدات و ئەیەوێ وێنای بكات زۆر شتێكی دوورە لە ڕاستیەوەو ئەگەر بیویستایە تێگەیشتن لـێی ئاسان بوو، بەڵام بلێین چی بەكەسێك هەموو مەبەستێكی تەنها ئەوەیە ڕەخنە بگرێت؟!

---

[1] باسمان كرد لـە هەڵەكانی وەرگێڕدا كە تەواو لـە مەبەست لایداوەو نەیزانیوە ماناكەی چیە!!
[2] رواه البخاري (٢٨/٣)، برقم: (١٩١٧).

ئەم ئایەتە زۆر ڕوون و ئاشكرابوو بۆ كەسێك كە شارەزایی بە زمانی عەرەبی و ڕەوانبێژیەكەی هەبێت و لە(ئیستیعارە)[1] تێگات، تەنها بەوەندەی كە هاتبوو(وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ، مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ)، ماناكەی زۆر ڕوونبوو ئیتر پێویستی بە شتێكی تر نەدەكرد، چونكە وشەی(الْخَيْطُ الأَبْيَضُ) یان، بەكارهێناوە بۆ بەرەبەیان و(الْخَيْطُ الأَسْوَدُ)ش بۆ سەرەتای شەو و تاریكبوون، هەروەكو لە شیعردا هاتووە:

فَلَمَّـــا أضَـــاءَتْ لَنَـــا سَـــدْفَةٌ     وَلاحَ مِـــنَ الصُّـــبْحِ خَـــيْطٌ أنَـــارَا

هەروەها:

أَلْخَيْطُ الأَبْيَضُ ضَوْءُ الصُّبْحِ مُنْفَلِقٌ     وَالخَيْطُ الأسْوَدُ جُنْحُ اللَّيْلِ مَكْتُومُ

جا ئەبینین كە ئەم جۆرە خیتابە لە زمانی عەرەبیدا باو و بڵاوبوە و لەلای هاوەڵانیش(ﷺ) شتێكی زانراوبووەو بۆیە بە تێكڕا زانیویانە و حاڵەتێكی وەهاش بونیادی حوكمی لەسەر ناكرێت و قسەش هەیە لەسەر ئەوەی كە ئەو كەسە كەمێك گێل بوبێت هەروەكو زەمەخشەری و ڕازی و بێجگە لەوانیش پێیان وابوەو ئەم وتەیەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەكەنە بەڵگە كە لەوەڵامیدا دەفەرموێت: «إِنَّكَ لَعَرِيضُ الْقَفَا». واتە: بەڕاستی تۆ پشتەملت پانە، جا ئەم وتەیەش لای عەرەب بەمانای گێلێتی دێت، هەندێكی تریش وەكو پێشەوا تەبەری وبێجگە لەویش ڕایان وایە كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرگیز مەبەستی ئەوە نەبوەو بەڵكو ئەو كەسە هەر خۆی وابوەو كەسێكی درێژبووە.

بەهەرحاڵ هەركامێكیانبێت، ئەگەر بێت و كەسەكە گێل بوبێت یاخود ئاستی زانستی لاوازبوبێت ئەوا خوای گەورە ئەو قورئانەی بەشێوەیەك ڕەوانەكردووە بەڵكو لەگەڵ تێگەیشتنی ئەوانیشدا یەك بێتەوەو هەرچەندە ناتوانن لە هەمووی تێبگەن، بەڵام ئەمە ئاماژەیەكی ڕاستەوخۆی تێدایە بەوەی كە خوای گەورە لەبیری نەكردوون، واتە ئەی

[1] ئیستیعارە ئەوەیە كە شتێك ناوێكی تری بۆ هێنراوەو پێی دراوە كە لە بنچینەداهی خۆی نیە و بە هۆی سیفەتێكەوە پێی دراوە.بەڵام ئەمە پێی ئەوترێت تەشبیە (وێكچواندن) چونكە ئەگەر وەجهی شەبەه باسكرا ئیتر لە ئیستیعارە دەردەچێت.

بەندەكانم  پێویستە ئێوەش بارو زروفیان لە پێشچاوبگرن و بە چاوی كەم سەیریان نەكەن و جێی گرنگیتانبن!!

خوای گەورە لەتواناو دەسەڵاتیدا هەبوو كە هەر یەكەمجار ئەو ئایەتە تەواو بكات، بەڵام بۆ تەواوتێگەیاندنی مرۆڤەكان كە چەندە خوای گەورە(ﷻ) گرنگی داوە بە هەموو چینەكانی خەڵكی و ئاستەكان و جیاوازی نەكردن لە نێوانیاندا، ئەگینا تەنها بەناردنی(وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الخَيْطُ الأَبْيَضُ، مِنَ الخَيْطِ الأَسْوَدِ) ئەوەی كە شارەزایی لە زمان و وردەكاریەكانی هەبوو –كە ئەمە زۆرینەی خەڵكی بوون كەم كەس هەبوون لەم ئاستەدا نەبن – ئیتر بەسبوو بۆیان و تێگەیشتن و كێشەشیان بۆ دروست نەبوو، بەڵام خوای گەورە(ﷻ) كاتێك ئەمەی تریشی ناردەخوارەوە(مِنَ الفَجْرِ) ئیتر ئەوكات تەواو بە ئاشكرا ئەم حیكمەتە گەورەیە هاتە دی و ئەوە سەلمێندرا كە گرنگی بەتەواوی چینەكان دراوە!!

## بەڵگەی دووەمی ئۆزۆن

ئەم فەرموودەیە كە دەڵێت: كاتێك خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە كە ئەو كەسانەی جیهاد دەكەن و ئەوانەی دانیشتوون هەرگیز وەكو یەك نین پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەیدی بانگ كرد بینوسێتەوە و، ئیتر ئیبن ئومی مەكتوم شەكوای كوێریی و نابینایی خۆیی كرد و خوای گەورەش ئەمەی تری ناردە خوارەوە: (غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ) و ئەمەش دەقە عەرەبیەكەیەتی: عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ البَرَاءَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ: لَمَّا نَزَلَتْ: (لاَ يَسْتَوِي القَاعِدُونَ) ﴿النساء: ٩٥﴾ مِنَ المُؤْمِنِينَ " دَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَيْدًا، فَجَاءَ بِكَتِفٍ فَكَتَبَهَا، وَشَكَا ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ضَرَارَتَهُ، فَنَزَلَتْ: (لاَ يَسْتَوِي القَاعِدُونَ مِنَ المُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ) ﴿النساء: ٩٥﴾ "[١].

دەڵێم: لەم فەرموودەیەی تریش بەهەمان شێوە خوای گەورە ئەوەمان نیشان ئەدات بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆی كرداریی كە ئەم پەیامە خواییە تەواو لەگەڵ بەرژەوەندی تەواوی

---

[١] رواه البخاري (٦/٤٧)، برقم: (٤٥٩٢).

چینەكاندا یەك دێتەوە، ئەگەر بێت و هەر بەجاری یەكەم تەواوی ئایەتەكە دابەزیایە هەرگیز ئیبن ئومی مەكتوم و بێجگە لەویش وردنەدەبوونەوە لە حوكم و بڕیارەكانی خوای گەورە بە وێنەی ئەوكاتەی كە بینیان وا خوای گەورە بەدەمیانەوە دێت و وەڵامیان ئەداتەوەو بەڕاستی ئەم پەیامە پەیامێكە هەموو ئاخاوتن و وتە بەرزەكانی وەكو یەكەو ئەم ڕووداوەش ڕاڤەكاری زۆر ورد و دروستی ئایەتی: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾﴾البقرة

ئەمەش زیاتر وایان لێ دەكات و ئێمەشە لەدوای ئەوانەوە هەست بە فەزڵ و بەخشش خوای گەورە بكەین .

لەلایەكی تریشەوە ئەم ڕووداوە گەورەترین بەڵگەیەو ئەیسەلمێنێت كە خوای گەورە(ﷻ) بەتەنها غەیب دەزانێت و پێغەمبەر(ﷺ) بێجگە لەوەی كە كۆمەڵێك هەواڵی داوە بە وەحیی لە نادیار و غەیب، هیچ شتێكی تری لێ نازانێت، چونكە ئەو وا خەریك بوو ئایەتەكە بنووسێتەوەو نەیدەزانی ئایەتی تر دێتە خوارەوەو هێشتا ماویەتی جا لێرەوە بۆمان بەدیار دەكەوێت بەس ئەوەندەی كە ئێمە دەیزانین حیكمەتی گەورەو بەرزن جا ئەوەی تریشی كە لە ئێمە شاراوەیەو پەی پێ نابەین زۆر لەوە زیاترن!!

## بەڵگەی سێیەمی ئۆزۆن:

عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ البَرَاءَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ: «نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِينَا، كَانَتِ الأَنْصَارُ إِذَا حَجُّوا فَجَاءُوا، لَمْ يَدْخُلُوا مِنْ قِبَلِ أَبْوَابِ بُيُوتِهِمْ، وَلَكِنْ مِنْ ظُهُورِهَا، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَدَخَلَ مِنْ قِبَلِ بَابِهِ، فَكَأَنَّهُ عُيِّرَ بِذَلِكَ، فَنَزَلَتْ»: (وَلَيْسَ البِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا البُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا، وَلَكِنَّ البِرَّ مَنِ اتَّقَى، وَأْتُوا البُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا) ﴿البقرة: ١٨٩﴾

واتە: گوێم لە بەڕا بوو ئەیوت: ئەم ئایەتە لەسەر ئێمەی ئەنسار دابەزیی، ئەنسارەكان كاتێك حەجیان دەكرد ئەهاتنەوەو لە دەرگای ماڵەوە نەدەچوونە ژوورەوە، بەڵكو لەپشتەوە دەچوونە ژوورەوە، پیاوێكی ئەنسار لەدەرگاوە هاتە ژوورەوە هەروەك ئەوەی بەمە عەیبداریان كردبێت، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾ ﴾البقرة

واتە: چاكە ئەوە نییە كە ئێوە لەپشتەوە خۆتان بكەن بەماڵدا، بەڵكو چاكە ترسانە لەخوای گەورە، دەسا ئێوەش سنووری خوای گەورە بپارێزن و لە دەرگاكانەوە بچنە ژوورەوە.

دەڵێم: بەس ئەوەندە ئەپرسم: ئاخر ویژدانتان بخەنە گەڕ و بڕیار بدەن، ئەمە لەگەڵ كوێی تەوەرەكەی ئۆزۆندا یەك دێتەوە؟! ئەم بەڵگەیە لەگەڵ كوێی دوو بەڵگەی پێشوو ئەگونجێت؟!

وابزانم تەنها ئەیەوێ وای نیشان بدات كە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز لەبەر هۆكار و مناسەبە نەهاتوونەتە خوارەوە و ئەمە هەڵوەشێنێتەوە، لەكاتێكدا ئەمە تەوەرەی باسەكەی ئۆزۆنیش نیە، بەڵام ڕەنگە ئەو بەس بیەوێ ئەوەی لە چارەكەكەیدایە بەتاڵی بكاتەوە ئیتر شوێنی خۆی بێت یاخود نا!!

هەروەكو دواتر زۆر بەبێ پەردە داوای لابردن و سڕینەوەی سەبەب نزول دەكات و وەڵامی دەدەینەوە بە ویستی خوای گەورە.

پاشان ئۆزۆن زۆر بێ شەرمانە دەڵێت: "جا ئەگەر خەڵكانێك وای دابنێن كە هەبوبێت لەسەردەمی ئیمامی بوخاریدا، ئەم ڕەفتارەی دووبارەكردبێتەوە، ئەوا بۆ ڕۆژگاری

ئەمڕۆی خۆمان بوونی ئەم حوكمە بە پێویست نازانرێ، بەتایبەت ئەمڕۆ كە زۆرێك لەخەڵك كە لە باڵەخانەدا دەژین و جگە لە دەرگایەكی سەرەكی هیچ ڕێگایەكی تری نیە"

ع: ٤٠، ك: ٦٠ ـ ٦١

**دەڵێم**: ئەترسم تاوەكو ئێستاش گومان لەوە هەبێت كە ئۆزۆن بڕوای بە ئیسلام و قورئانیش نییە نەوەك سەحیحی بوخاری بەتەنها!!

باشە گریمان ئەو فەرموودەیە لە لای پێشەوا بوخاری(ﷺ) نەهاتووە هەر وجودی نیە، باشە ئەم وتەیەی ئۆزۆن كە دەڵێت ئەمڕۆ پێویستمان بەو حوكمە نیە، ڕاستەوخۆ ڕووەو قورئان نیەو مەبەستی پێی دان لە قورئانیش نییە؟!

خۆ دەقی ئایەتەكە زۆر سەریح و ڕوونەو پێویستی بە شیكردنەوە نیەو دیارە كە باسی ئەو حوكمە دەكات!!

سەبارەت بە بیانووەكەی ئۆزۆنیش **دەڵێم**: وتەیەكی زۆر نازانستیە كاتێك دەڵێت ئەو حوكمە بۆ ئەمڕۆ بەكەڵك نایەت و ئەمڕۆ **ئێمە لە باڵەخانەدا ئەژین**، ئەویش لەچەند ڕوویەكەوە:

١ – وابزانم ئۆزۆن لەكاتی بڕیاردانیدا تەنها چاوی چینی سەرەوەو خەڵكە دەوڵەمەندەكە ئەبینێت و نازانێت كە هەر لە دەوروبەری خۆیدا خەڵكانێكی هەژار و نەدار و برسی هەن و ڕەنگە هەموو تەمەنیان باڵەخانەیەكیان بۆ چەند خولەكێكیش نەدیبێت.

٢ – چەندین وڵات هەن تاوەكو ئێستاش لەژێر هێڵی سفری هەژاریەوەن و ئێمەش چاك ئەزانین و ئەشیبینین، بەڵام یان ئۆزۆن نەزانە بە ژیانی خەڵك و گوێی لە گوزەرانی خەڵكی تر نیەو لە باریان ناپرسێت، یان ئەوەیە ئەزانێت و خۆی لەگێلی ئەدات.

٣ – تاوەكو ئێستاش زۆربەی خەڵكی لادێ نشین و ئەفریقاو هەندێك وڵاتی ئاسیاش ئەوە گوزەرانیانە، ئیتر نازانم ئۆزۆن چۆن وەها قسەیەك ئەكات؟!

٤ – باشە ئۆزۆن وای داناوە كە ئەمە تەنها بۆ ماڵە، ئەی چی ئەكەیت لە دوكان و ئۆفیس و ...، چەندین شوێنی تر كە ئایەتەكە گشتگیرەوە ئەوانەش هەموو دەگرێتەوە، نەوەك تەنها بۆ ئەنسارەكان بێت وەكو ئۆزۆن بانگەشەی دەكات، چونكە بە كۆدەنگی زانایان: عیبرەت و پەندوەرگرتن و هەڵێنجانی حوكم بەگوێرەی ڕەهایەتی دەقە نەوەك بەتەنها بۆ ئەوكەسەی كە لەسەری دابەزیووە.

لەكۆتاییدا دەڵێم: ڕەنگە شەریعەت و ئاین و دینداری لەلای ئۆزۆن تەنها بۆ خەڵكی نێو باڵەخانەكان بێت نەك تەواوی خەڵك بەبێ جیاوازی، وادیارە بە بۆچونی ئەو ئایین بۆ خەڵكی هەژار نەهاتووە!!

ئەوەی كە ماوە باسی بكەین هەڵوێستەیەك لەسەر لێدوانی ئۆزۆن لەبەرامبەر دوو فەرموودەی پێشوو كە لەسەر یەكەمیان دەڵێت:

"ئەم فەرموودەیە تەواو ئەوە دەخاتە ڕوو كە خوا – بەرزو باڵابێت – لەهەڵبژاردنی وتەكاندا ورد نەبوەو دواجار بەمەی زانیوە(پەی پێ بردووە)[١]... هەر بۆیە ئەو فەرموودەیە بە دەمدرێژی و سنوور بەزاندن – ڕەنگە بێ مەبەست بێت – بەسەر زانایی و زانستی ئەزەل و ئەبەدی و گشتگیریی خودا دەزانم" ع: ٤٠، ك: ٥٨

هەروەها لە بارەی فەرموودەی دووەمەوە دەڵێت: "لەم فەرموودەیە بەدیار دەكەوێ كە خوای گەورە هەر زوو فریای بڕیارەكەی كەوتوەو باری نابینایی(ابن أم مكتوم)ی

[١] وەرگێر وەری گێڕاوە لەسەر مانای خۆیی و دەڵێت (پێداچووەتەوە)، وتمان استدراك بە مانای پەی پـێ بـردن دێت.

لەبەرچاو گرتووەو(غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ)ی بۆ بڕیارەكە زیادكردووە – پەنا بەخوا – " ع: ٤٠، ك: ٥٨ ـ ٥٩

دەڵێم: دەمدرێژیی و سنوور بەزاندن تەنها لەلایەن ئۆزۆنەوەیە بەرامبەر قورئان و فەرموودەو زانستی شەرعی و هاوەڵان و ...، ئەو هەموو شتەی كە ئەو پێی هەستاو پەردەمان لەسەر هەڵماڵی ئەگەر بگاتەوە بەخۆی حەقێتی تنۆك تنۆك عارەقی شەرمی نێوچاوانی بسڕێت، ئیتر نازانم چۆن هێشتا هێندە سوورەو خەریكی زماندرێژییە بەو رادەیە!

خوای گەورە زانستی بەسەر هەموو شتێكدا هەیەو هەموو ئەو پێشهاتانەی كە دێت هیچی بەبێ ویست و ئیرادەی ئەو ناجولێت، بەڵكو هۆكاری درەنگ هاتنی ئەو ئایەتانەی تر لەبەر حیكمەت گەلێكە كە هەندێكیمان باسكرد و ئەگەر زیاتر لەسەری بوەستیت ئەوا شتی تریشت بۆ دەردەكەوێت، بەڵام ڕەخنەگرتنی ئۆزۆن لەم فەرموودانە هەروەكو ڕەخنەی كەسێك ئەبینم كە ڕەخنە بگرێت و بڵێ باشە چۆن خوای گەورە لەباسی دروستكردنی ئاسمانو زەویدا باسی ئەوە دەفەرموێت كە شەش ڕۆژ دروستی كردوون:

﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾الأعراف

هەروەها خوای گەورە لەچەندین ئایەتدا باسی ئەوە دەكات كە هەر شتێكی بوێ تەنها پێی بڵێ ببە خێرا ئەو شتە ئەبێت، هەروەكو دەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾ ﴾النحل

یان ڕەخنەی كەسێكی تر كە بڵێ باشە بۆچی قورئان هەمووی بە یەكجار نەهاتە خوارەوە!!

ئەم جۆرە ڕەخنانە ڕەخنەی كەسێكە لە حیكمەتی تەدەڕوج تێ نەگات و نەزانێت چی لە پشتیەوەیە، هەروەك چۆن ڕەخنەكەی ئۆزۆنیش ڕەخنەی كەسێكە كە هیچ شتێك

نەزانێت دەربارەی حیكمەتی وەحیی و پەیامی خودایی و وابەستبوونی بە ژیانی مرۆڤەوە و هۆكاری دابەزینی بە پچڕ پچڕ!!

## بانگەشەی سڕینەوەی هۆكاری دابەزاندن(أسباب النزول)

ئەم بانگەشەیە كۆنەو لە دێر زەمانەوە قادیانیەكان چەپڵەی بۆ دەكوتن و وائێستاش ئۆزۆن هاتوەو دووبارەی دەكاتەوەو دەڵێی گەورەترین داهێنانی كردووە و دەڵێت:

" تتضح لنا ضرورة الابتعاد عن أسباب النزول هذه لأنها تجعل من التنزيل الحكيم نصا تأريخيا ماضيا"[1] ع: ٤١

واتە: گرنگی دووركەوتنەوە لە هۆكارەكانی دابەزاندن لەوەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز دەخاتە بازنەی دەقێكی ڕابردووی مێژووییەوە.

دەڵێم: ئۆزۆن تا ئێستاش تێنەگەیشتووە لە هۆكارەكانی دابەزاندن و مەبەست پێی، ئەگەر تێگەیشتبا هەرگیز وەها ڕەخنەیەكی نەدەگرت.

گرنگی هۆكارەكانی دابەزاندن و زانینیان بۆ ئەوەیە هاوكاربن لە تەفسیرەكەی و بزانرێت لە چی زروفێكدا دابەزیوە نەوەك بەسەر كێدا دابەزیووە، ئەگەر بێت و جەخت لە خودی كەسەكان بكرێتەوە ئەوا ئەبێتە دەقێكی مێژوویی بەڵام ئەگەر جەخت لە بارو زروف و حاڵەكە بكرێتەوە هەرگیز نابێتە دەقێكی مێژوویی و بەڵكو هەر ئەو باروزروفانەیەو دووبارە دەبێتەوەو ئێمەش ئەمڕۆ پێویستمان پێیان ئەبێت.

هەروەها هەوڵدان بۆ نەهێشتنی هۆكاری دابەزاندن یاخود مناسەبەی دابەزاندن، لەهەوڵێكی فشۆڵ زیاتر نیە، چونكە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز هەیە كە زۆر سەریحە لەو بابەتە، هەروەكو: ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ۝١ ﴾المجادلة

ئایا ئەم بانگەشەی ئۆزۆن ڕاستەوخۆ دژی ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز نییە و ڕاستەوخۆ پێچەوانەی نییە كە لە كاتێكدا ئێمە هۆكاری دابەزینی ئایەتەكەمان ئەوێ و بەدوایدا

---

[1] وتەی وەرگێڕم نەهێنا چونكە بەویستی خۆی وەرگێڕانی كردووەو بەبەراوردكردن هەر نازانرێت ئەمە ئەو وتەیە وەرگێڕاوە، بەڵكو دەڵێی خۆی دایڕێژاوەتەوەو وتەی ئۆزۆنی بەدڵ نەبووە!! سەیری (ئەنجام) پەرەگرافی دووەم دێڕی یەكەم بەدواوە لا: ٦١.

دەگەڕێین هەر لە یەکەم بیستندا و ئەمانەوێ بزانین ئەو ئافرەتە کێیە کە لەبارەیەوە دەفەرموێت(قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا) هەروەها ئەی مێردەکەی کێ بوو؟! هەرچەندە زانینی ئەو کەسانەی کە لەبارەیانەوە ئایەتەکە هاتووە شتێکی لاوەکیە لە چاو زانینی ئەوەی کە ڕوویدا لە نێوانیان و بۆچی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و چی وتەیەکی پێ وتبوو، ئەمە سیفەتی تێکڕای مرۆڤە کاتێك باسی ڕووداوێکی بۆ دەکرێت خێرا دەیەوێت بزانێت ئەو کەسە کێیە کە لە ڕووداوەکەدا باسکراوە، بە هەرحاڵ گریمان پێویستمان بەوە نەبوو بزانین کەسەکە کێیە، بەڵام ئەتوانین بەبێ ئەوەی بزانین کە ئەو وتەیە چیە وا شەکوای حاڵی خۆی کردووە لێی ئایەتەکەمان لەلا ڕوونبێت و لێی تێبگەین؟ ئایا بەبێ زانینی ڕووداوەکە ئێمە لەکوێ بزانین "الظهار" مانای چیەو باسی چی حوکمێکە؟

ئەمە تەنها نمونەیەکە و لە قورئانی پیرۆزدا نموونە زۆرە لەو بارەیەوە کە پێویستمانە هۆکاری دابەزینەکەی بزانین بۆ سوود وەرگرتن لە دەرهێنانی حوکمەکانی، وەکو:

﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ۝٦٥ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ۝٦٦ ﴾التوبة

باشە نابێت ئێمە بزانین ئەوانە چیان وت وا کافربوون و لە کوێدا ئەو قسانەیان کردووەو کێبوون؟!

هەروەها ئەوەی کە ئۆزۆن ئەیەوێ هیچ موناسەبەو هەماهەنگیەك نەهێڵێت لە نێوان قورئانی پیرۆز و دابەزینەکانی سەرەڕای ئەوەی دابڕینی قورئانی پیرۆزە لە واقیع ونەهێشتنی ئەو پەیوەندیە بەتینەیە کە هەیەتی بە ژیانی خەڵکیەوە، تانەیەکیشە دێتە سەر قورئان چونکە ئەبێت ئەو قورئانە کە دادەبەزێت کۆمەڵێك ئایەتی تێدابێت باس لەو واقیعە بکات کە تێیدا دابەزیوەو هەمان واقیعیش ئەمڕۆ دووبارە بێتەوە، ئەگەر وەهاش نەبێت ئەوا ڕەخنە دێتە سەر بەهاو گرنگی دەقە پیرۆزەکانی، هەروەها چەندین ئایەتی قورئان ئەم بانگەشەیەی ئۆزۆن ڕەت دەکاتەوە وەکو:

- ﴿ * يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ... ﴿١٨٩﴾ ﴾البقرة
- ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ ...﴿٢١٥﴾ ﴾البقرة
- ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ ...﴿٢١٧﴾ ﴾البقرة
- ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ ﴾البقرة
- ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْ ۖ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتُ ۙ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ ۖ فَكُلُوا۟ مِمَّآ أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٤﴾ ﴾المائدة
- ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ... ﴿١٨٧﴾ ﴾الأعراف
- ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ ﴾الأنفال
- ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ ﴾النازعات

**بەڕاستی جێگای شەرمە وەها بانگەشەیەك لەدوای بینینی ئەو هەموو ئایەتە كە هەماهەنگی تەواوی لەگەڵ زرووفەكەدا هەبووە!!**

## نەسخ لە قورئانی پیرۆزدا

دوای ئەو هەموو بەدحاڵیبوونەی ئۆزۆن پاشان پەلئەهاوێت بۆ بابەتێكی زۆر هەستیار و وەكو پێش خۆی لە خەڵكانێكی تر كە بەنەزانی كەوتوونەتە گیانی بابەتە شەرعیەكان، باس لە نەبوونی نەسخ دەكات لە قورئانی پیرۆز و ڕەتی ئەكاتەوە كە نەسخ بە هیچ شێوەیەك بوونی هەبێت و دەڵێت:

"ناكرێت خودا كۆمەڵێك بڕیارو ڕێسا دابەزێنێت و لەكەمتر لە دوو دەیەدا بڕیارو ڕێسای پێشووی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە" ع: ٤٢، ك: ٦٢

**دەڵێم**: بوونی نەسخ شتێكی ڕەتنەكراوەیەو كەسێكیش بانگەشەی لابردن و نەهێشتنی بكات ئەوا لەوە بەدەر نییە كە وەسف بكرێت بەكەسێكی نەزان بە حەقیقەتی شەرع و قورئان، هەروەها خوای گەورە بە ئایەتێك كە واژەی ڕاستەوخۆی تێدایە لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾البقرة

بەڵكو خوای گەورە ئاسانی بكات لە داهاتوودا زۆر بەدرێژتر بێینە سەر ئەم بابەتەو تیشكی بخەینە سەر چونكە چەواشەكاریەكی زۆری تێداكراوە، لەلایەن چەندین گرووپەوە بە مەرامی جیا جیا كە لە هەندێكیشیاندا كۆك و تەبان.

بەكورتی **دەڵێم**: ئۆزۆن گەیشتوەتە ڕادەیەك لەسەر ئەوە قسە ئەكات و دەڵێت ناكرێ خودا وا بكات و وا بكات و ڕێگا بۆ خوای گەورە دادەنێ و بەبێ ئەدەبیشی نازانێت، بەڵام لەولاشەوە بەوپەڕی بێ ئەدەبیكردن بێ ئەدەبی دەكرد بەرامبەر فەرموودەكان و بەدەمدرێژیی ئەزانی بۆ سەر زانستی خوای گەورە!!

باشە ئۆزۆن خۆی بە چی ئەزانێ و لە چی ئاستێكی ماریفی و زانستی و لۆژیكیەوە ئەم قسانە دەكات؟! ئەو ئەتوانێت بڵێت لە زانستی هەندەسەدا ناگونجێت بەڵام بۆی نییە بەناوی شەرع و عەقڵ و مەنتیقەوە ئەم قسانە بكات، چونكە هەر سەری لێ دەرناكات!!

پاشان من پێی دەلَێم بۆچی ناگونجێت لەو ماوەیەدا ئەو یاسایانە لابدرێت و یاسای تربهێنرێت لەكاتێكدا ئێمە لە ژیانی خۆماندا ئەبینین، زۆرجار شتانێك كە بۆ ئەمڕۆ گونجاون لەماوەی مانگێكدا گۆڕانی تەواوی بەسەردا دێت و زیانی ئەبێت و ئەبێت لابدرێت و شتانێكی تر بێتە شوێنەكەی، ئەمەش تەنها كەسێكی خۆ بەزلزان لەبەرامبەر حەق و ڕاستیدا ئینكاری دەكات و وتەی ئێمەش بۆ ئەو جۆرە كەسانە نیە.

پاشان ئۆزۆن دەلَێت: " ئیمامی بوخاری ئاشنامان دەكات بە كۆمەلَێك ئایەت كە نەسخ بوەتەوە بەهەندێك ئایەتی تر كە هۆكارەكەیان دیار نین و نایانزانین و زانایانیش نەیانتوانیوە هۆكاری جێی باوەڕمان بۆ بدۆزنەوە" ع: ٤٢، ك: ٦٢

دەلَێم: لێرەوە ئۆزۆن ئەیەوێ ئەوەمان پێ بلَێ كە هەر ئایەتێك نەسخ بوەتەوە و هۆكارەكەی نەزانراوە، پێویستە بڕوامان پێی نەبێت!!

زۆر سەیرم دێت لەكەسێك كە چەندین بابەت هەیە تەسلیمی بووە لە غەیبیات و هۆكارەكانیشی نازانێت بەلاَم وا لێرەدا سەركەشی دەكات!

نەك بابەتی غەیبی، چەندین بابەتی پزیشكی ئەگەر دكتۆرێك پێی بلَێت وا بكەو ئەم دەرمانە بەكاربێنە بڕوای پێ دەكات، ئەگەر دوای ماوەیەكی تر پێی بلَێتەوە ئەو دەرمانە لابەو ئەمەی تر بەكاربێنەو دەرمانی پێشوو كاری تەواو بوو، خێرا تەسلیمی فەرمانی دكتۆر دەبێت و نالَێ بۆ، بەلاَم لێرە ئەیبینیت بەرامبەر سنووری خوای گەورە چەندە خۆبەزلزانە!

ئەوەندە دەلَێم: سەرەڕای حیكمەتی تەدەڕووج و خوێندنەوەی باروزروفی خەلَكی و شیاوی حوكمێك لە كاتێكداو نەگونجانی هەمان حوكم لەكاتێكدا، یەكێكی تر لە هۆكارەكانی نەسخ بە تاقیكردنەوەیەكی خودایی دەبینم بۆ دەرخستن و بەدیاركەوتنی ئاستی

ئیمانی خەڵكی، چونكە ئەمڕۆ زۆر كەس لەوبارەیەوە تووشی زماندرێژیی بوون و هیچ بەهاو ڕێزێكیشیان نەهێشتووەتەوە بۆ دەقەكان[١].

پاشان ئۆززۆن هەندێك بەناو بەڵگە دێنێتەوەو دڵی زۆر پێی خۆشە و وائەزانیٚ ئیتر هەرچی بەڵگە هەیە لەم كتێبە پڕچەواشەیەی كۆیكردووەتەوەو ئیتر هیچ وتەیەكی بۆ كەسانی تر نەهێشتووەتەوە كە هاوڕای نین، بەڵگەكانیشی:

## بەڵگەی یەكەمی ئۆززۆن:

"إِنَّ اللَّهَ بَعَثَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الكِتَابَ، فَكَانَ مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَرَأْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا، رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: وَاللَّهِ مَا نَجِدُ آيَةَ الرَّجْمِ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ، وَالرَّجْمُ فِي كِتَابِ اللَّهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أُحْصِنَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إِذَا قَامَتِ البَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الحَبَلُ أَوِ الِاعْتِرَافُ"[٢].

ئۆززۆن ڕەخنە دەگرێت لەوەی كە لەپێشتردا ئایەت لەسەر ڕەجم دابەزیبێت و پاشان نەسخ بوبێتەوەو بۆ ئەم مەبەستەش كۆمەڵێك ڕەخنەی هەیەو لە(٦) خاڵدا كۆیكردووەتەوەو دەڵێت[٣]:

١ – فەرموودەكە قسەی عومەرە نەك پێغەمبەر:

ئەم وتەیە زۆر لە ئاستێكی لاوازی زانستیەوە هەڵقوڵاوەو ئەگەر تەنها ئەو فەرموودەیەی كە خۆی هێناویەتی بیخوێندایەتەوە بەسیبوو بۆ ئەوەی تیٚ بگات چونكە بە ئاماژەی ڕاستەوخۆ دراوەتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)، كاتێك دەفەرمویت: (فَكَانَ مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَرَأْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا، رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ).

---

[١] خوای گەورە بۆمان ئاسان بكات بە درێژیی باسی ئەم بابەتە ئەكەین و لەسەری بوەستین، چونكە بابەتێكی هەستیارە لە ئێستاداو هەم تاقمە ئیسلامیەكان و هەم تەیارە دژە ئیسلامەكان (ئەتایست و خاچ پەرست و ..) زۆر ئەم بابەتە دەكەنەوەو لێی ئەدوێن.

[٢] رواه البخاري (١٦٨/٨).

[٣] ع:٤٢ – ٤٣، ك: ٦٢ – ٦٦

واتە: لەو ئایاتانەی كە خوای گەورە دایبەزاندووە ئایەتی ڕەجم بوو، ئێمەش خوێندمانەوەو لێشی تێگەیشتین، پێغەمبەر(ﷺ) ڕەجمی زیناكاری كرد و ئێمەش لەدوای ئەو ڕەجمان كرد!

باشە لەوە ڕەوانتر ئەبێ چی بێت كاتێك ئەیداتە پاڵ پێغەمبەرخوا(ﷺ) و لە پێش چاویی گشت هاوەڵانداو لەوتاری هەینی و لە ڕۆژانی حەجدا كە هەموو خەڵكی كۆبونەتەوەو تەواوی هاوەڵان لەوێدابوون، ئەگەر ئەم وتەیەی پێشەوا عومەر وانەبوایە –حاشا لە پێشەوا عومەر(رضي الله عنه) كە وتەی ناڕاست بڵێت و هەڵبەستێت – ئەوا بێگومان كەسێك ڕەخنەی دەگرت و دەیوت وانیە!!

٢ – لە(صحيح البخاري)دا هیچ دەقێك نییە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دووپاتی ڕەجم بكاتەوە:

من تەنها ئەوەندە دەڵێم: ئەگەر ئۆزۆن شەرمی بكردایە هەرگیز ڕووی نەدەهات وەها قسەیەك بكات چونكە كەسێك سەیری سەحیحی بوخاری بكات بە دەیان فەرموودە ئەبینێت و زیاتر لە(١٢) هاوەڵیش گێڕاویانەتەوەو داویانەتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ)!! جا ئەوە ئۆزۆن و ئێوەو سەحیحی ئیمامی بوخاری(رحمه الله) و بۆخۆتان حەكەم بن لەو نێوانەدا.

٣ – ئەم جارەیان ئۆزۆن باسی ئەوە دەكات كە ڕەجم لە قورئاندا نەهاتووە:

نازانم ئەم خاڵە چەند جار موناقەشەی ئۆزۆنی لەسەر بكەین، ئەگەر وەهاش داینێین كە ڕەجم لەقورئاندا نەهاتووەو نەسخیش بێتەوەو هەر شتێك نەهاتووە پێی بوترێت ڕەجم كە لەكاتێكدا وانیەو بە متەواتری هاتووەو هەموو ئوممەت قەبوڵی كردووە بێجگە لە خەواریج و لە گشت مەزهەبە فیقهیەكانیشدا هاتووە، بە ئیبازی و جەعفەری و زەیدی و .. هەموو یەكدەنگن لەسەر بوونی ڕەجم، هەر تەنها بەوەندەبێت كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) كردویەتی و باسی فەرمووەو بڕیاری لەسەرداوە ئیتر ئەوە خۆی بۆخۆی شەریعەتەو لەسەر ئەوەش بەڵگەی زۆرمان هێنایەو باسمانكرد.

٤ – ئەم ئایەتە دێنێتەوە: ﴿ وَٱلَّتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ١٥ ﴾النساء

دەڵێت: ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ئەو ئافرەتانەی كە زینا دەكەن و چوار شاهێدیان لەسەر بگرن و ئەگەر شاهێدیاندا ئەوا لە ماڵدا بەندیان بكەن تاوەكو دەمرن یاخود خوای گەورە رێگەیەكی تریان بۆ دابنێ.

جا ئۆزۆن دەڵێت: (سبیل) واتە: "خلاص و نجاة" واتە: دەرولێكردنەوەو ناشكری دەرولێكردنەوە رەجم بێت چونكە رەجم بەردبارانكردنە تاوەكو مردن.

دەڵێم: ئەو تەفسیرەی كە ئۆزۆن ئەیكات تەفسیرێكی باخەڵێەو بێ بەڵگەیەو گەورەترین ستەمە ئەیكات لە ئەمانەتی زانستی من نەمدیوە لەزمانی عەرەبیدا بەوشێوەیەبێت كە ئۆزۆن تەفسیری دەكات، بەڵام من چوومەوە سەر سەرچاوەگرنگ و گەورەو متمانە پێكراوەكانی زمانی عەرەبی وەكو:

المحكم والمحيط الأعظم(٨/٥٠٥)،لسان العرب(١١/٣١٩)، تهذيب اللغة(١٢/٣٠٣)، الزاهر في معاني كلمات الناس(٢/١٩٧)، العين للخليل(٧/٢٦٣)، الصحاح للجوهري(٥/ ١٧٢٤)، أساس البلاغة(١/٤٣٥)، النهاية في غريب الحديث والأثر(٢/٣٣٨)، مختار الصحاح، ص: (١٤١) .

بەڵام شتێكم نەدی بەو مانایەی كە ئەو باسی دەكات و خۆشتان ئەتوانن بچنەوە سەری و دڵنیا ببنەوە لەم چەواشەیەشی وەكو ئەوانەی پێشووی.

بەڵكو(سبیل) بەمانای رێگەبینینەوە دێت جا ئەگەر لەبەرژەوەندی ئەو تاكە كەسەبێت یان نا!!

ئەم سزایە دانراوە بۆ زیناكردن چونكە ئیسلام كۆمەڵگەی زۆر لەلا گرنگەو هەر مەترسیەك ببێتە هۆی هەرەشە بۆ سەری ئەوا سزای بۆ داناوە بە گوێرەی هەرەشەو مەترسیەكەی، جا گەورەترین هەرەشەیەكیش بۆ سەر ژیانی تاكەكان بریتییە لە زیناو ئەم

ڕاستیەش تەنها كۆمەڵگەی ئیسلامی هەستی پێ دەكات نەك كۆمەڵگەیەكی تر كە تەواو پوكاوەتەوە بەهۆی ڕۆچوونی لە بەد ئەخلاقی و كەسانێكیش كە كاریگەری ئەوانیان لەسەرە.

ئەگەرچی ئەم سزایە سەرەنجامی كەسێك بەرەو مردن دەبات، بەڵام ڕێگەچارەیە بۆ تەواوی كۆمەڵگەكەو بەیەكجاری ئەیپارێزێت لەو هەڕەشەیە، بەپێچەوانەی یاسادەستكردە نەفرینەكان كە بوونەتە هۆی سازاندنی كەشێكی وەها خەڵكی تووشی زینابێت بەمەش بوونە هۆكاری زیادكردنی ڕێژەكە بەشێوەیەكی زۆر فراوان، ئەمە لە كاتێكدا ماوەی حوكمڕانی ئیسلامیو بە درێژایی مێژووی ئیسلامی ژمارەی ئەوانەی كە ڕەجم كراون نەگەیشتووەتە(١٠) كەس[١]!!

بەڵام ئەمڕۆ لە وڵاتە گەورەكاندا بە سەدان هەزار كەس گیرۆدەی لێكەوتەكانی ئەم كارە قێزەونەن[٢].

جا لەم ڕوانگەیەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەدوای ئەو ئایەتە هات و فەرمووی: عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللهُ لَهُنَّ سَبِيلا، الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ، وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ، وَالرَّجْمُ»[٣].

---

[١] زۆر بەدوای ئەو بابەتەدا چووم بەڵام تاوەكو ئێستاش هەر چەند نمونەیەكی كەمەو لە كتێبەكاندا دووبارە دەبنەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی كە دەوڵەتی ئیسلامی هەموو ڕێگەیەك ئاسان دەكات بۆ گەنجان تاوەكو ژن بهێنن و ئەوپەڕی هاوكاریشیانی لە ئەستۆ گرتووە، بەمەش زیناو داوێنپیسی قەڵاچۆ دەبێت!

[٢] لە زنجیەی نەیارانی سوننەت بەشێوەیەكی زیاتر لەسەری وەستاوین و هێشتا هەر زیاتری پێویستەو حەقی خۆیمان پێ نەداوە!!

[٣] رواه مسلم (٣/١٣١٦)، برقم: (١٦٩٠). وأحمد (٢٥/٢٥٠)، برقم: (١٥٩٠٩)، والشافعي في المسند (٣/٢٦٧)، برقم: (١٥٦٩)، ت: ماهر ياسين فحل، الناشر: شركة غراس للنشر والتوزيع، الكويت، الطبعة: الأولى، ١٤٢٥ هـ - ٢٠٠٤ م.

واتە: لێمەوە وەرگرن! لێمەوە وەرگرن! خوای گەورە ڕێگەچارەی بۆ دانان زیناكارێك هاوسەرگیری نەكردبێت سەد دار و، ئەوەشی هاوسەرگیریی كردووە بەردباران كردن.

جا بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی ئەو ڕێگەچارەیەی كردوەو بروامان پێیەتی، باشتریش وایە ئەگەر ئۆزۆن بەباشی نازانێت بۆ ئەم سەردەمەو دەلێت گونجاو نییە بە ئاشكرا بیلێت و واز لەم شێرو ڕێویە بێنێت!!

پاشان ئۆزۆن بە شێوازێكی تری فرت و فێڵ و چەواشەكاریەوە دێت و دەلێت:

"دەبینین سزای نێرینە ئازاردانەو دەرگای تەوبەو چاكبوونیش بەڕوویاندا كراوەیە، بەلآم سزای ژنان بەردبارانكردنە(حسب ما استنتج ابن الصامت في حديثه) ئەمەش ئاماژەیەكی ڕوونە بە جیاكاری لە نێوان نێرو مێدا و خراپەیەكەو دەدرێتە پاڵ ئاینی ئیسلام" ع: ٤٤، ك: ٦٦

دەلێم: پێش ئەوەی وەلآمی ئەم وتەیە بدەمەوە ئەمەوێت ئەوە بلێم كە ئەو ڕستە عەرەبیەی كە خستوومانەتە كەوانەوە وەرگێڕ نەیهێناوە، كە ئەمەش مەبەستێكی بۆگەنی ئۆزۆن و خراپەكاریەكیەتی و ئەوەی كە باسی ئەكات دەلێت: (بەگوێرەی ئەوەی كە ئیبن صامت هێناویەتیە بەرهەم لە فەرموودەكەی)!! بەمەش ئۆزۆن ئەیەوێت گەورەترین تانە بدات لەهاوەلّی خۆشەویست عوبادەی كوڕی صامیت و لەسەرتاوە ئۆزۆن بەس بوخاری پێ تاوانباربوو دواتر چاومان كەوت بە شێواندنی سێ لەگەورە هاوەلآن و پاشان لێرەش وەك گۆلّد تسەیهەر(زیهەر) ئەیەوێ وا نیشان بدات كە هاوەلآن فەرموودەیان دروستكردووە.

دێمەوە سەر گفتوگۆی بابەتەكەو دەلێم: ئۆزۆن دیارە زۆر نەزانە بە ئاینی ئیسلام و ئەحكامەكانی ئەگینا ئەیزانی چەندین فەرموودە هاتوە لەسەر ئەوەی سزای نێربازی بریتییە لە كوشتن هەروەكو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ، وَالْمَفْعُولَ بِهِ»[1].

---

[1] رواه أبو داود (٤/١٥٨)، برقم: (٤٤٦٢)، ابن ماجة (٢/٨٥٦)، برقم: (٢٥٦١)، الترمذي (٣/١٠٩) برقم: (١٤٥٦).

واتە: هەركەسێكتان دی كردەوەی قەومی(لُوط) دەكات ئەوا ئەوكەسەی بكەرەو ئەوەشی پێی كراوە هەردووكیان بكوژن.

نازانم ئۆزۆن ئەم فەرموودەیەو چەندین فەرموودەی تری نەبینیوەو نەبیستووە یان بیستوویەتی و بەلآم ئەیەوێ لەخوێنەرەكانی خۆیی بشارێتەوەو وانیشان بدات كە بوونیان نیە؟! هەركامێك لەم دوانەش بێت هەر كێشەو لۆمەیە بەسەر ئۆزۆنەوە.

٥ – دەڵێت ئەگەر ئێمە دەقی ئەو ئایەتە وەرگرین كە دەڵێت:"الشَّيخُ والشَّيخَةُ إذَا زَنَيا فارْجُموهُما ألبَتةَ[١]". ئەوا دەبینین وشەی شەیخ بەكارهاتوە كە بۆ بەتەمەنەو تەواو لاوازن و لەسەرووی هەموشیەوە لاوازی سێكسیە:

دەڵێم: لێرەدا ئۆزۆن ئەیەوێ بڵێ ئەم دەقە ورد نەبوەو ڕەخنەی دێتە سەر بەوەی كە شەیخ بۆ كەسی بەتەمەن بەكاردێت و ئەوانیش توانای سێكسییان لاوازەو ڕەنگە هەر تواناشیان نەمابێت و بەمەش ڕەخنە دێتە سەری، منیش دەڵێم ئەگەر ئۆزۆن زانیاری هەبوایە دەربارەی زمانی عەرەبی و تەفسیری دەقەكان ئەوا هەرگیز ئەم وتەیەی نەدەوت.

بەهەرحاڵ ئەتوانین بەم چەند خاڵەی خوارەوە وەلآمی ئۆزۆن بدەینەوە:

١ – ئەم دەقە كە هاتووە(الشَّيخُ والشَّيخَةُ إذَا زَنَيا...)، كەس ناتوانێت بەوپەڕی یەقینەوە بڵێت ئەمە ڕێك ئەو دەقە قورئانەیە كە دابەزیووە، لەبەر ئەوەی خوێندنەوەكەی نەسخ بوەتەوە ئیتر ئەگەری ئەوەی هەیە پێشەوا عومەر(رضي الله عنه) بە مانا گێڕابیەتیەوەو باسی كردبێت.

٢ – مامەڵەكردن لەگەڵ ڕووكەشی دەقەكەدا ئەوپەڕی چەقبەستوویەو یەكێكە لەو هەڵانەی ئۆزۆن و بێجگە لەویش تێی كەوتوون و وا دەزانن مەبەست لە شەیخ خوودی كەسی بەتەمەنە، بەلآم ئەم تێگەیشتنە هەڵەیەكی گەورەیەو مەبەست پێی كینایەیە لەكەسێك كە ژنی هێنابێت نەك كەسی بەتەمەن، چونكە لە عادەتی عەرەبدا نەبووە كەسێك بگاتە تەمەنێكی وەهاو ژنی نەهێنابێت جا بۆیە وتەی شەیخ بەكارهاتووە لەبری كەسێك كە ژنی

---

[١] ئۆزۆن دەستەواژەی (ألبَتَة)ی بە هەمزەی وەسل هێناوەو نووسیویەتی (البتة)، ئەم وشەیە هەمیشە بە هەمزەی قەتع دەنووسرێت نەك وەسل!

هێنابێت، ئەمەش لەزمانی عەرەبیدا شتێكی باوەو هەمووان ئەزانین كە زمانی عەرەبی پڕیەتی لە كینایەو ئیستیعارەو تەشبیهات و زمانێكە زیاتر بە ڕەمزو كۆد ئەچێت، تاوەكو باش پێوەی خەریك نەبیت لێی حاڵی نابیت!

٣ – ئەگەر لەسەر حەقیقەتی وشەكە خۆشی وەری بگرین ئەوا هەر بۆیان ناچێتە سەر، چونكە قۆناغی شەیخوخە بەوە دەوترێت كە شوێنەواری تەمەنی لەسەر دەركەوتبێت و مووی سەر و ڕیش سپی تێكەوتبێت و ئەمەش زۆرجار لەسەرووی(٣٥) ساڵەوە ڕوو ئەدات و ئەگەر بە قۆناغی جیاكاری ساڵیش جیای بكەینەوە ئەوا دوای قۆناغی كوهولەت دێت كە لە(٤٠) ساڵیەوە دەست پێ دەكات بۆ دوای خۆی، جا تۆ بلێی هیچ كەسێكی عاقڵ هەبێت وا گومان بەرێت كە كەسێك لەم تەمەنەدابێت توانای سێكسی نەبێت؟!

سەبارەت بەو ئایەتەشی ئەیهێنێتەوە سەبارەت بە ئیبراهیم كە توانای منداڵبوونی نییە لەبەر تەمەنی و ئەیەوێ ئەوەی پێ بسەلمێنێ كە گوایە كەسێك لە قۆناغی شەیخوخبێت توانای سێكسیی نەماوە ﴿ قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ ﴾هود: ٧٢

دەڵێم ڕەنگە ئۆزۆن تەواو هەموو زانیاریەكانی لەلا تێكەڵ بووبێت یاخوود بەمەبەستێك تێكەڵی كردبێت، ئەگینا هەموومان ئەزانین، منداڵبوون لەهەموو كاتێدا پەیوەست نییە بە سەرجێیی كردنەوەو بەڵكو پەیوەندی بەتەمەنەوە هەیەو، مرۆڤ ئەگاتە قۆناغێكی تەمەن كە توانای سەرجێیی هەیە بەڵام ئەو تەمەنە تەمەنی منداڵبوون نییە و ئەمەش لەزانستی پزیشكی باس دەكرێت و ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆی، هەروەها پێغەمبەر ئیبراهیم لەوكاتەدا(٨٦) ساڵ بووە، هەروەكو پێشەوا ئیبن كەسیر دەفەرموێت: " وَوَلَدَتْهُ وَلإبْرَاهِيمَ مِنَ الْعُمرِ سِتٌّ وَثَمَانُونَ سَنَةً"[١].

واتە: هاجەرە منداڵی بوو لەوكاتەی كە ئیبراهیم تەمەنی هەشتاو شەش ساڵبوو!

---

[١] قصص الأنبياء لابن كثير، ص:(٢٠١)، ت: مصطفى عبد الواحد، الناشر: مطبعة دار التأليف – القاهرة، الطبعة: الأولى، ١٣٨٨ هـ – ١٩٦٨ م.

هەروەها بە وتەی ڕەوانتر دەفەرموێت: "إِنَّ إِسْمَاعِيلَ وُلِدَ وَلإِبْرَاهِيمَ مِنَ الْعُمُرِ سِتٌّ وَثَمَانُونَ سنة"[1]. واتە: ئیسماعیل لەدایك بوو لەوكاتەی كە ئیبراهیم هەشتاو شەش ساڵبوو.

دەی كەواتە جیاوازیەكی زۆر هەیە لەنێوان وشەی شەیخ لەم ئایەتەی كە ئۆزۆن دەیهێنێت لەگەڵ ئەوەی تر كە لە ڕەجمەكەدا هەیە، چونكە ئیبراهیم لە كۆتایی شەیخوخەدایەو جاری واش هەیە كەسێك كە(٣٠) ساڵە وشەی شەیخی بۆ بەكاردەهێنرێت بەهۆی دەركەوتنی شوێنەوارەكانیەوە.

٦ – ڕەنگە هاوەڵان(ﷺ) لەسەردەمی پێغەمەر(ﷺ)دا ڕەجمیان كردبێت بە حوكمی تەورات و بەسەر دوو جولەكەدا جێبەجێیان كردبێت:

ئەمە تەنها ئەگەرو گریمانەیەكی بێ مانایەو هەر ئەوەی كە عومەری كوڕی خەتتاب(ﷺ) فەرمووی پێغەمبەر(ﷺ)ڕەجمی كرد و ئێمەش دوای ئەو كردمان، واتە شەرعی ئیسلامە نەوەك جولەكە هەروەها لەسەردەمی پێغەمبەر(

ﷺ) و هاوەڵانیش چەندین جار ئەمە ڕوویداوە وەكو(ڕەجمی غامدیە و ماعز و جوهەینیە) هەروەها ئیمامی عەلی(ﷺ) چەندین ڕیوایەتی لەسەرە كە ڕەجمی كردووە، پاشان هەموو ئوممەت یەكدەنگن لەسەر ئەوەی كە ڕەجم لە ئیسلامدا هەبوەو ئێستاش هەر هەیە و مەگەر كەسی زیناكارو بەدكاریش لەو یاسایە بترسن، یان كەسی ڕێگەخۆشكەریش بۆ بەدڕەوشتی داوای لابردنی بكات(ئەگەر چی حەزیشی بەوە نەبێت بەڵام كارەكەی سەر دەكێشێت بۆی)، ئەوەشی كە لە تەوراتا ڕەجم هەبوە نابێتە هۆی ئەوەی ئێمە بكەوینە گومانەوە لەوەی كە لە ئیسلامدا هەیە چونكە چەندین حوكمی تریش هەیە هەردوولا هاوبەشن تیایدا وەكو نوێژ و ڕۆژوو ... با لە هەندێك شتی لاوەكیش جیاوازبن.

بەمەش كۆتایی هات بە بەڵگەی یەكەم و لێدوانەكانی ئۆزۆن و بینیتان كە بەڵگەكانی زۆر لاواز و بێ بنەمان لە ڕووی هەڵسەنگاندنی زانستیەوە.

---

[1] قصص الأنبياء، ص: (٢٩٠).

بەلّگەی دووەمی ئۆزۆن:

عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْوَامًا مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ إِلَى بَنِي عَامِرٍ فِي سَبْعِينَ، فَلَمَّا قَدِمُوا قَالَ لَهُمْ خَالِي: أَتَقَدَّمُكُمْ فَإِنْ أَمَّنُونِي حَتَّى أُبَلِّغَهُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَإِلا كُنْتُمْ مِنِّي قَرِيبًا، فَتَقَدَّمَ فَأَمَّنُوهُ، فَبَيْنَمَا يُحَدِّثُهُمْ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ أَوْمَئُوا إِلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ فَطَعَنَهُ، فَأَنْفَذَهُ، فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، فُزْتُ وَرَبِّ الكَعْبَةِ، ثُمَّ مَالُوا عَلَى بَقِيَّةِ أَصْحَابِهِ، فَقَتَلُوهُمْ إِلا رَجُلا أَعْرَجَ صَعِدَ الجَبَلَ، قَالَ هَمَّامٌ: فَأُرَاهُ آخَرَ مَعَهُ، «فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهُمْ قَدْ لَقُوا رَبَّهُمْ، فَرَضِيَ عَنْهُمْ، وَأَرْضَاهُمْ»، فَكُنَّا نَقْرَأُ: أَنْ بَلِّغُوا قَوْمَنَا أَنْ قَدْ لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا، وَأَرْضَانَا ثُمَّ نُسِخَ بَعْدُ..."[1]

كورتەی باسەكە ئەوەیە: كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەفتا لـەهاوەڵەكانی بە غەدر شەهیدكران و تەنها دانەیەكیان نەبێت كە قاچی شەل بووە، دوایی جبریل هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ)و هەواڵی پێدا كە خوای گەورە لـێیان ڕازی بووە، پاشان ئەنەس دەڵێ: ئێمە ئەمەمان دەخوێندەوە: ( أَنْ بَلِّغُوا قَوْمَنَا أَنْ قَدْ لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا، وَأَرْضَانَا) پاشان نەسخ بویەوە.

ماناكەی: (بگەیەنن بە گەلـەكەمان كە گەیشتین بە پەروەردگارمان و لـێمان ڕازی بوو، ڕازیشی كردین).

دەكرێت ڕەخنەكانی ئۆزۆن بەم پرسیارانەی خوارەوە دابەش بكەین[2]:

١ – ئۆزۆن دەڵێت: باشە ئەوپیاوە شەلە كێ بوو؟! چۆن بەسەر شاخدا سەركەوتووە لەكاتێكدا شەل بووە؟!

---

[1] رواه البخاري (٤/١٨)، برقم: (٢٨٠١).

[2] ع:٤٦ ـ ٤٧، ك: ٧٠ ـ ٧٣

دەڵێم: ئەمە ئەوپەڕی نەمانی بەڵگەیە، ئەگەرنا زانینی ناوی ئەو كەسە شەلە چی لەبابەتەكە دەگۆڕێت؟! پاشان ئەوەی كە ئۆزۆن دەڵێت چۆن بەسەر شاخدا سەركەوتووە، ڕەنگە ئۆزۆن تاوەكو ئێستا هەواڵی شەڕ و ڕووداوێكی نەبیستبێت ئەگەر هات و كەسێك لەناو كۆمەڵێكدابێت و بكوژرێن بە پێشچاویەوە، ئایا لەو كاتەدا شەلی ڕێگر دەبێت لە خۆ دەربازكردن؟ هەرگیز گوێ بەهیچ نادات و ئەوپەڕی هێزی ئەخاتە گەڕ بۆ ڕاكردن لەبەر خۆشەویستی گیان و ڕزگاربوون، هەروەها ئێمە باسی زنجیرە شاخەكانی هێمالایا ناكەین تاوەكو بلێین چۆن كەسێكی شەل پیایدا سەردەكەوێت بەڵكو باسی شاخەكانی عەرەبستان دەكەین!!

هەروەها ئێمە دیومانە كە كەسی شەل بە شوێنی زۆر سەختدا سەركەوتوە لەباری ئاساییدا، جا چی ئەبێت ئەگەر كار بگاتە ئەوەی هەڕەشەی گیانی لەسەربێت؟!

پاشان لە ڕیوایەتی تردا هاتووە كە تەفسیری ئەم ڕیوایەتە دەكەن و دەڵێت هەر لەسەر شاخەكەبووە نەك بەسەر شاخەكەدا سەركەوێت، لەم فەرموودەیەی پێشەوا بوخاریشدا(ﷺ) ئاماژەی ڕاستەوخۆی تێدا نییە كە سەركەوتنەكەی لەكاتی پەلامارەكەدابوو بێت.

٢ – قسەی كوژراوەكە بوەتە قسەی خوای مەزن:

نەزانی ئۆزۆن گەیشتوەتە ڕادەیەك كە ئەم ڕەخنەیە بگرێت، لەكاتێكدا ئەگەر بێت و كەمترین بەرچاوڕوونی هەبوایە بە قورئانی پیرۆز وەها ڕەخنەیەكی نەدەگرت، چونكە لە قورئاندا چەندین ئایەتی وامان هەیە بۆ پەند و عیبرەت، وەكو: ﴿ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا ٣٥ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا ٣٦ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرۡتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلٗا ٣٧ ﴾الكهف

ئەم ئایەتانەو چەندین ئایەتی دواتر هەر بەهەمان شێوەنیە؟! هەروەها: ﴿ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝٢٠ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرًا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ۝٢١ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ۝٢٢ ﴾يس

لەگەڵ چەندین ئایەتی تری قورئانی پیرۆز كە ئەم باس و خواسانەی تێدایە، نەك ئەمە بەڵكو لەچەندین شوێنی تردا وتەی كەسانی كافر و بێباوەڕەو خوای گەورە گێڕاویەتیەوە، وەكو: ﴿ قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدۡ كُنتَ فِينَا مَرۡجُوّٗا قَبۡلَ هَٰذَآۖ أَتَنۡهَىٰنَآ أَن نَّعۡبُدَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ۝٦٢ ﴾هود

هەروەها: ﴿ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ۝٧١ ﴾الشعراء: ٧١

لەگەڵ چەندین ئایەتی تری قورئاندا كە بەهەمان شێوەیە بەڵام ئۆزۆن زۆر نەزانە بەو حەقیقەتەو یان هەر بەشێوەیەكی هەمەجی ڕەخنەدەگرێت؟!

جارێك كتێبـــی كەسێك لە بێباوەڕە كوردەكانم دەخوێندەوە، ئەویش هەمان پرسیاری كردبوو، كەبۆچی ئەو ئایەتانەی كە وتەی كافران و موشریكانن ئەبێت پیرۆزبن؟!

وەڵامان بۆ ئەو كەسە و ئۆزۆن و هەركەسێكی تر ئەمەیە:

ئەو ئایەتانەی كە بەو شێوەیەن لەبەر چەندین حیكمەتی گەورە هاتوون و هەریەكیكیان چەندین پەندی تێدایەو ئەتوانین لە كتێبەكانی تەفسیردا پەی پێ بەرین، بەڵام بۆ وەڵامی ئەوەی كە بۆچی پیرۆزن؟!

دەڵێم: لەبەر ئەوەیە كە وتەكان وتەی خوای گەورەیەو ئەو كەلامە خوای گەورە جارێكی تر فەرموویەتی و بەوەحیی ناردویەتی بۆیە پیرۆزە، كەواتە هۆكاری پیرۆزییەكەی ئەوەیە كە وتەی خوای گەورەیە(ﷻ) و ئەو زاتە پیرۆزە گێڕاویەتیەوە نەك لەبەر ئەوەی وتەی ئەوانە!

٣ – ئۆزۆن دوای ئەوەی ئەو هەموو شتە باس ئەكات دەڵێت: من لەسەر ئەوانە هیچی ناوەستم بەڵكو: "ولكني سأقف عند نسخ هذه الآية –حسب تعبيرهم– وعدم قراءتها

وإسقاطها باللفظ والحكم والمكان من القران الكريم؟ كيف أسقطن؟ ولماذا أسقطن؟ وأين رأي أو قول الرسول الكريم"[1] ع: ٤٦

واتە: بەڵكو ئەوەستم لەسەر نەسخی ئایەتەكە(بەگوێرەی بۆچوونی ئەوان)[2] و نەخوێندنەوەو لابردنی بە لەفزو حوكم و شوێن لە قورئاندا؟ چۆن لادراون؟ بۆچی لادراون؟ كوانێ بۆچوون یاخود وتەی پێغەمبەر(ﷺ)؟!

دەڵێم: تۆ نەوەستای بەڵام ئێمە وەستاین و نەنگی وتەكانیشتمان باسكرد و لاوازی بەڵگەكانیشتمان هەمووی خستە ڕوو!

دەپرسم باشە تۆ بڵێی ئۆزۆن هەر كەسێكی نەخوێندەواربێت یاخود بەئەنقەست خۆی لە گێلی بدات بۆ ئەوەی بابەتەكەی شتێك درێژبێتەوە؟! ئەگینا ئەو هەموو وتە بێ مانایە چیە كۆیكردوەتەوە؟ بۆ نموونە كامە حوكم لەو چیرۆكە وا ئۆزۆن دەڵێت حوكمەكەی نەسخ بوەتەوە؟! یان ئۆزۆن دەڵێت بە لەفزو بە شوێن، باشە ئەگەر لەفز مەبەست پێی دەقەكەبێت لە قورئاندا ئەی چ مانایەك بۆ شوێن ئەمێنێتەوە؟!

هەروەها ئۆزۆن نازانم جارێكی تر مەبەستی چیە لە ڕای پێغەمبەر(ﷺ) یان وتەی ئەو باشە جیاوازییان چیە ئەگەر هەم دیسانەوە شتێكی لە پشتیەوە نەشاردبێتەوە یان حەجمی كتێبەكەی پێ گەورە نەكات؟!

## بەڵگەی سێیەمی ئۆزۆن:

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سَمِعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلا يَقْرَأُ فِي المَسْجِدِ، فَقَالَ: «رَحِمَهُ اللَّهُ لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً، أَسْقَطْتُهُنَّ مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا».[3]

---

[1] ئەمە لە لاپەڕە (٧١)دا وەرگیَر هەر باسی لێوە نەكردووەو نەیهێناوە ئەم شتانە!!

[2] یانی من نە بڕوام بەم ئایەتە هەیە نە بە نەسخ، بۆیە دەڵێت بەگوێرەی ڕاو بۆچوونی ئەوان.

[3] رواه البخاري (٦/١٩٣)، برقم: (٥٠٣٧).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لە پیاوێك بوو قورئانی دەخوێند لە مزگەوتدا و فەرمووی: ڕەحمەتی خوای لێبێت فلاّن ئایەت و فلاّن ئایەتی وەبیرهێنامەوە **كە بیرم كردبوون** لە سورەتی فلاّن و فلاّن.

ئەوەی ئۆزۆن ڕەخنەی لیّ دەگرێت ئەوەیە كە "پێغەمبەریی خوا قورئانی بیرچوەتەوەو هاوەلّێك وەبیری هێناوەتەو ئەو كۆمەلّە ئایەتە كەس نازانیّ چی بوون و لە چی سوورەتێكدابوون" ع: ٤٧، ك: ٧١

**دەلّێم:** ئەبوو ئۆزۆن بێت و مانای وشەی(أَسْقَطْتُهُنَّ) هەر لەو ڕیوایەتەی پێشەوا بوخاری(ﷺ) وەرگرێت كە دوا بەدوای ئەمەیان هاتوەو دەفەرموێت: عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلا يَقْرَأُ فِي سُورَةٍ بِاللَّيْلِ، فَقَالَ: «يَرْحَمُهُ اللَّهُ لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا، آيَةً كُنْتُ أُنْسِيتُهَا مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا»(١).

بابەتی بیرچوونەوەش شتێكی ئاساییەو سیفەتی گشتی مرۆڤەو ئەوەشی كە ڕوویداوە لە پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هەروەكو تەواوی مرۆڤەكانی ترەو دەكرێت بۆ ماوەیەكی كاتی شتێكی بیر بچێتەوەو ئەویش بەدەر نییە لە سیفەتەكانی تری مرۆڤ وەكو نەخۆش كەوتن و ماندوبوون و ... تاوەكو كۆتایی سیفەتەكانی بەشەر بێجگە لەوەی كە لەهەندێكیاندا خوای گەورە تایبەتی كردووەو ئەمەش هەروەكو لە كۆتایی سورەتی كەهف جەختی لەسەر كراوەو دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾﴾الكهف

بەلاّم بیرچوونەوە لە لایەن پێغەمبەری خواوە(ﷺ) جیاوازە لەوەی كە لە مرۆڤەكاندا هەیەو ئەو لەژێرچاودێری وەحیدایەو خوای گەورە ئەیپارێزێت جا ئەگەر هەر ئەو دەقەی كە خۆی هاوەلاّنی فێركردووە و ئێستا وەبیری بێننەوە، یا ڕاستەوخۆ خوای گەورە خۆی بیهێنێتەوە یادی، یا لە ڕێگەی جبریلەوەبێت.

(١) رواه البخاري (٦/١٩٤)، برقم: (٥٠٣٨).

ئەمەش شتێك نییە كە لە عەقڵ و ژیریدا جێی نەبێتەوەو شتێكی ئاساییە چونكە پێغەمبەری خوا(ﷺ) مرۆڤە، بەڵام پاراستنی پەیامەكەش خودای گەورە پەیمانی پاراستنی داوەو ئەگەر بیریشی بچێتەوە ئەوا ئەیخاتەوە یادی و لەسەرووی هەموویەوە جبریلی ئەمینی وەحیی ساڵانە قورئانی لەگەڵدا دووبارەكردوەتەوەو پێش وەفاتیشی دووجار قورئانی بۆ خوێندوەتەوە.

پاشان ئۆزۆن كۆمەڵێك پرسیار دەكات لەسەر بابەتی نەسخ و ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێت[1] :﴿ مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١٠٦ ﴾البقرة

١ – ئایا مەبەست لە وشەی نەسخ لەو ئایەتەدا چیە؟ ئایا بە واتا سڕینەوەیە؟ یان هەڵوەشاندنەوە؟ یا گواستنەوەیە؟ یا نووسینەوەیە؟ چۆن گەیشتنە ئەوەی كە هەڵوەشاندنەوە لە حوكم و هەڵوەشاندنەوە لە(گۆ)[2]دا هەیەو ئەم جیاكاریەیان لەكوێوە هێناوە؟!

دەڵێم: ئەگەر هەڵوەشاندنەوەو سڕینەوەو گواستنەوە هەر سێكیان بەمانای لادانی حوكمێك و هێنانی حوكمێكی تربێت ئەوا هیچ كێشەیەكی نیەو هەرسێكەی یەك مانایەو پێویست بەو هەرایەی ئۆزۆن ناكات.

بەڵام سەیر لەوەیە ئۆزۆن نەسخ ئەگەرێكی بۆ دانیَ كە لەم ئایەتەدا بەمانای نووسینەوەبێت، لەكاتێكدا كە خوای گەورە دوابەدوای وشەی نەسخ ئەم دێڕە پیرۆزەی هێناوە(أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ) پێم ناڵێن ئەگەر بەمانای نووسینەوەبێت ئەم دێڕە چی مانایەكی بۆ دەمێنێتەوە؟! چونكە كاتێك دەفەرموێت گونجاوترو لەبارتر بۆ ئەو

---

[1] ع:٤٨ ـ ٤٩، ك:٧٣ ـ ٧٤

[2] ئەبێ بوترێت لەفز و گۆ نەوەك دەق چونكە ئۆزۆن نووسیویەتی (لفـظ) نـەك (نـص) ئـەوەی كـە وەرگێـڕ نووسیویەتی لەگـەڵ بابەتەكـەدا یـەك نایەتـەوەو هەڵـەی تێدەكـەوێت، چـونكە دەق هـەم لـەفز و هـەم حـوكم ئەگرێتەوە!! لا: ٧٣

كاتە دێنێت، ئەبێت شتێك نەمابێت و سڕابێتەوە یان هەر شتێكی تر كە مانای لاچونی تێدابێت، نەك نووسینەوە!

٢ – نەسخ و سڕینەوەی ئایەتێكی قورئانی پیرۆز ئەبێت لەلایەن خواوە بێت لەرێگەی جوبرائیلەوە وەك لە وشەی(ننسخ)دا دیارە، ئایا دەتوانن ئایەتێكمان پیٚ بلێن لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە فەرمویێتی یان پێغەمبەرەكەی وتبێتی ئەمە بەو ئایەتە نەسخ بوەتەوە؟! ئایا دەتوانن بە ئایەتێكی قورئانی پیرۆز پێمان نیشان بدەن كە(كامە ناسخ و كامە مەنسوخە)؟!

خۆ گەر بلێی ئەمە بە كنەو پشكنین گەشتوینەتە ئەو دەرەنجامە، باشە ئەی بۆ هەر بەو بۆچوونە ئەم ئایەتەش وا لێناكەن كە هەمان دەق لەهەمان سورەتدا دووبارە بووەتەوە كە دەفەرموێت: ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٤١﴾ ﴾البقرة

دەلێم: نەسخ ڕاستە كە ئەبێت لەلایەن خوای گەورەوەبێت، بەلاّم ئۆزۆن ئەم دێرەی(خۆ گەر بلێی ئەمە بە كنەو پشكنین گەشتوینەتە ئەو دەرەنجامە)لەكوێ هێنا بێجگە لەباخەلّی خۆی؟! لەكاتێكدا باخەلّی پڕیەتی لەخیانەت و چەواشە!

كێ تاوەكو ئێستا وتویەتی كە دیاریكردنی ناسخ و مەنسوخ بە لێكۆلّینەوەو پشكنینی زانایانەو ئەوان دیاری دەكەن وا ئۆزۆن ئەم بابەتە دەوروژێنێت؟

هەروەهاكاتێك داوای ئایەتێكمان لێ دەكات كە نەسخ بوبێتەوە بە ئایەتێكی ترو واش گومان ئەبات كە ناتوانین بیهێنین، ئیتر ئەو كات تۆ تەواو ئەتوانی حوكمی نەزانی ئۆزۆن بدەیت چونكە دیارترین ئایەتێك كە هەمووومان بیستوومانە بریتییە لە باسی حەرامبوونی مەی كە بە سێ ئایەتی جیا دابەزی و هەر یەكێكیان نەسخی حوكمی پێش خۆی كرد هەروەكو دەفەرموێت: ﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ﴿٢١٩﴾ ﴾البقرة

پاشان فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾النساء

پاشان دوابەدوای ئەو ئایەتە فەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾المائدة

پاشان ئۆزۆن ئەیەوێ وای نیشان بدات گوایە ناسخ و مەنسوخ ئیش و كاری هاوەڵان و زانایان بووەو ئەوان بەم كارە هەستاون.

ئەم وتەیە هیچ كەسێكی عاقڵ تا ئێستا نەیكردووە تاوەكو بگاتە كەسانی زاناو دانا!!
بەڵام ئۆزۆن خۆی پرسیار دائەڕێژێ و پاشان خۆشی وەڵامی ئەداتەوەو پرسیارەكانیش كە دایەڕێژێ بە گوێرەی ئاستی وەڵام و توانای خۆی دایەڕێژێت.

سەرەڕای ئەوەی گەورەترین تانەو ڕەخنەیە بۆ سەرقورئان و ئەیەوێ دەرگای ئارەزوو بكاتەوەو ئایەتەكانی قورئان بەپێی ئیشتیها ڕەت بكاتەوە!!

بەڵام بە ئۆزۆن دەڵێم: ئەگەر توانی ئەوە بسەلمێنێت كە ناسخ و مەنسوخ دیاریكردن كاری هاوەڵان و زانایانە ئەوا با خۆی بدات لەو كوفرەو ئایەتەكە بسڕێتەوە!

٣ – پاشان ئۆزۆن پرسیاری ئەوە دەكات كە وشەی(ءَايَةٍ ) مەبەست پێی ئایاتی قورئانە یان ئایاتی كەونی!!

دەڵێم: سوێند بەخوا كاتێك ئەم وتەیەم بینی نەمزانی پێبكەنم یاخود بگریم بۆ زانستی ئۆزۆن، باشە بۆ خاتری خوا من لێتان ئەپرسم موعجیزەو ئایاتی كەونی چی پەیوەندیەكی بە نەسخەوە هەیەو لەكوێی نەسخ جێی دەبێتەوە؟!

هەروەها بڕگەی(نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ ) چی مانایەكی بۆ دەمێنێتەوە ئەگەر ئایاتی كەونی بێت؟!

٤ – دەڵێت: ئایا خوای گەورەو پێغەمبەر(د.خ) بە هیچ دەقێك كەسیان ڕاسپاردووە بە دیاریكردنی ناسخ و مەنسوخ؟!

دەڵێم: لاوازی ئەم وتەیەش کەمتر نییە لەوانەی پێشووی، چونکە دیاریکردنی ناسخ و مەنسوخ ئیشی خوای گەورەو پێغەمبەری خوایە(ﷺ) کە بەفەرمانی خوا(ﷻ) پێی هەڵدەستێ و ئەوەشی هاوەڵان گێڕاویانەتەوە داویانەتە پاڵ خودی پێغەمبەر(ﷺ)نەك خۆیان، ئیتر ئەم وتە بێ مانایەی ئۆزۆن مەگەر بەس خۆی لێی تێبگات!!

## فەرموودە قودسییەکان!

نووسەر باسێکی داناوە بەو ناونیشانەو تیایدا کۆمەڵێك فەرموودەی هێناوەو ڕەخنەیان لـیّ دەگرێت، بەڵام لـێرەش هەر بەهەمان شێوەی پێشوو هەموو وتەکانی لـەوپەڕی لاوازی و بیّ بنەماییدان هەروەکو دەیانبینین بە ویستی خوای گەورە(ﷻ)

### فەرموودەی یەکەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: " يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ "[١].

واتە: خوای گەورە(ﷻ) هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دنیا لـە سیّ یەکی شەودا و دەفەرموێت: هەرکەسێك لـێم بپاڕێتەوە وەڵامی ئەدەمەوە، هەرکەسێك داوای شتێکم لـیّ بکات پێی ئەبەخشم، هەرکەسێك داوای لـێخۆشبوونم لـیّ بکات لـێی خۆش دەبم.

ئۆزۆن هەندێك ڕەخنە دەگرێت[٢]:

١ – چۆن خوای گەورە دادەبەزێتە ئاسمانی دنیا؟!

دەڵێم: ئەمە لـەسەرکەشیەك زیاتر نییە ئەگینا کیّ وشەی "چۆن" لـەبەرامبەر سیفاتی خوای گەورەو کارەکانی بەکاردێنێت؟! یان ئەوەیە ئۆزۆن هێشتا نازانیّ خوای گەورە کێیەو سیفاتەکانی چۆنە یان ئەیەویّ بەهەموو شێوەیەك گومان بخاتە سەر ئیسلام و باکیشی بەوە نییە بەهەر شێوەو نرخێك بێت گرنگ ئەوەیە بگاتە مەرامی خۆی!!

٢ – ئایا خوای گەورە خۆی دادەبەزێت یان زانست و زانیاری ئەو؟!

---

[١] رواه البخاري (٢/٥٣)، برقم: (١١٤٥).

[٢] ع: ٤٩- ٥٠، ك: ٧٦

**دەڵێم:** ڕووكەشی فەرموودەكە ئەوەیە خوای گەورە خۆی دادەبزێت و ئەمەش لەسەر ڕای دروست لەبارەی سیفاتەكانی خوای گەورەوە، ئۆزۆنیش هەر گومانێكی هەیە ئەگەر باسی بكردایە وەڵاممان دەدایەوە لەمەڕ ئەم باسە[1].

٣ – باشە بۆچی خوای گەورە دادەبەزێ بۆ مەگەر پێویستی بەم دابەزینەیە لەكاتێكدا زانستی پێمان هەیە و لێمانەوە نزیكترە لە ڕەگی بناگوێمان؟

**دەڵێم:** پەنا بەخوای گەورە كێ ئەوێرێ وەها جورئەتێك بكات و بڵێ خودا پێویستی بەو دابەزینەیە یاخود كێ هاتوەو بڵێ خوای گەورە زانستی بە بارودۆخی خەڵكی نیە، بەڵام لێرە ئێمە پرسیارەكە بۆ ئۆزۆن پێچەوانە دەكەینەوەو دەڵێین: باشە ئەی ئێمە بۆچی هەر داوا لەخوای گەورە بكەین خۆ نەپێویستی پێیەتی و چاكیش ئەزانێ چی لەدڵماندایە ئیتر بۆ داوا بكەین ئیتر با هەر نەپاڕێینەوە؟!

ئۆزۆن تا ئێستاش تێ نەگەیشتووە لەوەی هەندێك بابەتی پەرستش هەیە بۆی نییە بپرسێت بۆ سەرەڕای ئەوەی كە هەندێك لە حیكمەتەكانیشی لە ئێمەوە دیارەو ئەتوانین چەندین خاڵ بژمێرین بۆ هەر یەكێكیان، بەڵام لێرەوە تەنها ویستم بەو دوو هۆكارە بێتامەی كە خۆی هێنایەوە ڕێگەی لێ بگرینەوە.

[1] بۆ ئەو مەبەستەش ئەتوانن بگەڕێنەوە سەر ڕاڤەو لێكدانەوەمان لەسەر هەردوو كتێبی (العقيدة الواسطية) و (سلم الوصول)، لەوێدا وەڵامی گومانەكانمان داوەتەوەو بە تێر و تەسەلی دواوین و لە یوتیوب بەردەستە (مروان الكردي).

فەرموودەی دووەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ بِشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً "[١].

لەم فەرموودەیەدا هیچ ڕەخنەیەكی نەگرتووە تەنها هێناویەتی و هەندێك لە وتەی ڕاڤەكارانی فەرموودەكەی هێناوە[٢]، بەڵام هیچ شتێكی تێدا نەدۆزیوەتەوە ڕەخنەی لێبگرێت و من وای تێدەگەم تەنها بۆ گەورەكردنی قەبارەی كتێبەكە هێناویەتی[٣].

فەرموودەی سێیەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " تَحَاجَّتِ الجَنَّةُ وَالنَّارُ، فَقَالَتِ النَّارُ: أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ وَالْمُتَجَبِّرِينَ، وَقَالَتِ الجَنَّةُ: مَا لِي لاَ يَدْخُلُنِي إِلا ضُعَفَاءُ النَّاسِ وَسَقَطُهُمْ، قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِلْجَنَّةِ: أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي، وَقَالَ لِلنَّارِ: إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا مِلْؤُهَا، فَأَمَّا النَّارُ: فَلاَ تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضَعَ رِجْلَهُ فَتَقُولُ: قَطْ قَطْ، فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، وَلاَ يَظْلِمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا، وَأَمَّا الجَنَّةُ: فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا "[٤].

---

[١] رواه البخاري (٩/١٢١)، برقم: (٧٤٠٥).

[٢] ع: ٥٠ ـ ٥١، ك: ٧٧ ـ ٨٠

[٣] بەڵام لێرەدە هەڵوێستەكردنێك لەسەر وتەی ڕاڤەكارانی فەرموودەكەدا هەیە، كە بابەتی سیفاتی خوای گەورەیە، ئەوەش بابەتی ئۆزۆن نیە تاوەكو گفتوگۆی بكەین لێرەدا و ئەگەر كەسێكیش بیەوێ ئەتوانێت بگەڕێتەوە ڕاڤەی كتێبە بیروباوەڕیەكان كە كردوومانەو لە یوتیوب بەردەستە.

[٤] رواه البخاري (٦/١٣٨)، برقم: (٤٨٥٠).

ئۆزۆن دوای ئەوەی كە فەرموودەكە ئەهێنێ پاشان وتەی ڕاڤەكارانی فەرموودەكەش دێنێت و هەندێك ڕەخنە دەگرێت، ئەوانیش[1]:

١ – ئۆزۆن ئەوە ڕەت ئەكاتەوە كە هاوشێوە(مرادف) لەزمانەوانیدا هەبێت!

كاتێك كە هەندێك لەزانایان فەرموویانە(متكبر) و(متجبر) بەیەك مانا دێن، ئۆززۆن وەكو زانایەكی زمانەوان خۆی نیشان ئەدات و دێتە مەیدانەوە، بەڵام تا ئێستا دیوتانە كەسی شەل وەك كەسێكی ساغ بڕوات بەڕێگادا یان كەسی كوێر وەكو چاوساغ؟!

ئۆزۆن ئەگەربێت و سەیرێكی گشت زمانەكانی جیهانی بكردایە ئەوا ئەیبینی كە بابەتی هاوشێوە لە هەموویاندا هەیەو هیچ جێگەی ڕەخنە نیە، لەگەڵ ئەوەی كە هەندێك جار لە مەبەست و ماناشدا جیاوازییان هەیە، بەڵام زۆر جاریش چەندین وشە بە یەك ماناو مەبەست بەكاردێن و بەكارهاتوون.

٢ – ئەیەوێ زۆر خۆی گەورە نیشان بدات بەوەی ڕەخنە لە پێشەوا ئیبن حەجەر بگرێت و دەڵێت: "هەژاران هەمیشە لای خوا مەزن و پایەبەرز نین ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡۖ قَالُواْ كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ قَالُوٓاْ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ٩٧ ﴾النساء

**دەڵێم**: ئۆزۆن چەندە لەو ئایەتە پیرۆزە تێگەیشتووە هەر هێندەش لە وتەكەی پێشەوا ئیبن حەجەر تێگەیشتووە، ئیبن حەجەر مەبەستی ئەوەیە كەسێك لەگەڵ هەژاریەكەیدا سوپاسگوزاربێت ئەوا لای خوای گەورە جێگەی ستایشە، ئەمەش بە تێكڕای هەموو خاوەن ژیریەكان وتەیەكی شیاو و ڕاستە، ئیتر ئەم هەراو هۆسەی ئۆززۆن لەپەنای چی؟!

بەڵام ئێمە مافی خۆمانە بپرسین ئەو ئایەتەی ئۆززۆن هێناویەتی چی پەیوەندیەكی بە هەژارانەوە هەیە؟! تاوەكو پەیوەندی بە وتەكەی پێشەوا ئیبن حەجەرەوە هەبێت؟!

[1] ع: ٥٢ ـ ٥٣، ك: ٨١ ـ ٨٤

نازانم تۆ بڵێی هێندە نەشارەزابێت كە وشەی(مُسْتَضْعَفِينَ) بە هەژار تێگەیشتبێت یان هێندە چەواشەكاربێت بۆ مەرامی خۆی بەكاری بێنێت لەكاتێكدا هیچ بەلای یەكدا ناچن؟!

ئەوەی كە زۆر سەیرە ئۆزۆن بڕوای بە بوونی موراديف "هاوشێوە" نییە لە زماندا بەڵام خۆی "فقير" و "ضعيف" دەكاتە یەك وشە، خۆزگە هاوشێوەی یەكتربوونایە!!

٣ – ئۆزۆن دەڵێت: بەهەشت بەهۆی كردەوەیەو بەبێ كردەوەی باش چوونە بەهەشت نیەو چەندین پەیمان هەیە لەلایەن خوای گەورەوە(ﷻ) كە هۆكاری چوونە بەهەشت كردەوەیە و ڕەخنە لەهەندێك لە زانایان دەگرێت بەوەی كە چونە بەهەشت بەهۆی كردەوەوە نیە:

ئێمەش دەڵێین: ئەمە شتێك نییە كە لە ئوممەتی ئیسلامی ون بوبێت و ئێستا ئۆزۆنی كەڵە زانای بلیمەت هاتبێت و كەشفی بكات، بەڵكو زانایانی ئەم ئوممەتە كتێبی تایبەتیان لەسەر نووسیوە بە زیاتر لە هەزاران ساڵ پێش ئێستا، هەروەكو پێشەوا ئاجوڕی و ئیبن بەتتە و لالەكائی و ئیبن تەیمیەو ...، هەموو باسی ئەوەیان كردووە كە بەبێ كردەوە چوونە بەهەشت نیەو بەڵكو كەسێك كردەوەی نەبێت ئیماندار نیە!

ئیتر نازانم بۆچی ئۆزۆن دەبێت لەسەر ڕای زانایەك كە ئیجتهادی كردوەو نەیپێكاوە، هێندە توندەو هیچ مافێك ناهێڵێتەوە بۆی لەكاتێكدا ئەو مافی خەڵكانێك ئەدات بە ئاشكرا جوێن بەخوای گەورەو تەواوی ئاینەكان و ... بدەن؟!

پێغەمبەر(ﷺ) و ڕای بەرامبەر!!

ئۆزۆن لەژێر ئەم ناونیشانەدا چەند نمونەیەك باس دەكات كە گوایە پێغەمبەر(ﷺ) خوینڕێژبوەو كەسێكی دلڕەق و بێ بەزەیی بووەو ڕێگەی بە نەیارانی نەداوەو لەپێناو ڕاجیایی خەڵكی كوشتووە، بەئاشكراش دەڵێت من بڕوام بەم شانە نیە(واتە پێشەوا بوخاری خۆی هەڵبەستوون)!!

## یەكەم: كوشتنی كەعبی كوڕی ئەشرەف!

ئۆزۆن باسی كەعبی كوڕی ئەشرەف دەكات كە كوژراوە بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ)و درێژەی چیرۆكەكە باس دەكات و لەبارەی هۆكارەكەشیەوە دەڵێت: " تاوانباربووە بەوەی كە جنێوی بە پێغەمبەر(د.خ) داوە" ع: ٥٩، ك: ٩٢

جا ئۆزۆن زۆر بێ شەرمانە دەڵێت: (وقد اتهم بهجائه للنبي)!! واتە: تۆمەتباركراوە بە جنێودان و داشۆرینی پێغەمبەر(ﷺ).

ئەیەوێ ئەو حەقیقەتە مێژوییە تێكبدات و بەوشێوەی كە خۆی ئەیەوێ وێنای بكات و گومان دروستبێت، واتە بەس تۆمەت بووەو ئیتر فەرمانی كوشتنی كراوە بێ ئەوەی دڵنیا ببنەوە لەوەی كە وتویەتی یاخود نا!!

بەڵام ئۆزۆن پشتی كردووە لەو هەموو دقانە كە باس لە كەعب دەكات كێیەو بۆچی كوژراوە، جا ئێمەش ئێستا پێتانی ئەناسێنین بۆ ئەوەی چاك بزانن كە ئەو گورگەی كە ئۆزۆن لاوانەوەی بۆ ئەكات كێ بووە!

" إِنَّ كَعْبَ بْنَ الأَشْرَفِ الْيَهُودِيَّ كَانَ شَاعِرًا ، وَكَانَ يَهْجُو رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيُحَرِّضُ عَلَيْهِ كُفَّارَ قُرَيْشٍ فِي شِعْرِهِ "[1].

---

[1] أبو داود (٣/١٥٤)، برقم: (٣٠٠٠)، السنن الكبرى للبيهقي (٩/٣٠٨)، برقم: (١٨٦٢٨)، المعجم الكبير للطبراني (١٩/ ٧٦)، تأريخ المدينة لابن شبة (٢/ ٤٥٩)،

واتە: كەعبی كوڕی ئەشرەفی جولـەكە شاعیربوو، پێغەمبەری خوای(ﷺ) دادەشۆری و كافرانی قورەیشی لـەدژ هان دەدا لـە شیعرەكانیدا.

باشە پێم نالـێیت ئەم گریان ولاوانەوەیەی ئۆزۆن لـەسەر كەسێكی خیانەتكاری وەكو كەعب لـەپەنای چیە و بۆچی؟!

## دووەم: كوشتنی عبدالله ی كوڕی ئەبی حوقەیق!

ئۆزۆن باسی كوشتنی ئەبوڕافیع(عبدالله ی كوڕی ئەبی حوقەیق) ئەكات و ڕەخنە دەگرێت.

پاشان ئەم دێڕە دەڵێت: "ئازاری پێغەمبەری دەداو گەلـەكۆمەكێی لـیێ دەكرد،(پارەو پولـی زۆری دەدا بە هۆزە عەرەبە بتپەرستەكان كە دوژمنایەتی پێغەمبەریان دەكرد)"[١] ك: ٩٤

دەڵێم: باشە ئەی هاوار من لـەكوێ كەسێك بێنم ئۆزۆن تێبگەیەنێت؟! باشە ئۆزۆن خەڵكی بە گێل دەزانێ یان ئەیەوێ پێغەمبەر(ﷺ) وەسف بكات بەوەی كەسێكی بێ ئاگایەو نازانێ چی لـە دنیای سیاسەت و بەڕیوەبردنی ولاَت دەگوزەرێ؟!

ئەگینا چی كەسێكی عاقڵ و ژیر هەیە ڕێگە بدات كەسێك بەو خیانەت و دوژمنكاری و پلانگێڕیە لـەناو دەوڵەتەكەیدا بژی؟!

هەم دیسانەوە وەكو جاری پێشوو ئۆزۆن دەڵێت ئەمیش تۆمەتباربووە بەوەی جوێنی بە پێغەمبەر(ﷺ) داوە، بێ ئەوەی شەرم بكات لـە خوای گەورەو خوێنەرانیشی!!

هەروەها ئۆزۆن دەڵێت: عبدالله ی كوڕی عەتیك كاتێك ئەچێ بۆ كوشتنی قاچی دەشكێت و پێغەمبەری خوا دەستی پێدا دەهێنێ و قاچی چاك دەبێتەوە بەلاَم سەعدی كوڕی موعاز كە پێغەمبەر چەنێكی خۆش دەوێ تیرێك لـێی دەداو ئەمرێت و پێغەمبەر ئەم كارەی لـەگەڵدا ناكات. ع: ٦١، ك: ٩٨

[١] ئەوەی كەوانەكە زیادەی وەرگێڕەو ئۆزۆن نەیهێناوە.

دەڵێم: سەرەڕای ئەوەی قاچ شكان شتێكەو تیرێك ئەگەر بەر شوێنێكی كوشندە بكەوێت شتێكی زۆر جیاوازتر، بەلاَم ئەبوو ئۆزۆن هەستی بەوە كردباو بیزانیایە بابەتی موعجیزە لەدەستی پێغەمبەران خۆیاندا نیەو بەویستی خوای گەورە دێتە ئەنجام، ئەگینا هەموو ئەزانین كە حەمزەی مامیشی(رضي الله عنه) كە بەهێزترین قەلاَی ئەم ئیسلامەبوو بەپێشچاویەوە دەمرێت بە ڕمێك و ناتوانێت كارێكیشی بۆ بكات بەبێ فەرمانی خوای گەورە، ئیتر نازانم ئەم ڕەخنە سواوەی ئۆزۆن چی مانایەكی هەیە؟!

## سێیەم: كوشتنی ئیبن خەتەل!

ئۆزۆن باسی "ئیبن خەتەل" ئەكات كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە كوشتنی كرد لە ڕۆژی فەتحی مەككە. ع: ٦٢ـ ٦٣، ك: ٩٨

پاشان باسی هۆكاری كوشتنەكەی ئەكات و دەڵێت: " بەشیعر جنێوی بە پێغەمبەر(د.خ) ئەداو دووكەنیزەكی هەبوو فەرمانی پێدەكردن بە گۆرانی جوێن بە پێغەمبەر بدەن" ع: ٦٢، ك: ٩٩

دەڵێم: ئۆزۆن وەك هەمیشە ئەیەوێ خیانەت بكات و كردوشیەتی، ئەوەی ئەو باسی دەكات تاكە هۆكارێك بووە كە تەنها ئەوە بەسە بۆ ئەوەی ئەو كەسە لەناو بدرێت، چونكە كەسێك ڕێزی سەدان هەزار هەست و نەست نەگرێت و جوێن بدا بەو كەسەی كە لەلای ئەوان خۆشەویستترین كەسیانە، بێگومان مافی ژیانی نییە وەها كەسێك چونكە قەدری ژیانی خەڵكانی لەلا نیە.

بەهەرحاڵ ئەمە هۆكارێك بوو، هۆكارێكی تریش ئەوەبووكە ئیبن خەتەل خوێنی ئەنساریەكیشی ڕشتبوو، كاتێك هات و مسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند و پێغەمبەری خواش(ﷺ) كەسێك لە ئەنساریەكانی كردە هاوەڵی بەلاَم خیانەتی كرد و وەرگەڕایەوە لە ئاین و ئەو ئەنسارییەی شەهید كرد[1].

---

[1] معالم السنن للخطابي (٢٨٨/٢)، الناشر: المطبعة العلمية – حلب –، الطبعة: الأولى ١٣٥١ هـ، ١٩٣٢ م

پاشان گلەییەكی گێلانە دەكات و دەڵێت: بۆچی بوخاری لە(جزاء الصيد)(باب دخول الحرم ومكة بغير إحرام) ڕووداوەكەی هێناوە؟!

دەڵێم: هەركەسێك كتێبەكەی پێشەوا بوخاری خوێندبێتەوە ئەزانێت كە بابەكانی بەگوێرەی(فقه) داناوەو فیقهی ئیمامی بوخاری لە بابەكانیەتی و حوكمی لێ وەرەگیرێت، جا بۆیە ئەبینین فەرموودەیەكی لە چەندین بابدا هێناوەو ئەم فەرموودەیەش بەهەمان شێوە لە چەندین بابی تردا هاتووە، بۆیە لێرەش هێناویەتی چونكە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ئیحرامدا نەبووە و دروستە بچێتە مەككەو مەدینەوە بەبێ ئیحرام، جا ئەو بابانەش كە فەرموودەكەی تێدا هاتووە:

١ – دخولُ الحرمِ وَمَكةَ بغيرِ إحْرامٍ[1].

٢ – بابُ قَتْلِ أَسِيْرٍ[2].

٣ – أينَ رَكز النبـيُّ(ﷺ)[3].

پاشان ئۆزۆن وتەی خۆی دەڵێت دەربارى هەرسێ فەرموودەكەو دەڵێت:

"ئەوەی لەم سێ فەموودەیەوە دەردەكەوێ پێغەمبەر(د.خ) هەركەس دژی وەستابێتەوە، یەكسەر فەرمانی لەناوبردنی بۆ دەركردوەو لەناو براوە، كە بەڕاستی ئەمە لەگەڵ ئەو هەموو سۆزو میهرەبانیەی پێغەمبەر(د.خ) یەك ناگرێتەوە، چونكە خودای گەورە وەك ڕەحمەتێك ڕەوانەی كردووە بۆ هەموو مرۆڤایەتی ... هەربۆیە لەسەر هەموو كەسێكی مسوڵمانی تێگەیشتوو پێگەیشتوو ئەوە پێویستە كە ئەم جۆرە فەرموودانە ڕەت بكاتەوەو بە هیچ جۆرێك لە ژێر هیچ ناو و كتێبێكدا نەیداتە پاڵ پێغەمبەر(د.خ)، چونكە بەڕاستی ئەم جۆرە فەموودانە ئەبنە مایەی نەنگی بۆ عەرەبایێتی و ئیسلامیش... بەڕاستی ئەوەی ئەم جۆرە كارانەی كردوەو داویەتیە پاڵ پێغەمبەر(د.خ)، خۆی پڕ لەدەمارگیری خێڵەكی بووە ... خۆ ئەگەر پێشەوا بوخاری زۆر نزیك بوبێت لەو سەدەو چاخەی ئەم خێڵایەتی و

---

[1] (١٧/٣).
[2] (٦٧/٤).
[3] (١٤٦/٥).

دەمارگیریە تیادا بلآو بووە، باسكردنی ئەم شتانەی بەلاوە سادەبوبێت، دەبێت ئێمە لەم ڕۆژگارەدا ئەمانە وەك ڕەفتار و سوننەتی پێغەمبەر ڕەت بكەینەوەو بەكۆمەلێك ڕووداوی مێژوویی لەقەلەم بدەین و بە هیچ جۆرێك پەیوەندی نەدەین بە ئاینەوە". ع: ٦٢ ـ ٦٣، ك: ٩٩ ـ ١٠١

دەلێم: نازانم ئۆزۆن ئەیەوێ بەم وتە بێ مانایانەی چیمان پێ بلێ؟ یەكێك نەزانێت بەلگەكانی زۆر بەهێزو حاشاهەلنەگربوون واهێندە قسەی گەورە ئەكات كە چەندین جار لەقەبارەی خۆیی و ئاستی زانستیی و بەلگەكانی گەورەترن!

نازانم باسی چی كوشتنێك ئەكات لەسەر فیكر و ڕاجیایی یەكێك نەزانێ باسی مۆساد و دەزگا داپلۆسێنەرەكانی تاغوتان و بێ ئاینان دەكات؟

ئۆزۆن چی ناوئەنێ هۆكاری سیاسی و مێژوویی و ئەیەوێ ئەم شتانە لە ئاین دەركات و بلێ پەیوەندیەكی دوور و نزیكی پێوەی نیە! لەكاتێكدا ئێمە هەموو ئەمانەمان دی كە بەچەندین هۆكاری جیاجیا ئەنجامدرابوون نەك جیاوازی ڕاو كوشتن لەسەر فیكر.

پاشان ئۆزۆن ئەیەوێ بە سۆز و عاتیفەی پێغەمبەر(ﷺ) سیاسەت و حیكمەت و دانیاییەكەی بخاتە ژێر پرسیارەوە، چونكە سۆزو میهر و نەرمونیانی شوێنی خۆیی هەیەو ئەبێ لەشوێنی خۆیدا بەكاربهێنرێت و نابێت هەرگیز لەسنووری خۆی بترازێت ئەگینا زیان بە بڕیاری عەقلێ و ژیریی ئەگەیەنێت.

هەروەها ئۆزۆن زۆر ئاسان و سانا ئەیەوێ ئیمامی بوخاری بەوە تاوانبار بكات كە كەسێكی دەمارگیربوەو لەبەرخاتری دەمارگیریەكەی ئەم فەرموودانەی گێڕاوەتەوەو تۆماركردوەو، ئەم كوشتنانەش كە ئەنجامدراون هەمووی هەر دەمارگیریی لەپشتەوەبووە لەكاتێكدا هەموویمان باسكرد و نەزانی ئۆزۆنیشمان ئاشكراكرد.

ئۆزۆن لـەم باسەدا ئەیەوێ پێمان بڵێت: پێشەوا بوخاری وەسفێكی ناشرینی پێغەمبەری(ﷺ) كردووەو ناشرین وێنای كردووە، تەنها لـەبەر ئەوەی فەرموودەكان لـەگەڵ بنەماو ڕێساكانی ڕۆژئاوا یەك نایەنەوەو گەورەكانی ئۆزۆن تووڕە دەبن!!

ئۆزۆن دەڵێت: "پێغەمبەری خوا وەك هیدایەتدەر و ڕەحمەتێك خودای گەورە ڕەوانەی كردووە بۆ مرۆڤایەتی، بەڵام ئەوەی كە لـە(صحیح البخاری)دایە پێغەمبەر جگە لـەشەڕخوازێك كە خەمی تالآنی و بەزاندنی خەڵكانی تری هەیە خەمێكی تری نەبووە" ع: ٦٤، ك: ١٠٣

دەڵێم: ئەگەر بێت و كەسێك سەیری سەحیحەكەی پێشەوا بوخاری بكات(رحمه الله) ئەوكات بەتەواوی دەزانێ كە ئەم بانگەشەیەی ئۆزۆن لـە وتەیەكی بێ بنەماو بوهتانێك زیاتر نیە، چونكە ئەو فەرموودانەی كە باس لـە ڕەحم و بەزەیی و چاكەكردن لـەگەڵ خەڵكی و چەسپاندنی دادگەریی و پێدانی مافەكان و ... دەكەن چەند هێندەی ئەو فەرموودانەن كە باس لـە جیهادكردن دەكەن لـە پێناو خوای گەورە!!

هەرچەندە وشەی جیهاد شەرم نیەو مسوڵمان ئەوپەڕی شانازی پێوە دەكات و هەرگیز خۆشی لـێ بەدوورناخاتەوەو لـەوەش ناترسێت كە دوژمنان پەنجە ڕاكێشن و بڵێن ئاینەكەی ئێوە جیهادی تێدایە، بەڵكو ئەوپەڕی شانازیە ئەگەر هات و وەكو خۆی لـێی تێگەیشتین و بەرجەستەمان كرد و هەمیشە مسوڵمانان شانازییان پێوەی كردووە، ئیتر نازانم بۆچی ئۆزۆنیش هەروەكو چۆن قادیانیەكان لـەبەر خاتری ئینگلیز جیهادیان پەكخست و نەیانهێشت ئەمیش هاتووە ئەیەوێ جیهاد نەهێڵێ؟!

ڕەحمەتی خوا لە ئەحمەد شەوقی کە دەفەرموێت[1]:

قَالُوا غَزَوتَ وَرُسْلُ اللهِ ما بُعِثوا لِقَتلِ نَفسٍ وَلا جاؤوا لِسَفكِ دَمِ
جَهلٌ وَتَضليلُ أَحلامٍ وَسَفسَطَةٌ فَتَحتَ بِالسَيفِ بَعدَ الفَتحِ بِالقَلَمِ

ئەگەر ئۆزۆن کێشەی لەگەڵ پێشەوا بوخاری هەیە خۆ ئایەتەکانی قورئان شاهێدن لەسەر ئەو حەقیقەتەو تیایدا ئەدرەوشێتەوە، ئیتر بۆچی ئۆزۆن بەوپەڕی نەزانی خۆی دێتو هەڵەشاخیێ بە فەرموودەکانداو ڕەتیان دەکاتەوە لەکاتێکدا لەقورئانیشدا جێگیرن بە سەدان ئایەت هەروەکو خوای گەورە(ﷻ) دەفەرموێت: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٩٣ ﴾البقرة

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ٣٩ ﴾الأنفال

هەروەها: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَاۚ ...٤ ﴾محمد

من نازانم ئۆزۆن سورەتی ئەنفال و تەوبەی نەخوێندوەتەوە؟ ئەی چی دەربارەی محمد و فەتح؟!

بەڵێ غەزاو جیهادکردن هەیە بۆ لادانی دوژمنکاری و گەیاندنی ئاین لەکاتی دروستبوونی هەر بەربەستێکدا، مەبەستی سەرەکیش لە جیهاد بریتییە لە چەسپاندنی دادگەری و گەڕاندنەوەی بەهای مرۆڤبوون دوای بەرز ڕاگرتنی ناوی پیرۆزی خوای گەورە، نەك ستەم و نەدانی مافەکان و پێشێلکردنیان بەو شێوەی کە ڕۆژئاواو ئەوانەشی بەدەهۆڵیان سەمادەکەن وێنای دەکەن!!

---

[1] نهج البردة للشوقي مطبوع ملحقا بشرح البردة للباجوري، ص: (٢٣٠)، بيت: (١١٨-١١٩)، ت: يوسف علي بديوي، دار منابع النور ـ سورية ـ، ط:الأولى ١٤٢٥هـ.

هەروەها سەبارەت بە دەستكەوتی جەنگیش قورئان باسی دەفەرموێت ئیتر ئۆزۆن ئەم هەرایەی لە چیە؟ ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ١ ﴾الأنفال

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ ۞ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ٤١ ﴾الأنفال

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَـٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٦٩ ﴾الأنفال

ئەوەتانێ خوای گەورە باسی دەستكەوتەكانی شەڕ و دابەشكردنەكەشی دەكات، وابزانم ئۆزۆن هەر بڕوای بەم ئایەتانەش نەبێت و ڕای وابێت ئەبێ ئەوەی دەستیان كەوت فڕێی بدەن و هەڵێنەگرن و بەلایا نەچن و دەستی بۆ نەبەن، هەروەكو چۆن گەورەكانی ئۆزۆن وەكو ئەمریكا چۆن وازی لە خێرو بێری عێراق هێناو دەستی بەسەردا نەگرت و هیچی نەبردو لەگەڵ بەریتانیا هیچیان دابەش نەكرد، هەروەكو چۆن فەڕەنسا تاوەكو ئێستاش خوێنی ئەفریقا نامژێت و زێڕ و گەوهەرو كانزاكانیان نادزێت و خێرو بێری وڵاتەكە نابات، ئاوەهاش نابێت پێغەمبەر(ﷺ) دەستی ببردایە بۆئەو شتانەی دەستیان كەوتووە!!

پاشان ئۆزۆن چەند فەرموودەیەك دێنێت و ڕەخنەیان لێ دەگرێت و ئەوانیش:

فەرموودەی یەكەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، فَبَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الأَرْضِ، فَوُضِعَتْ فِي يَدِي».[1]

واتە: وتەی كورت و پوختم پێ بەخشراوە[2]، سەرخراوم بەترس[3]، كاتێك من خەوتبووم كلیلی خەزێنەكانی سەرزەویم بۆ هات، پاشان لەنێو دەستم دانرا.

پاشان ئۆزۆن ڕەخنە لەمانە هەمووی دەگرێت و پاشان دەڵێت: "ئەمە وامان لێ دەكات بەم فەرموودانە بلێین فەرموودەی ئەمەوی[4] نەك فەرموودەی نەبەوی وەك هەندێك دەڵێت" ع: ٦٤، ك: ١٠٣

ئەوەی ئۆزۆن ڕەخنەی لێ دەگرێت سەبارەت بە ترس كەوتنە دڵی دوژمنەكانیەوە دەڵێم: زۆر بێ ئاگایە لەوەی كە ئەم حەقیقەتە لە قورئاندا باسكراوەو تۆماركراوە، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ١٢ ﴾الأنفال

ئەوەتا لەم ئایەتەدا خوای گەورە زۆر بە سەریحی باسی ئەو حەقیقەتە دەكات كە پێغەمبەر و ئیمانداران ترس و بیمێكن لە دڵی بێباوەڕاندا، نەك لەبەر ئەوەی كە ئەمان دڕندەو

---

[1] رواه البخاري(٤/٥٤)، برقم: (٢٩٧٧).

[2] وتەی كورت كە مانای زۆری لە خۆ گرتووە.

[3] واتە ترس خراوەتە دڵی دوژمنان و لەكاتی ڕووبەڕووبونەوەدا توانای شەڕیان نامێنێت.

[4] وشەی "ئەمەوی" هەڵەیەكە و جیل لەدوای جیلی نەخوێنەواران دووبارەی دەكەنەوە و ڕاستەكەی (ئومەوی)ە، هەروەكو چۆن چەمكی خیلافەشیان كردووە بە "خەلافە"!! (ئەم وتانە دەكەم مانای وا نیە لە هەموو كارێكی سەردەمیان ڕازی بین، بەڵام كامەیان زۆر خراپە من لە دەسەڵاتدارە دین و نیشتیمانفرۆشەكانی ئەمڕۆ پێم باشترن)!

خوێنرێژن بەڵكو لەبەر عیززەت و شەهامەتیان و مەیدانەكەش مەیدانی شەڕەو نەرم و نۆڵی لەوێدا بێ عەقڵیە هەركەسێك بانگەشەی بۆ بكات.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَأَنتُمۡ أَشَدُّ رَهۡبَةٗ فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ۝١٣ لَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرٗى مُّحَصَّنَةٍ أَوۡ مِن وَرَآءِ جُدُرِۭۚ بَأۡسُهُم بَيۡنَهُمۡ شَدِيدٞۚ تَحۡسَبُهُمۡ جَمِيعٗا وَقُلُوبُهُمۡ شَتَّىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ۝١٤﴾الحشر

ئیتر من نازانم ئۆزۆن ئەم وتە بێ مانایانەی لە چیەو چی بەهایەكیان بۆ ئەمێنێتەوە؟!

هەرچی بابەتی خەزێنەی زەوییە چی كێشەیەكی تێدایە؟ مەگەر حەقیقەت نیەو هەموو خەزێنەكانی فارس و ڕۆم و هەموو جیهان نەكەوتە دەستی ئیماندارانەوە؟!

هەروەها ڕق و كینەی هەموو ڕۆژهەلاّتناسان و ئۆزۆن ئاساكان بەرامبەر ئومەویەكان لەڕادەبەدەرە، چونكە خاوەن پێگەو هێز و شارستانیەكی گەورەبوون و هەموو دەسەلاّتدارانی بەنی ئومەیە لە یەزیدەوە وێنا دەكەن خوای گەورە لە باوكی ڕازیبێت.

جا خۆزگە ئۆزۆن پێی بوتینایە كێ بەم فەرموودانە دەڵێت فەرموودەی ئومەی بۆ ئەوەی چاك بزانین كە ئۆزۆن كاریگەرە بەكێ!!

## فەرموودەی دووەم:

«أَيُّهَا النَّاسُ، لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ العَدُوِّ، وَسَلُوا اللَّهَ العَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ» ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الكِتَابِ، وَمُجْرِيَ السَّحَابِ، وَهَازِمَ الأَحْزَابِ، اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ».[(١)]

ئەوەی كە ئۆزۆن هێناویەتی لە ڕەخنە لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە، ئەمانەیە[(٢)]:

---

(١) رواه البخاري (٤/٦٣)، برقم: (٣٠٢٤).

(٢) ع:٦٤ ـ ك:١٠٤

١ – لە پێغەمبەری ڕەحمەت(ﷺ)ناوەشێتەوە ئەم وتەیە بەڵكو لە وتەی هۆڵاكۆ دەچێت.

دەڵێم: ئۆزۆن ئەیەوێ بەناوی ڕەحمەتەوە بیروباوەڕی قادیانیەكان بچێنێ لەناو مسولڵمانانادا و جیلێكی زەلیل و بێ غیرەتیان لێ دروست بكات و ئازایەتی و جوامێری و مەردایەتی و ڕۆحی فیداكاری و هەوڵ و تێكۆشان بۆ ئاین بە هەموو شێوەیەك لە ناخیان دەربێنێ، ئەوەی كە ڕۆژئاوا بانگەشەی بۆ دەكەن لە نەرشتنی خوێن و دووركەوتنەوە لە چەك و مافی مرۆڤ و هەزارەها درووشمی بریقەدار، ئۆزۆن باوەڕی كردوەو هەڵخەڵەتاوە پێیان و نابینێت كە ئەوان منداڵەكانیشیان لەسەر جۆرەهای چەك ڕاهێنان پێ دەكەن و فێریان دەكەن!!

بەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێغەمبەری ڕەحمەتە بۆ هەموو ئەوانەی ڕەحمەتیان ئەوێ، بەڵام ئەی ئەگەر كەسانێك بە نیقمەتەوە هاتن و بوونە ڕیگر لەبەرامبەر ئەو ڕەحمەتە؟!

دكتۆر كاتێك چارەسەری پێ دەكرێ كە ڤایرۆس و میكرۆبەكان لەناوبەرێت یاخود لاوازیان بكات، ئەمەش حەقیقەتیكی تاقیكراوەیەو هەموو كەسیكی ژیر دانی پیادا دەنێ.

٢ – ئەگەر جیهاد عیبادەتە بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) لێرەدا دەفەرموێت: ( لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ العَدُوِّ) واتە: ئاوات بە ڕوبەڕوبوونەوە مەخوازن لەگەڵ دوژمنانادا؟!

ڕاستە جیهاد عیبادەتەو كەسیش ناتوانێت ئینكاری ئەوە بكات، بەڵام ئەوەی كە لێرەدا هاتووە لەبەر دەرەنجامی شەڕەكانەو زیاتر دەری دەخات كە ئیسلام حەزی بە خوێن ڕشتن نیەو مەگەر یەخەی بگرێت یان ڕێگەی لێ بگیرێت و ئەویش لەناچاریدا دەستی بۆ بەرێت، ئەبوو ئۆزۆن لەم دێڕەشەوە خەجاڵەتی بیگرێت و چی نووسیوە بیسڕێتەوەو تێ بگات لەوەی كە فەرموودەكان باس لە چی دەكەن، بەڵام وا دیارە ئۆزۆن تەنها ویستویەتی ڕەخنە بگرێت و ئەوەی لایەتی بیسەپێنێت نەوەك لێكۆڵینەوەی زانستی بكات و بیەوێ حەق و ڕاستی دەركەویت.

## مەبەست لە لەشكركێشی!

ئۆزۆن ئەم جارەیان ئەیەوێ پێمان بڵێ ئەوەی لە فەرموودەكاندا هاتووە لەبارەی غەزاو جیهادەوە ئەوە دەردەخەن كە هەموویان لەپێناو دەستكەوت و تاڵانیەكانی جەنگ بووەو هیچ هۆكارێكی تری نەبووە، بۆ ئەم مەبەستەش چەند بەڵگەیەك دێنێتەوەو ئەوانیش:

### بەڵگەی یەكەم:

فەرموودەیەك لە سەحیحی بوخاری دێنێتەوە كە یەكێك لە پێغەمبەران غەزای كردووە پاشان دەستكەوتەكانی هەمووی كۆكردەوەو بە ئاگر سووتاندی، واتە دەستكەوتەكان بۆ ئەوان حەڵاڵ نەبووە بەڵام بۆ ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) حەڵاڵكرا لەبەر لاوازییان هەروەكو دەفەرمویێت: (ثُمَّ أَحَلَّ اللَّهُ لَنَا الغَنَائِمَ رَأَى ضَعْفَنَا، وَعَجْزَنَا فَأَحَلَّهَا لَنَا)[1].

ئۆزۆن دەڵێت: "لێرەدا ئەم تێبینیە شایانی سەرباركردنە كە ئوممەتێكی لاواز و بێ بەرهەم حەقی ئەوەی هەیەو حەڵاڵە بۆی كە بەتاڵانی و هەڵكوتانە سەر ئەوانی دی خۆی بژێنێتەوە"[2]!! ع: ٦٧ ـ ك: ١٠٨

من نامەوێ باسی ئەوە بكەم كە تەنها ئەو دێڕەی پێویستە لە فەرموودەكە ئیتر بۆچی ئەوەندە درێژی ئەكاتەوە بەشێوەیەك لە وەرگێڕانەكەدا(٤) لاپەڕەی گرتووە، بەڵام ئەمەوێ باسی خیانەتی ئۆزۆن و ئەو تێگەیشتنە سەقەتەی بكەم بۆ دەقەكە چونكە هیچ كەسێكی ژیرو عاقڵ بەوشێوەی ئۆزۆن تێناگات لەدەقەكە، ئەوەی كە هەیە لێرەدا باسی ئەوەیە ئوممەتی ئیسلامی لەكاتی شەڕەكاندا زەرەرو زیانیان بەركەوتوەو ئاینەكەشیان ئاینێكی گشتگیربوە بۆ هەموو ئوممەتان و جیهادی تەلەب لەسەر هیچ پێغەمبەر و ئوممەتێكی تر فەرز نەبووە، چونكە ئاینەكەشیان تەنها بۆ گەل و هۆزی خۆیان بووە، جا كاتێك

---

[1] رواه البخاري (٤/٨٦)، برقم: (٣١٢٤).

[2] نووسەر دەڵێت: (وهنا نضيف حكما) واتە: (لێرەدا حوكمێك زیاد دەكەین)، بەڵام وەرگێڕ نووسیویەتی: (لێرەدا ئەم تێبینیە شایانی سەرباركردنە)!!

مسولّمانەكان ئەو هەموو زیانە دێتە ڕێگەیان و لـەگەلّ چەندین ئیمپراتۆری گەورەدا بەشەڕ دێن ئەگەر بێت و دەستكەوتەكانیش بسوتێنن و بەكاری نەهێنن ئەوا هەم لـە ڕووی ئابووریەوەو هەم لـە ڕووی چەكی پێویستەوە تەواو لاواز دەبن و بەرامبەریشیان چەند هێندە بەهێز دەبن، چونكە بێباوەڕان دەستیان بەسەر ئەوشتانەدا دەگرت و بەكاریان دەهێنا كە ئەیانگرت لـە مسولّمانەكان.

ئەگەر بێت و وازیان لـە دەستكەوتەكانی جەنگ بهێنایەو نەیانبردایە ئەوا زیانێكی زۆریان دەكرد و لـە ڕووی هێزی سەربازیەوە زۆر لاواز دەبوون.

جا ئەمە وەكو ڕاڤەی فەرموودەكە، بەلآم خیانەتی ئۆززۆن زۆر لـەوە گەورەترە كە چاوەڕوانی دەكەی، چونكە فەرموودەكە باس لـە شەرعیەتی وەرگرتنی غەنیمەت دەكات نەك هۆكاری شەرعیەتی غەزاو جیهادكردن!!

غەزاكانی پێغەمبەر(ﷺ) لـەبەر خاتری بەرزڕاگرتنی ناوی پیرۆزی خوای گەورەو چەسپاندنی دادگەریدایە، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٩٣ ﴾البقرة

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ العُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[1].

واتە: هەركەسێك جەنگا لـەبەرئەوەی كەلیمەی خوای گەورە(ئاینەكەی) بەرزو بالآبێت ئەوە لـە پێناوی خوایە.

جا ئەم فەرموودەیە لـە سەحیحی ئیمامی بوخاریدا(٤) جار هاتووە، ئیتر نازانم ئۆززۆن بۆچی باسی نەكردووە؟ ئەگەر نەیبینیوە ئەوا كتێبەكەی نەخوێندوەتەوەو ڕەتی ئەكاتەوە، ئەگەر خوێندوشیەتیەوەو ئەیشارێتەوە ئەوا خیانەتە، هیچ كام لـەم دوو حالّەتە بەدەر نییە لـەوەی كە ئۆززۆن لـۆمە بكرێت.

**بەلّگەی دووەم:**

[1] رواه البخاري (٤/٢٠)، برقم: (٢٨١٠)

ئۆزۆن دەڵێت: " لەم فەرموودەی دواتر زۆر بە ئاشكرا دەردەكەوێت كە زۆربەی هاوەڵان سەرچاوەی سەرەكی بژێویی ژیانیان بریتی بووە لە تالانی و دەستكەوتی جەنگ" ع: ٦٩ ـ ك: ١١١

تاكە بەڵگەشی كە وەچنگی كەوتووە ئەم فەرموودەیە: عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ حُنَيْنٍ، فَلَمَّا التَقَيْنَا كَانَتْ لِلْمُسْلِمِينَ جَوْلَةٌ، فَرَأَيْتُ رَجُلًا مِنَ المُشْرِكِينَ قَدْ عَلاَ رَجُلًا مِنَ المُسْلِمِينَ، فَضَرَبْتُهُ مِنْ وَرَائِهِ عَلَى حَبْلِ عَاتِقِهِ بِالسَّيْفِ فَقَطَعْتُ الدِّرْعَ، وَأَقْبَلَ عَلَيَّ فَضَمَّنِي ضَمَّةً وَجَدْتُ مِنْهَا رِيحَ المَوْتِ، ثُمَّ أَدْرَكَهُ المَوْتُ فَأَرْسَلَنِي، فَلَحِقْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ فَقُلْتُ: مَا بَالُ النَّاسِ؟ قَالَ: أَمْرُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ رَجَعُوا، وَجَلَسَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: «مَنْ قَتَلَ قَتِيلًا لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ» فَقُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِي، ثُمَّ جَلَسْتُ، قَالَ: ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ، فَقُمْتُ، فَقُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِي، ثُمَّ جَلَسْتُ، قَالَ: ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ، فَقُمْتُ، فَقَالَ: «مَا لَكَ يَا أَبَا قَتَادَةَ؟». فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ رَجُلٌ: صَدَقَ، وَسَلَبُهُ عِنْدِي، فَأَرْضِهِ مِنِّي، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: لاَهَا اللَّهِ إِذًا، لاَ يَعْمِدُ إِلَى أَسَدٍ مِنْ أُسْدِ اللَّهِ، يُقَاتِلُ عَنِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيُعْطِيكَ سَلَبَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «صَدَقَ، فَأَعْطِهِ». فَأَعْطَانِيهِ، فَابْتَعْتُ بِهِ مَخْرَفًا فِي بَنِي سَلِمَةَ، فَإِنَّهُ لأَوَّلُ مَالٍ تَأَثَّلْتُهُ فِي الإِسْلاَمِ"[١].

هەم دیسانەوە ئۆزۆن ئەو فەرموودەی هێناوە لە كاتێكدا ئەو تەنها ئیشی بەو بەشەیە كە "ئەبو قەتادە" دەڵێت: (فَإِنَّهُ لأَوَّلُ مَالٍ تَأَثَّلْتُهُ فِي الإِسْلاَمِ). واتە: ئەو دەستكەوتە یەكەم ماڵی من بوو لە پاش ئیسلام.

ئۆزۆن وا ئەزانێ هاوەڵان وەكو خۆی هەموو هەر خەریكی كۆكردنەوەی سەروەت و سامان بوون و ئەو بیری كردووە كە هاوەڵی خۆشەویست ئەبوبەكر چەندین جار هەموو سەروەت و سامانەكەی بەخشی لە پێناو خوای گەورە، ئەو بیری كرد پشتیوانان هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ)و فەرموویان هەموو سەروەت و سامانمان بكەرە دوو بەشەوە لە نێوان

[١] رواه البخاري (١٥٤/٥)، برقم: (٤٣٢١).

ئێمەو كۆچبەران، بەڵێ زۆربەی هاوەڵان بیریان لای ئەوە نەبووە كە پارەو ماڵ كۆ بكەنەوەو داینێن بەڵكو هەموو خەمی ئەوان بڵاوكردنەوەو گەیاندنی ئاین بووە، موسعەبی كوڕی عومەیر لەكاتێكدا دەوڵەمەندترین و خۆشگوزەرانترین هاوەڵ بوو كاتێك كۆچ ئەكات و شەهید ئەبێت تەنانەت كفنێكیشی لێ جێ نەماوە كە هەموو جەستەی داپۆشێت، نازانم ئۆزۆن باسی چی ئەكات و ئەیەوێ چی بلێ و بە چی شێوەیەك هاوەڵان ناشرین بكات كە باشترینی ئەم ئومەتەن؟!

ئەوان هەرشتێكیشیان دەستكەوتبێت تەنها بەشی پێویستی خۆیانیان لێ هێشتوەتەوەو ئەوی تریان بەخشیوە لە پێناو خوای گەورەدا، بەڵام ئۆزۆن ئەیەوێ هاوەڵان وا نیشان بدات كە وەكو كۆمەڵێك ڕێگر و چەتە ژیاون و ناڵێت "ئەبو قەتادە"و بێجگە لەویش ئەوەی هەیانبوو ئەیانكردە قوربانی ئاین و ئەیانبەخشی لە پێناو خوای گەورەدا و هیچیان نەدەهێشتەوە، تەنانەت ئەبو بەكر یەك درهەمیشی نەدەهێشتەوە چەندین جار، جا ئەگەر شتێك لە دەستكەوت ببێتە یەكەم سامانیان نابێتە لۆمە لەسەریان و بەڵكو ئەوپەڕی مایەی ڕێزو شكۆن چونكە هەرگیز بیریان لای ئەوە نەبووە پارەو پول بخنەلاوە بۆخۆیان.

بەڵێ ئەبو قەتادە هەموو سەروەت و سامانی خۆی دەكاتە قوربانی ئیسلام و دەیبەخشێت، جا ئەگەر لە یەكێك لە غەزاكاندا شتێكی وەرگرتبێت و ئەوە بوبێتە یەكەم ماڵی ئەو لەدوای ئەو بەخشینەی ئیتر چی سەرزەنشتێك هەیە بۆ ئەو هاوەڵە بەڕێزە؟!

**بەڵگەی سێیەم:**

ئۆزۆن ئەم فەرموودەیە دێنێت: «إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ سَرِيَّةً فِيهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ قِبَلَ نَجْدٍ، فَغَنِمُوا إِبِلا كَثِيرَةً، فَكَانَتْ سِهَامُهُمْ اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيرًا، أَوْ أَحَدَ عَشَرَ بَعِيرًا وَنُفِّلُوا بَعِيرًا بَعِيرًا»[1].

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) سریەیەکی نارد ڕووەو نەجد کە عبداللە ی کوڕی عومەریشیان تێدابوو، وشترێکی زۆریان بە غەنیمەت گرت و پشکیشیان بریتی بوو لە(١٢) وشتر، یان(١١) وشتر و ئەوانەشی مافی(نَفَل)یان هەبوو وشتر وشتر بەریان کەوت[2].

جا من نازانم ئەمە چی خەلەلێکی تیدایە؟ ئەبێت ئەو دەستکەوتانە چی لێبکەن وابزانم ئەبێ بیانگێڕایەتەوە بۆ بێباوەڕان بۆ ئەوەی جارێکی تر هێرشی پێبکەنەوە سەر مسوڵمانان و ببنە بەربەست لە بەردەمیاندا، ئەوکات ئۆزۆن لێیان ڕازی دەبوو بەڵام خوای گەورە لێیان تورە دەبوو.

وەکو بینیتان ئۆزۆن هەموو هەوڵێکی خۆیدا بۆ ناشرین کردنی مێژووی ئیسلامی و فەرموودەناسان و گێڕەرەوەی فەرموودەکان و دایکی ئیمانداران عائشە کە تەمەنێکی زۆری لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەسەر بردوو لە کۆشی ئەویشدا وەفاتی کرد، ناشرین کردنی ئەو ناشرینکردنی پێغەمبەرە(ﷺ)، وا ئێستاش ئەیەوێ هەموو هاوەڵان بە تێکڕا ناشرین بکات و هیچیان دەربازیان نەبێت لە نووسینە بەکرێگیراو و چەپەڵەکەی.

---

[1] رواه البخاري (٤/٩٠)، برقم: (٣١٣٤).

[2] وەرگێڕ ڕەنگە هەر نەزانێ جیاوازی چیە لەنێوان ئەو دوانەیا چونکە نەفەل بە زیادە تێگەیشتووەو وەها وەریگێڕاوە کە وشتری زیادە ماوەتەوەو دراوە بە هەندێکیان و نەفل زیادەیە، بەڵام جیاوازی نێوانیان ئەوەیە نەفەل: ئەو شتانەیە کە سەربازێك بەکاری دێنێت لە چەك و پێداویستی و دەگیرێت لەلایەن ئەو کەسەوە کە دەیکوژێت. غەنیمەت: ئەوەی لە شارێك ئەگیرێت یاخود پاشماوەی سوپاکەیە بە گشتی و خاوەنێکی تایبەتی نیە.

## قوربانیانی لەشكركێشی ژن و منداڵ بوون!!

جارێكی تر ئۆزۆن بە بەزمێكی تر و هەڵخەڵەتاندن و شێواندنی حەقیقەتێكی ترەوە دێت و ئەیەوێ ئاینەكەمان بشێوێنێت و دەڵێت: بەهۆی غەزاكانەوە ژن و منداڵ كوژراون خراپەكارییان كردووە لەسەر زەویدا و چەند بەڵگەیەك دێنێتەوە و ئەوانیش:

### بەڵگەی یەكەم:

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، قَالَ: مَرَّ بِي النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالأَبْوَاءِ، أَوْ بِوَدَّانَ، وَسُئِلَ عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنَ المُشْرِكِينَ، فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ قَالَ: «هُمْ مِنْهُمْ»[1].

ئۆزۆن دەڵێت: "ئەم فەرموودەیە زۆر بە ڕوونی ڕەوایەتی داوەتە كوشتنی ژن و منداڵ لە كاتی جەنگدا" ع: ٦٩، ك: ١١٣

دەڵێم: ئەمەش یەكێكی ترە لە چەواشەكارییە ئۆزۆنیەكان كە هەر چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەكرێت چونكە ئەگەر كەسێك خیانەتێكی كرد چاوەڕوانی ئەوە دەكرێت دووەمیش بێت بەشوێنیدا، جا ئەگەر دووەمیش هات تاوەكو دەیەم و ... ئەڕوات!

خوێنەری خۆشەویست ئەوەی لەم فەرموودەیەدا هاتووە، ئۆزۆن ڕێك بۆ مەرامی خۆیی هێناوە لەكاتێكدا هەموو ئوممەت لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە ژن و منداڵی بێباوەڕان ناكوژرێن مەگەر ئەوانیش شەڕ بكەن یاخود كرابن بە قەڵغان بۆ دەگەدان لە مسوڵمانان، هەروەكو پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَخْبَرَهُ: أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقْتُولَةً، «فَأَنْكَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَتْلَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ»[2].

---

[1] رواه البخاري (٤/٦١)، برقم: (٣٠١٢).

[2] رواه البخاري (٤/٦١) برقم: (٣٠١٤)، مسلم (٣/١٣٦٤)، برقم: (١٧٤٤)، أحمد في المسند (١٠/١٧٣)، برقم: (٥٩٥٩).

واتە: ئافرەتێك بە كوژراوی بینرا لە یەكێك لە غەزاكانی پێغەمبەردا(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) نەهی كرد لە كوشتنی ئافرەت و منداڵ.

هەروەكو پێشەوا نەوەوی(رحمه الله) دەفەرموێت لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە: "أَجْمَعَ الْعُلَمَاءُ عَلَى الْعَمَلِ بِهَذَا الْحَدِيثِ وَتَحْرِيمِ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ إِذَا لَمْ يُقَاتِلُوا فَإِنْ قَاتَلُوا قَالَ جَمَاهِيرُ الْعُلَمَاءِ يُقْتَلُونَ"[١].

واتە: هەموو زانایان یەكدەنگن لەبارەی كاركردن بەم فەرموودەیەو حەرامێتی كوشتنی ئافرەت و منداڵ كاتێك ئەوان شەڕ ناكەن، ئەگەر هات و شەڕیان كرد ئەوا زۆربەی زانایان ئەفەرموون ئەكوژرێن.

جا سەیری بكەو بزانە كە هیچ زانایەك نەیفەرمووە ژن و منداڵ ئەكوژرێن تەنانەت هەندێك لەزانایان ڕایان وایە ژن و منداڵ لە هیچ بارێكدا ناكوژرێن و ئەگەر چی بیشكرێنە قەڵغان و بەهۆیەوە مسوڵمانان زیانیشیان بەركەوێت[٢]!!

ئەم فەرموودەیەو چەندین فەرموودەی تریش هەیەو ئەمەیان هەر لە سەحیحی بوخاریش هاتووە كە ئۆزۆن لێی بێ خەبەرە یان بە نیازی چەواشەبووە وا شاردویەتیەوەو باسی نەكردووە.

بەلاَم ئەگەر ئۆزۆن كەمێك وردبوایە جوان لە فەرموودەكە تێدەگەیشت، چونكە ڕاڤەكارانی فەرموودەكە زۆر بە وردی لەو بابەتە دواون، چونكە خوێنی خەڵكیان لەلا گرنگ بوەو دوای پاراستنی ئاینی خەڵك خوێنیان گەورەترین شتێك بووە كە پێویستە بپارێزرێت.

---

[١] شرح مسلم (١٢/٤٨).

[٢] هەندێك جار بێباوەڕان ئەمەیان كردوەو مسوڵمانان تووشی زەرەرێكی زۆر هاتوون، كافران زانیویانە مسوڵمان دەست دەپارێزێت لە ژن و منداڵ هاتوون ژن و منداڵەكانیان كردوەتە قەڵغانی خۆیان و لەپێشی خۆیانەوە دایاناون، دەگێڕنەوە هەمان شت لەسەردەمی زانای گەورەو خواناس و موجاهید ئیبن تەیمیە لەیەكێك لەشەڕەكانی تەتاردا ئەمەی بینی فەرمووی دەست مەپارێزن ئەگینا شكست دێنن، كە ئێوە دەستان كرد بە شەڕ ئەوان ئافرەت و منداڵەكان دوای خۆیان ئەخەن و ئێوەش ئەتوانن هێرش بەرنە سەر چەكدارەكانیان و بەمەش توانی پیلانی تەگریسیان پوچەڵ بكاتەوە.

فەرموودەی یەكەم هەروەكو دیارە باسی حاڵەتێكی تایبەت دەكات ئەویش هەروەكو لە ناونیشانەكەی پێشەوا بوخاریدا دیارە كە دەفەرموێت: (بَابُ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ، فَيُصَابُ الوِلْدَانُ وَالذَّرَارِيُّ).

ئیمامی بوخاری باسی ئەوە دەكات كە كافران لە شەودا ئەمێننەوەو منداڵ و ژن پێوە دەبێت.

جا ئەبینین لەم ناونیشانەدا ئەمە حاڵەتێكی تایبەتەو لەكاتێكدایە ڕووبەڕووبونەوە لەشەودایەو ڕەنگە هەندێك جار بەهۆی نەزانیەوەو لەتاریكە شەودا بەبێ هیچ مەبەستێك منداڵێك یاخود ژنێك پێوە بێت، پێغەمبەری خواش(ﷺ) دەفەرموێت ئەو ژن و منداڵەش لەوانن، واتە وەكو چۆن خوێنی گەورەكانیان دیەی نییە بەهەمان شێوە لەسەر كوشتنی منداڵ و ژنیش دیە واجب نیە.

بەمە ڕوون دەبێتەوە كە كوشتنی ژن و منداڵ ئیجماعی لەسەرە كە حەرامەو بەهیچ شێوەیەك دروست نیە، ئەوەشی لەو فەرموودەیە هاتووە باس لەوە دەكات كە لەشەودا شەڕ دەبێت و بەبێ ویست جاری وا هەیە ژنێك یاخود منداڵێك بەردەكەوێت، نەك بە ئەنقسەت سارو‌خیان پێوە بنرێت و گازی كوشندە بەكاربێت بۆ لەناوبردنیان و بە فڕۆكە بۆردومان بكرێن، كە ئەمڕۆ هەموو سەرانی كوفر بەرجەستەی دەكەن و ئۆزۆنیش لە ئاستیان كەڕ و كاسە!

## بەڵگەی دووەم:

عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: «حَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَقَطَعَ، وَهِيَ البُوَيْرَةُ» فَنَزَلَتْ: (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ) ﴿الحشر: ٥﴾"[١].

باس لەوە دەكات كە پێغەمبەر(ﷺ) خورماكانی(بَنِي النَّضِيرِ) سووتاند و بڕیەوە.

[١] رواه البخاري (٥/٨٨)، برقم: (٤٠٣١).

ئۆزۆن ڕەخنە دەگرێت و دەڵێت: "زۆرم پێ سەیرە ئەم ئایەتە دابڕێنرێتە سەر ئەم كردارە... ئایەتەكە باسی سووتاندنی داری تێدا نیە، بەڵكو زۆر بە ڕوونی باس لەوە دەكات كە بڕینی دارو درەخت و واز لێهێنانی بە ئیزن و زانیاری خودایە نەك فەرمانی خودا" ع: ٧٠، ك: ١١٤

دەڵێم: نازانم بگریم بۆ نەزانی ئۆزۆن یان وەرگێڕ یاخود ئەو كەسەی پێداچوونەوەی بۆ كردووە؟! گریانم بۆ ئۆزۆن لەبەر نەزانی و لاوازی بەڵگەكانی، بۆ وەرگێڕیش بۆ كەمی ئاستی زانستی و وەرگێڕانی وەها شتێك، بۆ ئەوكەسەشی پێداچوونەوەی كردووە، تەنانەت یەك لێدوانیشی نەداوە لەسەر یەكێك لەمانەو ڕەنگە زۆر جاریش باسی فەلسەفەو لۆژیك بكات و خۆی زۆر پێ گەورەبێت لە بابەتە عەقڵیەكان، بەلاّم نەیوتوە ئەمە كەی بەڵگەیە!! بە هەرحاڵ بۆیان ناگریم بەلاّم وەلاّمێكیان ئەدەمەوە بە ویستی خوای گەورە هەر سێكەیان بگرین!

جارێ پێش هەموو شتێك بڕینی دارو درەخت لە بنچینەدا قەدەغەیەو نابێت بە هیچ شێوەیەك ببڕدرێت، بەلاّم بەهۆی پێویستی و وەستانی كاروباری گشتی و زەفەربردن بە دوژمن دروستە، بەتێكڕای وتەی خاوەن ژیریەكان، جا ئەوەی پێغەمبەری خواش(ﷺ)بە فەرمانی خوای گەورەبووەو ئەو ئایەتەش زۆر بە ڕوونی باسی ئەو ڕووداوە دەكات، هەرچەنە ئۆزۆن بیەوێ چەواشەكاری بكات و بڵێ ئەم ئایەتە باسی ئەو ڕووداوە ناكات و بەڵكو باسی زانستی خوای گەورە دەكات كە زانستی بە بڕین و نەبڕینی دارەكان هەیە!! بەلاّم لە ئایەتەكەدا دوو قەرینە هەیە بۆ ئەوەی باش تێبگەین لەوەی كە مەبەست پێی ئەو چیرۆكەیەو ئەگەربێت و ئۆزۆن وردبوایەتەوە لە ئایەتەكە باش هەستی پێ دەكرد و لێی تێدەگەیشت، ئەوانیش:

١ – ئەگەربێت و كۆتایی ئایەتەكەی بهێنایە ئەوكات زۆر باش بەدیار دەكەوت كە مەبەست پێی چیە، خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝ ﴾الحشر

باشە بۆچی ناپرسیت ئەگەر تەنها باسی زانستی خوای گەورە ئەكات پێم ناڵێی بۆ كۆتایی ئایەتەكە(وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ)ە، واتە: بۆ ئەوەی لەڕێ لاچوەكان سەرشۆڕ بكات(جولەكە)؟! بۆچی نافەرموێ خوای گەورە توانای بەسەر گشت شتێك هەیە، یان زانستی بە گشت شتێك هەیە؟ یان پێم ناڵێی برین و نەبرینی دارخورما چیە تاوەكو دەلالەت لەسەر فراوانی زانستی خوای گەورە بكات؟! باشە كۆتایی ئایەتەكە كە باس لەوە دەكات لەڕێ لاچوان و فاسقان(جولەكە) سەرشۆڕ دەكات تەفسیرەكەی ئەبێت لای ئۆزۆن چیبێت؟

ئاخر ئەمە لای كەسێكی شارەزا بە زمانی عەرەبیدا باس بكەیت و بڵێی ئایەتێك هەیە دەڵێت: ئێوە هەر دارێك كە دەیبڕن و هەرچیش وازی لێ دێنن خوای گەورە زانستی پێی هەیەو بۆ ئەوەی فاسقەكان سەرشۆڕ بكات!

ئاخر ئەم دەقە لە گەڵ دەقە لاوازەكانی موسەیلەمەدا جیاوازییان چیە؟ "الْفِيلُ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْفِيلُ، لَهُ زَلُومٌ طَوِيلٌ، إنّ ذَلِكَ مِنْ خَلْقِ رَبّنَا الْجَلِيلِ"

"وَالطّاحِنَاتِ طَحْنًا، فَالْعَاجِنَاتُ عَجْنًا، فَالْخَابِزَاتُ خَبْزًا، إهَالَةً وَسَمْنًا"

"يَا ضِفْدَعُ ابنةُ ضِفْدَعٍ، نِقّي مَا تَنِقّينَ، أَعْلاكِ فِي المَاءِ وَأَسْفَلُكِ فِي الطِّينِ، لا الشّارِبَ تَمْنَعِينَ، وَلا الْمَاءَ تُكَدّرِينَ، يَا ضِفْدَعُ كَمْ تَنِقّينَ، نِصْفُكِ فِي المَاءِ وَنِصْفُكِ فِي الطِّينِ، لا الْمَاءَ تُكَدّرِينَ وَلا الشّارِبَ تَمْنَعِينَ"

٢ – پێش و پاشی ئایەتەكە باس لەو شەڕە دەكات و باسی ئەو ڕووداوانە دەكات، هەروەكو دەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُواْۖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُواْۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ ۝٢ ﴾الحشر

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ

لَنَنصُرَنَّكُمْ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنْ أُخْرِجُواْ لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمْ وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾ لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾الحشر

بەڕاستی هێندە بەسە بۆ كەسێك خاوەن شەرم بێت و كاتێك چەواشەیەكیان ئاشكراكرد ئیتر بەسی بێت و ڕووی نەیەت جارێكی تر كاری وەها بكات!

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: " لێرەدا دەبێت بپرسین ئایا پێشەوا بوخاری ئاگای لەو ئامۆژگاریە جوانەی جێنشین ئەبوبەكر نەبوە كە هەموو جار ئامۆژگاری سەركردە سەربازیە كانی ئەكردو پێیانی دەفەرموو: دار نەبڕن و كەسی بەتەمەن و ئافرەت نەكوژن و (...) تاد، ئایا جێنشین پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر(د.خ) جوڵاوەتەوە؟ یا هەندێ هاوەڵ شتێكیان گێڕاوەتەوە كە پێچەوانەی كاری پێغەمبەر(د.خ)یەو پێشەوا بوخاریش لە سەحیحەكەیدا ئەمەی بۆ ئێمە جیگیر كردووە؟" ع: ٧٠، ل: ١١٤ ـ ١١٥

دەڵێم: باشە ئۆزۆن چۆن هێندە دڵنیایە كە پێشەوا ئەبوبەكر شتی وای وتووە؟ وابزانم ئەو بەس گومانی لە سەحیحی بوخاری هەیەو بەس ئیتر گشت سەرچاوەیەك جێی باوەڕە بێجگە لە كتێبەكانی فەرمووده!

نە ئیمامی بوخاری بێ ئاگابووە لە وەسێتی پێشەوا ئەبوبەكر(ﷺ) و ئێستا كەڵە زانای فەرموودەناس ئۆزۆن دۆزیبێتیەوەو نە هاوەڵانیش شتێكیان كردووە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵكو هەردووكیان هاتوون و جێگیرن وەكو وتمان لە بنچینەدا نابێت دارو درەخت ببڕدرێت و خانوو ماڵ تێك بدرێت، بەڵام ئەگەر ناچاری و پێویستیەكی زۆر هەبوو ئەوكات دەست ئەبرێتە بەر ئەو كارەو هەموو زانایان لەسەر ئەوە كۆكن.

بەڵام من بە ئۆزۆن دەڵێم: بۆچی چاوی كاولكاریەكانی ئەمریكاو بەریتانیا نابینێت كە كردوویانەو بەردەوامیش ئەیكەن؟ باشە كێ ئەفغانستان و عێراقی كردە گۆمی خوێن و

جەهەنەمێکی خولـّقاندو ئەو دوو وڵاتەی کردە بیابان؟ کێ تاوەکو ئێستاش ئاگری شەڕ خۆش ئەکات لە سوریاو هاوکاری بەشار ئەسەد ئەکات وچەکی بۆ دەنێرێت بۆ کوشتنی خەڵکی بەستەزمانی سووری؟ باشە بۆ ئەوەی ئەمریکاو ڕووسیاو بەریتانیا نابینێت و نیشتووە بە کۆمەڵێك ڕووداوی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) کە هەندێك دارخورمایان بڕیوەو ئەگەر ئەوە نەبوایە جولەکە خۆیان بەدەستەوە نەدەدا لە قەڵاکەیانداو هەرخەریکی ئاشوبی خۆیان دەبوون و پیلانیان دەگێڕا، سەرەڕای ئەمانە هەمووی ئۆزۆن پیاهەڵدانێکی نمونەیی خاچپەرستانی ڕۆژئاوا دەکات کە دێینە سەری، باشە کاتی ئەوە نەهاتووە بڵێین تۆ بڵێی ئۆزۆن مەبەستێکی شاراوەی نەبێت لەپشتی ئەم کتێبەوە؟!

بەڵگەی سێیەم:

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أُصِيبَ سَعْدٌ يَوْمَ الخَنْدَقِ، رَمَاهُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ، يُقَالُ لَهُ حِبَّانُ بْنُ العَرِقَةِ وَهُوَ حِبَّانُ بْنُ قَيْسٍ، مِنْ بَنِي مَعِيصِ بْنِ عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ رَمَاهُ فِي الأَكْحَلِ، فَضَرَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْمَةً فِي المَسْجِدِ لِيَعُودَهُ مِنْ قَرِيبٍ، فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الخَنْدَقِ وَضَعَ السِّلاَحَ وَاغْتَسَلَ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ وَهُوَ يَنْفُضُ رَأْسَهُ مِنَ الغُبَارِ، فَقَالَ: " قَدْ وَضَعْتَ السِّلاَحَ، وَاللَّهِ مَا وَضَعْتُهُ، اخْرُجْ إِلَيْهِمْ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَأَيْنَ فَأَشَارَ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ " فَأَتَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَزَلُوا عَلَى حُكْمِهِ، فَرَدَّ الحُكْمَ إِلَى سَعْدٍ، قَالَ: فَإِنِّي أَحْكُمُ فِيهِمْ: أَنْ تُقْتَلَ الْمُقَاتِلَةُ، وَأَنْ تُسْبَى النِّسَاءُ وَالذُّرِّيَّةُ، وَأَنْ تُقْسَمَ أَمْوَالُهُمْ"(١).

ئۆزۆن كۆمەڵێك ڕەخنەی هەیە لەم فەرموودەیەو دەكرێت بەم شێوەی خوارەوە دابەشیان بكەین(٢):

١ – پێغەمبەر(ﷺ) هەموو بەنی قورەیزەی خستە ژێر فەرمانی سەعدی كوڕی موعازەوە:

دەڵێم: یەكێك نەزانێت پێغەمبەری خوا(ﷺ) مۆسۆلۆنی یاخود هیتلەر یان حافز ئەسەد ی كردوەتە بڕیاردەر بەسەریانەوە كە مافی خۆیانیان پێ نەدات، سەعدی كوڕی موعازی كردە حەكەم بەسەریانەوە بۆ ئەوەی بزانن كە چەندە هاوەڵان جێی گرنگی پێغەمبەرن(ﷺ) و كاتێك سەعد بریندار بووە وا حوكمی ئەو كەسانەی برینداریان كردووە دەهێنێتەوە بۆ لای ئەو، ئەمە لەلایەك و لەلایەكی تریشەوە ئەوە دەبینین كە سەعد(رضي الله عنه) شتێك ناڵێت كە پێشتر پێغەمبەر(ﷺ)نەیكردبێت بەڵكو ئەوپەڕی بەزەیش ئەنوێنێ بەرامبەریان لەكاتێكدا بەسەختی برینداریان كردووەو بەو برینەش شەهیدبوو، بەمەش بۆمان دەردەكەوێت

(١) رواه البخاري (٥/١١٢)، برقم: (٤١٢٢).

(٢) ع:٧١، ك: ١١٦-١١٧

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) تەنانەت لەوپەڕی نارەحەتیشدا لە لوتكەی ڕەوشتدابوون و هەر ئەوانن كە لەكاتی شەڕ و ئاشتی لایان نەداوە لە پاراستنی بەها بەرزە مرۆڤایەتیەكان.

٢ – ئۆزۆن دەڵێت: "ئەمە دوای(٢٥) شەو لە ئابلۆقە بەنی قورەیزە خۆیان بەدەستەوەدا، بەپێی ئەم فەرموودەیە قوربانیەكان تەنها ژن و منداڵ بوون و سامانی داراییش قوربانی دووەمە، تەنانەت هەركەس لە نێرینەكان توانای شەڕی هەبوبێت خۆبەدەستەوەدان دادی نەداوەو كوژراوە":

دەڵێم: ئەم قسانەی ئۆزۆن كروزانەوەیەكی لەڕادەبەدەری دڵسۆزێكی خزمەتكارە بۆ بێ سیفەتترین و بێ غیرەتترین و خیانەتكارترین مەخلوقی خوای گەورە كە جولەكەن، نازانم چی پەیوەندیەك ئەیانبەستێتەوە پێكەوە لەگەڵ ئۆزۆندا وادەستكاری حەقیقەتەكان دەكات لەبەرخاتری ئەوان و هەموویان ئەشێوێنێ و وای نیشان ئەدات كە زۆر ستەمدیدەو بەستەزمان بوون و هاوەڵان زۆر دڵڕەق و بێ بەزەیی بوون بەرامبەریان، بێ ئەوەی ئاوڕێك بداتەوە بۆ سورەتی ئەحزاب و ئەو ئایەتانە ببینێت كە باسی وردەكاری ڕووداوەكان ئەكات و خیانەتی گەورەی جولەكە ببینێت و بزانێ كە ئەوان بوون بە شمشێرێكی ژەهراوی لە پشتی مسولمانەكان و لەگەڵ كوفر بوونە یەك بەرەو پەیمانیان شكاند و دەستیان تێكەڵكرد لەگەڵ كافران و وەرگەڕاوەكان لە ئاین، سەرەڕای ئەمەش كە ئەوان خیانەتیان كردوەو ئەبێت بكوژرێن دەرگای تۆبەی كردەوە بەڕوویانداو ئەگەربێت و مسولمان بن وازیان لێ دەهێنرێ، ئەمە لەكاتێكدا لێخۆشبوون و ئازادكردن لە هیچ یاسایەكدا نەبووە بۆ كەسێك كە خیانەتێكی گەورەی هاوشێوەی ئەمە دەكات، بەئێستاشەوە لە هیچ ولاتێكدا مایەی لێخۆشبوون نیە!!

جا ئیتر بەس ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی ئۆزۆن و بیریارانی شەرم بیانگرێت و بەخۆیاندا بچنەوە.

ئەوەشی كە ئۆزۆن دەڵێت، قوربانیان ژن و منداڵبوون، لە درۆیەك زیاتر نیەو ئەوانیش بەپێی یاسای سیاسی ئەوكات مامەڵەیان لەگەڵداكراوەو لەسەرڕووی ئەوەشەوە دەرگایان بۆ كرابوەوە كە تۆبە بكەن و مسولمان بن.

٣ – ئۆزۆن دەڵێت: لەفەرموودەكەدا گومانی ئەوە دەكرێت كە دایكی ئیمانداران عائشە(ﷺ) جوبرائیلی دیبێت: ئەمە تەنها هەواڵێكی دایكە عائشەیە و لە پێغەمبەری خوای بیستوە(ﷺ) كە جبریلی دیوە یاخود بە نیشانەیەكدا زانیویەتی جبریلە، ئەوەی كە ئۆزۆن دەڵێ گومانی بینینی دەكرێت لەلایەن عائشەوە(ﷺ) ، وتەی باخەڵی بەتاڵی خۆیەتی كە چەندین لاپەڕە جارێك دانەیەك دێنێت و ئەگەر نەیهێنایە باشتربوو چونكە هێندە ئاستی خۆی دەرنەدەخست!!

پاشان نوێگەری سەردەم و زانای هەڵكەوتە ئۆزۆن پرسیارێك دەكات و دەڵێت:

"لێرەدا پرسیارێكی گرنگ دێتە پێشەوەو ڕوو لەزاناو مەشایەخەكانی ئەم ئیسلامەو شوێنكەوتوانیان دەكات كە پێیان وایە سەحیحی بوخاری سوننەتی پێغەمبەرەو دەبێت لەهەموو سەردەمێكدا پەیڕەوی لێبكرێت، پرسیارەكەش ئەمەیە: ئایا ئێستاو لەم ڕۆژگارەدا دەكرێت لەجەنگ و لەشكركێشیەكاندا، بۆ نموونە لە جیاتی ڕێكەوتننامەی "جنێڤ" و "بڕیارەكانی ئەنجومەنی ئاسایش" ئەو یاساو ڕێسایانەی ئەوسا هەبوون بسەپێنرێن"

ع: ٧١ ـ٧٢، ك: ١١٧ ـ ١١٨

دەڵێم: جاریّ ئۆزۆن و هەوادارانی با بەخەبەربێنەوەو چاك بەهەموو فەرموودەكاندا بچنەوەو سەیر بكەنو ببینن كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەو خاڵانەی لەو ڕێكەوتننامانەی كە باسی كردوون جوانتری هێناوەو جێبەجێكردووە یاخود نا؟ هەروەها ببینن كە چی خاڵێك هەیە لەوێدا هەبێت و لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتی بێت و لە ئاكارو سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ)نیە؟ ئەوە بۆ ناڕواننە كتێبی(أخلاق الحروب)ی دكتۆر راغب سەرجانی و ببینن كە ڕەفتاری پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی چۆن بووە؟

دەڵێم: ئەم یاسایانەی كە ڕۆژئاوا لاف و گەزافی پێوە لێ دەدەن گەورەكان ناگرێتەوەو تەنها دانراوە بۆ خواردنی لاوازەكان یاخود ئەو وڵاتانەی وەختە پێبگەن و ئەوان بەو یاسایانە لەكاریان ئەخەن، ئەگینا هێنانی هێز لەلایەن ڕوسیاوە بۆ سوریاو بەكارهێنانی گازی كوشندەو ئەو جۆرە ساروخانە بە هیچ یاسایەك ڕێگەی پێنەدراوە ئەی بۆچی ئەو یاسایانە ڕێگر نین؟!

باشە خۆ بەكارهێنانی زەرەو هایدرۆجین لەلایەن هوبەلی سەردەم(ئەمریكا)وە بۆ تواندنەوەو كاولكردنی هێرۆشیماو ناكازاكی بەپێی هەموو یاساكان قەدەغەبوون، باشە كامەیە یاسای لەكارخستنی ئەمریكاو وەستاندنی؟!

باشە ئەو هەموو سنوركێشی و ڕێكخراوی ئیستیعماری و ... كە خێرو بێری هەموو ولأتانیان خواردو هەموو دنیایان وێران و كاولكرد بۆ كەسێك نەبوو بیانوەستێنیٚ؟!

باشە سەرەنجامی ئەو هەموو هیندیە سوورەی كە دانیشتوانی سەرەكی ئەمریكابوون بۆ كەس ناپرسێت چیان بەسەرهات؟!

باشە ولأتەكانی ئەفریقا لەژێر هێلّی سفری هەژاریەوە ئەژین و بەهەزاران كەس تیایاندا لەبرسان دەمرێت سالأنە، هەمووی بەهۆی سیاسەتی برسیكردن لەلایەن فەرەنساو بەریتانیاوە، بۆ ئەوەی هەرگیز بیر لەوە نەكەنەوە ببنە خاوەنی داهاتی ژێر زەوی خۆیان و خشلّ و زێڕەكانیان بەكاربێنن و بۆ ئەو زلهێزانەبێت، برسی دەكرێن و دەكوژرێن، بۆ كەس وەدەنگ نایە؟!

جا باشتر وایە ئۆزۆن ئەم قسانە بۆ كەسێك بكات وەكو خۆی بێت و متمانەی پیٚ بكات، سوپاس بۆ خوای گەورە ئەمڕۆ مسولّمان زۆر لەوە وریاترە كە فریو بخوات بە هەندێك بانگەشەی بیٚ بنەما.

پاشان ئۆزۆن بیٚ ئەدەبیەكی گەورە ئەنوێنیٚ بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) و نمونەیەكی زۆر ناشرین دێنێتەوەو، بەو بیانووەی كە گوایە پێغەمبەر(ﷺ) بەرییە لەو شتانەی كە ئیمامی بوخاری ئەیلیٚ، وتەیەكی زۆر ناشرین دەلێت ئەویش:

"ئەمانە كۆمەلە كارێكن دەبێت مسولّمانان جارێكی تر و سەرلەنویٚ چاوپیاخشاندنی بۆ بكەن و ئەم شتانە ڕەت بكرێنەوەو بیر لەوە نەكەنەوە كە بیدەنە پالّ پێغەمبەر(د.خ) كە هێندەی گورگەكەو خوێنی یوسف بێبەرییە لێیان" ع: ٧٢، ك: ١١٨

نازانم ئۆزۆن شتێكی شك نەبردووە بێجگە لەم نمونەیە كە بیهێنێتەوە یان مەبەستی ناشرینكردنی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بووە چونكە خۆی لەدواتردا ڕەخنە دەگرێت

**لە وەها وێكچواندنێك و بە تانەی دەزانێت جا ڕەنگە خۆی بیەوێ سووكایەتی و گاڵتە بە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بكات؟!**

ئۆزۆن دیسانەوە ڕەحم و بەزەییەكی دروستكراو ئەنوێنێ بەرامبەر كەسانێك كە شیاوی نین و ئەبێت سزا بدرێن، بەڵام وەكو باسمانكرد خۆشی گێل كردووە هەروەكو "كەرەی شەربەت" لەئاست ئەو هەموو ئازارو نالەی كە مسوڵمانانی جیهان ئەمڕۆ ئەیبینن بەدەست ستەمكار و خوێنڕێژانەوە، ڕەنگە تەنها بۆرما بەسبێت كە ئۆزۆن چەندین كتێبی لەسەر بنووسێت ئەگەر ڕاستەكات و بەدوای مافی مرۆڤدا وێڵە!!

جا ئۆزۆن بۆ ئەم مەبەستەش چەند نمونەیەك دێنێتەوە، لەوانەش:

## نمونەی یەكەم:

إِنَّ نَفَرًا مِنْ عُكْلٍ ثَمَانِيَةً، قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَايَعُوهُ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَاسْتَوْخَمُوا الأَرْضَ فَسَقِمَتْ أَجْسَامُهُمْ، فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: «أَفَلاَ تَخْرُجُونَ مَعَ رَاعِينَا فِي إِبِلِهِ، فَتُصِيبُونَ مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا» قَالُوا: بَلَى، فَخَرَجُوا فَشَرِبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَصَحُّوا، فَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَطْرَدُوا النَّعَمَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَرْسَلَ فِي آثَارِهِمْ، فَأُدْرِكُوا فَجِيءَ بِهِمْ، فَأَمَرَ بِهِمْ فَقُطِّعَتْ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ، وَسَمَرَ أَعْيُنَهُمْ، ثُمَّ نَبَذَهُمْ فِي الشَّمْسِ حَتَّى مَاتُوا"[١].

ئۆزۆن ڕەخنە دەگرێت لەم فەرموودەیەو حوكمەكەی پێغەمبەر(ﷺ)

بە ڕەوا نازانێ كاتێك كە ئەم كۆمەڵە خەڵكەی عوكل هاتوون و مسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاندووەوكاتێك تینوو برسیانە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت بۆ لەگەڵ شوانەكەمان ناڕۆن و لە شیری وشترەكەی بنۆشن، ئەوانیش وتیان باشەو ڕۆشتن و تێر شیریان خواردەوەو پاشان شوانەكەیان كوشت و وشترەكانیشیان دالەبەر، پاشان هەواڵەكە گەیشتەوە

---

[١] رزاه البخاري (٩/٩) برقم: (٦٨٩٩).

پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش ناردی بەشوێنیاناو شوێنپێیان هەڵگرتن و هێنانیان بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)

و ئەویش فەرمانی کرد دەست و قاچیان ببڕدرێتەوە، وەکو حەدی حیرابە چونکە ئەوان تاڵانیان کردبوو و فەسادیان لەسەر زەوی نایەوەو خوای گەورەش لەوبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ ﴾المائدة

هەروەها ئەوان شوانەکەیان چاوهەڵکۆڵی بوو، لەگەرمای بیابانیش وازیان لێی هێنا تاوەکو بەو ئێشەوە بمرێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمەی پێکردن بۆ ئەوەی بەهەمان ئازار کە بەکەسێکیان چێژاوەو کوشتویانە بیانکوژێتەوە، جا ئەمەش بۆ ئێستاو ئەوساش لە هەندێك بارو زروفدا شتێك نییە کەسانی ژیر و عاقڵ ڕەتی بکەنەوەو پێیان قەبوڵ نەبێت، چونکە دادگەری وا ئەخوازێت کە مافی ئەو کەسە هەر لە دنیاش بگەڕێتەوە بۆی لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە بێتە گەڕینەرەوەو مایەی ترسیش بۆ هەر کەسێك بیەوێ ئەو کارە ئەنجام بدات.

جا ئەگەر لەبەر خاتری ئەوە نەبێت کە ئازاری ئەو شوانانەی بەوشێوەیە داوە ئەوا دروست نییە بە هیچ شێوەیەك هەڵکۆڵینی چاو و لێکردنەوەو پارچە پارچەکردنی ئەندامەکانی جەستە کە پێی ئەوترێت "مُثْلَة"، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی نەهی کردووە لێی هەروەکو لێیەوە ئەگێڕنەوە کە دەفەرموێت: «نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ النُّهْبَى وَالْمُثْلَةِ»[١].

واتە: پێغەمبەر (ﷺ)نەهی کردووە لە نوهبا[٢] و هەروەها لە موسلە[٣].

---

[١] رواه البخاري (٣/١٣٥)، برقم: (٢٤٧٤).

[٢] نوهبا: بردنی ماڵی کەسێکە بە ئاشکراو بە زۆرە ملێ.

[٣] پارچەپارچەکردنی جەستەی مردوو، یان هەر ئەندامێکی لەجەستەی بکرێتەوە.

تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی كردوە لەوەی كە باڵندەو ئاژەڵ بكرێتە نیشانە، چونكە سوكایەتیە بەو گیانلەبەرە هەروەكو دەفەرموێت: قَالَ أَنَسٌ: «نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تُصْبَرَ البَهَائِمُ»[1].

جا ئەم فەرموودەیە هەردوكیان لە سەحیحەكەی ئیمامی بوخاریدا هەیەو ئەبوو ئۆزۆن ئاگاداری بێت و ئاوەها نەزانانە نەكەوێتە ناو شیكاری بابەتەكان و حەق و باتڵ تێكەڵ بكات!!

هەروەها فەرموودەی دووەمی ئەم باسە كە ئۆزۆن هێناویەتی ئەم وتەیەی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە، هەروەكو ئاماژەی پێ دەكەین بە ویستی خوای گەورە.

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: (هەمان شت عەبدوڵلا ی كوڕی جەعفەر كردی بە عبدالرحمن ی كوڕی مەلجەم بكوژی ئیمامی عەلی" و خەلیفە "مەنسور"یش بەرامبەر "ئیبن موقەففەع") ع: ٧٣، ك: ١٢١

دەڵێم: ئەم ڕیوایەتە زۆر دوورە لە ڕاستیەوەو هەرگیز جێگەی باوەڕ نییە لەبەر چەند هۆكارێك:

١ – پێچەوانەی وەسێتەكەی ئیمامی عەلیە، چونكە محمد ی كوڕی حەنیفیە و حوسەینی كوڕی خۆی بانگ كرد و پێی فەرموون: "ئەگەر مردم تەنها بیكوژنەوە وەكو قصاص، ئەگەر نەمردم ئەوا من خۆم بڕیاری لەسەر ئەدەم و موسلەی پێ مەكەن"[2]، جا ئەبینین ئیمامی عەلی داوای ئەوەی نەكردوەو ڕێگریشی لێی كردووە!

٢ – جاریَ با ئۆزۆن بۆمان یەكلایی بكاتەوە كە "عبدالله" بوو یا "محمدی كوڕی حەنیفە" یان "حەسەن" یاخود "حوسەین"؟! چونكە جیاوازیەكی زۆر هەیە لە نێوان گێڕانەوەكاندا سەرەڕای نادروستیان.

---

[1] رواه البخاري(٧/٩٤)، برقم: (٥٥١٣).

[2] مصنف عبدالرزاق(١٠/١٥٤)، برقم: (١٨٦٧٢).

٣ – بە هەر ڕیوایەتێك هاتوە پچڕان لە سەنەدەكەی هەیەو هیچیان وەرگیراو نین، جا ئەگەر هەركەسێك كردبێتی لەدوای پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر بێت و بەهۆی قصاصەوە نەبێت و ئەو نەهاتبێت بەوشێوە خەڵكی كوشتبێت ئەوا هەرگیز دروست نییە بەو شێوەیە بكوژرێت.

بۆ ئەم چیرۆكەش ئەتوانن بگەڕێنەوە ژیاننامەی حەسەنی كوڕی عەلی(ﷺ) نووسینی دكتۆر عەلی صلابی، بە شێوەیەكی فراوان لەم باسە دواوە.

لەبارەی چیرۆكی ئیبن موقەففەعیشەوە هەرچەندە وتەی خراپی زۆرەو بابەتی كوفری لەڕادەبەدەری هەیە، بەڵام ئەگەر ئەم هەواڵە ئەسڵی هەبێت، هەرچەندە لە كۆمەڵێك كتێبی مێژوویی هەیە بەبێ سەنەد نە ڕاست و دروست نەلاوازیش، تەنانەت شێوازی كوشتنەكەی بە چەندین شێواز هاتوەو پێشەوا ئیبن كەسیریش دڵنیا نەبوە لە شێوازی كوشتنەكەی، بەڵام ئۆزۆن هێندە بە دڵنیاییەوە قسە دەكات یەكێك نەزانێ لە قورئاندا باسكراوە، ئەمە لەكاتێكدا گومان ئەخاتە سەر بوخاری بەهێنانی چیرۆكی بێ سەنەد!!

بەڵام لەئەگەری ڕاستی ڕوودانی ئەو كردەوەیەدا هەر چەندە ڕاست نیەو بێ متمانەیە، ئێمە ئەوپەڕی نەهی لێ دەكەین چونكە ئەو جۆرە كوشتنە بۆ هیچ كەسێك نییە جێبەجێی بكات مەگەر بەو هۆیەی كە باسمان كرد، ئیتر پێویست ناكات ئۆزۆن تاوانی خەڵكانی تر بخاتە سەر شانی ئیمامی بوخاری(ﷺ) و كتێبە بەپێزو بەنرخەكەی تاوانبار بكات بەوەی ڕێخۆشكاری ئەم كارانەیە، چونكە هەموو كەسێكی خاوەن زانست و دانایی و ئاین لە پیاوچاكان و زانایان و كاربەدەستە باش و خواناسەكان هەموو تێكڕا ئەم فەرموودانەیان دیوەو، ئەوەشیان لێی نەخوێندوەتەوە كە بۆیان هەیە بەو شێوەیە مامەڵە بكەن لەگەڵ بەندەكانی خوای گەورە!!

### نمونەی دووەم:

ئەمیش بەهەمان شێوە ئۆزۆن كە ئەیهێنێت دەڵێت داوام وایە لەزانایان فەرموودەی پێشوو بەراورد بكەن بەم فەرموودەیە ئەویش: "عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: عَدَا يَهُودِيٌّ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى جَارِيَةٍ، فَأَخَذَ أَوْضَاحًا كَانَتْ عَلَيْهَا، وَرَضَخَ

رَأْسَهَا، فَأَتَى بِهَا أَهْلُهَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ فِي آخِرِ رَمَقٍ وَقَدْ أُصْمِتَتْ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ قَتَلَكِ؟» فُلاَنٌ لِغَيْرِ الَّذِي قَتَلَهَا، فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا: أَنْ لاَ، قَالَ: فَقَالَ لِرَجُلٍ آخَرَ غَيْرِ الَّذِي قَتَلَهَا، فَأَشَارَتْ: أَنْ لاَ، فَقَالَ: «فَفُلاَنٌ» لِقَاتِلِهَا، فَأَشَارَتْ: أَنْ نَعَمْ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُضِخَ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ"[١].

بەكورتی مانای فەرموودەكە ئەوەیە كە جولەكەیەك سەری كیژۆڵەیەك پان دەكاتەوەو پێغەمبەری خواش(ﷺ) بەهەمان شێوە تۆڵەی لێ دەكاتەوە.

جا من بە ئۆزۆن دەڵێم: چی ڕەخنەیەك لەم كارە هەیە، چۆن ئەو كیژۆڵەی كوشتووە، ئەویش كوژراوەتەوە، ئیتر بۆچی ڕەخنە دەگرێت؟! خۆ دڵنیابن لەوەی ئەگەر هەمان تۆڵەی لێ نەكردایەتەوە ئەوكات ئۆزۆن بەشێوەیەكی تر دەهات و ئەیوت دیارە خوێنی ئافرەت هیچ نرخێكی نییە بۆیە نەیكوشتوەتەوە!!

وابزانم لەوەی كە دەڵێت بەراوردی بكەن مەبەستی ئەوەیە بۆچی چاوی ئەم جولەكەی دەرنەهێناو دەست و قاچی نەبڕی وەكو نمونەی پێشوو؟!

بەڵام ئۆزۆن نازانێ ئەمە بەڵگەیە بەدەستمانەوە نەك بەڵگەبێت بەسەرمانەوە خۆی خستوەتە ناو داوێكەوە وای زانیوە ئازادبوونە!!

ئەمە گەورەترین بەڵگەیە بەدەستمانەوە كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) موسلەی نەكردوەو هەموو حەدێكی لە سنووری خۆی داناوە، بۆ نموونە ئەم جولەكەیە تەنها ئەو كیژۆڵەی كوشتووە بەبێ موسلە پێغەمبەریش(ﷺ)كوشتویەتیەوە بەبێ موسلە، بەڵام ئەوەی پێشوو كە حەددی حیرابەیان بەسەردا دەسەپێنراو جێبەجێ دەبوو هەروەها موسلەشیان كرد بەو كەسەی كە كوشتیان، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەكو خۆیانی لێ كردن.

---

[١] رواه البخاري (٥١/٧)، برقم: (٥٢٩٥).

نمونەی سێیەم:

ئۆزۆن ئەم فەرموودەیەش دێنێت و دەڵێت پێچەوانەی فەرموودەی پێش خۆیەتی، ئەویش[1]: عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَسَرَتِ الرُّبَيِّعُ وَهْيَ عَمَّةُ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ثَنِيَّةَ جَارِيَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَطَلَبَ القَوْمُ القِصَاصَ، فَأَتَوُا النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالقِصَاصِ، فَقَالَ أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ عَمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: لاَ وَاللَّهِ، لاَ تُكْسَرُ سِنُّهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «يَا أَنَسُ كِتَابُ اللَّهِ القِصَاصُ» فَرَضِيَ القَوْمُ وَقَبِلُوا الأَرْشَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ»[2].

كورتەی فەرموودەكە ئەوەیە كە روبەیعی پوری ئەنەس دانی كەنیزەكێكی شكاند و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی كرد بە شكاندنی ددانی روبەیع وەكو قصاص، دوای ئەوەی ئەنەس زۆر نكۆڵی ئەكات كە دانی نەشكێننەوە، كەس و كارەكەشی ڕازی ئەبن كە ئەرش وەربگرن و بەو پارەیە ڕازی دەبن كە پێیان بدرێت لەبری دانە شكاوەكە.

ئۆزۆن ئەیەوێ بڵێ باشە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لەمەیانا حەدی جێبەجێ نەكرد و لەوەی پێشوو حەدی جێبەجێ كرد؟!

دەڵێم: ئەم نمونەیە شكاندنی دانێكەو كەسوكارەكەشی لێی خۆشبوون و ڕازی بوون بە وەرگرتنی ئەرش، بەڵام نمونەی دووەم كوشتن و سەرپانكردنەوەیە كە كابرای جولەكە ئەنجامیداوە و كەس و كاری كچە كوژراوە سەرپانكراوەكەش داوای خوێنەكەیان كرد و بكوژرێتەوە، ئیتر نازانم ئەم دوو حاڵەتە مەگەر بەس لای ئۆزۆن و هاوبیرانی وەكو یەكبن.

پاشان دوابەدوای ئەمە ئۆزۆن دیسانەوە دێتەوە باسی هاوەڵان و ئەیەوێ ناشرینیان بكات و دەڵێت: " ئێمە هەر لەگەڵ بوخاری بەردەوام دەبین بۆ ئەوەی ببینین كە چۆن

---

[1] ع:٧٥، ك:١٢٣ ـ ١٢٤

[2] رواه البخاري (٦/٥٢)، برقم: (٤٦١١).

هەندێك لەهاوەڵان گلەییان لەدابەشكردنی مافەكانیان هەیە لەلایەن پێغەمبەرەوە" ع: **٧٥**، ك: **١٢٤**

**دەڵێم**: ئێستا ئەچینە لای ئۆزۆن و ئەبینین ئایا ئەم باسە تا چەند حەقیقەتی هەیەو تا چەند وایە!!

بەڵام پێش ئەوەی بچینە ناو بابەتەكە پێویستە پێشەكیكەك باس بكەین وەكو ڕێخۆشكارێك، ئەویش ئەوەیە ئەگەر هاوەڵێك یان كەسێك ڕەخنەیەك بگرێت مانای عەیبداركردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ)نیەو بەڵكو ئەگەر ئەمە ڕوویدابێت خێرا پەشیمان بوەتەوەو بۆی دەركەوتووە كە هەڵەبووەو، ئاستی تێگەیشتن و ئیمانی هەموو هاوەڵانیش(رضي الله عنهم) وەكو یەك نەبوەو ئەوەش شتێك نییە هیچ مرۆڤێكی خاوەن ژیری ئینكاری بكات و ڕەتی بكاتەوە، بەڵام ئەگەر ئێمە سەیری ژیانی هاوەڵەگەورەكان بكەین ئەوا نابینین تەنها بۆ جارێكیش لەبەرامبەر فەرمانێكی پێغەمبەر(ﷺ) وتبێتیان بۆ؟ نەك ڕەتكردنەوەو ڕازینەبوون!!

ئێستاش ئەچینە لای بەڵگەكانی ئۆزۆن و شیكاركردن و ڕوونكردنەوەیان:

فەرموودەی یەكەم:

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْسِمُ غَنِيمَةً بِالْجِعْرَانَةِ، إِذْ قَالَ لَهُ رَجُلٌ: اعْدِلْ، فَقَالَ لَهُ: «لَقَدْ شَقِيتُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ»[1].

ئەم فەرموودەیە باس لەوە دەكات كەسێك بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڵێت: دادگەربە لەكاتی دابەشكردنی غەنیمەتدا!

دەڵێم: ئەمە ئەوپەڕی نەزانیە تاوانی ئەم كەسە بدەیتە پاڵ هاوەڵان، باشە بە چی حوكمێك ئۆزۆن ئەم وتەیەی زولخوەیسیرە ئەداتە پاڵ هاوەڵان و پێیان دەڵێت هاوەڵان ناڕازییوون بە حوكمی خوای گەورە، لەكاتێكدا هەموو باش ئەزانین كە ئەم كابرایە سەری خەواریج بووە، وەك ئەوە وایە ڕەخنە بگریت لەهاوەڵان بەوەی بیٚ ئەدەبیەكانی عبدالله ی كوڕی سەلول ی دوڕوو بێنیت و بلێی ئەوەتانیٚ خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی هاوەڵان دەكات كە خەڵكانێكیان تێدابووە وتویانە: ﴿ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ المنافقون

ئەگەر ئۆوزن ئاستی تێگەیشتنی باشبێت ئەوا ئەم نمونەیەی بەسە!! جا ئەگەر ئەو ڕووداوەش نەبێت و كەسێكی دەشتەكی بوبێت وەكو هەندێك لەزانایان ئەفەرموون چۆن ئەبێتە بەڵگە لەسەر ناشرینكردنی هاوەڵان(رضي الله عنهم) لەكاتێكدا كەس نازانێت كێیەو دەشتەكیەكانیش هیچیان لیٚ نەگێراوەو ئیتر تۆ چاوەڕوانی چی دەكەی لە كەسێك بێت و میز بكاتە ناو حەرەمی مزگەوت؟

---

[1] رواه البخاري (٤م٩١)، برقم: (٣١٣٨).

فەرموودەی دووەم:

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: بَعَثَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذُهَيْبَةٍ فَقَسَمَهَا بَيْنَ الأَرْبَعَةِ الأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ الحَنْظَلِيِّ، ثُمَّ المُجَاشِعِيِّ، وَعُيَيْنَةَ بْنِ بَدْرٍ الفَزَارِيِّ، وَزَيْدٍ الطَّائِيِّ، ثُمَّ أَحَدِ بَنِي نَبْهَانَ، وَعَلْقَمَةَ بْنِ عُلاَثَةَ العَامِرِيِّ، ثُمَّ أَحَدِ بَنِي كِلاَبٍ، فَغَضِبَتْ قُرَيْشٌ، وَالأَنْصَارُ، قَالُوا: يُعْطِي صَنَادِيدَ أَهْلِ نَجْدٍ وَيَدَعُنَا، قَالَ: «إِنَّمَا أَتَأَلَّفُهُمْ». فَأَقْبَلَ رَجُلٌ غَائِرُ العَيْنَيْنِ، مُشْرِفُ الوَجْنَتَيْنِ، نَاتِئُ الجَبِينِ، كَثُّ اللِّحْيَةِ مَحْلُوقٌ، فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ يَا مُحَمَّدُ، فَقَالَ: «مَنْ يُطِعِ اللَّهَ إِذَا عَصَيْتُ؟ أَيَأْمَنُنِي اللَّهُ عَلَى أَهْلِ الأَرْضِ فَلاَ تَأْمَنُونِي» فَسَأَلَهُ رَجُلٌ قَتْلَهُ، - أَحْسِبُهُ خَالِدَ بْنَ الوَلِيدِ - فَمَنَعَهُ، فَلَمَّا وَلَّى قَالَ: " إِنَّ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا، أَوْ: فِي عَقِبِ هَذَا قَوْمًا يَقْرَءُونَ القُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ، يَقْتُلُونَ أَهْلَ الإِسْلاَمِ وَيَدَعُونَ أَهْلَ الأَوْثَانِ، لَئِنْ أَنَا أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ عَادٍ "[1]

كورتەی ئەم باسە ئەوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پارچەیەك ئاڵتون دێنێ و ئەیداتە هەندێك كەسی دوور و نایداتە قورەیش و ئەنسارییەكان و ئەوانیش ڕەخنە دەگرن و دەڵێن: بەخشی بە كەسە دیارەكانی نەجد و نەیدا بە ئێمە، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی بۆ ئەوەی دڵیان ڕابگرم، پاشان زوڵخوەیسرە ناماقوڵی خۆی دەكات و دەڵێت: ئەی محمد لەخوا بترسە!! جا پێغەمبەری خواش(ﷺ) دەفەرموێت: باشە من لەخوا نەترسم كێ لەخوا دەترسێ؟! خالیدی كوڕی وەلیدیش دەفەرموێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگەم بدە با بیكوژم ئەویش ڕێگەی نادات.

جا ئەگەر سەیر بكەین ئەبینین ئۆزۆن دیسانەوە وتەی كابرای خەواریج[2] دێنێ و ئەیسەپێنێ بەسەر هاوەڵاندا، بەڵام ئەوەی كە لەهاوەڵانەوەبوو تەنها پرسییان بۆچی وا

---

[1] رواه البخاري (٤/١٣٧)، برقم: (٣٣٤٤).

[2] باسی وەرگێڕیشمان كرد كە لێرە بەنیازی چی بوو (بگەڕێرەوە بۆ خیانەتەكانی وەرگێڕ لە سەرەتای كتێبەكەدا)!!

ئەكات و ئەیدا بەوان و نایداتە ئێمە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: دڵیان ڕائەگرم. ئیتر هاوەڵان ڕازی بوون و هیچیان نەفەرموو بەڵام ئەو كەسە شەقیە هەستاو قسەی خۆی كرد.

جا خاڵێكی گرنگیش هەیە ئەبێت باسی بكەین ئەویش ئەوەیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەكو سەرۆكی دەوڵەت بۆی هەبووە كۆمەڵێك كاروكردار بكات و چی پێ باش بێت وەكو بەرژەوەندی دەوڵەت جێبەجێی دەكات، ڕەنگە كەسانێكیش لە كارو كردەوەكان تێ نەگەن و ڕەخنە بگرن و دوایی كە حەقیقەتیان بۆ دەركەوت پەشیمان ببنەوە، جا ئەمەش شتێكی ئاساییە ئەگەر ڕوویدات، هەروەكو لە ڕیوایەتێكی تری فەرموودەكەدا هاتوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕوویكردە ئەنسارو فەرمووی: (فَإِنِّي أُعْطِي رِجَالًا حَدِيثِي عَهْدٍ بِكُفْرٍ أَتَأَلَّفُهُمْ، أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالأَمْوَالِ، وَتَذْهَبُونَ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى رِحَالِكُمْ، فَوَاللَّهِ لَمَا تَنْقَلِبُونَ بِهِ خَيْرٌ مِمَّا يَنْقَلِبُونَ بِهِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ رَضِينَا)[1].

واتە: من ئەیبەخشم بەخەڵكانێك كە تازە مسوڵمان بوون و بەوە دڵیان ڕائەگرم، ئایا ڕازی نابن خەڵكی بەپارەو دنیاو بڕۆن و ئێوەش بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بگەڕێنەوە؟ سوێند بەخوا ئەوەی كە ئێوە پێوەی ئەگەڕێنەوە زۆر باشترە تاوەكو ئەوەی ئەوان، ئەنساریش فەرموویان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕازی بووین.

هەروەها لە گێڕانەوەیەكی تریشدا دەفەرموێت: «لَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا أَوْ شِعْبًا، لَسَلَكْتُ وَادِيَ الأَنْصَارِ أَوْ شِعْبَهُمْ»[2].

واتە: ئەگەر خەڵكی هەر دۆڵ و گردێك بگرێتە بەر ئەوا من ئەوە ئەگرمە بەر كە ئەنسارییەكان ئەیگرنە بەر.

جا بەمەش حەقیقەتی تەسلیم بوونی هەموو هاوەڵانمان بۆ دەردەكەوێت بەوپەڕی ڕازیبوونەوە بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ).

پاشان ئۆزۆن هەندێك ڕەخنەی تر ئاڕاستەی ئیمامی بوخاری(رحمه الله) دەكات و دەڵێت فەرموودەكە بەچەندین گۆی جیاواز هاتوە لە كاتێكدا ڕاوی هەر هەمان ڕاویەو[1]:

---

[1] رواه البخاري(٥/١٥٨)، برقم: (٤٣٣٢).
[2] رواه البخاري (٥/١٥٨)، برقم: (٤٣٣٢).

١ – جارێك دەڵێت پارچە زێڕێك بووە جارێك دەڵێت دابەشكردنێكی گشتی بووە:

دەڵێم: ئۆزۆن لەبەر ئەوەی سەحیحی ئیمامی بوخاری(ﷺ) نەدیوە بۆیە نازانێت بە چی شێوازێك نووسیویەتی، وەكو زانراوە هەموو كتێبێك خاڵێك كە زۆر گرنگبێت پێش خوێندنەوەی بریتییە لە خوێندنەوەی پێشەكیەكەی و ئاشنابوون بە مەنهەجی نووسەر لەو كتێبەداو ئەو شێوازەی گرتویەتیە بەر لە نووسینەكەیدا، بۆ ئەوەی وەكو خۆی لە شتەكان حاڵی بێت و تووشی هەڵە نەبێت وەكو ئۆزۆن!!

ئیمامی بوخاری وەكو باسمان كرد، سەحیحەكەی لەژێر كۆمەڵێك باسدا جێكردوەتەوە، كە لەسەر دەرهێنانی حوكمی فیقهی دایناون، جا بۆیە ئەبینین زۆر جار تەنها فەرموودەیەكی زیاد لە پێنج جار هێناوەو ئەم فەرموودەیەش بەهەمان شێوەیە، جا كاتێك باسی قەسامە دەكات، هیچ لە بابەتەكە ناگۆڕدرێت ئەگەر بوترێت دابەشكردنی گشتی، چونكە یەكێك لەو شتانەی كە لەم فەرموودە ئەخوێنرێتەوە پێشەوای بڕواداران خۆی سەرپشكە لەوەی كە لەبەر خاتری بەرژەوەندی گشتی هەندێك لەماڵی گشتی ببەخشێت بەكەسانێك و نەیدات بەهەندێكی تر، بەڵام ئەمە بۆ كاربەدەستێكە بەرژەوەندی گشتی بخوێنێتەوە نەوەك بەرژەوەندی كەس و كارو ناسراو و نزیكانی خۆی.

جا لێرەدا پێشەوا بوخاری چی بفەرموێ ئاڵتون یان بفەرموێ دابەشكردنی گشتی جیاوازیەكی نیەو هەردووكیان هەر دابەشكردنی گشتین، ئەگەر كەسێكیش بیەوێ بزانێ ئەو دابەشكردنە گشتیە چیە، ئەوا پێشەوا بوخاری لە بابەكانی تردا هێناویەتی و بۆ كەسی خوازیار.

٢ – لەهەندێكیان ناوی زولخوەیسرە هاتوەو لە هەندێكیاندا نەهاتووە:

دەڵێم: لە هەندێك شوێندا پێویست بەوە ناكات كە ناوی كەسەكە ببرێت چونكە باسی قەسامەیە، چی پێویستە بوترێت زولخوەیسرە وای كرد؟! چونكە ئەوەی لەم(باب)ەدا گرنگە جەختی لەسەر بكرێتەوەو باسی بكرێت دابەشكردنەكەیە نەك فلاَن وای وت!

---

(١) ع: ٧٦ ـ ك: ١٢٧

٣ – جارێك باسی حوكمیان دەكات كە بكوژرێن و لە هەندێكیشی باسی ناكات وەك ئەوەی بلێی بڕیاری كوشتن و ژیانی خەڵك شتێكی زۆر سادەبێت و بكرێت فەرامۆش بكرێت:

دەڵێم: ئۆزۆن بەوپەڕی لێزانیەوە ئەیەوێ ژەهری خۆی بڕێژێت و خیانەت بكات و وای نیشان بدات كە ژیان و مردنی خەڵكی لای پێشەوا بوخاری گرنگ نەبووە، بەڵام ئەمە تەنها تێگەیشتنی چەوتی خۆیەتی و ئەگەر كەمێك وردبوایە پەی پێ دەبرد و دەیزانی كە پێشەوا بوخاری كاتێك تەواوی چیرۆكەكە باس دەكات باسی ئەوە دەكات كە خەواریج لەمەوە سەرهەڵدەدەن و لەكاتی دەرچوون و شەڕو ئاشوبیان ئەبێت بكوژرێن.

بەڵام وەكو وتمان كاتێك فەرموودەكە بە دووبارەیی لە باسێكی تردا دێنێت و تەنها بەشێكی لەگەڵ ئەو باسەی ئیمامی بوخاریدا هەیە، ئیتر چی پێویست ئەكات بێت و دیسانەوە درێژی بكاتەوەو هەمووی بێنێت؟! كاتێك باسی قەسامەیە چی پێویست بەوە دەكات وتەكەی خالیدیش بێنێت، خۆ باسی كوشتن و بێ ئەدەبی بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) نییە تاوەكو بیهێنێت!

وابزانم ئۆزۆن ئەیەوێ پێشەوا بوخاری(رحمه الله) وەكو خۆی كردبا و هەموو فەرموودەكەی بهێنایەو گوێی بەوە نەدایە كە درێژ بێتەوە، وەكو چۆن خۆی فەرموودەیەك دێنێ لە(٤) لاپەڕەدا لەكاتێكدا تەنها ئیشی بە دوو دێڕی هەیە!!

فەرموودەی سێیەم:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ حَدَّثَهُ: أَنَّ رَجُلا مِنَ الأَنْصَارِ خَاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شِرَاجِ الحَرَّةِ، الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا النَّخْلَ، فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ المَاءَ يَمُرُّ، فَأَبَى عَلَيْهِ؟ فَاخْتَصَمَا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلزُّبَيْرِ: «أَسْقِ يَا زُبَيْرُ، ثُمَّ أَرْسِلِ المَاءَ إِلَى جَارِكَ»، فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ، فَقَالَ: أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ؟ فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: «اسْقِ يَا زُبَيْرُ، ثُمَّ احْبِسِ المَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الجَدْرِ»، فَقَالَ الزُّبَيْرُ: " وَاللَّهِ إِنِّي لَأَحْسِبُ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ: (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ) ﴿النساء: ٦٥﴾"[١]

بەكورتی ئەم چیرۆكە باس لەوە دەكات كە زوبەیر و كەسێكی ئەنسار بوە ناكۆكیان لەسەر "ئاو" و پێغەمبەری خواش(ﷺ) ویستی سوڵح بكات كابرای ئەنساری ڕازی نەبوو بە سوڵح و وتی: حوكم بكە لە نێوانمان و دواتریش بە حوكمەكە ڕازی نەبوو وایزانی كە لایەنگیری زوبەیری كردووە، وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەبەر ئەوەی زوبەیر كوڕی مامتە؟ پیغەمبەریش(ﷺ) ڕەنگی دەمووچاوی تێكچوو، زوبەیریش دەفەرموێت من وا هەست ئەكەم ئەم ئایەتە(فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ) لەسەر ئەو بابەتە دابەزی.

ئەم چیرۆكە ئینكاری ناكرێت لەوەی حەقیقەتی هەیە، بەڵام من ئەپرسم ئایا ئەم هاوەڵە كێ بوو؟! هەروەها كێ وتویەتی هاوەڵان بێ هەڵەو كەم و كورتین و مەعسومن؟ هاوەڵان ئەكەونە هەڵەوەو كردوشیانە بەڵام خێرا لێی پەشیمان بونەتەوە، پاشان كێ دەڵێت ئەم كەسە مونافیق نەبووە؟! چونكە تەنها خوای گەورە ئاگای لەدڵەكانە و ئەزانێت چیان تێدایە و هەرخوای گەورە باسی ئەوە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُواْ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْاْ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ۝٥٨ ﴾التوبة

---

[١] رواه البخاري (١١١/٣)، برقم: (٢٣٥٩).

ئەوەتانیٚ خوای گەورە باسی ئەوە دەفەرمویٚت كە هەندێكیان لەمز و غەمزیان هەیە لەكاتی دابەشكردنەكانی پێغەمبەردا (ﷺ).

پاشان ئۆزۆن لە كۆتایی ئەم باسەداو لە(ئەنجام)دا كۆمەڵێك شیكاریی دەكات وتەواو لەبابەتەكە دوور دەكەویٚتەوەو تا بتوانیٚت خیانەت و چەواشەكاری دەكات و ئەتوانین وتەكانی بەم شیٚوەی خوارەوە دابەشیان بكەین([1]):

١ – پێغەمبەر(ﷺ) بە بڕیار و یاسای خوای گەورە نەوەستاوەو زیادەشی خستوەتە سەری نەوەك بە ڕەحم و بەزەیی خۆی كەمی بكاتەوە:

دەڵیٚم: وتەیەكی زۆر سەیرە كە ئۆزۆن ئەیكات باشە یانی چی بەڕەحم و بەزەیی حەد كەم بكاتەوە؟! بۆ بەدەستی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) یان ئەو سنورانەی كە خوای گەورە دایناون پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا سەرپشكە؟ بەڕاستی ئەگەر سەرپشك بیٚت نافەرمویٚ ئەگەر فاتیمە دزی بكات دەستی دەبڕمەوە، هەروەكو هاتووە لە چوار شوێنی سەحیحی بوخاری:

" إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الحَدَّ، وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا"([2]).

واتە: ئەوەی كە ئومەتانی پێش ئیٚوەی لەناوبرد، ئەوەبوو ئەوان كاتێك كەسێكی خاوەن پلە دزی دەكرد وازیان لیٚ دەهێنا، بەڵام ئەگەر كەسێكی لاواز و بیٚ دەسەڵات دزی كردبا حەدیان لەسەر جیٚبەجیٚ دەكرد، سوێند بەخوای گەورە ئەگەر فاتیمەی كچی ﴿محمد﴾ دزی بكات ئەوا دەستی دەبڕمەوە.

ئەمە لەلایەك و لەلایەكی تریشەوە ئۆزۆن ئەگەر تێگەیشتبا لەو فەرموودانەی پێشوو ئەوا هەرگیز وەها ڕەخنەیەكی نەدەگرت، چونكە وەكو باسمان كرد ئەوەی كە پێغەمبەری خوا(ﷺ)كردویەتی و جیٚبەجیٚی كردووە زیادە نەبووە بەسەر یاسای خوای گەورەوە، بەڵكو "قصاص" بووە بەوشیٚوەی كە ئەنجامدراوە تۆڵەی سەندوەتەوە.

٢ – وەها كارێكی كردووە كە لەدوای خۆشی كەسانی تر هەمان ڕێگە بگرنە بەر:

---

([1]) ع:٧٨، ك: ١٣٠ ـ١٣١

([2]) رواه البخاري(١٧٥/٤)، برقم: (٣٤٧٥).

مەبەستی ئەوەیە كە ئیمامی عەلی ئەو خەڵكەی سوتاند كە بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كە عەلی كوڕی ئەبی تالیب(ﷺ) خوایە، هەرچەندە ئەمە بلاّوەو دیارە لەناو كتێبەكانی مێژووداو بە پێچەوانەی ئەمەش هاتووەو دەڵێت پێشەوا عەلی كاری وای نەكردووە، بەلاّم بەهەرحاڵ پێشەوای ئیمانداران خۆی وەكو سەرۆكی ولاّت ئەمەی بە ڕێگەچارە داناوە بۆ ڕێگەگرتن لەوەی كەس جارێكی تر نەوێرێ خوایەتی بدات بە كەسێك و تەنانەت ئیمامی عەلی داوای ئەمە ناكات بۆ بكوژەكەشی وەكو باسمانكرد سەرەڕای ئەوەی سووتاندن لە هیچ كارێكی پێغەمبەر(ﷺ)

ەوە وەرنەگیراوەو هەرگیز كاری وەهای نەكردووەو تەنانەت هەندێك لەهاوەلاّنیش ئەم كارەیان پێ باش نەبوەو ڕەتیان كردوەتەوە وەكو ئیبن عەبباس(ﷺ) ، بەهەرحاڵ ئەگەر ئەمە كرابێت فەرمانی ئیمامی عەلی(ﷺ) بوەو بۆ كوشتنیان مافی خۆیەتی چونكە ئەوان ئاژاوە نەما نەیگێڕن و فیتنەی ئیبن سەبەئی یەهودی زۆر بلاّوەو هەموو ئەزانین چی كرد، بەلاّم بۆ سووتاندنیان نەمدیوە زانایانیش هاوڕابوبێتن لەسەری.

٣ – پێغەمبەر(ﷺ) لایەنگیری خەڵكانێكی كردووە لە نزیكەكانی خۆی كە شیاوی ئەوە نەبوون:

**دەڵێم:** تەنها ئەمە بەسە بۆ ئەوەی ببینیت كە ئۆزۆن چۆن ئەیەوێ لە بەهای پێغەمبەر(ﷺ) بێنێتە خوارەوە، نازانم كامە لایەنگیری كە ئۆزۆن باسی دەكات؟ ئەگەربێت و مەبەستی پێی ئەوەی پێشوبێت ئەوا لە بەڵگەیەكی لاواز زیاتر هیچمان نەدی كە لەوپەڕی بێ بنەماییدا خۆی دەبینیەوەو تەنانەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوای فەتحی مەككەش گەڕایەوە ناو ئەنسار و لەگەڵ ئەواندا مایەوە لە مەدینە هەتاوەكو وەفاتی فەرموو لەكاتێكدا ئەو مەككەیەی كە جێی هێشت و چاوەكانی لێوان لێو بوو لە فرمێسك لە خۆشەویستیدا بۆی، بەلاّم دیسانەوە جێی دەهێڵێتەوە لەبەر ئەنساریەكان و مانەوە لەناویاندا، ئیتر كامە لایەنگیری و ئۆزۆن باسی چی ئەكات؟!.

٤ – ئەم جارەیان نۆبەی ئیمامی عوسمانە(ﷺ) ئۆزۆن ناشرینی بكات و دەڵێت:

" من ئەم فەرموودانە بەدەستی كەسانێك دەزانم كە بەدەم پێغەمبەرەوە(د.خ) هەلّیان بەستووە، بۆ مەرامی سیاسی و بەرژەوەندی خزمایەتی و دەمكوتكردن و سزادان و سەركوتكردنی نەیارانیان.

بۆ زیاتر بەهێزیی و پالّپشتی ئەم قسەیەشم، وتەی خەلیفەی سێیەم(عوسمان) دێنمەوە، كە لەبەردەم كۆمەلّێك هاوەلاّندا – كە عەمماری كوڕی یاسریشیان تێدایە – و بۆ پاساودانی لایەنگری خۆی لە خزمەكانی و بەنی ئومەییە پێیان دەلّێت: من پرسیارێ لە ئێوە دەكەم، پێم خۆشە قسەكەم پشت ڕاست بكەن: سوێندتان دەدەم بەخودا، ئایا نازانن و نەتانبیستووە پێغەمبەر(د.خ) وەختی خۆی قورەیشی پێش دەخست و تای كەسە قورەیشیەكانی دەدا بەسەر خەلّكانی ترداو لەناو قورەیشیشدا(نەوەی هاشم)ی پێش دەخست؟ خەلّكەكە هەموو بێدەنگ بوون. ئەوجا(عوسمان) وتی: سوێند بەخوا ئەگەر كلیلی بەهەشت بەدەست من بوایە، تەسلیمی هۆزی بەنی(ئومەیە)م دەكرد، هەتا هەر هەموویان دەچوونە بەهەشت." ع: ٧٨، ك: ١٣١

**دەلّێم:** ئۆزۆن یەك یەك هات بۆ هەموو كەسایەتیە دیارەكان و بە دایكی ئیمانداران و ئەبو هورەیرە و ئیبن عەبباس و عەلی و... نەوەستاوە تاوەكو چاوەڕوانی ئەمەشی لێ نەكرێت، سەیر ئەوەیە ئۆزۆن پشتی بەكۆمەلّێك چیرۆك بەستووە كە هیچ بنەمایەكیان نیەو ئەیەوێت سەحیحی پێشەوا بوخاری(ﷺ) پێ هەلّسەنگێنێ كە هەموو ئومەت وەریان گرتوەو لەلایان پەسەندبووە، كارەكەی خۆشی بە لێكۆلّینەوەی زانستی لەقەلّەم داوە!!

ئەوەی ئۆزۆن دەلّێت وای ئەبینم ئەگەر مەبەستی بینینی چاو بێت ئەوا بەدلّنیاییەوە بینینی تەواو نییە ئەگەر هەر لەدەستیشی نەدابێت، و ئەگەر مەبەستیشی بیركردنەوەو بینینی دلّ بێت ئەوا بەدلّنیاییەوە بیركردنەوەو تێگەیشتنی نەخۆشە ئەگەر هەر مابێتی!!

ئەم چیرۆكەی ئیمامی عوسمانیش(ﷺ) هیچ بنەوایەكی نیەو ئەتوانن خۆتان بگەڕێنەوە سەر كتێبە مێژووییەكان و سەنەدەكەی ببینن كە بەم شێوەیە وەكو پێشەوا ئیبن جەوزی هێناویەتی: "أَنْبَأَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ بْنُ الْمُبَارَكِ قَالَ نا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُظَفَّرِ قَالَ أَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْعُتَيْقِيُّ قَالَ أَخْبَرَنَا يُوسُفُ بْنُ الدَّخِيلِ قَالَ نا الْعَقِيلِيُّ قَالَ نا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْحَسَنِ الْقَوْسِيُّ قَالَ

نا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْقُدُّوسِ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ قَالَ:

خَطَبَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ النَّاسَ فَقَالَ:" إِنَّكُمْ قَدْ عَرَفْتُمْ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُعْطِي بَنِي هَاشِمَ وَيُؤْثِرُهُمْ وَإِنِّي وَاللَّهِ لَوْ مَلَكْتُ مَفَاتِيحَ الْجَنَّةِ لَجَعَلْتُهَا فِي بَنِي أُمَيَّةَ وَقَدْ مَلَكْتُ مَفَاتِيحَ الدُّنْيَا وَسَأُعْطِيهِمْ عَلَى رَغْمِ أَنْفِ مَنْ رَغِمَ".

پاشان حوكمی لەسەر دەدات و دەفەرموێت:

: هَذَا حَدِيثٌ لا أَصْلَ لَهُ.

قَالَ الْعَقِيلِيُّ: لا يُعْرَفُ إِلا بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الْقُدُّوسِ أَوْ مَنْ هُوَ فِي مِثْلِ حَالِهِ وَمَذْهَبِهِ قَالَ يَحْيَى هُوَ رَافِضِيٌّ خَبِيثٌ لَيْسَ بِشَيْءٍ.

قُلْتُ: عَلَى أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ حُمَيْدٍ كَذَّبَهُ أَبُو زُرْعَةَ وَابْنُ وارَةَ وَقَالَ ابْنُ حِبَّانَ: يَتَفَرَّدُ عَنِ الثِّقَاتِ بِالْمَقْلُوبَاتِ"[١].

پێشەوا ئیبن جەوزی ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت: هیچ بنەوایەكی نیە.

پاشان ڕای پێشەوا عوقەیلی نەقڵ دەكات كە فەرموویەتی: تەنها لەڕێگەی عبداللە ی كوڕی عبدالقدوس و هاوشێوەكانیەوە هاتووە، حاڵی ئەوان و مەزهەبیشیان دیارە!!

هەروەها ڕای پێشەوا یەحیا نەقڵ دەكات كە دەفەرموێت: كەسێكی ڕافیزی زمان پیسەو جوێنی بەهاوەڵان داوە و هیچ نیە[٢].

هەروەها محمدی كوڕی حومەید یشی تێدایە كە ئەبو زورعە دەفەرموێت كەسێكی درۆزنە.

هەروەها پێشەوا "هەیسەمی"ش ڕای وایە سەنەدەكەی پچڕاوە چونكە لە(سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ) ئەیگێڕێتەوەو لەویشەوە بۆ عوسمان و، نەیداوەتە پاڵ كەسێك كە ڕووداوەكەی دیبێت[١]، و لای ئیبن جەوزیش بەهەمان شێوەیە.

---

[١] العلل المتناهية لابن الجوزي (١/٢٩٥)، برقم: (٤٧٤)، ت: إرشاد الحق الأثري، الناشر: إدارة العلوم الأثرية، فيصل آباد، باكستان، الطبعة: الثانية، ١٤٠١هـ/١٩٨١م.

[٢] (كاتێك دەڵێت رافیزیەكی پیسە مەبەستیان ئەوەیە زمانی پیسە بەرامبەر هاوەڵان).

تەنها وتەی کەڵە زانای ئەم مەیدانە ئیمامی عوقەیلی بەسە، كە ئیبن جەوزی هێنابووی و دیسانەوە دەیهێنینەوە كە لـە كتێبەكەی خۆیدا دەفەرموێت: "لَيْسَ لَهُ أَصْلٌ، وَلا يُعْرَفُ إلا بِهِ، أَوْ مَنْ هُوَ فِي مِثْلِ حَالِهِ وَمَذْهَبِهِ"[٢].

واتە: هیچ بنەمایەكی نیەو تەنها لە ڕێگەی عبداللە ی كوڕی عبدالقدوس و هاوشێوەكانیەوە هاتووە.

لەكۆتایی ئەم باسەدا ئەمەوێ بڵێم: ئۆزۆن زۆر بە ڕوونی وتەكانی خۆی هەڵوەشاندەوە، بەوەی كە باسێكی دانابوو گوایە پێغەمبەر(ﷺ) ڕای بەرامبەری نەهێشتووەو سەركوتی كردووە، دواییش بە كۆمەڵێكی تر فەرمووددەوە هات كە هاوەڵان ڕازی نەبوون لە دابەشكردنەكان پێغەمبەر(ﷺ)، ئەی باشە پێغەمبەر(ﷺ)چۆن ڕێگەی پێدان ڕەخنە بگرن و كاتێك خالیدیش(رضي الله عنه) دەفەرموێت ڕێگەم بدە بیكوژم ڕێگە نادات؟!

هەروەها ئەو نمونانەی ڕابورد ئەوە دەردەخات كە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ئەوپەڕی ئازادی هەبووەو خەڵكی توانیانە بەوپەڕی ئازادی بەبێ هیچ ترسێك ڕووبەڕوو ڕەخنە لە سەرۆكی وڵات بگرن و ڕای خۆیان دەربڕن و كەسیش ڕێگەی لێ نەگرتوون، بە پێچەوانەی ملهوڕ و كاربەدەست و تاغوتەكانی ئەمڕۆوە كە سەدان دەزگای داپڵۆساندنیان هەیەو خەڵكی سەركوت دەكەن و لەناویان دەبەن!!

ئۆزۆن لەو هەموو بەها بەرزو جوانە لایداوە كە لە ژێر چەتری سیستەمی خیلافەتی ئیسلامیدا هەبووەو ئەیەوێت پەردەیەكی تار بدات بەسەریا، هەرگیز بۆ ئەو و هیچ كەسێكی تریش ناچێتە سەرو خێرا پەردەیان لەسەر هەڵماڵرێ.

---

[١] مجمع الزوائد للهيثمي (٩/٢٩٢)، برقم: (١٥٥٨١)، ت: حسام الـدين القدسـي، الناشـر: مكتبـة القدسـي، القاهرة، عام النشر: ١٤١٤ هـ، ١٩٩٤ م.

[٢] الضعفاء الكبير لأبي جعفر محمد بن عمرو بن موسى بن حماد العقيلـي المكـي (المتـوفى: ٣٢٢هــ) (٢/٢٧٩)، ت: عبد المعطي أمين قلعجي، الناشر: دار المكتبة العلمية – بيروت – الطبعة: الأولى، ١٤٠٤هـ – ١٩٨٤م.

## ئایا پێغەمبەری خوا(ﷺ) سیحری لێكراوه؟

ئەم باسە یەكێكە لەو بابەتانەی كە ئۆزۆن هەرایەكی لەسەر ناوەتەوەو لێمانی زۆر گەورەكردوە، بەڵام خۆزگە وتەكان هی خۆی بوونایەو هەر هەمان وتە دووبارەكانی پێشوو نەبوونایە كە هێندە دووبارە بونەتەوە وەڕەس بووین لە بیستن و بینینیان، چونكە هەزاران ساڵ پێش ئێستا موعتەزیلە دەستیان دایە ئەم بابەتەو وروژاندیان تاوەكو چەندین زانای وەكو پێشەوا ئیبن قوتەیبە هاتە مەیدان و وەڵامی دانەوە، پاشان دوابەدوای ئەوانیش ڕۆژهەڵاتناسان و ئەوانەشی كاریگەربوون بە بەنگەوازیان ئەم بابەتەیان ئەورووژاند تاوەكو خوای گەورە جیل لەدوای جیل زانایانی خواناس و شارەزای بۆ ناردن و وەڵامیان دانەوەو حەقیان بەیان كرد بۆ تەواوی خەڵك.

جا ئێستا وانازانم شتێك مابێتەوە بۆ ئۆزۆن كە خۆی پێوە سەرقاڵ بكات و ئەوەشی كە هێناویەتی تەنها دووبارەكردنەوەی وتە وەڵامدراوەكانی موعتەزیلەو ڕۆژهەڵاتناسانەو دەبوو ئۆزۆن وەڵامی وتەكانی زانایانمانی بدایەتەوەو پاشان ئەوەی لایەتی باسی بكات و ئەوەشی كە ئەیلێ شتی تازەبێت و شتێك نەبێت هەزار ساڵ زیاترە وەڵامدراوەتەوە!!

ئۆزۆن ئەم فەرموودەیە نەقڵ دەكات: عَنْ عَائِشَةَ، رضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُحِرَ، حَتَّى كَانَ يَرَى أَنَّهُ يَأْتِي النِّسَاءَ وَلاَ يَأْتِيهِنَّ، قَالَ سُفْيَانُ: وَهَذَا أَشَدُّ مَا يَكُونُ مِنَ السِّحْرِ، إِذَا كَانَ كَذَا، فَقَالَ: " يَا عَائِشَةُ، أَعَلِمْتِ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ، أَتَانِي رَجُلاَنِ، فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي، وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ، فَقَالَ الَّذِي عِنْدَ رَأْسِي لِلآخَرِ: مَا بَالُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ، قَالَ: وَمَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ أَعْصَمَ – رَجُلٌ مِنْ بَنِي زُرَيْقٍ حَلِيفٌ لِيَهُودَ كَانَ مُنَافِقًا – قَالَ: وَفِيمَ؟ قَالَ: فِي مُشْطٍ وَمُشَاقَةٍ، قَالَ: وَأَيْنَ؟ قَالَ: فِي جُفِّ طَلْعَةٍ ذَكَرٍ، تَحْتَ رَاعُوفَةٍ فِي بِئْرِ ذَرْوَانَ " قَالَتْ: فَأَتَى النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ البِئْرَ حَتَّى اسْتَخْرَجَهُ، فَقَالَ: «هَذِهِ البِئْرُ الَّتِي أُرِيتُهَا، وَكَأَنَّ

مَاءَهَا نُقَاعَةُ الحِنَّاءِ، وَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ» قَالَ: فَاسْتُخْرِجَ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: أَفَلاَ؟ – أَيْ تَنَشَّرْتَ – فَقَالَ: «أَمَّا اللَّهُ فَقَدْ شَفَانِي، وَأَكْرَهُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ شَرًّا»[1].

پاشان ئۆزۆن هەندێك ڕەخنەی لەبارەیەوە هەیەو، پێش ئەوەی كە وەڵامی ڕەخنەكانی بدەینەوە پێشەكیەك باس دەكەین وەكو وەڵامێك بۆ ئەو و هەموو ئەوانەشی كە دەڵێت چۆن ئەبێت پێغەمبەران سیحریان لێ بكرێت؟!

دەڵێم: بابەتی سیحر و جادوو حەقیقەتی هەیە و خوای گەورە لەقورئاندا باسی فەرمووە هەروەكو لە چیرۆكی "هاروت و ماروت"دا: ﴿ وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾البقرة

هەروەها لەچیرۆكی موساو ساحیرەكاندا بە ڕوونی لەچەندین ئایەتی قورئاندا ئەمە بەدیار دەكەوێت.

هەروەها بۆ ئەوەی كە ئایا دەكرێت پێغەمبەران سیحریان لێ بكرێت؟

دەڵێم: سیحرو و جادوو لەهەمان جنسی نەخۆشی و ناخۆشیەو وەكو چۆن هەردوو شتێكن و لەرێگەی هەموو كەسێكدایە لە نەوەی ئادەم، پێغەمبەرانیش لێی بەدەر نین و دەكرێت بەسەریاندا بێت، بەڵام خوای گەورە وەحیی و پەیامەكەیان دەپارێزێت لەوەی هەر شتێكی تێكەڵ بێت، وەكو هەموو ئەزانین یەكێك لە جۆرەكانی سیحر بریتییە لە چاوبەست و هێنانە پێش چاوی كەسی سیحر لێكراو شتانێك كە حەقیقەتیان نییە لە

[1] رواه البخاري (١٣٧/٧)، برقم: (٥٧٦٥).

واقیعدا، ئەم جۆرەش تەنانەت پێغەمبەرانیش لێی بەدەر نەبوون و ئەوەتا خوای گەورە لەبارەی پێغەمبەر موساوە دەفەرموێت: ﴿ فَأَجْمِعُوا كَيْدَكُمْ ثُمَّ ائْتُوا صَفًّا ۚ وَقَدْ أَفْلَحَ الْيَوْمَ مَنِ اسْتَعْلَىٰ ﴿٦٤﴾ قَالُوا يَا مُوسَىٰ إِمَّا أَن تُلْقِيَ وَإِمَّا أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ أَلْقُوا ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ ﴾طه

هەروەكو ئەبینین موسا(عليه السلام) وای زانی ئەوەی كە ساحیرەكان پێوەی هاتوون مارە لە حەقیقەتداو چاوبەستكرا لەلایەن ئەوانەوەو كەمێكیش ترسی بۆ دروست بوو!!

جا ئیتر ئۆزۆن و خەڵكانێكی تریش چۆن ئەتوانن جورئەتی وەها وتەیەك بكەن و ئەو هەموو سەفسەتەیان لە چییە؟!

مەگەر زۆرێك لە پێغەمبەران شەهید نەكراون؟ مەگەر زۆرێكیان نەخۆشی توندیان نەگرتوە؟ مەگەر زۆرێكیان جۆرەهای نەخۆشی و ناخۆشیان نەدیوە؟ جا ئەگەر بێت و ئەوان تووشی ئەو شتانە نەبن ئیتر جیاوازی ئەوان و فریشتەكان چییە؟

ئێستاش دێینە سەر ڕەخنەكانی ئۆزۆن و ئەتوانین بەم شێوەیە دابەشیان بكەین[1]:

١ – پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جادووی لێكراوەو لە ڕووی سێكسیەوە كاری تێكردووە، خۆ ئەگەر مەسەلەكە كێشەیەكی سێكسی نێوماڵی پێغەمبەربێت مەبەست لە ورووژاندن و بلاوكردنەوەی چیە؟

**دەڵێم**: بۆ خاتری خوا كەی لەدەقی فەرموودەكەدا شتی وا هەیە كە ئاماژەبێت بۆ ئەوەی كە كاریگەری خستوەتە سەر كەمبوونەوەی توانای سێكس؟! سوێند بەخوای گەورە هەموو گیانم هەژاوە لە گەورەیی خیانەت و چەواشەكاریەكانی ئۆزۆن و شێواندنی حەقیقەت و ڕاستیەكان!!

---

[1] ع: ٨٠ ـ ٨١، ك:١٣٤ ـ ١٣٥

ئەوەی کە هاتووە لەفەرمووودەکە بریتییە لەم دەقە(كَانَ يَرَى أَنَّهُ يَأْتِي النِّسَاءَ وَلاَ يَأْتِيهِنَّ). واتە: هەتاوەکو وای لێهات وای ئەزانی دێتە لای خێزانەکانی، بەڵام نەدەهاتە لایان.

ئەوەی لێرە باسکراوە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەهۆی کاریگەری سیحرەکەوە وای زانیوە شتێکی ئەنجامداوە، بەڵام ئەنجامی نەداوە، ئەمەش شتێکی ئاساییە و هەروەکو چۆن پێغەمبەر موسا(عليه السلام) وای ئەزانی ماری دیوەو ئەو پەت و گوریسانەی کە ساحیرەکان فڕێیان داوە هەر بە ڕاستی مارە لەکاتێکدا حەقیقەتیشی نەبوو.

تەنها باسکردنی حاڵی پێغەمبەرە(ﷺ) کە بەوشێوەی بەسەرهاتووە، نەوەك باسکردنی کاروباری خێزانی ناو ماڵەوەی پێغەمبەر(ﷺ) تاوەکو ئۆزۆن هێندە سنوور ببەزێنێت و بەمشێوەیە قسە بکات.

ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا چەندین کەسمان دیوەو لێمان بیستوون و بەسەر زۆرێکیشماندا هاتووە، کە شتێك وائەزانین کردوومانەو نەمانکردووە، یان زۆر جار بەهۆی نەخۆشیەوە ئەمە ڕوو دەدات یاخود هەندێك جار بەهۆی ماندووبونێکی زۆرەوە، ئیتر ئەمە کەی مایەی ڕەخنەیە لای کەسی ژیر؟!

٢ – ئایا ئەمە سوننەتێکەو هەرکەس لاوازی جنسی هەبوو، ئیتر سیحری لێکراوە؟

دەڵێم: جا لەکوێی فەرموودەکە ئەوەی تێدایە تاوەکو بوترێت سوننەتە؟ دیارە ئۆزۆن پێویستی بەوەیە بڕوات و بە ئاستی بیرکردنەوەو تێگەیشتنیا بڕواتەوەو دڵنابێت لەوەی سەلامەتە پاشان بێتەوە سەیرێکی فەرموودەکە بکاتەوە!!

٣ – ئەگەر جبریل و میکایل سیحری پێغەمبەریان(ﷺ) بەتاڵ کردبێتەوە، ئەی خەڵکی تر چیبکەن؟ ئایا بچن بۆ لای سیحربازو جادووگەر و فاڵچیەکان؟

دەڵێم: ئەمە هەوڵێکی تری نەزۆکی ئۆزۆنە بۆ ئەوەی بڕواداران بکەونە گومانەوە لە ڕاسترین کتێبی دوای قورئان کە سەحیحی پێشەوا بوخاریە(رحمه الله) ، ئەگینا چارەسەری سیحر و جادوو کەس نەیوتووە بە چوونە لای جادووبازو فاڵچیەکانە، بەڵکو بە گەڕانەوەیە بۆ لای خوای گەورە و پاڕانەوەیە لێی، ئەوەی پێغەمبەری خواش(ﷺ) لەبەر

پلەو پایەو پێغەمبەرایەتیەكەیتی كە فریشتەكانی خوای گەورە بەتاڵیانكردوەتەوە، ئەم جۆرە بەڵگەیەش لەوپەڕی لاوازیدایەو هەروەكو ئەوەیە كەسێك بێت و بڵێ: ئەی باشە پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر بەشی نەفس و شەیتانی لێدەرهێنرابێت و مەیلی بۆ تاوان نەبێت، ئەی باشە مرۆڤەكانی تر چی بكەن وا مەیلی تاوان و خراپەیان هەیە؟

ئەمە وتەی كەسێكە ڕێگەی ون كردبێت و حەزی بە تاوانبێت و نەزانێ پێویستە لەسەر هەموو كەس لەخوای گەورە بترسێت و ڕێگاكانی زاڵبوون بەسەر نەفسی خۆی بگرێتە بەر!!

جا ئەو وتەیەی ئۆزۆنیش وتەی كەسێكە خۆی حەزی لە فاڵگرتنەوەو سیحروو جادوبێت ئەگینا ڕێگای چارەسەرەكەی زۆر ڕوون و ئاشكرایە.

٤ – ئەی بۆ حەوت دەنك خورمای مەدینەی نەخوارد تاوەكو نەكەوێتە ژێر كاریگەری جادووگەرانەوە.

دەڵێم: ئەم وتەیەی ئۆزۆن بۆ هەڵوەشاندنەوەی فەرموودەكە زۆر لاوازە، چونكە كەسێكی تریش بۆ هەیە بپرسێت: ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ)كێ دەڵێت خورمای خواردووە ئەو بەیانیە؟ پاشان ئۆزۆنیش دێتە وەڵام و دەڵێت: ئەی بۆ نەیخواردووە بۆ ئەوەی جادووی لێ نەكرێت؟

پاشان وەڵامی ئۆزۆن ئەداتەوەو دەڵێت: باشە تۆ ئەتەوێ بڵێی پێغەمبەری خوا(ﷺ) غەیب و نادیاری زانیوەو زانیویەتی سیحر و جادووی لێ دەكرێت تاوەكو خورماكەی بیر نەچێت و بیخوات؟ لەكاتێكدا دوای سیحرەكەش نەیزانی سیحری لێكراوە تاوەكو ئاگادار كرایەوە كە تووشی سیحر بووە!!

هەروەها لەلایەكی تریشەوە دەڵێم: كاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت دوای خواردنی خورما سیحر كاریگەری نابێت، ماناكەی وانیە كە ئەو كەسە هەرگیز تووشی سیحرو جادوو نابێت بەڵكو مەبەست پێی جۆرە خورمایەكی دیاریكراوەو پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێكردووەو كێ ئەڵێ لەوكاتەدا هەر بەردەست بووبێت؟!

دیسانەوە **دەڵێم**: ئۆزۆن بڕوای بە لێكۆڵینەوە پزیشكیەكان هەیەو تەنانەت لە قورئان زیاتر پشتی بە زانستی سەردەم بەستووە، چونكە هەموو دەقەكان ملكەچی ئەو زانستە دەكات و ئەیخاتە ژێر ڕكێفی فەرمانڕوایی زانستەوە!

جا ئێمە ئەگەر زانستی پزیشكی وەرگرین بە نموونە كە لەچەندین بواردا قسەی كردوە بۆ نموونە بۆ تووش نەبوون بە نەخۆشی شێرپەنجەی جگەر و شەكرەو چەوری خوێن ئەوەیان دووپاتكردوەتەوە كە خواردنی بادەم ڕێگرە لە تووشبوون بەو نەخۆشیانە، باشە ئەگەر هات و كەسێك ڕۆژانە بادەم بخوات و ئەو هۆكارانەش نەگرێتە بەر كە تووشكەرن بەو نەخۆشیانەو تووشیش بوون بە یەكێك لەو نەخۆشیانە، ئۆزۆن دێت ئەم توێژینەوە زۆر و زەبەندانە ڕەت بكاتەوەو بڵێ درۆیە؟!

بەدڵنیاییەوە نەخێر بەڵكو ئۆزۆن تەنها كاری ئەوەیە كە فەرمووده ڕەت بكاتەوەو ئیسلام بشێوێنێ و دەڵێت بابەتی پزیشكی كاری من نیەو من ئەندازیارم!!

## ئایا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەیدەزانی سزای گۆڕ هەیە؟

ئۆزۆن ئەو فەرموودەیە دێنێت كە دوو پیرەژنی یەهود دێن و باسی سزای گۆڕ دەكەن لەلای دایكی ئیمانداران عائشە(رضي الله عنها) و ئەویش بڕوایان پیٚ ناكات و دواتر هەوالّەكە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوەو ئەویش دەفەرموێت: ڕاستیان كردووە، جا دوای ئەوە ئۆزۆن كۆمەلّێك ڕەخنە دەگرێت و دەكرێت بەم شێوەیە دابەشیان بكەین[1]:

١ – دوو پیرەژنی جوولەكە پێغەمبەر(ﷺ) بەئاگا دێننەوە لەوەی كە گرنگە پەنا بگرێت بەخوای گەورە لەسزای گۆڕ.

**دەلّێم:** جا ئەگەربێت و پێغەمبەر(ﷺ) ئەم وتەیەی لەوان وەرگرتبێت و دواییش خوای گەورە بەڕاستی خستبێتەوە چ كێشەیەكی هەیە؟ ڕەنگە ئەوانیش لە تەوراتیان وەرگرتبێت و ڕاست و دروست مابێتەوە بۆیان؟باشە مەگەر تەورات سەرتاپا دەستكاریی كراوە؟ وەحیی خوای گەورەبێت و ئەم بابەتەش هەوالّێكی بیروباوەڕیەو گۆڕانی بەسەر نایەت و لە گشت ئاینەكاندا وەكو یەكە، سەرەڕای ئەوەی كە بەلّگەی زۆری لەسەرە لە قورئان و سوننەتیش.

وەك زانراویشە كتێبە ئاسمانیەكانی پێشوو سەرتاپای نەگۆڕاوەو هەندێك شتی ڕاستی تێدا ماوەتەوە، هەربۆیە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرموێت: هەوالّەكانیان نە بە ڕاست بخەنەوە نە بە درۆ، بێگومان ئەمەش ئەگەر پێچەوانەی دەقەكانی ئیسلام نەبێت، ئەگەر پێچەوانەبوو ئەوا ڕەت دەكرێتەوە.

٢ – مرۆڤ لە گۆڕدا زیندوو نیەو نە قورئان و نە زانستیش پشتڕاستی نەكردوەتەوە.

**دەلّێم:** ئەمە وتەیەكی بیٚ بنەماو زۆر لاوازەو تەنها لە كەسێكی وەكو ئۆزۆنەوە چاوەڕوانی بیستنی دەكەین، ئەگینا قورئان ئەوەی پشتڕاستكردوەتەوەو لەبارەی فیرعەون و دارودەستەكەیەوە دەفەرموێت: ﴿ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ

---

[1] ع: ٨١ ـ ٨٢، ك: ١٣٥ ـ ١٣٦

إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾غافر

ئەوەتانێ خوای گەورە دەفەرموێت: بەیانیان و ئێواران سزا ئەدرێن تاوەكو ڕۆژی قیامەت!!

ئەمە لە قورئاندا زۆر سەریحەو هەروەها لەبارەی شەهیدانەوە خوای گەورە دەفەرموێت زیندوون: ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٞ وَلَٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾البقرة

هەروەها دەفەرموی: ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾آل عمران

ئەمە جۆرە ژیانێكەو لەبەرزەخدایەو تەنها خوای گەورە خۆی ئەزانێت چۆنە، بەڵام ئۆززۆن تەنها ئەیەوێ ئینكاری حەقیقەت بكات و هەرچیەك سوننەت پێی بێت ڕەتی بكاتەوە ئەگەرچی لە قورئانیشدا هاتبێت، یاخود ئەیەوێ پێكەوە هەم لە قورئان بدات و هەم سوننەتیش!!

هەروەها لەبارەی زانستی سەردەمیشەوە كە گوایە پشتڕاستی نەكردووەتەوە، لەوتەیەكی بێ مانا زیاتر نییە چونكە زانستی سەردەم ئەوە نییە كە ئۆززۆن لێی تێگەیشتووەو وائەزانێ شتێك زانستە تەجرییەكان قسەیان لێوەكرد ئیتر ئەوە بڕیاری یەكلاكەرەوەیەو هیچ شتێكی تر هەڵناگرێت وەكو باسمان كرد، هەروەها لەلایەكی تریشەوە زانستی سەردەم زۆر شت هەیە تاوەكو ئێستاش ئەناڵی بەدەستیەوەو لە دژیەكی و ناكۆكیەكی بەرچاودا خۆی دەبینێتەوەو هەر تیۆرەو شتێك دەڵێت و پێش خۆی بەدرۆ دەخاتەوە، هەروەكو لە پێشوودا بەشێوەیەكی تارادەیەك بە فراوانی لێی دواین!!

هەموو ئەو حەقیقەتە دەزانین كە زانستی سەردەم مەودای پەیپێبردنی بەرتەسكەو ناتوانێت لە هەموو شتێك بدوێت و پشتڕاستی بكاتەوە یاخود بە درۆی بخاتەوە، بەتایبەت بابەتی

غەیب و نادیار كە ئەم زانستانە پشت بە هەستی مرۆڤ دەبەستن و هەرگیز ناتوانن پەی بە وەها شتێك ببەن، ئیتر نازانم ئۆزۆن داوای پشتڕاستكردنەوەی چی دەكات؟!

٣ – ئەگەر وادابنێین زیندووش بێت، باشە بۆچی باسی ئاسوودەیی و خۆشبەختی مردووە خواناسەكانمان بۆ باس ناكەن؟

دەڵێم: بەم وتەیە ئۆزۆن تەواو تەواو نەزانی خۆی بە سوننەت دەردەخات و بەئاشكرا ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێت كە هیچ نازانێت بەرامبەر كۆی فەرموودەكان و تەنها ئەو شتانەی بیستووە كە ڕەخنەگرانی سوونەت لەپێش خۆی هێناویانە، ئەگینا ئێمە بڕوانین بۆ سوننەت زۆر بەڕوونی چەندین فەرموودە ئەبینین لەبارەی خۆشی و نیعمەتەكانی بەهەشتەوە، هەروەكو لە فەرموودەكەی بەڕا هاتووە كە ناسراوە بە فەرموودە درێژەكەی سەرەمەرگ تاوەكو دوا مەنزلی وباسی خۆشی و ناخۆشیەكانی قەبریشی تێدایە، هەندێك لەو خۆشیانەی كە باسی دەكات[1]:

١ – ڕاخەری بەهەشتی بۆ ڕادەخرێت.

٢ – پۆشاكی بەهەشتی لەبەر دەكرێت.

٣ – دەرگایەكی بەهەشتی لێدەكرێتەوەو شوێنی خۆی دەبینێت تێیدا.

لەگەڵ چەندین خۆشی و نیعمەتی تر كە باسكراون لە فەرموودەی تردا كە ئۆزۆن لێیان بێ خەبەرەو ڕەخنە دەگرێت، من وا ئەبینم لەوپەڕی كەماڵ و تەواویتی هەر یاساو قانونێك ئەوەیە(نەك هەر ڕای من بەڵكو ڕای هەموو كەسێكی عاقڵیشە) هەم سزای تیادابێت هەم هاندان و پاشاداشتی چاكیش، چونكە سرووشتی مرۆڤەكان وایە بەباسكردنی یەك دانەیان و وازهێنان لەوی تریان بە ئاقارێكی خراپدا ئەڕوات، بۆ نموونە ئەگەر باسی سزا نەكرێت و هەر باسی خۆشی بكرێت ئەوا خەڵكانێك كە پێویستیان بەوە هەیە شتێك دووریانبخاتەوەو بیانسڵەمێنێتەوەو ڕێگەیان لێ بگرێت، زیاتر بەرەو هەڵدێر ئەڕۆن و نایەن بەرەو كردەوەی باش و ناتوانن بەبێ ترس لە سزا زاڵ بن بەسەر شەهەوات و

---

[1] رواه أحمد (٣٠/٤٩٩)، برقم: (١٨٥٣٤)، شعب الإيمان (١/٦١٠)، بـرقم: (٣٩٠)، المصـنف لعبـدالرزاق (٣/٥٨٠)، برقم: (٦٧٣٧) مصنف ابن أبي شيبة (٣/٥٤)، برقم: (١٢٠٥٩).

ئارەزووكاندا!! جا بۆیە باسكردنی یەكێكیان و وازهێنان لەوی تریان شتێكی دروست نیەو كەم و كورتە.

٤ – وادیارە سزای گۆڕ تەنها تایبەت بێت بە جولەكە، ئەوەتا هەر لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە: كە پێغەمبەر(ﷺ) دای بەلای گۆڕێكداو دەنگێك هات و فەرمووی: جوولەكەن لە گۆڕەكەیاندا سزا دەدرێن.

دەڵێم: ئۆزۆن وەك سیفەتی هەمیشەیی خۆی خەریكی چەواشەو گەندەڵیە، ئەگینا لەكوێی فەرموودەكەدا شتی وا باسكراوە كە تایبەتە بە یەهود، بەڵكو ئەو دەنگە لە گۆڕێكەوە هاتوەو جوولەكەبووە، ئیتر ئەم تایبەتكردنەی ئۆزۆن هی باخەڵی بەتاڵی خۆیەتی و ئەمەش دەقی فەرموودەكەیە: عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ وَجَبَتِ الشَّمْسُ، فَسَمِعَ صَوْتًا فَقَالَ: «يَهُودُ تُعَذَّبُ فِي قُبُورِهَا»[١]

جا دوابەدوای ئەم فەرموودەیە فەموودەیەكی تری هێناوە ئیمامی بوخاری كە بەشی یەكەمی وتەكانی ئۆزۆن هەڵەوەشێنێتەوە كە ئەیویست وامان پێ بڵێ كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو دوو پیرەژنەوە فێری پەناگرتن بەخوای گەورە بووبوو لە سزای گۆڕ، ئەویش ئەمەیە: وَهُوَ «يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ»[٢].

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) پەنای بەخوای گەورە دەگرت لە سزای گۆڕ!!

---

[١] رواه البخاري (٢/٩٩)، برقم: (١٣٧٥).

[٢] رواه البخاري (٢/٩٩)، برقم: (١٣٧٦).

## ئایا كەس شتی حەڕامكردووە لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟!

ئۆزۆن چیرۆكی ئەو خواردنەوەی هێناوە كە پێغەمبەر(ﷺ) لای یەكێك لە خێزانەكانی خواردویەتیەوەو لەپاشان هەندێكی تریان غیرەیان كردوەو وتویانە بۆنی ناخۆشە و پاشان دەڵێت: "ئەوەی كە گرنگە بەلامانەوە كۆتایی فەرموودەكەیە كە دەڵێ هەنگوینمان لە پێغەمبەر(ﷺ)(قەدەغە)حەڕامكرد، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت حەڕامكردن كە گرنگترین شتێكە لە ئایین و شەرعدا پاڵنەرەكەی **ئارەزوو** یان ئیرەیی یا **درۆكردنە**"ع: ٨٣، ك: ١٤٠

دەڵێم: ئۆزۆن هەم نەزانی بەرامبەر ئاین و زمان، هەم دڵڕەقی و بێویژدانیەكی زۆری پێكەوە كۆكردوەتەوە، بۆیە هەر چاوەڕوانی ئەو شتانەی لێدەكرێت، ئەگینا سەرەتایی ترین كەس لە زمانی عەرەبیدا ئەزانێت وشەی(حرام) تەنها بۆ ئەو حەڕامكردنە نایەت كە هەموو ئەیزانین لە شەرعداو پێویستە لەسەر هەموو كەس لێی دووربكەونەوەو ئیتر ئەبێتە تەشریع، بەڵكو هەندێك جار دەستەواژەی حەڕام بەكاردێت بۆ شتێك كە كەسێك لەسەر خۆی یان لەسەر كەسێكی تری قەدەغە دەكات و پێی دەڵێت نەیخوات یاخود خۆی نایخوات، هەروەكو خوای گەورە لەبارەی پێغەمبەری خوا موسا(عليه السلام) دەفەرموێت:

﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ ﴿١٢﴾﴾القصص

جا لێرەدا لەم ئایەتە پیرۆزە زۆر بە جوانی ڕوونی دەكاتەوە كە دەستەواژەی(حرام) تەنها بۆ قەدەغەكردن و حەڕامكردنێك نایەت كە لە ئایندا حەڕام كرابێت ئەو شتە وەكو تەشریع، چونكە پێغەمبەر موسا(عليه السلام) شیرەخۆرەبووەو خوای گەورە دەكرێت وەكو فەرمان شیری لێ حەڕام بكات كە منداڵەو تەكلیفی لەسەر نیە؟ یان شیری هەموو ئافرەتانی لێ قەدەغەكرد و وای لێكرد شیری كەس نەگرێت بێجگە لەشیری دایكی خۆی بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە لای و لەكۆشی ئەودا گەورەبێت.

دەی ئەم بابەتەی تریش بەهەمان شێوەیەو دایكە عائشەو حەفصە ئەو خواردنەوەیان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەدەغەكرد كە نەیخواتەوە، نەوەك حەڕامیان كردبێت لەسەر ئوممەت

بەو شێوەی کە ئۆزۆن ئەیەوێ یاری بکات بە هەست و سۆز و ژیریی خوێنەرانی و سووکایەتیش بکات بەرامبەر دایکانی ئیمانداران(رضي الله عنهن) و پێغەمبەری خواش(ﷺ)، هەروەها قورئانیش پشتڕاستی ئەم ڕووداوە دەکاتەوەو ئایەتیشی لەسەر دابەزیووە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١ ﴾التحريم

جا بەم شێوەیە تانەی ڕاستەوخۆیە لەلایەن ئۆزۆنەوە بۆ خوودی پێغەمیەری خوا(ﷺ) و وەسفکردنێتی بەوەی کە لەبەر هەواو ئارەزوو غیرە حەڵاڵی حەرامکردووە!!

هەروەها بێئەدەبیەکی تری ئۆزۆن ئەوەیە غیرەو درۆ تێکەڵ دەکات و لە دەقی فەرموودە درێژەکەی کە چەندین لاپەڕی گرتوەو خۆی دەڵێت ئێمە تەنها پێویستمان بە دەستەواژەیەکێتی، هاتووە کە دایکی ئیمانداران عائشە(رضي الله عنها) دەڵێت: (فَغِرْتُ)، واتە غیرەم کرد. ئیتر من نازانم کوێی ئەم ڕووداوە مایەی ڕەخنەیە؟

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: "ئێمە ئەمانە نە لە خاتوو عائشەو نە لە بوخاری و نە لەکەسیان وەرناگرین و پەسەندی ناکەین" ع: ٨٣، ك: ١٤٠

دەڵێم: کەس چاوەڕوان نییە بزانێ تۆ وەری دەگریت یاخود نا، چونکە نە خۆت نە نووسینەکەشت هیچ بەهایەکتان نیەو بە بوون و نەبوونتان هیچ گۆڕانێك نایەتە ئاراوە.

ئەمەوێ سەرنجتان ڕابکێشم بۆ شێوازی فێڵ و خیانەتی ئۆزۆن:

ئەویش ئەوەیە تاوەکو بتوانێ درۆو چەواشە دەکات و سەدەها ناڕاست ئەداتە پاڵ هەموو کەسایەتیە ئیسلامییەکان و لەکەداریان ئەکات لەوەو پێش و چەند دێڕێك پێش ئێستاش چی زماندرێژیەکی دەکرد بەرامبەر دایکی ئیمانداران و بوغزێنەری دووڕووان عائشە(رضي الله عنها)، بەڵام دواتر وەسفی دەکات بە(خاتوو عائشە) بۆ ئەوەی خوێنەر وا هەست بکات کە هیچ ڕقێکی لەدڵ نەگرتوەو کەسێکی دادپەروەرە و هیچ دەمارگیریەکی نیەو تەنها حەقی مەبەستە!!

بەس ئۆزۆن كە بابەتی حەرام و حەڵاڵ بە گرنگترین شتی ئایین دەزانێ هەر بەڕاستی و مەبەستی چەواشەكاریی نیە، بۆچی تاوەكو ئێستا یەك دێڕیشی نەنووسیوە لەسەر حوكمكردن بە قورئان و كردنی بە دەستوور؟!

نەك ئەوە بەڵكو ئۆزۆن هەر بڕوای بە یاساو حدودی ئیسلامیی نیەو لای وایە كە بۆ ئەم سەردەمە بەكەڵك نایەت، هەروەكو لە هەردوو كتێبی خۆی(لفق المسلمون) و(الاسلام هل هو الحل؟) زۆر جار ئاماژەی بەمە كردووە!!

ئیتر ئەم وتە بەرزو نزمانەی لە چیەو بۆ حەقیقەتی خۆی بەیان ناكات و بە ئاشكرا نالێت هەر بڕوام بە ئیسلام و قورئان نیە، ئەگەر هەر بڕوای بە خوای گەورەش هەبێت!!

## ئیمامی بوخاری و ئاینەكانی دی!!

ئۆزۆن ئەم جارەیان ڕێگەیەكی تری گرتوەتە بەر بۆ ناشرینكردنی فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەم جارەیان بە فێڵێكی ترەوە هاتوەو ئەیەوێ خوێنەرانی چەواشە بكات، بەوەی چەند فەرموودەیەكی هێناوەو ئەیەوێ بڵێ ئاینی ئیسلام بە دیدی بوخاری بەكەڵكی ئەمڕۆ نایەت، هەروەها دەڵێت: "پێغەمبەر بە پێی سەحیحی بوخاری هیچ ئاینێكی تری قەبوڵنەكردووە ئاسمانیەكان و بێجگە لەوانیش" ع: ٨٥، ك: ١٤١

جا خۆشەویستانم وا گومان نەبەن ئۆزۆن مەبەستی ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) شەڕی لەگەڵ كردوون بۆیە جێگەی ڕەخنەیە لەلای، بەڵكو ئۆزۆن دەڵێت ئەوانیش ئەچنە بەهەشت و چۆن ئەبێ پێغەمبەر(ﷺ) بڵێ تەنها ئاینی ئیسلام لای خوای گەورە پەسەندكراوەو تەنها پەیڕەوكارانی دەچنە بەهەشتەوە!!

لەكاتێكدا ئەو حەقیقەتانە لە قورئانیش باسیان لێوەكراوە نەوەك تەنها لەفەرموودەكانی پێغەمبەردا(ﷺ) هتبن و ئەو فەرموودانەش كە ڕەخنەی لێگرتوون ئەمانەی خوارەوەن:

**فەرموودەی یەکەم:**

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلا بِحَقِّ الإِسْلاَمِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ»[1].

دەڵێم: ئەم فەرموودەیە کرداری پێغەمبەر(ﷺ) و مێژووی ئیسلامی ڕوونی دەکاتەوە، کە مەبەست پێی کافرانی قورەیش و ئەوانەبوون کە هێرشیان ئەکردە سەر مسوڵمانان، جا پێغەمبەری خواش(ﷺ) شەڕکردن لەگەڵیانو کوشتنیانی پەیوەست کردوە بە وازهێنان لەشەڕ و دوژمنکاری و مسوڵمانبوونیانەوە، ئەگینا بەو شێوەی کە ئۆزۆن باسی ئەکات هەموو خەڵکی لەژێر هەڕەشەی کوشتنی ئیسلامدابن باشە ئەی جزیە چی بەسەر دێت؟ ئەی ئەو هەموو خەڵکەی تر لە جولەکەو خاچپەرست و بێباوەڕان لە شوێنەکانی تر ماونەتەوەو کەس دەستی بۆ نەبردوون؟

پاشان ئەگەر سەیری هۆکاری جیهاد بکەین لە قورئاندا تەنها بۆ ئەوەیە کە دوژمن هێرشی هێناوە، یان بۆ کەسانێك ڕێگربوون لە بڵاوبونەوەی نووری ئیسلام و نەیانهێشتووە بانگەوازی بۆبکرێت.

هەروەها وشەی(الناس) بەمانای تێکڕای خەڵکی نایەت، چونکە هەر لە زمانی عەرەبیدا ئەم وشەیە بۆ یەك کەس و دوو کەس و زیاتر لەوەو بۆ تەواوی خەڵکیش بەکاردێت، هەر وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ١٧٣ ﴾آل عمران

جا لە وشەی(ٱلنَّاسُ)ی یەکەم مەبەست پێی تاکە کەسێکە ئەویش(نوعەیمی کوڕی مەسعود)ە، هەروەها دووەمیش مەبەست پێی ئەبو سوفیان و هاوەڵەکانیەتی!!

[1] رواه البخاري (١/١٤)، برقم: (٢٥).

جا كەواتە لە زمانی عەرەبیدا ئەم جۆرە گوزارشتە شتێكەو هیچ كێشەیەكی تێدا نیەو لە بەلاغەدا باس دەكرێت و ئەوترێت(عام يراد به الخاص) گۆیەكی گشتگیرەو مەبەست پێی كەسانێكی دیاریكراو و تایبەتە.

دەی كەواتە مانای(أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ..) مەبەست پێی كافرانی قورەیش و هەركەسێكی ترە كە وەكو ئەوانن نەك تێكڕای خەڵكی، چونكە ئەگەر بەوشێوەیەبێت كەسی موسالیم و ئەهلی كتاب(ئەوانەی كە بەجزیە ڕازین) لەژێر زەبری مسولّمان بوون یان شمشێردان كە ئەمەش ژیانی پێغەمبەری خواو هاوەڵانیش ڕەتی دەكاتەوە!

هەروەها خوای گەورە ڕێگری چاكەكردنیشی نەگرتووە لەگەڵیان تاوەكو بگاتە ئاستی كوشتن و لەناوبردنیان، هەروەكو دەفەرموێت: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ۝٨﴾الممتحنة

جا ئەگەر تۆ هەموویان بكوژیت و كەسیان نەهێڵیتەوە ئیتر پێم ناڵێیت چاكە لەگەڵ كێدا دەكەیت؟!

نازانم ئۆزۆن بۆچی چاوی ئەو بابە نابینێت كە پێشەوا بوخاری لە سەحیحەكەیدا دایناوەو دەفەرموێت: (بَابُ إِثْمِ مَنْ قَتَلَ مُعَاهَدًا بِغَيْرِ جُرْمٍ)

واتە: باسی تاوانی كەسێك كە كەسێكی ئەهلی زیممە یان ئەوەی پەیمانی سەلامەتی پێدراوە ئەكوژێت بەبیٚ تاوان.

جا جزیەش پەیمانێكەو نابێت هەرگیز خوێنی ئەوكەسە بڕێژرێت بەبیٚ تاوان و تەنانەت داوای ئەوەشی لیٚ ناكرێت ببێتە سەربازی دوڵەتی ئیسلامی لەشەڕی دوژمنی دەرەكی، تەنانەت دەبێت ماڵ و سامان و خوێن و ئابڕوشی پارێزراوبێت لە ژێر سێبەری خیلافەتدا!!

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَنْ قَتَلَ مُعَاهَدًا لَمْ يَرِحْ رَائِحَةَ الجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا تُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًا»[1].

---

[1] رواه البخاري (٤/٩٩)، برقم: (٣١٦٦).

واته: هەركەسێك پەیمان پێدراوێك بكوژێت بۆنی بەهەشت ناكات، لەكاتێكدا بۆنەكەی لە دووری چل ساڵەوە هەستی پێدەكرێت.

من نامەوێ لەوە زیاتر لەوە بدوێم بەڵام دەڵێم كەسێك سەیری مێژووی مسوڵمانان بكات و كەسێكی دادگەربێت زۆر باش لەو ڕاستیە تێدەگات، یەك نموونە دێنمەوەو دەڵێم تەنها ئەوە بەسە بۆ كەسێك كە بیەوێ تێبگات، ئەویش هەڵوێستی شەیخی ئیسلام ئیبن تەیمیە(ﷺ) كاتێك داوای بەربوونی دیلەكانی ئەهلی زیمەی كرد لە(غازان)ی گەورەی تەتار و ئەویش سەری سوڕما كاتێك داوای دیلە گاورەكانیش دەكات و تەنها داوای ئازادكردنی مسوڵمانەكان ناكات و پێی گووت: ئەی داوای ئازادكردنی ئەوان بۆچی دەكەیت؟

ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: ئەوان لە وڵاتی ئێمەدان و پەیمانی پاراستنیان لەگەردنی ئێمەدایە!!

دوای بیستنی ئەم وتەیەی زانای خواناس ئیبن تەیمیە(ﷺ) ئەوانیشی ئازادكرد.

فەرموودەی دووەم:

عَنْ أَبِي ذَرّ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " أَتَانِي آتٍ مِنْ رَبِّي، فَأَخْبَرَنِي – أَوْ قَالَ: بَشَّرَنِي – أَنَّهُ: مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لاَ يُشْرِكُ بِاللّٰهِ شَيْئًا دَخَلَ الجَنَّةَ " قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ»[(١)].

واتە: كەسێك هاتە لام لەلایەن پەروەردگارمەوە هەواڵی پێدام ـ یان موژدەی پێدام ـ كە: هەركەسێك لە ئوممەتەكەم هاوەڵ بۆخوای گەورە دانەنێت ئەچێتە بەهەشتەوە، وتم: ئەگەر داوێنپیسی و دزیش بكات؟ فەرمووی: ئەگەر داوێنپیسی و دزیش بكات.

ئۆزۆن دەڵێت: "گەر ئوممەتی پێغەمبەر دزی و حیزیش بكەن هەر بەهەشت جێگەو بەشیانە" ع"٨٦، ك: ١٤٣

ئزۆن دەڵێت: "وان زنی أهلها وسرقوا" ع: ٨٦. واتە: زینا لەگەڵ كەسوكاری خۆشی بكات.

دەڵێم: لێرە نامەوێ باسی ئەوە بكەم كە ئۆزۆن ئەوپەڕی عەرەبی نەزان و لاوازەو تەنانەت لە داڕشتنی كتێبەكەی هەڵەی زۆری هەیەو ئەمەشم بەو مەبەستە نەهێناوە بڵێم كە ئۆزۆن(زنی) ی بە "مفرد" هێناوەو(سرقوا)ی بە "جمع" هێناوەو ئەبوو مادام عەتفی كردوونەتە سەر یەك وەكو یەك بیهێنایە یان بە مفردی یاخود بە جەمع[(٢)]!!

بەڵكو بۆ ئەوە هێنام كە بزانن چەندە وشەی بازاڕی بەكارهێناوەو دیسانەوە وەرگێڕیش كردویەتی بە "حیزی"، كە من شەرم دەكەم لە ڕووتان وا گێڕاومەتەوە بەڵام بۆ ئەوە هێناومە تاوەكو ئاستی زمان پیسییان بزانن، باشە خۆ ئەو دوو وشە ناشرینەی ئەمان بەكاریان هێناوە هیچیان لە فەرموودەكەدا نیە، باشە بۆچی ئەم دوو وشەیان هێناوەو بە چی مەبەستێك؟!

---

(١) رواه البخاري (٢/٧١)، برقم: (١٢٣٧).

(٢) كتێبەكەی ئۆزۆن لە دەقە عەرەبیەكەدا چەندین هەڵەی بەلاغی و ڕێزمانی تێدایەو ئەگەر خوای گەورە دەرفەتیداو وەڵامی تاوانی (سیبویه)م دایەوە، ئەوكات لەوێ ئاماژە بە هەڵەكانی ئێرەشی دەكەم بە ویستی خوای گەورە.

هەروەها بۆ ڕاڤەی فەرموودەكەش **دەڵێم:** ئەوەی ئۆزۆن ڕەخنەی لێ دەگرێت حەقیقەتێكی قورئانیەو قورئانیش باسی فەرمووە كە گشت تاوانێك لەگەڵ تۆبەدا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، هەروەكو دەفەرموێت: ﴿ ۞ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥٣ ﴾الزمر

نەك تەنها لێخۆشبوون، بەڵكو فەرموویەتی ئەیگۆڕێت بە چاكەش بۆیان: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ۝٧٠ ﴾الفرقان

هەموو تاوانەكان(بێجگە لە كوفر و شیرك) خوای گەورە بە ویستی خۆیەتی كە سزایان بدات یاخود لێیان خۆش بێت، بەلاٌم ئەو دوانەی تر بەڵێنی داوە كە بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێننەوە، هەروەكو دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ۝٤٨ ﴾النساء

جا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە هەمان شێوەی فەرمووەو مەبەستی ئەوەیە كە ئەو كەسە ئەگەر خوای گەورە لێی خۆش نەبێت ئەوا ئەچێتە دۆزەخەوەو چەندە سزا بخوات سەرەنجام هەر دێتە دەرەوە لە دۆزەخ و تەنها كافرانن بە هەمیشەیی دەمێننەوە لەگەڵ ئەوكەسانەی هاوەڵ بۆخوای گەورە بڕیار دەدەن، چونكە بەهەشتیان لەسەر حەرامكراوە بۆ هەمیشە، هەروەكو دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ۝٧٢ ﴾المائدة

بەلاٌم ئۆزۆن بەشێوەیەك باسی دەكات وەك ئەوەی بلێی هەر ئاساییەو هیچ تاوانێكی لەسەر نیەو هیچ لۆمەیەك شایستەی نیە! لەكاتێكدا من دڵنیام كە ئۆزۆن باش ئاگاداری ئەو سزاو و حەدانە هەیە لە دونیاو قیامەتدا بۆ كەسێك ئەو تاوانانەو هەر تاوانێكی تر ئەنجام بدا، من سەیرم لەوە دێت كە ئۆزۆن كاتێك باسی ڕەجم ئەكەیت ڕەخنە دەگرێت

بەڵام لێرەش هەر ڕەخنە دەگرێت و وا نیشان دەدات كە كەسێك زینا بكات هیچی لەسەر نییە و ئەمەش دژەوانەیەكی ڕوونە، جا بەڕاستی ئەم وتانە تەنها لەكەسێكەوە دێتە دەرەوە كە هیچ دادگەری نەبێت و هیچ بەهایەك بۆ خوێنەرانی دانەنێت!!

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: "ئەو فەرموودەیە پێچەوانەی ئەم فەرموودەیەی ترە: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي مَا وَسْوَسَتْ بِهِ صُدُورُهَا، مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَكَلَّمْ»(١).

ئەم فەرموودەیە باس لەوە دەكات كە كەسێك كارێك یان كردەوەیەك بكات لێپرسینەوەی لەسەرە، بەڵام فەرموودەی پێشوو دەڵێت هەر دەچێتە بەهەشتەوە ئەگەر دزی و زیناش بكات" ع: ٨٦، ك: ١٤٤

دەڵێم: لەكوێی فەرموودەكەدا هەیە كە باسی ئەوە بكات ئەگەر بێت و كەسێك ئەم تاوانانەش بكات لێپرسینەوەی لەسەر نیە، تاوەكو ئۆزۆن وای نیشان بدات نە لێپرسینەوەو نە سزا نییە بۆ ئەو تاوانانە؟!

ئێمەش لە ئۆزۆن و نەیارانی تریش دەپرسین: ئایا كەسێك پیاوێك بكوژێت یان زینا بكات یان دزی بكات و بەحەڵاڵی نەزانێت؟ ئایا بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە یاخود دوای ئەوەی كە سزای ئەو تاوانانەی خوارد دێتە دەرەوە لە دۆزەخ؟!

ئەگەر بڵێن نایەتە دەرەوە لە دۆزەخ ئەوا هەمان وتەی خەواریجە، ئەگەر بڵێن: دێتە دەروە لە دۆزەخ ئەوا دەڵێین: ئیتر ئەم هەرایە لە پێناو چی؟!

پاشان ئۆزۆن ڕەخنە لەم فەرموودەیەی تر دەگرێت: " أَنَّ الجَنَّةَ لاَ يَدْخُلُهَا إِلا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ"(٢).

واتە: بەهەشت ناچێتە ناویەوە تەنها مسوڵمان نەبێت.

بەڵام فەرموودەكە بە تەواوی ناهێنێت ئیتر ڕەنگە مەبەستی ئەوەبێت كە ئوممەتانی پێشووش كەسی ناچێتە بەهەشتەوە، ئەویش ئەمەیە كە لەكەوانەكەدا هاتووە: "(وَالَّذِي

---

(١) رواه البخاري (٣/١٤٥)، برقم: (٢٥٢٨).
(٢) رواه البخاري (٨/١١٠)، برقم: (٦٥٢٨).

نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَذَلِكَ) أَنَّ الجَنَّةَ لاَ يَدْخُلُهَا إِلا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ "

واتە: سوێند بەو كەسەی كە گیانی ﴿محمد﴾ی بەدەستە تكام وایە كە ئێوە نیوەی خەڵكی بەهەشت بن و بەهەشتیش بێجگە لە مسوڵمان كەسی تری تیَ ناچێت.

جا بێگومان هەموو بەهەشت هی ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) نیەو بەڵكو نیوەی بۆ ئەوان دانراوە، بە گوێرەی ڕووكەشی فەرموودەكە، بەمەش وتەی ئۆزۆن بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەگەر بەنیازی ئەوەش بێت بڵێت: هێشتا هەر كەسی تر بێجگە لە مسوڵمان بۆی هەیە لەسەر ئاینی خۆی بمێنێتەوە وەكو(بوزی و جولەكەو..) هەر ئەچێتە بەهەشتەوە، ئەوا دەڵێم ئۆزۆن ڕەتی سەریحی قورئانی كردوەتەوە كە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ۗ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩﴾ ﴾آل عمران

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾آل عمران

جا كاتێك خوای گەورە شتێكی فەرموو، یان پێغەمبەرەكەی(ﷺ) لەبارەی ئاینەوە، ئەوا كەسی ئیماندار بیَ یەك و دوو شوێنی ئەكەوێت و گویَ بەوە نادات كە ئۆزۆن و هاوشێوەكانی چی دەڵێن.

## فەرموودەی سێیەم:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ فِي قُبَّةٍ، فَقَالَ: «أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الجَنَّةِ» قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: «أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الجَنَّةِ» قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: «أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الجَنَّةِ» قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا

نِصْفَ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَذَلِكَ أَنَّ الجَنَّةَ لاَ يَدْخُلُهَا إلا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَمَا أَنْتُمْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ إلا كَالشَّعْرَةِ البَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ، أَوْ كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَحْمَرِ»[(١)]

ئەم فەرموودەیەش هەر دەلالەت لەسەر مانای هەمان فەرموودەی پێشوو دەكاتەوە.

بۆیە هیچی دەستنەكەوتووە بیكاتە ڕەخنەو وا هەستەكەم تەنها بۆ ئەوەی هێنابێت كە قەبارەی كتێبەكەی پێ گەورە بكات، ئەگەر ڕەخنەیەكی بێتامیشی هەبوایە ئەوا بەدڵنیاییەوە وەكو ئەوانەی پێشووی بۆمان ڕوون دەكردەوەو پێمان ئەوت كە ئەمە فەرموودەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) ئەو پێغەمبەرەی كە خوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝٤ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ۝٥ ﴾النجم

پاشان ئۆزۆن فەرموودەیەكی درێژی هێناوە كە لە وەرگێڕانەكەدا(٣) لاپەڕەی بردووەو باسی ئەوە دەكات كەسێك جولەكەبوو پاشان مسوڵمان بوو دوایی هەم بویەوە بە جولەكەو پاشان كەسەكە كوژرا.

ئۆزۆن دەڵێت: ئەمە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیەو ئەبوایە لەكاتی گۆڕینی ئاینەكەشی لەوكاتەی كە لە جولەكەوە گۆڕی بۆ ئیسلام هەر بكوژرایە چونكە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ) واتە: هەركەسێك ئاینەكەی گۆڕی بیكوژن([٢])!!

جا من پێش ئەوەی وەلامی ئەم وتەیەی بدەمەوە دەڵێم: ئەو كەسەی كە جولەكەبوو پاشان مسوڵمان بوو دوای ئەوە هەم بویەوە بە جولەكە، وەكو پێشەوا ئیبن حەجەر(ﷺ) دەفەرموێت(٢٠) دانە شەو بانگەوازیان كرد[(٣)].

جا بەدڵنیاییەوە كەسێك كە ئەبو موسای ئەشعەری(٢٠) شەو دانیشێت و بانگەوازی بكات لەكاتێكدا كاربەدەستی بالایەو لەشوێنی سەرۆكێكی ئەمرۆی ولاتێكە( دووربێت

---

[(١)] رواه البخاري (٨/١١٠)، برقم: (٦٥٢٨).

[(٢)] ع:٨٨، ك:١٤٨

[(٣)] فتح الباري (١٢/٢٧٥).

لەوەی بیچوێنین بە دزو جەردە)دیارە كە زۆر بایەخیان پێی داوەو ئەگەر هۆكارێكی گرنگ نەبێت لـە كوشتنیدا هەرگیز كەسێك هێندە بەنرخ بێت و ڕێزی بگیرێت و هێندەی كات بۆ تەرخان بكرێت ئەوا بە هیچ شێوەیەك هەروا بیٚ هودە خوێنی نارژێت!!

جا بۆ ئەوەی كە ئۆزۆن دەڵێت: (مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ). بۆ هەموو ئاینەكانە و هەركەسێك هەر ئاینێكی هەبێت و بیگۆڕێت فەرموودەكە وا ئەخوازێت بیگرێتەوەو بكوژرێت.

پێكەنینم هات بە هەمان پێكەنین كە بۆ شەیخێكی "موفتین" نەك "موفتی" لـە ئەزهەر هەمان فەتوای دا بەحەڵاڵكردنی خوێنی ئافرەتێكی گاور كە مسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، و پشتی بەهەمان فەرموودە بەستبوو، وا دیسانەوە نەزانێكی تری وەكو ئۆزۆن هەمان ڕێچكە ئەگرێتەوەو هەمان قسە ئەكات!!

ئەوەی لـەفەرموودەكەدا هاتووە ئەوەیە كوفر هەمووی یەك میلـەتەو هەمووی بە ئاین دانانرێت و ئاین تەنها ئاینی حەق و ڕاستە وەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ .. ١٩ ﴾آل عمران: ١٩

جا كەواتە هیچ ئاینێك پێی ناوترێت ئاین بەومانایەی لـە شانی ئیسلامدایەو ڕاستە، چونكە حەق و ڕاستی نیە، هەروەكو چۆن ئێمە دەڵێین: (لا إلهَ إلاّ اللهُ) واتە: هیچ پەرستراوێك نییە جگە لـە(الله) ئایا هەر بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نییە جگە لـە(الله) ئەوەتا ئێمە چەندین پەرستراو ئەبینین كە ئەپەرسترێن لـە غەیری خوای گەورە!!

مەبەستی لـێی ئەوەیە هیچ پەرستراوێك نییە شایستە پەرستن بێت جگە لـە(الله)!!

هەروەها كاتێك ئەوترێت(من بدلَّ دینَهُ) واتە: ئەو كەسەی ئاینی حەق دەگۆڕێت كە ئیسلامە، نەوەك هەموو ئاینەكانی تریش ئەگەر كەسێك گۆڕی هەمان حوكمی هەبێت،

جا لێرەدا ئەمە تەنها هەڵوەشاندنەوەی گومانی بەدی ئۆزۆن و هاوبیرانی بوو بەڵام كوشتن و نەكوشتنی مورتەد هەڵەگرین بۆ كات و ساتی خۆی[1]!!

---

[1] بابەتی كوشتن و نەكوشتنی مورتەد لێرەدا قسەی لەسەر ناكەم و بە ویستی خوای گەورە بەم نزیكانــە هــەوڵی بابەتێكی تێرو تەسەل ئەدەم لەسەری.

**فەرموودەی پێنجەم:**

بەڕاستی زۆرم پێ سەیرە ئۆزۆن ئەم فەرموودەیە دێنێت کە تێیدا هاتووە: کەسێك گاور بووەو مسولمان بوە پاشان هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام و بوەتەوە بە گاور، دوای ئەوە گاڵتەی بە پێغەمبەر(ﷺ) کردوەو سووکایەتی پێ کردووە و گاڵتەی بە ئیسلام و مسولمانان کردووە و پێغەمبەری خواش(ﷺ) دووعای لێ دەکات کە خوای گەورە بیکاتە پەند بۆ هەموو خەڵکی و خوای گەورەش دووعاکەی وەڵام دەداتەوە، هەروەکو هاتووە[1]: عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ نَصْرَانِيًّا فَأَسْلَمَ، وَقَرَأَ البَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ، فَكَانَ يَكْتُبُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَعَادَ نَصْرَانِيًّا، فَكَانَ يَقُولُ: مَا يَدْرِي مُحَمَّدٌ إِلا مَا كَتَبْتُ لَهُ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ فَدَفَنُوهُ، فَأَصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الأَرْضُ، فَقَالُوا: هَذَا فِعْلُ مُحَمَّدٍ وَأَصْحَابِهِ لَمَّا هَرَبَ مِنْهُمْ، نَبَشُوا عَنْ صَاحِبِنَا فَأَلْقَوْهُ، فَحَفَرُوا لَهُ فَأَعْمَقُوا، فَأَصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الأَرْضُ، فَقَالُوا: هَذَا فِعْلُ مُحَمَّدٍ وَأَصْحَابِهِ، نَبَشُوا عَنْ صَاحِبِنَا لَمَّا هَرَبَ مِنْهُمْ فَأَلْقَوْهُ، فَحَفَرُوا لَهُ وَأَعْمَقُوا لَهُ فِي الأَرْضِ مَا اسْتَطَاعُوا، فَأَصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الأَرْضُ، فَعَلِمُوا: أَنَّهُ لَيْسَ مِنَ النَّاسِ، فَأَلْقَوْهُ"[2].

جا ئۆزۆن ڕەخنەی لەم فەرموودەیە هەبێت کەواتە شەرعیەت ئەدات بە هەموو ئاینەکان و پێی وایە مرۆڤ سووکایەتی بە خوای گەورەو قورئانیش بکات هەر کێشەی نیەو بەهەشتیە، چونکە لە دەقی فەرموودەکەدا هاتووە کە ئەو پیاوە گاڵتەی بە قورئان کردوەو وتویەتی ﴿محمد﴾ هیچ شتێك نازانێت ئەوە نەبێت من بۆم نووسیوەتەوە!!

وا ئەبینن کە ئۆزۆن سنووری بۆ هیچ شتێك نەهێشتوەتەوە بە ناوی ڕەخنەگرتن لە ئیمامی بوخاری و تەنها ئیسلامی بەدڵ نیەو تەنها حەزی بە قورئان نیە، تەنها پێغەمبەری خوا محمد(ﷺ) ی بەدڵ نیەو تەنها گاڵتە بە هاوەڵەکانی ئەو دەکات(رضي الله عنهم) و تەنها زانایانی

[1] ع:٨٨ ـ ٨٩، ك: ١٤٩

[2] رواه البخاري (٢٠٢/٤)، برقم: (٣٦١٧).

ئیسلامن كە بەلای ئۆزۆنەوە خەڵكانی دواكەوتوو هیچن و ئیتر هەموو خەڵكی باشن و پێشكەوتوو زانستخوازن!!

## فەرموودەی شەشەم:

ئۆزۆن ئەو فەرموودە درێژە دێنێت كە خوای گەورە فەرمان بە ئادەم(عليه السلام) دەكات كە بەشی ئاگری دۆزەخ دەربكات لە نەوەكانی و جیایان بكاتەوە، و ئەویش ئەوفەرموودەیە:

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " يَقُولُ اللَّهُ: يَا آدَمُ، فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، قَالَ: يَقُولُ: أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ...»[١]

ئۆزۆن هەندێك ڕەخنە دەگرێت و دەڵێت: نازانین بۆچی ئادەم نەك خەزنەداری دۆزەخ یان میكایل نا" ع: ٨٩، ك: ١٥٢

جا توخوا ئەمە ڕەخنەیە؟ خۆ ئەگەر ڕەخنەی وا بگرێت هەزاران ڕەخنە دەگیرێت لە هەموو شتێك ئەی بۆچی ئەوە نا ئەی بۆ ئەوە؟

منیش ئەپرسم لە ئۆزۆن ئەی بۆ زەبانیە نەبێت یان ئیسرافیل نەبێت یان ...، ئەمانە هەمووی وتەی بێ بنەمان و خوای گەورە پێی ناوترێت بۆ وا دەكەیت و بۆ وا ناكەیت و كەس ناتوانێت پەی بە زانستی خوای گەورە بەرێت، هەرچەندە هەندێك حیكمەتی دیارە لە ئێمەوە، بەڵام هەرچیەك بڵێین: دەبێت كۆتاییەكەی هەر(والله أعلم) و تەسلیم بوون بێت.

پاشان لەبارەی(الرقمة)وە دەڵێت[٢]: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەسفی ئێمەی كردووە بە پێی ئەم فەرموودەیە بە تاڵە مویەكی سپی لە گایەكی ڕەشدا یان(الرقمة) پەڵەیەكی سپی بچوكە لە قاچی گوێدرێژێكدا، پاشان دەڵێت: ئەمە تانەیەو زانایانیش ڕوویان نایە باسی بكەن!

دەڵێم: ئەم وێكچواندنە هیچ كێشەیەكی تێدا نییە بۆ كەسێك شارەزای زمانی عەرەبی بێت، چونكە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت ئەو دوو شتە چەندە بچووكن ئێوەش هێندە كەمن

---

[١] رواه البخاري (٨/١١٠)، برقم: (٦٥٣٠).

[٢] ع:٩٠، ك: ١٥٢

لە ناو ئوممەتەكانی تردا كە ئەچنە دۆزەخەوەو مانای وا نییە كە ئەوان ئەو تاڵە موەبن یاخود ئەو پەڵە سپیەی قاچی گوێدرێژ، چونكە كاتێك دوو شت كە ئەچوێنرێن بە یەك لە هەموو ڕوویەكەوە ناچوێنرێن بە یەك لەهەموو ڕویەكەوە، ئەم جۆرە وێكچواندنە وەكو لە زانستی بەلاغەدا باس دەكرێت پێی دەوترێت: (تَشبيهٌ مِنْ وَجْهٍ). واتە وێكچواندن لە یەك ڕووەوە.

بۆ نموونە كاتێك بە كەسێك دەڵێیت: لە مانگ دەچیت! باشە خۆ مانگ بێ عەقڵەو بێ گیانیشە، مانای وایە ئەو كەسە بێ عەقڵیشە؟! نەخێر تۆ لەیەك ڕووەوە مەبەستە كە جوانی و ڕووناكیە، واتە تۆ وەكو مانگ جوانیت.

جا بە هەمان شێوەش لەم نمونەیەدا واتە ئێوە وەكو ئەو تاڵە موە كەمن یاخود وەكو ئەو پەڵەیە كەمن لە چاو ئوممەتەكانی تر‌داو كەمێك لە ئێوە ئەچنە دۆزەخەوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم وێكچواندنەشی ڕەنگە لەكاتێكدا كردبێت كە خەڵكێكی دەشتەكی لەوێدا ئامادەبوبێتن و تەنها لەو شتانە تێبگەن كە لەچواردەوریانەو وا بخوازێت نموونە بەو شتانە بهێنرێتەوە كە ئەوان لێی تێدەگەن، ئیتر ئەویش ئەو وێكچواندنەی كردبێت بۆ تێگەیشتنی ئەوان، یان هەر هۆكارێكی تر كە ئۆزۆن هەر خۆی بەگەورە دەزانێت بەرامبەر هەموو دەقێك و هیچ ئەگەرێك بۆ ڕاستی و دروستیان ناهێڵێتەوە و هیچ مەودایەكیش ناهێڵێتەوە بۆ بەرامبەرەكەی و وانابینێت كە حەقیان لەلابێت، ئیتر من بڵێم چی بە كەسێكی وەكو ئەو كە هیچ شارەزاییەكی بە زمان و بەلاغەی عەرەبی نیەو تێگەیشتنی وەكو پێویست نیە، سەرەڕای ئەمانەش بە ڕاست و چەپدا ڕەخنە دەگرێت؟!

ئێستا كاتی ئەوەیە بپرسین: ئۆزۆن ئەم ڕەخنەیەی گرت و وتی ئەمە گونجاو نیەو زانایان ئێستا ڕوویان نایە باسی ئەمە بكەن و ئێمەی پێ بچوێنن، ئەی باشە ئێستا ئێمە مافی خۆمانە بپرسین چۆن ئۆزۆن پێغەمبەری خوای(ﷺ) چواند بە گورگ؟! ئایا ئەمە ئەوپەڕی بێ ئەدەبی نیە؟ چونكە ئۆزۆن وا ئەزانێ كە هەر شتێك چوێنرا بە شتێكی تر ئەوا لە هەموو ڕوویەكەوە وەكو یەكن و نابێت بەكاربێت وەكو لە ڕەخنەكەیدا بەدیار كەوت، ئەی باشە خۆی چۆن كاتێك باسی كوشتن و كۆمەڵێك بابەتی كرد وتی:

"ئەمانە کۆمەڵە کارێکن دەبێت مسوڵمانان جارێکی تر و سەرلەنوێ چاوپیاخشاندنی بۆ بکەن و ئەم شتانە ڕەت بکرێنەوەو بیر لەوە نەکەنەوە کە بیدەنە پاڵ پێغەمبەر(د.خ) کە هێندەی **گورگەکەو خوێنی یوسف** بێبەرییە لێیان" ع: ۷۲، ك: ۱۱۸

جا ئێستا ئۆزۆن حوکم لەسەر ئۆزۆن دەدات بەوەی کەسێکی بێ ئەدەبە بەرامبەر پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) و ئەوپەڕی سنووری بەزاندووە.

فەرموودەی حەوتەم:

وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «رَأَيْتُ عَمْرَو بْنَ عَامِرِ بْنِ لُحَيٍّ الخُزَاعِيَّ يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ وَكَانَ أَوَّلَ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ»[1].

فەرموودەكە باس لەوە دەكات كە عەمری كوڕی لوحەی لە ئاگری دۆزەخدایە لەبەر ئەوەی یەكەم كەسبووە كە ئاژەڵی بەرەڵاكردووە بۆ بتەكان(وەكو پەرستشێك بۆیان و ئیتر كەس بۆی نەبووە سەریانبڕێت و بەكاریان بهێنێت).

سەیر نەبێت لەلات كە ئۆزۆن دڵی بۆ عەمری كوڕی عامری كوڕی لوحەی ئەسوتێ چونكە ئەو بەس ڕقی لە پیاوچاكان و بۆخوا سوڵحاوانەو بۆ كەسی بێباوەڕو خوێنڕێژیش خەریكی شین و ڕۆڕۆیە!!

كەسێك كە بێباوەڕبێت و بڕوای بە خوای گەورە نەبێت و یەكەم كەسبێت جۆرێك لە پەرستشی بۆ غەیری خوای گەورە داهێنابێت و خەڵكی گومڕاكردبێت وەكو لە فەرموودەكەدا دیارەو لە فەرموودەی تریشدا هاتووە كە یەكەم كەس بووە بتی هێناوەتە چواردەوری كەعبەو دایناوەو دینی پێغەمبەر ئیسماعیلی گۆڕیوەو لەبری تەوحید شیریكی هێناوە[2].

ئۆزۆن خۆشی باسی ئەمانە هەمووی دەكات، بەڵام نازانم ئەم دەنگ بەرزكردنەوەو هات و هاوار و شین و ڕۆڕۆیەی لە چیە بۆ كەسێك كە سەرچاوەی كوفرە بەرامبەر خوای گەورەو ئاینی یەكتاپەرستی گۆڕیوەو بتی هێناوەتە شوێنەكەی؟!

---

[1] رواه البخاري (٤/١٨٤).

[2] مسند البزار(١٥/٣٨٤)، برقم: (٨٩٩١)، فتح الباري لابن حجر (٦/٥٤٩)، عمدة القاري للعيني (١٦/٩٢)، إكمال المعلم بفوائد مسلم (٣/٣٤٢).

ئۆزۆن دەڵێت: "بەپێی ئەم فەرموودەیەی ئەبوهورەیرە ئەوەی كە "هیندۆسە بەڕێزەكان"[1] دەیكەن لەوەی كە ئاژەڵ وازی لێبهێنرێت و نەدۆشرێت و كەڵكی لێ وەرنەگیرێت، ئەوا ئەوانیش دەچنە دۆزەخ" ع: ٩٠، ك: ١٥٢

دەڵێم: پێم سەیرە ئۆزۆن چۆن ڕێگا بە مانگا پەرستیەكەی هیندۆس دەدات و جەرگی ژان دەكات بۆیان، و ڕەخنە دەگرێت لەكەسێك بلێت كارەكەیان كوفرە، لەكاتێكدا شتی خراپ نەما نەیداتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی(رضي الله عنهم) ؟!

وادیارە ئۆزۆن هەموو ئاینێكی قەبوڵەو ڕێزیشی هەیە بۆ شوێنكەوتوانی تەنها ئیسلام و هەڵگرانی نەبێت!!

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: " دواجار خوێنەری بەڕێز دەبێت ئەوە بزانێت كە ئەم عەمرەی ئاوا هەڕەشەی لێكراوە لە ناو عەرەبدا گەورەترین ناو و ناوبانگی هەبوە، بە جۆرێك كە هیچ عەرەبێك پێش ئەو و دوای ئەویش لە سەردەمی نەفامیدا ئەوەندە ناوبانگی نەبوەو زۆر بەقەدر و گەورەبووە، تەنانەت قسەكانی و كارەكانی وەك دین خەڵك وەریگرتوەو نەدەكرا سەرپێچی لێبكرێ، یەكەم كەس بووە بتی لەدەوروبەری كەعبە داناوە" ع: ٩٠، ك: ١٥٣

دەڵێم: ئۆزۆن ئەیەوێ یەكەم خاڵ باسی ئەوە بكات كە عەمر كەسێكی گەورەبوەو چۆن ئەبێت بچێتە دۆزەخ، چونكە ئەم دەستەواژەیە(دواجار خوێنەر..) بۆ وەئاگاهێنان دێت لە هەواڵێكی ناڕاست یان حوكمێكی ناحەق دەرحەق بە كەسێك!!

باشە ئۆزۆن دان بەوەدا دەنێت كە بتپەرست بوەو بڕوای بە خوای گەورە نەبووە بە تاك و تەنها، چۆن لاوانەوەی بۆ دەكات و ڕەخنە لەوە دەگرێت كە بوترێت لە ئاگردایە؟!

هەروەها ئەمەوێ ئاماژە بەوەش بكەم ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی ئەو عەمرەی نەكردایە هەرگیز ناوی نەدەكەوتە نێو ناوان و كەسیش نەیدەناسی، بەڵكو ئۆزۆن هەستاوە بە دروستكردنی ئەم هەموو وتە درۆیە بۆ ئەوەی خوێنەر بەرەو هەڵدێر بەرێت، جا

---

[1] نووسینەكەی وەرگێڕمان نەهێنا چونكە وشەی بەڕێزەكانی لادابوو (السادة الهندوس) ئیتر بە چی مەبەستێك؟ نازانم!!

ئەوانەی کە لەناو عەرەبدا ناوبانگیان هەبووە، هەروەکو حاتەمی تائی بۆ سەخاوەت و چەندین کەسایەتی تر کە دەماو دەم عەرەب باسی کردوون و لە کتێب و دیوانەکاندا کارەکانیان تۆمار کراوە!!

ئەی ئۆزۆن نایەت پێمان بڵێت: "عەمری کوڕی لوحەی" ئەو پیاوە مەشهورە کێ باسی کردوەو لە کوێدا هێندە باسکراوە تاوەکو کەس لە پێش خۆیی و دوای خۆشی هێندە ناوبانگی نەبووە؟! ئێوە هەمووتان "موعەلەقات"ی "سەبع" یان "عەشر"تان بیستووە، ئەگەر ناوی خاوەنەکانیشیان نەزانن، بەڵام پێم نالێن کامتان ناوی ئەو کابرایەتان بیستوەو دەزانن کێیە؟ ڕەنگە کەسێك بڵێت ئاخر ئەو لەسەردەمی جاهیلیدا ناوی هەبووە، دەڵێم: زۆر بێ مانایە کە حاتەمی تائی لە سەردەمی جاهیلیدا هێندەی عەمر ناوبانگی نەبوبێت و ئێستا هەموو خەڵكی حاتەم بناسێت کەسیش عەمر نەناسێت!!

جا ئەمەوێ ئەوەش بڵێم کابرا با بۆ خۆی ناوبانگی هەبوبێت، خۆ هێندەی "ئیمروئولقەیس"ی شاعیر ناوبانگی نەبووە، ئایا ئەو ناوبانگە ڕزگاری دەکات ئەگەر کەسێکی بێباوەڕبێت؟!

وابزانم ئۆزۆن پێویستی بەوەیە خولێك ببینێت بۆ شارەزابوو لە مانای(لا إلـه إلاّ الله)، پێش ئەوەی دەم بکوتێ لەم شتانە!!

پاشان ئۆزۆن هەر بەوەوە ناوەستێ و دەڵێت:

"وەك لە هەندێك فەموودەی نێو "سەحیحی بوخاری"دا هاتووە بەهەشت تەنها موڵکی مسوڵمانانەو ئیدی تەواوی دینەکانی وەك(جولەکە، گاور، هیندۆسی، بودایی و...تاد) تەنها خودا خۆی دەزانێ کە چ حاڵێکیان دەبێ، بەڵام ئەوەندە هەیە چاویان بەبەهەشت ناکەوێ. دیارە ئەو بەهەشتەی تەنهاو تەنها بوەتە موڵکی باوەڕدارە ئیسلامەکان بە پێی سەحیحی بوخاری" ع: ٩٠، ك: ١٥٣

دەڵێم: نازانم ئۆزۆن چی دەکات لەو ئایەتانەی کە باسی ئەوە دەکات کە موشریك و کافران بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێننەوەو هەرگیز ناچنە بەهەشتەوە؟ یان تۆ بڵێی هەر بیستبێتی؟

ئێمە لەوەو پێش هەندێك بەڵگەمان لە قورئانی پیرۆز هێنایەوەو ئەوەندەش بەسە بۆ ئەوەی بزانین كە شەرِی ئۆزۆن لەگەڵ قورئان و ئیسلامدایە نەوەك فەرموودەو پێشەوا بوخاری!!

پاشان ئۆزۆن بەڵگە بەم ئایەتە دێنێتەوەو دەڵێت هەموو ئەمانە ئەگەر كردەوەی باش بكەن لەگەڵ ئیماندا ئیتر هیچ ترس و بیمێكیان لەسەر نیە، واتە ئەچنە بەهەشتەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾البقرة

دەڵێم: تەفسیری ئەم ئایەتەی بە كەیفی خۆی كردووەو بە ئاقارێكیدا بردووە كە هەرگیز هەڵناگرێت، ئەم ئایەتە باس لە هەریەكێك لەمانە لەسەردەمی خۆیاندا دەكات و كاتێك كە پێغەمبەری خوا محمد(ﷺ) نەهاتبوو، لەوكاتەدا هەركەسێكیان بڕوای بەخوای گەورەو دوارِۆژ هەبوبێت و كردەوەی باشی ئەنجامدابێت ئەوا ئەچێتە بەهەشتەوەو هیچ ترس و بیمێك نایگرێتەوە، بەڵام دوای هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) تاكە ئاینی وەرگیراو لای خوای گەورە تەنها ئیسلامە، هەروەكو دەفەرمویت: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ۗ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩﴾ ﴾آل عمران

جا رِەنگە هەندێك كەسی نەخۆش بڵێن(وتوشیانە): ئیسلام هەر ئاینێكی ئاسمانی دەگرێتەوەو هەركەسێك شوێن یەكێكیان بكەوێت ئیتر هیچ لۆمەو سزایەكی لەسەر نیە!

بەڵام ئەوان ئەگەر لە ئایەتی دوای خۆی تێرامانایە ئەوكات ئەیانزانی كە مەبەست پێی ئەو پەیامەیە كە پێغەمبەری خوا محمد(ﷺ) هێناویەتی، هەروەكو خوای گەورە رِاستەوخۆ رِووی خیتابی تێ دەكات و دەفەرموێت: ﴿ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ ۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسْلَمْتُمْ ۚ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ ٱهْتَدَواْ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠﴾ ﴾آل عمران

جا ئەمە بەڵگەیەكی زۆر بەهێزە لەخودی ئایەتەكەدا بۆ تەفسیر و رِاڤەی ئیسلام!!

هەروەها خوای گەورە بەم ئایەتەی تر ئاینی حەقمان بۆ دیاری دەكات و پێمان دەڵێت كە یەهود و نەسارا لـەسەر ئاینی ئیبراهیم و میلـەتەكەی نەماون: ﴿ مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾آل عمران

جا ئەگەر جولـەكەو بەناو مەسیحیەكان لـەسەر ئاینی ڕاست نەمابن و لـێیان وەرنەگیرێت، ئەبێ حاڵی ئاینە دەستكردەكان چیبن؟!

هەروەها خوای گەورە پەیامەكەی خۆشەویستمانی(ﷺ) كردووە بە پەیامێك بۆ هەموو جیهان و كردویەتیە موژدەدەر و ترسێنەریان هەروەكو دەفەرمویت: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ﴾الفرقان

هەروەها دەفەرمویت: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾سبأ

باشە ئەگەر بێت و هەموو ئەو ئاینانەی تر ڕەوابێت شوێنكەوتنیان و هیچ كێشەیەكی تێدا نەبێت، ئیتر پێم نالـێن مانای ناردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەموو جیهان چی مانایەكی هەیە؟!

جا ئەوەی سەیرە ئۆزۆن شێنی بتپەرستیشی ئەكرد و تەنها ئاینە ئاسمانیەكانی نەهێناوە كە دروستە شوێنیان بكەویت بەڵكو فەلسەفەی(بوزا)[1] و ئاینی(هیندۆس)یشی هێناوە كە ڕەوایە شوێنكەوتنیان و هیچ كێشەیەكی نیە!!

## پێشەوا بوخاری و فەرمانڕەوایەتی و هاوەڵان!

ئۆزۆن ڕەخنە دەگرێت لـەوەی كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ئیمامەت و دەسەڵاتداری بۆ قورەیشەو دوو فەرموودە دێنێت[2]:

---

[1] بوزاو تێڕوانینەكانی بۆ چەمكی خـودا، وادەخوازێـت بلـێین: فەلسـەفەیە نـەك ئـاین، چـونكە ئـەو بـڕوای بەخودایەك نەبوەو خۆشی بە خودا دانەناوە، بـەڵكو دوای خـۆی بـە كۆمـەڵێك قۆتـاغ شـوێنكەوتوانی هـاتن و هەندێك بابەتیان بۆ زیاد كرد.

[2] ع: ٩٤ ـ ٩٥، ك: ١٥٨ ـ ١٦١

**فەرموودەی یەکەم:**

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: "النَّاسُ تَبَعٌ لِقُرَيْشٍ فِي هَذَا الشَّأْنِ، مُسْلِمُهُمْ تَبَعٌ لِمُسْلِمِهِمْ، وَكَافِرُهُمْ تَبَعٌ لِكَافِرِهِمْ"(١).**

لە بارەی ئەم فەرموودەوە دەڵێت: " ئەبوهورەیرە ئەیەوێ ئەوەمان پێ بڵێ كە قورەیش لە پێش ئیسلامدا پلەو پایەیان بەرزبوەو پێویستە لە ئیسلامیشدا بەهەمان شێوە پلەو پایەیان بمێنێتەوە"

**دەڵێم:** ئۆزۆن ئەیەوێ هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە ناشرین بكات و وای نیشان بدات كە ئەو هاوەڵە خۆشەویستە(رضي الله عنه) ئەم فەرموودەی دروست كردوەو هی باخەڵیەتی ئەمە لە كاتێكدا ئەو بەتەنها نییە كە ئەم فەرموودەی گێڕابێتەوەو هاوەڵانی تریش گێڕاویانەتەوە كە پێویستە دەسەڵاتداری لە ناو هۆزی قورەیشدابێت، هەروەكو پێشەوا ئەبو بەكرو عومەری كوڕی خەتتاب و عبدالله ی كوڕی مەسعود و چەندین هاوەڵی تریش گێڕاویانەتەوە.

ئەم بابەتە ئیجماعی زانایانی لەسەربوەو بێجگە لە خەواریج و هەندێك لە موعتەزیلەو چەند زانایەكی كەم تێكڕا لەسەر ئەوەن كە دەبێت خەلیفە قورەیشی بێت، هەر وەكو ئیمامی حەرەمەین دەفەرموێت: "بێجگە لە زیراری كوڕی عەمر هیچ كەسێك خیلافی نەبووە لەوەی كە پێویستە خەلیفە قورەیشی بێت"(٢)

پاشان دەفەرموێت: "ئێمە نازانین ئەو مەرجە بۆچی دانراوەو لێی تێ ناگەین، بەڵام خوای گەورە ئەم پلەیە بەرزەی داوە بە كەس و كاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەوەش بەخششی خوای گەورەیەو ئەیداتە هەر كەسێك كە خۆی بیەوێت"(٣)

---

(١) رواه البخاري (٤/١٧٨)، برقم: (٣٤٩٥).

(٢) غياث الأمم في التياث الظلم لإمام الحرمين، ص: (٢٥٦)، ت: د.عبدالعظيم الديب، دار المنهاج ـ المملكة العربية السعودية ـ ط: الثالثة/١٤٣٢هـ.

(٣) سەرچاوەی پێشوو: لا (٢٥٨).

بە هەرحاڵ ئەوەی کە زانایان فەرموویانە دەبێت خەلیفە قورەیشی بێت و ئەوەش بەخششێکی خواییەو داویەتی پێیان، دەکرێت بەو شێوەیەبێت و خوای گەورە تایبەتی کردبن پێی، یان دەکرێت بوترێت:

هۆکاری قورەیشی بوون دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەوکاتەدا قورەیش بەهێزبوون و گوێڕایەڵێکراوبوون، هەروەکو لەم فەرموودەیەدا بە ڕوونی بەدیار دەکەوێـ کاتێك دەفەرموێت: " مُسْلِمُهُمْ تَبَعٌ لِمُسْلِمِهِمْ، وَكَافِرُهُمْ تَبَعٌ لِكَافِرِهِمْ ".

واتە: کافریان شوێ، کافریان دەکەوێت و موسوڵمانیشیان شوێنی مسوڵمانیان.

وەك دەبینین تەنها نەبەستراوەتەوە بە سیستەمی خیلافەتی ئیسلامیەوەو ئەوەتانێ دەفەرموێت کافرانیشیان شوێن کافرانیان دەکەون و قورەیشیان لەلا پەسەندە.

لێرەوە ئەوە بەدیار دەکەوێت کە ماناى وا نییە تاوەکو قیامەت هەر وائەبێت و ئەگەر نەخوێندەوارێکی قورەیشی هەبوو پێشی بخەین بەسەر زانایەکی غەیرە قوریشیداو، ئەمڕۆش لەهەموو دنیادا بەوشێوەیەو نەك پشت و پەناو هێز و دەسەڵات بەڵکو ئەوەش ئەخوێنرێتەوە لە ڕواڵەت و قیافە بۆ سەرۆك ولاّت و بۆ نموونە کەسێك ناکەنە کاربەدەست کە کەم ئەندام بێت یان جۆرێك لەجۆرەکان تەواو نەبێت، جا مەرجی ناوبانگ و قسە ڕۆیشتویی لەوکاتەدا مەرجێکی زۆر گرنگ بووەو لە ئەمڕۆشدا هەوڵی ئەوە ئەدەن کە کەسێکی وەهابێت دەنگی پێ بدرێت لەو ولاّتانەی سیستەمی پەرلەمانی بەڕێوە دەچێت.

سەرەڕای ئەوەی کە هەندێك لەزانایان[1] ڕایان وابووە کە ئەم فەرموودانە وەکو هەواڵەو دەفەرموێت لەو سەردەمەدا خیلافەت و بەڕێوەبردنی ولاّت لەلایەن قوڕەیشەوەیەو نەك فەرمانبێت بەوەی کە ئەبێ قوڕەیشیەکان حوکم بکەن بۆ هەمیشە، ئەمەش هەواڵێکی ڕاست و دروستی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) کە وەکو خۆی هاتوەتە دی و وەکو بینیمان خیلافەت هەر لە ناو قوڕەیشدا مایەوە تاوەکو ئەو سەردەمەی کە دانرابوو بۆ خیلافەت و سەردەمی پادشایەتی نەهاتبووە کایەوە.

---

[1] هەروەکو دکتۆر "حاکم"یش ڕای وایە.

هەندێكی تریش لە زانایان وەكو ئیبن خەلدون كە لە بابەتەكە دواوەو پێی وایە كە مەرج نییە لە هەموو كاتێكدا قورەیشی بێت و ئەیداتە پاڵ قازی ئەبو بەكری باقەلانیش[١].

فەرموودەی دووەم:

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: «لاَ يَزَالُ هَذَا الأَمْرُ فِي قُرَيْشٍ مَا بَقِيَ مِنْهُمُ اثْنَانِ»[٢].

جا ئەم فەرموودەو تەواوی فەرموودەكانی تریش كە باسی قورەیش دەكەن بۆ ئیمامەت هەر ئەوەیە بۆچونمان(والله أعلم).

لێرەش مەبەست پێی ئەوەیە تاوەكو دوانیان بمێنێ كە شیاوی ئەو كارەبن و بەوشێوەیەش بوو كە پێغەمبەری خوا(ﷺ)هەواڵی پێدابوو.

پاشان ئۆزۆن فەرموودەیەكی تر دێنێت وەكو ڕەخنەو ئەویش[٣]

فەرموودەی سێیەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ أَطَاعَ أَمِيرِي فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ عَصَى أَمِيرِي فَقَدْ عَصَانِي»[٤].

واتە: هەركەسێك گوێڕایەڵی من بكات ئەوا گوێڕایەڵی خوای گەورەی كردووە و هەكەسێكیش سەرپێچی من بكات ئەوا سەرپێچی خوای گەورەی كردووە،

---

[١] پێشەوا ئیبن خەلدون زۆر بە وردی باسی ئەم لایەنە دەكات و دەتوانن بگەڕێنەوە سەری.مقدمة ابـن خلـدون، ص: (٢٢٦-٢٢٧)، اعتناء و دراسة: أحمد الزعبـي، شركة الأرقم بن أبي الأرقم، بيروت، لبنان، بدون سنة النشر ورقم الطبعة.

[٢] رواه البخاري (٩/٦٢)، برقم: (٧١٤٠).

[٣] ع: ٩٦، ك: ١٦٢

[٤] رواه البخاري (٩/٦١)، برقم: (٧١٣٧).

هەركەسێكیش گوێڕایەڵی پێشەواكەی بكات ئەوا گوێڕایەڵی منی كردووەو هەركەسێكیش سەرپێچی كاربەدەستەكەی بكات ئەوا سەرپێچی منی كردووە.

دەڵێم: ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ)ڕاستەوخۆش بیفەرمواية هەركەسێك گوێڕایەڵی كاربەدەستەكەی كرد گوێڕایەڵی خوای گەورەی كردووەو ئەگەر سەرپێچیشی كرد سەرپێچی خوای گەورەی كردووە، ئەوا هیچ نەنگیەكی تیادا نەبوو، چونكە خوای گەورە فەرمانی كردووە بە گوێڕایەڵیان هەروەكو دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ... ﴿٥٩﴾ ﴾النساء

نازانم ئۆزۆن بۆچی ئەم ڕەخنەیە دەگرێت لەكاتێكدا خوای گەورە واجبی كردووە گوێڕایەڵیان؟!

بەڵێ كاربەدەستانی وڵات پێویستە گوێڕایەڵیان بكەین تا ئەو كاتەی كار بەبەرنامەی خوای گەورە دەكەن و چاكەكارن و ئەمەش هیچ كەسێكی خاوەن عەقڵ و ژیریی ڕەخنەی لێ ناگرێت، بەڵام ئەگەر ئۆزۆن وا تێگەیشتووە كە گوێڕایەڵی كاربەدەستێكی خوێنڕێژو گەندەڵ و دزو خراپەكارە كە حوكم بەیاسای خوای گەورە ناكات و لەهەمان كاتدا خوای گەورەو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویانە گوێڕایەڵی بكرێت ئەوا زۆر بەهەڵەدا چووە، بەڵكو ئەو جۆرە كەسانە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی پێویستە لەكاربخرێن و دەسەڵاتیان نەهێڵرێت.

هەروەكو دەفەرموێت: " فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَيْس وَرَاءَ ذَلِك مِنَ الإيمَان حَبَّةُ خَرْدَلٍ"[1].

---

[1] رواه مسلم (٦٩/١)، برقم: (٥٠)، والبزار في المسند (٢٨١/٥)، وابن حبان في الصحيح (٧٣/١٤)، والطبراني في المعجم الكبير (١٣/١٠)، برقم: (٩٧٨٤) ،والبيهقي في شعب الايمان (٥٦/١٠) برقم: (٧١٥٤)، وغيرهم كثير.

واتە: هەركەسێك بە دەستی بەرەنگاریان بێتەوەو جیهادیان بكات ئەوا ئیماندارە، هەركەسێك بە زمانی بەرەنگاریان بێتەوە ئیماندارە، هەركەسێكیش بەدڵی بەرەنگاریان بێتەوە ئیماندارە، بەڵام لەدوای ئەو سێ حاڵەتە ئیمان نییە بە هێندەی گەردێكیش!!

جا سەیر بكەن پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی سێ قۆناغی بەرەنگاربوونەوەی كردووە بە پێی تواناو هێز كە پێویستە هەموو بەرەنگاری ئەو جۆرە كەسانە ببینەوەو گوێڕایەڵیان نەكەین، جا ئەم فەرموودانەو چەندین فەرموودەی تریش كە ئۆزۆن و هاوشێوەكانی خەجاڵەت دەكەن!!

## فەرموودەی چوارەم:

بەهەمان شێوە باسی گوێڕایەڵی كاربەدەستە چاكەكان دەكات و دەفەرموێت:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: «السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ»[1].

دەلیلم: گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بۆ كاربەدەستان لەسەر مسوڵمان پێویستە لەوەی كە پێی خۆشەو لەوەشی كە ڕقی لێیەتی تاوەكو فەرمان بە خراپەكاری و تاوان ناكات، جا ئەگەر فەرمانی بە خراپە كرد ئەوا نە گوێڕایەڵی هەیەو نە فەرمانبەرداری.

من لە ئۆزۆن و هاوشێوەكانی ناگرم ڕەخنە بگرن لەم فەرموودانە چونكە تەنها چاویان كاربەدەستی دز و ستەمكارو تاغوت و لاڕێیان دیوەو كەسانێكی عومەر ئاسا لای ئەوان ئەفسانەیە، بۆیە ڕەخنە دەگرن لە فەرموودەكانی گوێڕایەڵی كاربەدەستان!

بەڵام ئەوەی كە مایەی ڕەخنەبێت بەسەر ئۆززۆنەوە ئەوەیە كە ئەم دەستەواژەیە[2]: (مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ). واتە: هەتاوەكو فەرمانیان بە سەرپێچی نەكردووە.

---

[1] رواه البخاري (٩/٦٣) برقم: (٧١٤٤).

[2] ع:٩٦- ٩٧، ك: ١٦٣ - ١٦٤

ئەم فەرموودەیە باسی ئەوە دەكات كە لە سەرپێچیدا گوێڕایەڵێكردن نیەو نابێت گوێڕایەڵی بكرێن، بەلاّم ئۆزۆن خیانەت دەكاتو وای نیشان دەدات كە وشەی(مَعْصِيَة) كوفر و بێباوەڕیەو تەنها لە كوفردا بەگوێیان ناكرێت و دەڵێت فەرموودەكەی عوبادەی كوڕی صامت ڕوونی ئەكاتەوە كە دەفەرموێت: " إلا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ ".

واتە: تاوەكو كوفرێكی ئاشكراو گەورەیان لێ دەبینن و بەڵگەتان پێیە لەلای خوای گەورەوە كە كوفرە.

دەڵێم: ئۆزۆن گەورەترین خیانەت دەكات لە كاتێكدا ئەیەوێ دوو بابەت تێكەڵ بكات و تەفسیری یەكتریان پێ بكات كە دوو شتی جیان و هیچیان تەفسیری ئەوی تری پێ ناكرێت و دوو حاڵەتی جیان، چونكە فەرموودەی یەكەم باسی فەرمانبەرداری ئەكات كە سنوورەكەی تاوەكو كوێیەو دەفەرموێت تا ئەو كاتە گوێڕایەڵی هەیە كە سنووری خوای گەورە نابەزێنن و فەرمان بەچاكە دەكەن و لەفەرموودەیەكی تریشدا ئەفەمەرموێ: «لا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللهِ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ»(1).

واتە: گوێڕایەڵێكردن لە سەرپێچی خوای گەورەدا نیەو بەڵكو گوێڕایەڵی لە چاكەدا دەكرێت.

بەلاّم ئەو فەرموودەیەی دووەم كە ئۆزۆن بۆ تەفسیری فەرموودەی یەكەم هێناویەتی تەنها بەشێكی كورتی هێناوە كە خزمەت بەمەرامی خۆی ئەكاتو ئەگەر هەمووی بهێنایە ئەوا بەتەواوی كارە بۆگەنەكەی ئاشكرا دەبوو، جا تەواوی فەرموودەكە ئەمەیە:

«أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا، وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا وَأَثَرَةً عَلَيْنَا، وَأَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ، إِلا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا، عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ»(2).

هەرووەكو ئەبینین فەرموودەكە باس لە شێوازی بەیعەت وەرگرتن دەكات و دەفەرموێت: (وَأَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ، إلا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا).

---

(1) رواه البخاري (٩/٨٨)، برقم: (٧٢٥٧)، ومسلم (٣/١٤٦٩).

(2) رواه البخاري (٩/٤٧)، برقم: (٧٠٥٥)، ومسلم (٣/١٤٧٠).

فەرموودەكە زۆر بە ڕوونی ئاماژە بەوە دەكات كە شەڕ لەگەڵ خەلیفەی مسوڵمانان نەكەین و لێی هەڵنەسین تاوەكو كوفرێكی ئاشكرای لێ نەبینین.

جا هەروەكو لە فەرموودەكەدا دیارە باسی ئەوە دەكات لەو كاتەدا ڕەوایە كە بە شمشێر لێی هەستیت و شەڕی لەگەڵدا بكەیت و لەم كاتەدا هیچ جیاوازیەك لە نێوان زانایاندا نییە كە لەكاتی هێزو دەسەڵاتدا لادانی ئەو كاربەدەستە واجبە.

جا وەكو بینیمان فەرموودەی یەكەم باسی گوێڕایەڵی دەكات و فەرموودەی دووەم باسی هەڵسان لە كاربەدەستەكە دەكات، بەڵام ئۆزۆن بەوشێوەیە هەردووكیانی شێواندوەو تێكەڵی كردوون!

## فەرموودەی(پێنجەم) و(شەشەم)

فەرموودەی(پێنجەم) و(شەشەم)[1]یش لەسەر گوێڕایەڵی كاربەدەستانەو بۆ ئەوەی درێژ نەبێتەوە نایهێنین و ئەگەر ئۆزۆنیش وتەیەكی دەربارەیان هەبوایە ئەمان هێناو ئەگەر ڕاستبوایە ئەمانوت ڕاستەو هەڵەش بوایە بۆمان ڕاست دەكردەوە.

پاشان ئۆزۆن دێتە سەر بابەتێكی ترو ڕەخنە دەگرێت لەوەی كە پێغەمبەر(ﷺ) مەدینەی كردوەتە حەرەم و حورمەتی داوەتێ و دووعای بەرەكەتیشی بۆ كردووە، هەروەكو چۆن پێغەمبەر ئیبراهیم(عليه السلام) مەككەی كردە حەرەم و دوعای بۆ كرد، جا فەرموودەكە دێنێت وەكو ڕەخنە[2]:

## فەرموودەی حەوتەم:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَةَ وَدَعَا لَهَا، وَحَرَّمْتُ المَدِينَةَ كَمَا حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ، وَدَعَوْتُ لَهَا فِي مُدِّهَا وَصَاعِهَا مِثْلَ مَا دَعَا إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَامُ لِمَكَّةَ»[3].

---

[1] ع:٩٧، ك:١٦٥

[2] ع:٩٨، ك:١٦٦

[3] رواه البخاري (٦٧/٣) برقم: (٢١٢٩).

جا من نازانم ئۆزۆن گومانی لەوە هەیە كە پێغەمبەر(ﷺ)
دووعای گیرایە؟ یاخود گومانی لەوە هەیە كە داوای شتێك لەخوای گەورە بكات و پێی ببەخشێت؟ یان چ شتێك تا ڕوونمان بكردایەتەوە؟

## فەرموودەی(هەشتەم) و(نۆیەم):

بەهەمان شێوە فەرموودەی(هەشتەم) و(نۆیەم) كە ئۆزۆن هێناویەتی[1] باسی ئەوە دەكات كە مەدینە حەرامەو نابێت ڕاوی تیادا بكرێت و خوێنی تێدا برژێت.

لەكۆتایی ئەم فەرموودانەدا ئۆزۆن ڕەخنە دەگرێت و باسی ئەوە دەكات، باشە تۆ بڵێی مسوڵمانان و زانایان و كاربەدەستانی مسوڵمانان ئەم فەرموودانەیان نەبیستبێت لەكاتێكدا كە هەر لەسەردەمی هاوەڵاندا پەلاماری كەعبە درا دووجار و خرایە بەر شاڵاوی ئاگر و مەنجەنیق، پاشان لەپەراوێزەكەیدا دەڵێت: (راجع ما فعله الحصين بن نمير المسكوني والحجاج بن يوسف الثقفي في كتب التراث)ع: ٩٩، ك: ١٦٨ ـ ١٦٩

واتە: بگەڕێرەوە سەر ئەوەی كە حوصەینی كوڕی نومەیری مەسكونی و حەججاجی كوڕی یوسفی سەقەفی كردویانە، لە كتێبەكانی كەلەپوور.

## حەقیقەتی گەمارۆدانی مەككەو مەدینە!!

دەڵێم: دیسانەوە ئۆزۆن كەوتوەتە هەڵەیەكەوەو نازانم لە كێی نەقڵ كردوە بێ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر ئەو كتێبانەی كە بابەتەكەی داوەتە پاڵ و وەرگێڕی فەقیریش وەكو ئەو كەوتوەتە ئەو هەڵەیەوەو هیچی دەربارەی نەزانیوە و ناوی(حوصەینی كوڕی نومەیری سكونی) بە(مەسكونی نووسیوە)!!

باشە ئەمە چی ڕەخنەیەكە ئۆزۆن دەیگرێت؟ یەكێك نەزانێ پێشەوا ئەبوبەكرو عومەر و هاوەڵان پەلاماری مەككەو مەدینەیان داوە وا هەرایەكی ناوەتەوە، بەڵكو ئەوەی كە هێرشی هێناوەتە سەریان گەورە زانایانی ئوممەت لێیان هەستاون و هەندێكیان بەكافریان

---

[1] ع:٩٨، ك:١٦٦ ـ ١٦٧

زانیون و ئەوانەی تریش كە ماونەتەوە بە فاسق و لاڕێیان زانیون و لێیان هەستاون، ئەوەی تریش كە لێی هەڵنەستاوە لە خوێنی مسوڵمانان ترساوە، بەڵام بێدەنگ نەبووە لە لۆمەو سەرزەنشتی كارە خراپەكانیان!!

كەسێك گوێ بەڕشتنی خوێنی مسوڵمان نەداو ستەمكاربێت، ئیتر كەی گوێی لەوە هەیە مەككەو مەدینە حەرامكراوە یاخود نا؟!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە ڕووداوەكانی باسی(حوصەینی سكونی) لەڕێگەی "ئەبی میخنەف"ەوە دەگێڕدرێتەوەو باسی حاڵیمان كرد لەوەو پێش كە شیعەیەكی توندبووەو هەواڵی لێ وەرناگیرێت لەو بابەتانەداو، هەروەها لەسەنەدەكەشیدا پچڕان هەیەو هەر یەكێك لەم دوو هۆكارە بەسە بۆ ئەوەی وەرنەگیرێت هەواڵەكان[1].

ڕووداوی "حەڕە" وەك خۆی!

پاشان ئۆزۆن باسی ڕووداوی "حەڕە" دەكات و هەندێك شتی تێدا باس دەكات و دەكرێت بەم شێوەی دابەش بكەین[2]:

١ –عوقبەی كوڕی موسلیم هێرش دەكاتە سەر شاری مەدینەو(٣) ڕۆژ هەموو شتێكی تێدا حەڵاڵ دەكرێت.

٢ – نزیكەی چوارهەزار و پێنج سەد كەسی تێدا دەكوژرێت.

٣ – دەڵێن: پەردەی كچێنی هەزار كچی تێدا دڕێنراوە.

**دەڵێم**: من بە تەحەدداوە بە ئۆزۆنو وەرگێڕ و ئەوەشی پیایدا چوەتەوە دەڵێم ئەگەر توانیتان ئەم هەمووە درۆی كە ئۆزۆن گێڕاویەتیەوە بسەلمێنن ئەوا مافی خۆتانە هەرچیەك بڵێن لە دوای ئەوەو ئێمەش قەبوڵمانە، بەڵام ئۆزۆن هاتووە نوسیویەتی سەیری بەرگی(٥)ی(الكامل) بكە، ئەی باشە خۆ ئەم سەرچاوەیە بەرگ و دوان نییە و چەندین چاپی جیا جیای هەیە تۆ مەبەستت بەرگی(٥)ی كام چاپەیە، چونكە جاری وا هەیە

---

[1] تأریخ الطبري (٥/٤٩٦).

[2] ع:٩٩، ك: ١٦٨-١٦٩

جیاوازی نێوان چاپێك و چاپێكی تر چەندین بەرگە! چاپیشی هەیە بە یەك بەرگ چاپ كراوە؟

من دیسانەوە دەڵێمەوە ئەگەر وجودی هەبوو تیایدا ئەوكات با بێن و قسەی خۆیان بكەن، بەڵام ئێستا پێویستە عارەقی شەرمەزاری برێژن ئەگەر شەرم بیانگرێت.

ئەم وتانە لە كاتێكدا لای پێشەوا تەبەری نەهاتووە كە ئەوهەر هەواڵێك هەبوبێت بە ڕاست و ناڕاستەوە تۆماری كردوەو دایناوەو جیاكردنەوەكەشی بەجێ هێشتووە بۆ خوێنەران، تەنانەت ئەبو میخنەف كە چەندە ڕقی لە ئومەویەكان و یەزید بووەو درۆشی بۆ هەڵبەستوون، هیچ كام لەو درۆیانەی كە ئۆزۆن دەیكات ئەو نەیكردوەو تەنانەت باسی یەك ئافرەتیشی نەكردووە كە پەردەی كچێنی لابرابێت و ئەو ژمارە زۆرە خەیاڵیەش كە ئۆزۆن باسی دەكات هیچ بنەوایەكی نیە، بەڵكو ئەوەی ڕاستی بێت ئەم پەلامارە یەك ڕۆژی خایاندوەو ئەوەتا كۆنترین مێژوونووس كە لە ڕووداوەكەوە نزیك بووە، پێشەوا خەلیفەی كوڕی خەییاتە كە وردەكاری ڕووداوەكان و تەنانەت ناوی ئەوانەشی كە بوونەتە قوربانی بە چەندین پشتیشیانەوە ناویان دەبات و ئاگاداری تەواوی وردەكاریەكانی بوەو تۆماری كردووە، سەرتاپا ئەوەی كە ئۆزۆن باسی دەكات بێ بنەمایەو ئەوەتا دەفەرموێت: " وَجَمِيع من أُصِيب من قُرَيْش وَالْأَنْصَار ثَلَاث مائَة رجل وَسِتَّة رجال "[1].

واتە: سەرجەمی ئەوانەی كە پێوەبوون لە قورەیش و ئەنسار(٣٠٠) كەس بوون.

سەبارەت بە دڕاندنی پەردەی كچێنی هەزار كچی تازە پێگەیشتووش، كۆنترین كتێبێك كە ڕووداوەكەی تێدابێت، مێژووەكەی ئیبن عەساكرە كە بەسەنەدێكی لاواز و وەرنەگیراوهاتوەو هەندێكی تریش لە زانایان لەسەر هەمان بنچینە هێناویانە وەكو زەهەبی[2]، ئیبن عەساكر دەڵێت: " أخبرنا أبو عبد الله الفراوي أنا أبو بكر البيهقي ح وأخبرنا أبو محمد السلمي نا أبو بكر الخطيب ح وأخبرنا أبو القاسم بن السمرقندي أنا أبو

---

[1] تأريخ خليفة بن خياط، ص: (٢٥٠)، ت: د. أكرم ضياء العمري، الناشر: دار القلم ، مؤسسة الرسالة – دمشق ، بيروت، الطبعة: الثانية، ١٣٩٧.

[2] سير أعلام النبلاء (٣/٣٢٣).

بكر بن الطبري قالوا أنا أبو الحسين بن الفضل أنا عبد الله بن جعفر نا يعقوب نا يوسف بن موسى نا جرير عن مغيرة قال: أنهب مسرف بن عقبة المدينة ثلاثة أيام فزعم المغيرة أنه افتض منها ألف عذراء"[١].

جا ئەگەر بڕوانینە ڕیوایەتەكە موغیرە خۆی لەوكاتەدا نەبوەو ڕووداوەكەی نەبینیوەو نەیداوەتە پاڵ كەسیش، موغیرە خۆشی كەسێكی(مُدَلِّس)بوەو ئەو جۆرە كەسانەش لە كاتێكدا ڕیوایەتی بەو شێوەیە بگێڕنەوە لێیان وەرناگیرێت بە كۆڕای زانایان، هەروەها زانایان فەرموویانە كەسێكی لاوازیش بووەو سەرەڕای ئەوەی كە ئەو كەسەشی لە موغیرە ئەگێڕێتەوە بەو شێوەیە هێناویەتی: (فزعم المغيرة). واتە: موغیرە وای گومان بردووە. ئەمەش دیسانەوە تانەیەكی ترە لە ڕیوایەتەكەو وا ئەخوازێت قەبوڵ نەكرێت چونكە نادیاری و نا ڕوونی هەیە لە زانستی موغیرە سەبارەت بە ڕوودان و ڕوونەدانی ئەو هەواڵە.

باشە ئەوەی كە دەڵێت: پەردەی هەزار كچ درێنراوە، ئەگەر بنەمایەكی هەبێت ئەوا دەبوو كەسوكاری ئەو كچانە بەشەڕ بهاتنایەو هیچ نەبێت ئەگەر بۆ هەر یەكێك لەو كچانە كەسێكیش خۆی بەكوشت دابێت، ئەبێت ژمارەی كوژراوان لە هەزار تێپەڕی كردبێت وەكو ئۆزۆن دەڵێت پەردەی هەزاران كچ!

بەڵام ئەوەی كە كوژراوە لەو شەڕەدا وەكو خەلیفەی كوڕی خەییات فەرمووی: سێسەد كەس بوون.

جا بۆیە هیچ بنەوایەكی نیە، سەرەڕای لاوازی سەنەدو جێگیرنەبوونی ئەوەش كێشەی مەتنەكەی با لەولاوە بوەستێت!

ئەمەش زیاتر ڕاستی فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەردەخات كە باسی سەرشۆڕی ئەو كەسانە دەكات كە خراپەیان بوێت بۆ ئەهلی مەدینەو ئەوەتا هەم موسلیم و هەم یەزید كەس دانی خێریان پێدا نانێت و خاوەن سیرەیەكی ڕەش بوون، تەنانەت موسلیم بە نزیكی حەفتەیەك دوای ڕووداوەكە دەمرێت و یەزیدیش بە نزیكی حەفتا ڕۆژ هەروەكو پێشەوا

---

[١] تأريخ دمشق لابن عساكر (١٠٨/٥٨)، ت: عمرو بن غرامة العمروي، الناشر: دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع، عام النشر: ١٤١٥ هـ - ١٩٩٥ م.

زەهەبی(رحمه الله) دەفەرموێت: ڕق و كینەی خەڵكی زیاتر بوو بۆ یەزیدو حەفتاو ئەوەندە ڕۆژ دوای ڕووداوەكە یەزیدیش مرد[1].

جا ئەوەی كە زۆر سەیرە ئۆزۆن دەڵێت: هەر لەسەردەمی هاوەڵاندا ئەمە ڕوویداوە، جا ئیتر یەكێك نەزانێت گەورە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سەرۆكایەتی ئەم ئابلۆقەیان كردووەو ئەوان بوون حورمەتی مەككەو مەدینەیان شكاندووە، باشە ئەگەر لەسەردەمی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)كەسێكی دووڕوو یان خراپەكارێك بهاتایەو پشێویەكی بنایەتەوە ئیسلام بەرپرس بوو لەم كارە یاخود ئەو كەسە نەیارە؟!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی مێژووی هیچ تاكێك مێژووی ئیسلام نیەو نابێتە ماڵ بەسەر مسوڵمانانەوە، بەڵكو ئەوەی ئێمە لێی بەرپرسیارین قورئان و سوننەتی سەحیحەو بەس.

ئێستا ئەوەندە ماوە بپرسم باشە ئۆزۆن چۆن هێندە دڵنیایە لەم ڕووداوانەو وەها باسیان دەكات وەك ئەوەی بە چاوەكانی خۆی بینیبێتی، بەڵام ئەو پەڕی گومانی لە فەرموودەكانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەیەو تەنانەت دەڵێت ئەبو هورەیرە وا دەڵێ، یان دەڵێت بە گوێرەی ئەوەی كە ئیبن صامت هێناویەتی، یان بە گوێرەی ڕای بوخاری(رحمه الله) ، بەڵام ئەم ڕیوایەتە مێژوویە ناڕاستانەی لەلای خوێنەرانی وەكو یەقین نیشان دەدات و ئەیەوێ بیانكاتە قازی و حاكم بەسەر ڕاسترین كتێب لە دوای قورئانی پیرۆز كە سەحیحی ئیمامی بوخارییە(رحمه الله)!

---

[1] سير أعلام النبلاء (٣/٣٥٢).

## هەوڵی ئۆزۆن بۆ ناشرینكردنی هاوەڵان(رضي الله عنهم)

ئۆزۆن دوابەدوای ئەم باسانە دێت و ئەیەوێ هاوەڵان ناشرین بكات و تاوانباریان بكات و دەڵێت: "شوێنكەوتوان و زانا بەڕێزەكان زۆر زیادڕۆییان كردووە لە پلەو پایەی هاوەڵان و وەك فریشتەیان لێكردوون ئەگەر لەوەش زیاتر نەبێت" ع: ١٠٠، ك: ١٧٢

پاشان دەڵێت: "هاوەڵانیش وەكو غەیری خۆیان تاوانبار و تۆبەكاریان تێدایە، چاك و خراپیان تێدایە، ڕەزیل و سەخی، داناو هەڵەشە، ئازاو ترسنۆك... تا كۆتایی سیفەتی خەڵكی وەكو ئەمڕۆ" ع: ١٠١، ك: ١٧٢

دەڵێم: ڕاستە هاوەڵان وەكو ئێمە مرۆڤن، بەڵام خوای گەورە هەڵیبژاردوون و كردونیەتیە باشترین جیل بۆ هاوەڵی باشترین پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەوانبوون كە وازیان لە هەموو خۆشیەكی دونیا هێناو سەرجەمی كاتەكانیان دانا بۆ پەرستش و بڵاوكردنەوەی ئاین و، ڕزگاركردنی خەڵكی لە زوڵم و زۆری كاربەدەستان و مرۆڤەكان بەرەو دادی ئیلاهی.

هەر ئەوانن خوای گەورە بەچەندین شێوە لە قورئانەكەی وەسفیان دەكات و بەوپەڕی باشە باسیان دەكات و دەفەرموێت: ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠ ﴾التوبة

هەرووەها دەفەرموێت: ﴿ ۞ لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ١٨ ﴾الفتح

هەر خوای گەورەیە لەبارەیانەوە دەفەرموێت باشترینی ئوممەتانن: ﴿ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ وَلَوۡ ءَامَنَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۚ مِّنۡهُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ١١٠ ﴾آل عمران

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ٢٩ ﴾الفتح

هەر ئەوانن تاوانبارەكانیان لە خۆپارێزو بەتەقواكانی ئێستا ئیمانیان دامەزراوترو توندو تۆڵتربووەو ئەوەتا ئەوەیان تاوانێكی ئەنجامداوە دوای چەندین جار پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەیگەڕێنێتەوەو ئەیەوێ واز بێنێت، بەڵام ئەو هەر سوورە لەسەر ئەوەی حەدی لێ بدرێت، ئەوەتا ئەو ئافرەتەی كە تووشی كاری خراپ بوو هاتە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ئەوەی حەدی بەسەردا جێبەجێ بكات و دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی تۆبەیەكی كردووە ئەگەر دابەش بكرایە بەسەر هەموو خەڵكی دنیا بەشی دەكردن!!

باشە جیلێك ئەمە تاوانبارەكەی بێت ئەبێت خەڵكە موتەقی و سنوور پارێزەكەی چۆنبوبێت؟

ئەوان ئەو جیلەبوون كاتێك لە یەكێك لە غەزاكاندا چەند دانەیەكیان كەوتبوون و مەرگ هاتبووە بینیان و وەختبوو لە تینوێتیدا بمرن، كاتێك ئاویان بۆ هێنان و بردیانە لای یەكەم كەسیان بەڵام نەیخواردەوەو وتی نەوەك ئەوەی تەنیشتم لە من زیاتر تینووبێت، بردیانە لای دووەمیش بە هەمان شێوەی یەكەم تاوەكو گەیشتە كۆتایان و هەر ئامادە نەبوو بیخواتەوە لەكاتێكدا دەبینێت وا براكەی لە تەنیشتی كەوتوەو تینووە!!

تاوەكو گەڕاندیانەوە لای یەكەم و بیخواتەوە بینیان وا گیانی پاكی سپاردووە، دانە دانە سەیری ئەكەن ئەو كۆمەڵە هاوەڵە خۆشەویستە مردوون و كەسیان هەڵپەی ئاویان نەكرد و براكانیان بیر نەكرد لەو ساتە دژوارەدا!!

ئەوان ئەو هاوەڵانەبوون كە لەناو یەكدا بەشێوەیەك دەژیان هەموو خوی پێغەمبەریان(ﷺ) گرتبوو، هەروەكو مەحوی دەڵێت مەدینەی منەوەرە وەكو پێغەمبەرستانی لیَ هاتبوو:

بەنووری عەكسی پێغەمبەر ئەوەندە مونعەكیس بووبوون

غەریبی تازە هاتوو دەیگوت ئەمە پێغەمبەرستانە

هەر ئەو جیلەبوو كە لەكاتێكدا ئەوەی پێویستیان بوو لای خۆیان نەیاندەهێشتەوەو ئەیاندا بە براكەیان هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٩﴾الحشر

ئێمە نالێین بچن سەیری سەحیحی بوخاری بكەن بۆ ئەوەی هاوەڵان بناسن، بەڵكو دەڵێت تەنها سەیری ئەو ئایەتانە بكەن كە خوای گەورە باسی هاوەڵان دەكات و بزانن دوای وتەی خوای گەورە وتە بۆ كێ ئەمێنێتەوە؟! تاوەكو قورئان لەبەردەستماندابێت و ئێمە بیخوێنینەوە ئیتر ئۆزۆن و هاوشێوەكانی با بۆخۆیان بلێن.

بەڵام دیسانەوە ئەیخەمەوە یادتان كە كێشەی ئۆزۆن لەگەڵ بوخاریدا نیە، بەڵكو لەگەڵ قورئان و ئیسلامیشە، بەڵكو لەگەڵ پێغەمبەری خواشدایە(ﷺ)، ئەگەر لەگەڵ خوای گەورەش نەبێت(بەڵام ئەوەیان نازانم)!!

بە ئۆزۆن دەڵێم: ئەو سیفەتە ناشرینانەی كە باسی دەكات هی كام هاوەڵەو كامیان ئەو سیفەتانەی هەبووە بۆمان دیاری بكات و سەرچاوەیەكی دروستیشمان بداتیَ با لە قورئان بەهێزتربێت و لە بوخاری بەهێزتربێت!! نەك ئەوەی دەست ناكەوێت بەڵكو هەر بە سەحیحی دەستی ناكەوێت جا لە هەر كتێبێكدابێت.

پاشان ئۆزۆن هەندێك بەڵگە دێنێتەوەو وا دەزانیَ ئیتر هیچی نەهێشتوەتەوە:

بەڵگەی یەكەم:

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الإِسْلَامِ، فَأَصَابَ الأَعْرَابِيَّ وَعْكٌ بِالْمَدِينَةِ، فَأَتَى الأَعْرَابِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنَّمَا المَدِينَةُ كَالكِيرِ، تَنْفِي خَبَثَهَا، وَيَنْصَعُ طِيبُهَا»[1].

ئەم فەرموودەیە باس لەوە دەكات كە كابرایەكی دەشتەكی دێتە مەدینەو مسوڵمان دەبێت دوای ئەوەی نەخۆش دەكەوێت داوای گەڕانەوەو هەڵوەشاندنەوەی بەیعەتەكەی دەكات و پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرمویێت: مەدینە وەكو كورەی ئاسن تواندنەوە وایە كەسە پیسەكان فڕێ دەداتە دەرەوە.

جا ئۆزۆن كێشەی لەگەڵ وتەكەی پێغەمبەری خوادا هەیە(ﷺ)، پاشان فەرموودەیەكی تریش دێنێتەوە بۆ پاڵپشتی ئەم وتەیەو ڕەخنە دەگرێت و دەڵێ:

"باشە ئەم فەرموودەیە كە گەیشتووە بە پێشەوا بوخاری نەگەیشتووە بە خەلیفەی چوارەم عەلی كوڕی ئەبی تالیب كە مەدینە جێ دەهێڵێ و بەروە عێراق دەڕۆن و دەیكەنە سەنتەری دەسەڵات، یان عەلیش لەبەر پیسیەكەی مەدینە كردبێتیە دەرەوە؟ یان ئەم فەرموودەیە سەرتاپا وەهمەو تەنها لەكاتێكی دیاریكراودا بۆ كەسێك وتراوەو سونەتێكی جێگیر نییە؟ پرسیارێك دێتە ئاراوە لەبارەی دووڕوەكانی مەدینەوە كە لەوێ ماونەتەوەو تەنانەت عبداللە ی كوڕی سەلول لەوێش نێژراوە" ع: ١٠١-١٠٢، ك: ١٧٤ ـ ١٧٥

دەڵێم: ئۆزۆن دیسانەوە پەردە لەسەر خۆی لادەبات و ئەگەر وردبوایەتەوە لەمانای فەرموودەكە باش تێدەگەیی و نە پێشەوا عەلی و نە پێشەوا بوخاری تاوانبار نەدەكرد، چونكە فەرموودەكە باسی تاقیكردنەوەو ئارامگرتن لەسەر نارەحەتی و ئازار دەكات و سەرەتای فەرموودەكەدا دیارە، كە باس لە نەخۆشكەوتنی ئەو پیاوە دەكات و ئارام

[1] رواه البخاري (٩/٧٩)، برقم: (٧٢١١).

ناگرێت و مەدینەش وەکو کورە وایە لـەوەی کە پڕی بووە لـە برسێتی و نارەحەتی و ئازار و ترسی دوژمنی دەرەکی و ئەمەش تەنها کەسانی خاوەن ئیمان و بڕواو کەسانی دامەزراو توانیویانە بەرگەی بگرن و بەمەش کەسە ئیمان لاواز و دووڕووەکان کە خۆیان پاڵداوەتە پاڵ ئیسلام ئاشکرا دەبن.

عبدالله ی کوڕی سەلول و هاوشێوەکانی هەموو کەس باش ناسیونی و تەواو نیفاقەکەیان ئاشکرابووەو گومانیان لـێی نەبووە، ئیتر با هەر لـە مەدینەدابێت و پاشان بە ڕوونتر بلـێین فەرموودەکە باسی ئەو کەسانە دەکات کە کۆچ دەکەن بەرەو مەدینە لـەو حالـەتەدا خۆی ناگرێت و باسی ئەوانە نەك کەسێك کە خۆی هەر دانیشتووی مەدینەبێت، چونکە ئەو کەسە کۆچبەرە دوورکەوتوەتەوە لـە خاکی خۆی و ئەبێت ئارامگربێت لـەبەرامبەر ئەو هەموو بارگرانیە .

هەروەها ڕۆشتنی ئیمامی عەلیش(رضي الله عنه) لـەوکاتەدا نەبوو بەڵکو ئەوپەڕی جوامێری نواند لە گشت سات و کاتێك کە مسولـمانان پێویستیان پێی بووە، هەروەها ڕۆشتنەکەشی لـەبەر دامرکاندنەوەی فیتنەی خەواریج و ئاشوب و ئاژاوەکانی عێراق بوو، نەوەك دلـی لە خاکی عێراق چوبێت یاخود مەدینە فڕێی دابێت بەوشێوەی کە ئۆزۆن وێنای دەکات.[1]

پاشان ئۆزۆن فەرموودەیەکی تر دێنێت کە دەکاتە:

---

[1] هەندیك جار ئوزون لە بەڵگەیەك زیاتر دەهێنێت بۆ بابەتیك کە یەك ماناو مەبەستیان هەیە، بەلام ئیمە تەنها یەك دانەمان هیناوەو قسەمان لـەسەر کردووەو ئەوی تر ناهینین و راستەوخۆ دەچێنە سەر بەڵگەی دوای ئەو، بە لە بەرچاوگرتنی قەبارەی کتێبەکەو دووبار نەکردنەوەی شتێك کە بیویست نییە.

بەڵگەی سێیەم:

هِشَامُ بْنُ زَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا، فَكَلَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّكُمْ أَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ»[(١)].

واته: ئافرەتێك لە ئەنسار هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) ومنداڵێكی لەگەڵدابوو، ئەویش قسەی لەگەڵ فەرموو، پاشان فەرمووی: سوێند بەوكەسی گیانی منی بەدەستە ئێوە خۆشەویسترین كەسن لەلای من.

ئۆزۆن دەڵێت: "ئەم فەرموودانە باسی ڕێز و پلەو پایەی ئەنسار دەكات لەلای پێغەمبەر..بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا پێشەوا بوخاری هیچ دژیەكیەكی نەبینوە لە نێوان ئەو فەرموودانەو فەرموودەی تردا كە پێغەمبەر(ﷺ)ئەنساریەكانی لە پۆستەكان لاداوەو دووری خستونەتەوەو پێشیان دەڵێ نابێت داواشی بكەن، لە تاڵانی و غەنیمەت بێبەشیان دەكات و، هەروەها ئەو(١٠) كەسەشی موژدەی بەهەشتیان پێدراوە هەموویان هەر لە كۆچبەرانن و ئەنساریان تێدا نیە" ع: ١٠٣، ك: ١٧٦ ـ١٧٧

دەڵێم: كاتێك پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) كەسێكی لە پۆستێك لاداوە مانای وانەبووە كە ڕقی لێیەتی و بەلایەوە گرنگ نییە چونكە زۆرجار ئێمە كەسێك بە شیاوی پۆستێك نابینین نەك لەبەر ئەوەی متمانەمان پێی نییە یان ڕقمان لێیەتی، بەڵكو بۆ ئەوەیە كە ئەو پۆستە پێویستی بە كۆمەڵێك تایبەتمەندی هەیە، بەڵام كارێكی تر هەیە كە ئەو شیاوە بۆی ئەوا ڕادەستی ئەوی دەكەین.

ئەنسارەكان لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا دەسەڵاتی باڵایان هەبوەو نەك بەوشێوەی كە ئۆزۆن وێنای دەكات.

دەپرسین: باشە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ هەموو یەمەن كێ دەنێرێت؟! مەگەر موعازی كوڕی جەبەلی ئەنساری نەبوو؟!

---

(١) رواه البخاري (٥/٣٢)، برقم: (٣٧٨٦).

ئەی بۆحەزرەمەوت مەگەر زیادی كوڕی لەبیدی ئەنساری نانێرێت و نایكاتە والی ئەوێ؟ مەگەر عوممانی نەدایە دەست ئەبو زەیدی ئەنساری؟ مەگەر محمدی كوڕی مەسلەمەو عبداللە ی كوڕی ڕەواحەو چەندین ئەنسارییی تری دەیان جار نەكردوەتە سەرۆكی سوپاو چەندین گەورە هاوەڵی كۆچبەری نەخستونەتە بەردەست؟

جا ئەم وتانەی ئۆزۆن تەنها بۆ خۆیی دەكات و ئەگەر بابەتەكە ڕق و كینەبێت و خۆشی نەویستنایە یاخود بەكەڵك نەهاتنایە ئەوا ئەم ئەنسارییانەی نەدەكردە خاوەن پۆست و ئەگەر سەیری سیرە بكەین ئەوا سەدان نمونەی وەها دەبینین!!

پاشان ئەوەی كە ئۆزۆن باسی موژدەی بەهەشت دەكات، باشە خۆ موژدەی بەهەشت بەدەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نیەو ئەوە خوای گەورە دیاری دەكات و پێغەمبەر(ﷺ)تەنها وەحیی دەگەیەنێت.

نازانم ئۆزۆن موژدەی بەهەشت بە خەڵات تێگەیشتوە وەكو پلەی سەربازی، یاخود قەباڵەی لێخۆشبوونی برا گاورەكانی(صُكُوكُ الغُفْرَانِ)؟!

سەبارەت بەوەی كە ئەنسار موژدەی بەهەشتیان پێدراوە یاخود نا؟

بەڵێ موژدەیان پێدراوەو چەندین نمونەمان هەیە، بەلاَم ئەوەی كە وای كردووە فەرموودەی عەشەرەی موبەشەرە زۆرتر بلاَببێتەوە، چونكە لە یەك دەقدا هەموویانی كۆ كردوەتەوەو لە یەك كاتدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: فلاَن و فلاَن و فلاَن لە بەهەشتدان، ئەگینا لە كات و ساتی تردا باسی هاوەلاَنی تریشی كردووە هەر لە كۆچبەران و ئەنساریش، لەوانە دایكی ئیمانداران خەدیجە و هەندێك لە كۆچبەرانی تر و هەروەها لە ئەنساریەكانیش وەكو سەعدی كوڕی موعاز و حەنزەلە و ئوم سەلیم و ...و تاد، ئیتر ئەم هات و هاوارو وتە بێ ماناییانەی ئۆزۆن لە پای چی؟!

پاشان باسی هەڵبژاردنی خەلیفە دەكات لە "سەقیفەی بەنی ساعیدە" و دەڵێت كەسیان ئەو فەرموودانە باس ناكەن كە ئەبێت فەرمانڕەوا لە قورەیش بێت بەتەنهاو ڕەنگە ئەم فەرموودانە لەوكاتەدا نەبوبێتن كە ئیمامی بوخاری هێناویەتی[1].

دەڵێم: نازانم ئۆزۆن خۆی نەخوێندەوارەو بە هەموو تەمەنی "سەحیحی بوخاری" و یەك كتێبی تری فەرموودەی نەبینیووە، یان دەیەوێت بە هەر نرخێك بێت چەواشەكاری و خیانەت بكات، ئەگینا لە چەندین كتێبی فەرموودەدا ئەوە هاتووە كە هاوەڵان ئاماژەیان بەوە كردووە، كە پێویستە ئەو كارە بسپێردرێتە قورەیش، هەروەكو پێشەوا ئەبو بەكر فەرمووی: " وَلَنْ يُعْرَفَ هَذَا الأَمْرُ إلا لِهَذَا الحَيِّ مِنْ قُرَيْشٍ "[2].

باشە خۆ ئەم وتەیە سەرەڕای ئەوەی لە چەندین كتێبی فەرموودەدا هاتووە[3] لە "سەحیحی بوخاری"یشدا بەهەمان شێوە هاتووە، ئیتر چۆن ئۆزۆن تانە لە كتێبێك دەدات كە نەیدیوەو نەیخوێندوەتەوە؟!

جا ئەوەشمان ڕوونكردەوە لەوپێش و باسمان كرد كە ماناو مەبەست لێی چیبووەو بۆچی ئەو فەرموودانە لە بارەی قورەیشەوە هاتوون و پێویست ناكات دیسانەوە لەسەری بوەستینەوە.

---

[1] ع:١٠٣، ك:١٧٧

[2] رواه البخاري (١٦٨/٨)، برقم: (٦٨٣٠).

[3] مسند أحمد (٤٥٢/١)، مسند الروياني (٣٤١/٢)، برقم: (١٣٢٣)، صحيح ابن حبان (١٥٠/٢)، مصنف عبدالرزاق، (٤٣٩/٥)، برقم: (٩٧٥٨)، وغيرهم

## بەڵگەی چوارەم:

قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: «لَمَّا ثَقُلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَاشْتَدَّ وَجَعُهُ اسْتَأْذَنَ أَزْوَاجَهُ أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِي، فَأَذِنَّ لَهُ، فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ تَخُطُّ رِجْلاَهُ الأَرْضَ، وَكَانَ بَيْنَ العَبَّاسِ وَبَيْنَ رَجُلٍ آخَرَ»، فَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَذَكَرْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ مَا قَالَتْ عَائِشَةُ، فَقَالَ لِي: وَهَلْ تَدْرِي مَنِ الرَّجُلُ الَّذِي لَمْ تُسَمِّ عَائِشَةُ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: هُوَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ"[1].

فەرموودەكە باسی وەفاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەكات و دایكی ئیمانداران عائشە(رضي الله عنها) دەیگێڕێتەوە كە دوو كەس لە هاوەڵان هەڵیان گرتوەو دەفەرموێت: لە نێوان عەبباس و پیاوێكی تردابوو، پاشان عوبەیداللە ی ڕاوی فەرموودەكە دەفەرموێت: ئیبن عەبباس پێی وتم ئەزانی ئەو پیاوەی تر كێبوو؟ وتم: نەخێر، وتی: عەلی كوڕی ئەبی تالیب بوو.

پاشان ئۆزۆن بە ویستی خۆی دێت و دەست دەكات بەچەواشەكاری و خیانەت و دەڵێت: " ئەم فەرموودەیە پێشەوا بوخاری لە باسی دیاری پێشكەشكردنی نێوان ژن و مێردا هێناویەتی لە كاتێكدا ئەم باسە یەكێكە لە فەرموودە مەترسیدارەكان" ع: ١٠٤، ك: ١٧٨

**دەڵێم:** ئەم ڕەخنەیەی ئۆزۆن زۆر بێ مانایەو چەندین جار وەڵامان دایەوەو وتمان پێشەوا بوخاری(رحمه الله) باسەكانی سەحیحەكەی بە شێوەی فیقهی فەرموودەكان داناوەو یەكێك لەو شتانەی كە تێیدایە، ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی خۆشبوو كۆتا ساتەكانی ژیانی لای عائشە بەسەربەرێت و سەرەی ئەویش نەبوو بەڵام مۆڵەتی لە هاوسەرەكانی تری خواست و داوای لێكردن لەلای عائشە(رضي الله عنها) بمێنێتەوە، جا ئەمەش وەكو دیاریەكە لە نێوان ژن و مێردو بەڵكو گەورەترین دیارییە كە خۆشەویستی خوای گەورە لە كۆشتا وەفات بكات، سەرەڕای ئەوەی كە لە چوار باسی سەحیحەكەیدا هێناویەتی و ئەوانیش:

١ –(بَابٌ: حَدُّ المَرِيضِ أَنْ يَشْهَدَ الجَمَاعَةَ)[2]

---

[1] رواه البخاري (١٥٨/٣)، برقم: (٢٥٨٨).
[2] (١٣٣/١).

٢ –(بَابُ هِبَةِ الرَّجُلِ لامْرَأَتِهِ وَالمَرْأَةِ لِزَوْجِهَا)[١]

٣ –(بَابُ مَرَضِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَوَفَاتِهِ)[٢]

٤ –(بَابُ اللَّدُودِ)[٣]

جا ئیتر نازانم ئۆزۆن داوای چی دەكات و ئەبێ لە چی بابێكدا بیهێنێت؟!

بۆ ئەوەشی كە دەڵێت: ترسناكترین فەرموودەیە مەبەستێكی هەیە كە لە نەفسی شەیتاندایە، وەك پێی دەگەین و بە ئاشكرا دەیلێێت.

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: "زۆر بە ڕوونی دڵگرانی و بێ ڕەحمی خاتوو عائشە دەردەخات بەرامبەر عەلی و بەشێوەیەك كە ناوهێنانی زۆر بەلاوە قورسە بەپێی ئەم ڕیوایەتە، وەك ئەوەی بیەوێ ناوی عەلی بسڕێتەوە لە بوون و هاوكاری بۆ پێغەمبەر(د.خ) لە نەخۆشیەكەیدا، بەڕاستی ئەمەش سەیر نیەو چونكە پێشتر عەلی لەكاتێكدا بوختان بۆ عائشە كرا هەڵوێستی باش نەبوو لەبارەی عائشەوە بە پێغەمبەری فەرموو: خۆ خوای گەورە ئافرەتی نەبریوەو هەر ئافرەت زۆرە" ع: ١٠٤، ك: ١٧٩

پاشان دەڵێت: " ناكۆكی و جیاوازی ئەم دوو كەسە گرنگە لەم سەردەمەداهەرچەندەبێت و هەرچۆنێك بێت ـ هاوسەری پێغەمبەرو زاواو ئامۆزاكەی ـ دواجار ئەم ناكۆكیەی نێوانیان دەگوێزرێتەوە بۆ شەڕێكی خوێناوی و شەڕی جەمەلی لێدەكەوێتەوە كە زۆر لە گەورە هاوەڵان دەبنە قوربانی" ع: ١٠٤، ك: ١٧٩

دەڵێم: ئەمەی ئۆزۆن دەیكات ئەوپەڕی خیانەت و دڵڕەقی و چەواشەكارییە هەروەكو چۆن پێشتر لە باسی هەردوو هاوەڵی خۆشەویست ئەبوهورەیرەو عومەردا(رضي الله عنهما) كردبووی و بەویستی خۆی ڕووداوەكانی پێش و پاش خستبوو، لێرەش بەهەمان شێوە ئەكەوێتە ناو هەمان دڵڕەقی و چەواشەكاری، بەشێوەیەك كە ڕۆژهەڵاتناسانیشی تووشی حەیرەت كردووەو شەیتانیش سەری سوڕماوە لە فێڵ و خیانەتەكانی!!

---

[١] (١٥٨/٣).

[٢] (٩/٦).

[٣] (١٢٧/٧).

من پێش ئەوەی بێمە سەر باسەكە ئەمەوێ بڵێم ئەم ڕێكخستنەی ئۆزۆن هیچ بنەمایەكی نیەو ئەیەوێ وای نیشان بدات كە ڕق لە نێوان عائشەو عەلی هەبووە بەپێی ئەم گێڕانەوەیە پاشان ئەم ڕق و كینەیە درێژە دەكێشێ تاوەكو شەڕی جەمەلی لێدەكەوێتەوە!!

من دەڵێم یان ئۆزۆن زۆر نەزانە هەم بە فەرموودەو هەم بە مێژووش یان زۆر كەسێكی خیانەتكارو شێوێنەری ڕاستیەكانەو هیچ ئەمانەتی لەلا نیە، چونكە ئەم گێڕانەوەیە لەدوای شەڕی جەمەلەوە ڕوویداوەو عبیداللە ی كوڕی عبداللە كە فەرموودەكەی گێڕاوەتەوە لەدوای خیلافەتی عومەری كوڕی خەتتاب لەدایك بوەو واتە لەدوای بوختانكردن بۆ دایكی ئیمانداران عائشە(ﷺ) بە چەندین ساڵ لە دایك بووە، هەروەكو زانایانی مێژوو فەرموویانە[1].

جا بەوەی كە ئێمە زانیمان ئەم فەرموودەیە دوای جەمەل گێڕدراوەتەوە بۆمان دەردەكەوێت شەڕی جەمەل بەهۆی ڕق و كینەوە نەبووە لە نێوان عەلی و عائشەوە، بەڵكو خەڵكانێكی دوو ڕوو دروستیان كردو ئێرە شوێنی موناقەشەی ئەوە نییە كە لەسەری بڕۆین، بەڵام ئەوەی كە ئۆزۆن هەوڵی بۆدا زۆر نەزۆك و بێ بەرهەم بوو.

هەروەها تاوەكو ڕووداوی جەمەل چەندین هاوەڵی تر ئاگاداری وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و شتێكی زۆر بەناوبانگ بوە وەفاتی و ئەوەتا ئیبن عەبباس دەفەرموێت: كەسی دووەم عەلی بوو، ئیتر پێم نالێی كێ ئەتوانێ ناوی پێشەوا عەلی(ﷺ) بشارێتەوە تاوەكو دایكی ئیمانداران(ﷺ) هەوڵی بۆ بدات؟!

ئەی بۆچی دایكی ئیمانداران ناوی نەهێنا؟

وەڵام: ئەمە شتێكی ئاساییەو لەناو مرۆڤەكاندا ڕوو دەدات كە دوو كەس لە نێوانیاندا شەڕ ڕووبدات هەر شتێك ئەمێنێتەوە جا ئەگەر بێت و برینی شەڕەكەش ئەستەم بێت و ببینیت كە هەندێك كەسی گەورەی تێدا كوژراوە، ئیتر من نازانم ئۆزۆن بۆچی ڕەخنە لە پێشەوا بوخاری(ﷺ) دەگرێت و دەڵێت بۆچی هاوەڵان بە مەعسوم دەزانێت، بەڵام

[1] سیر أعلام النبلاء (٤/٤٧٥)،

كاتێك پێشەوا بوخاری دەقێكی هێناوەو دەفەرموێت سەرەڕای چاكی بێ ئەندازەیان ئەمەش هەبووەو مەعسوم نەبوون هاوەڵان، ڕەخنەی لێ دەگرێت و دەڵێت باشە بۆچی هاوەڵان مەعسوم نین؟!

## بەڵگەی پێنجەم:

ئۆزۆن ئەم جارەیان چیرۆكێك دێنێت كە لە وەرگێڕانەكەدا(٦) لاپەڕەی بۆ تەرخان كردووە[1]و درێژەی بابەتەكە ئەوەیە كە پێشەوا عەلی و عەبباس(رضي الله عنهما) لەسەر پارچە زەویەك دەبێتە ناكۆكیان و دۆسیەكەیان بردوەتە لای پێشەوا ئەبو بەكر و پاشان دوایی دیسانەوە لەسەردەمی پێشەوا عومەردا ئەیهێننەوەو ئەویش دەفەرموێت: یان ئەبێت ڕازی بن بە حوكمەكەی پێشەوا ئەبو بەكر، یان خۆتان لە نێوان خۆتاندا سوڵح بكەن و پێك بێن.

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: "تاوەكو كار گەیشتوەتە ئەوەی دەستیان كردووە بە شەڕە جنێو و قسەی سووك بەیەك" ع: ١٠٦، ك: ١٨٥

دەڵێم: وشەی(استبا) كە لە دەقی فەرموودەكەدا هاتوەو ئۆزۆن بەوشیوەیە تەفسیری دەكات، هەرگیز لەكەسێكی سەرەڕۆش ناوەشێتەوە جوێن و جوێنكاری و قسەی سووك لە نێوان مامەو برازادا بگۆڕدرێتەوە بەوشێوەیە تاوەكو كار بگاتە ئەوەی ئیمامی عەلی ئەو كارە بكات، بەڵكو ئەوەی كە هاتووە بە یەكتریان وتووە ستەمكارەو ماڵەكەی زەوت كردووم وەكو لە ڕیوایەتەكانی تردا هاتووە، بەڵام پێمان خۆشە ئۆزۆن ئەو جوێن و قسە سووكانەمان بۆ دیاری بكات و پێمان بڵێ چیبووە وا هێندە بە دڵنیاییەوە باسی دەكات دەڵێی خۆی لەوێدا وجودی هەبووە!!

باشە ناكرێت پێمان بڵێت: جوێن و وتەسوكەكان چیبوون گەر ڕاست دەكات و خیانەتی نەكردووە؟!

---

[1] لا: ١٨٠ ـ ١٨٥

پاشان شتێکی ئاساییە دوو هاوەڵ لەسەر شتێك ناكۆكبن و بچنە لای دادگای شەرعی و قازی بڕیاری لەسەر بدات جا ئەگەر ئەوە ڕوو نەدات ئیتر بوونی دادگاو قازی بۆ چی شتێكە؟!

**بەڵگەی شەشەم:**

عَنِ البَرَاءِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِحَسَّانَ: «اهْجُهُمْ – أَوْ هَاجِهِمْ وَجِبْرِيلُ مَعَكَ»[1].

واتە: پێغەمبەر(ﷺ)بە حەسانی فەرموو هەجویان بکە ـ یان وەڵامی هەجوەکەیان بدەرەوە ـ جبریل لەگەڵتایە.

ئۆزۆن ڕەخنەی لەم فەرموودەیە هەیەو دەکرێت ڕەخنەکانی بەم شێوەیە دابەش بکەین[2]:

١ – چۆن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمان بە هەجو(داشۆرین) دەکات لە کاتێکدا ئەو خوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾القلم

**دەڵێم:** وابزانم ئۆزۆن پێی وایە بەهۆی ئەخلاقی جوانی پێغەمبەر(ﷺ) و ڕەحمەتیەوە بۆ هەموو جیهان، ئیتر دەبێت بێدەنگ بێت لە ئاست گشت شتێك و هەرچی ئەوتری با بوترێ و هەرچی دەکرێت بکرێت کەس نابێت هیچ بڵێت، بەڕاستی ئەوەیە(فِقْهُ المَذَلَّةِ) کە ئۆزۆن پەیڕەوی دەکات و ئەیەوێ هەموو ئوممەت گەوج بکات بە وتە خوارەکانی!

بەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردوەو نابێت بێدەنگیش بێت لە ئاست شاعیرەکانی بێباوەڕان و کاتێك بە بەڵگە هاتن بەبەڵگە وەڵامیان ئەدرێتەوەو کاتێك بە شیعرەوە دێن بەشیعر و کاتێکیش بە شمشێرەوە هاتن بە شمشێر وەڵام ئەدرێنەوەو ئەوەتا خوای گەورەش باسی ئەوە دەفەرموێت کە فریشتەکان هاوکاری ئیماندرانن و لەگەڵیاندان: ﴿ إِذْ يُوحِي

---

[1] رواه البخاري (٤/١١٢)، برقم: (٣٢١٣).

[2] ع: ١٠٧، ك: ١٨٦ ـ ١٨٧

رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّى مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ سَأُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلرُّعْبَ فَٱضْرِبُوا۟ فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ وَٱضْرِبُوا۟ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴿١٢﴾الأنفال

جا ئەوەی كە حەسسان كردویەتی وەڵامی دەستپێشخەری ئەوان بوەو وەكو لە دەستەواژەی(وهاجهم) بە ڕوونی دەردەكەوێت چونكە بابی "مُفَاعَلَة" بۆ مشاركەیە لە نێوان دوو كەس یاخود زیاتر، بەڵام ئۆزۆنی ڕەخنەگر لە "سِیْبَوَیْه" تەنانەت شتە سەرەتاییەكانی زمانیش نازانێت، ئەم داشۆرینەش ئەترسم ئۆزۆن بە شیعرەكانی ئەبو نەواس تێگەیشتبێت یاخود ئەوانەی شێخ ڕەزای خۆمان تاوەكو بیكاتە جێی ڕەخنە، خۆ هەموو شیعرەكانی حەسان بەردەستەو ئەتوانن سەیری بكەن و بزانن چی تێدایە، بەڵام ئۆزۆن وەكو ئەو كەسە وایە كە لە شەوی تاردا چیلكە كۆ بكاتەوە لەكاتێكدا مارو دوپشكیشی لێ دەبێتە چیلكەو كۆی دەكاتەوە، جا ئەویش دەست بۆ هەموو شتێك دەبات و وا ئەزانێ بەڵگەیە بۆ ئەوەی پێشەوا بوخاری(رحمه الله) پێ ناشرین بكات، ئیتر نازانم بۆچی ئۆزۆن هێندە خۆی گێل دەكات یان ڕوونتر بڵێین ئەیەوێ خەڵكانی تر گێل بكات بە تێكدانی ئەم ڕاستیانە؟

٢ – حەسان تێوە گلا لە بوهتان بۆ عائشە، باشە تۆ بڵێی لەو كاتەدا حاڵی جبرایل چۆنبوبێت؟

دەڵێم: ئۆزۆن دیسانەوە ئەو پەردەیەی كە بەسەر كەسی نەزانەوەیەو تاوەكو قسە نەكات كەس نازانێت نەزانە لای دەبات بە قسەكردن و ڕەخنەی بێتام، ئەگینا ئەمە كەی وتەی كەسێكی خاوەن ماریفەت و ژیرییە؟

هەموو كەسێكی عاقڵ و ژیر دەزانێت وەكو چۆن لەو ئایەتەی پێشوو هێنامانەوە كە فریشتەكان لەگەڵ ئیمانداراناندا تەنها لەوكاتەدا كە ڕووبەڕووی بێباوەڕان بوونەتەوە، نەك لە هەموو كات و ساتێكدا، جا ئەوەی حەسانیش بەهەمان شێوەو تەنها لەوكاتەدایە، جا ئەگەر لە هەموو باروزروفێكدابێت ئەوا حەسان مەعسوم دەبێت لە هەڵەو پەڵە كە ئەمەش هیچ كەسێكی عاقڵ و ژیر داڵغەی بۆ ناڕوات بێجگە لە ئۆزۆن!!

بەڵێ حەسسان تێوەگلا بەڵام تۆبەی کرد و پەشیمان بویەوەو ئەم چەند بەیتە شیعرەشی وت[1]:

حَصَـــانٌ رَزَانٌ مَـــا تُـــزَنُّ بِرِيبَـــةٍ
وَتُصْـــبِحُ غَرْثَـــى مِـــنْ لُحُـــومِ الْغَوَافِـــلِ
فَـإِنْ كُنْـتُ قَـدْ قُلْـتُ الَّـذِي قَـدْ زَعَمْـتُمُ
فَلَـــا رَفَعَـــتْ سَـــوْطِي إِلَـــيَّ أَنَـــامِلِي
وَكَيْـــفَ وَوُدِّي مَـــا حَيِيـــتُ وَنُصْـــرَتِي
لِـــآلِ رَسُـــولِ اللَّـــهِ زَيْـــنِ الْمَحَافِـــلِ
لَـــهُ رَتَـــبٌ عَـــالٍ عَلَـــى النَّـــاسِ كُلِّهِـــمْ
تَقَاصَـــرُ عَنْـــهُ سَـــوْرَةُ الْمُتَطَـــاوِلِ
فَـــإِنَّ الَّـــذِي قَـــدْ قِيـــلَ لَـــيْسَ بِلَـــائِطٍ
وَلَكِنَّـــهُ قَـــوْلُ امْـــرِئٍ بِـــي مَاحِـــلِ

[1] البداية والنهاية (٦/٢٠٣-٢٠٤).

بەڵگەی حەوتەم:

"يَقُولُ: أَخْبَرَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ، قَالَ: إِنَّكُمْ تَزْعُمُونَ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ يُكْثِرُ الحَدِيثَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَاللَّهُ المَوْعِدُ إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مِسْكِينًا، أَلْزَمُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى مِلْءِ بَطْنِي، وَكَانَ المُهَاجِرُونَ يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ، وَكَانَتِ الأَنْصَارُ يَشْغَلُهُمُ القِيَامُ عَلَى أَمْوَالِهِمْ، فَشَهِدْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ، وَقَالَ: «مَنْ يَبْسُطْ رِدَاءَهُ حَتَّى أَقْضِيَ مَقَالَتِي، ثُمَّ يَقْبِضْهُ، فَلَنْ يَنْسَى شَيْئًا سَمِعَهُ مِنِّي» فَبَسَطْتُ بُرْدَةً كَانَتْ عَلَيَّ، فَوَالَّذِي بَعَثَهُ بِالحَقِّ مَا نَسِيتُ شَيْئًا سَمِعْتُهُ مِنْهُ"[١].

فەرموودەكە باس لەوە دەكات كە ئەبوهورەیرە(ﷺ) دەفەرموێت: بەهۆی ئەوەوە فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە كە ئەو تەنها خەریكی بیستنی فەرموودەكان و كۆكردنەوەی بوەوكەسێكی هەژاربووە، ئەنساریەكان خەریكی گەڕان بوون بە بازاڕو خەریكی باخداری و ئیش و كاری ڕۆژانەیان بوون و ئەوە بوەتە هۆی ئەوەی كە فەرموودەی كەمتر بگێڕنەوە.

نازانم ئەمە چی ڕەخنەیەكی تێدایەو لەكوێی سەرباسەكەی ئۆزۆندا جێی دەبێتەوە، بەهەرحاڵ ئۆزۆن ڕەخنەی لێ دەگرێت و دەڵێت[٢]:

١ – فەرموودەكە باسی دانایی ئەبوهورەیرەیەو شاهیدیش هەر خۆیەتی و بە سوێند دووپاتی دەكاتەوە.

دەڵێم: ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی ئەبوهورەیرەو متمانەی هاوەڵان پێی وا داوای شاهیدیی لێ ناكەن لەسەر وتەكەی و ئەمەش هەموو وتەكانی پێشووی ئۆزۆن لەسەر ئەم هاوەڵە بەڕێزە بەدرۆ دەخاتەوە، هەروەها لەلایەكی تریشەوە هاوەڵان خۆیان

---

[١] رواه البخاري (١٠٨/٩)، برقم: (٧٣٥٤).

[٢] ع: ١٠٨، ك: ١٨٨-١٨٩

دان بەو ڕاستیەدا دەنێن، ئەوەتا ئیبن عومەر(رضي الله عنه) دەفەرموێت: «أَنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ كُنْتَ أَلْزَمَنَا لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَعْلَمَنَا بِحَدِيثِهِ»[1].

واتە: ئەی ئەبو هورەیرە تۆ لەهەموان زیاتر لەگەڵ پێغەمبەری خوابووی، هەروەها زاناترینیشمانی بە فەرموودەكانی.

هەروەها "ئەبو تەڵحەی ئەنساری"ش(رضي الله عنه) دەفەرموێت: «وَاللَّهِ(مَا يَشُكُّ)[2] أَنَّهُ سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا لَمْ نَسْمَعْ وَعَلِمَ مَا لَمْ نَعْلَمْ إِنَّا كُنَّا قَوْمًا أَغْنِيَاءَ لَنَا بُيُوتٌ وَأَهْلُونَ، كُنَّا نَأْتِي نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَرَفَيِ النَّهَارِ، ثُمَّ نَرْجِعُ، وَكَانَ(أَبَا)[3] هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مِسْكِينًا لا مَالَ لَهُ وَلا أَهْلَ وَا وَلَدَ، إِنَّمَا كَانَتْ يَدُهُ مَعَ يَدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَ يَدُورُ مَعَهُ حَيْثُمَا دَارَ، وَلا يَشُكُّ أَنَّهُ قَدْ عَلِمَ مَا لَمْ نَعْلَمْ وَسَمِعَ مَا لَمْ نَسْمَعْ، وَلَمْ يَتَّهِمْهُ أَحَدٌ مِنَّا أَنَّهُ تَقَوَّلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا لَمْ يَقُلْ»[4].

واتە: سوێند بە خوای گەورە گومان ناكرێت لەوەی ئەو(واتە ئەبوهورەیرە) شتانێكی لەپێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بیستووە كە ئێمە نەمانزانیوە، زانیویەتی كە نەمانبیستووە، ئێمە دەوڵەمەندبووین و خاوەن ماڵ و منداڵبووین، ئێمە لە بەیانی و ئێوارەدا ئەهاتینە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و پاشان دەگەڕاینەوە، بەڵام ئەبو هورەیرە(رضي الله عنه) هەژاربوو، نەماڵی هەبوو نە منداڵ و دەستی بە دەستی پێغەمبەری خواوەبوو(صلى الله عليه وسلم) بۆ هەرشوێنێك بڕۆیشتایە لەگەڵی دەڕۆیشت.

---

[1] رواه أحمد (٢١/٨)، والترمذي (١٦٥/٦)، برقم: (٣٨٣٦)، والحاكم في المستدرك (٥٢٤/٣)، برقم: (٦١٦٧) وصححه و وافقه الذهبي، وغيرهم.

[2] هەڵەی چاپەو دەبێت: (مَا يُشَكُّ) بێت بە مەبنی مەجهول، والله أعلم.

[3] هەڵەیە و لە چاپی (المستدرك) هاتووە، ئەبێت بوترێت (أبو) چونكە "اسم"ی "كان" مەرفوعە.

[4] رواه الحاكم في المستدرك (٥٨٥/٣)، برقم: (٦١٧٢)، وصححه ووافقه الذهبي، والترمذي (١٦٦/٦)، برقم: (٣٨٣٧) ،وضعفه الألباني، ومسند أبي يعلى (١٠/٢) برقم: (٦٣٦)، ت: حسين سليم أسد، الناشر: دار المأمون للتراث – دمشق-، الطبعة: الأولى، ١٤٠٤ – ١٩٨٤. صحح محققه.

هەروەها هیچ كام لە ئێمە تۆمەتباری نەكردووە بەوەی شتانێك بەدەم پێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەڵێت كە نەیوتووە.

ئەو بەشەی كۆتایی بخوێنەوە زۆر بەجوانی و بیر لـە بوهتانە كۆنەكانی ئۆزۆنیش بكەرەوە كە بۆ ئەم هاوەڵە خۆشەویستەی هەڵبەستبوو كە گوایە لـەلای هاوەڵان تۆمەتبار كراوەو یەكەم ڕاوی بووە كە قسەی لـەسەر كرابێت!!

٢ – فەرموودەی فەزڵ ی كوڕی عەبباسیش ئۆزۆن كە ڕەخنەی لـێ دەگرێت، ئەبو هورەیرە خۆی دەفەرموێت من ڕاستەوخۆ لـە پێغەمبەری خوام(ﷺ) نەبیستووە، جا ئەمەش لـە ناو هاوەڵاندا باوبووە كە كەسێكیان شتێكی لـە پێغەمبەر(ﷺ) بیستبێت ئەوانی تریش بەهۆی متمانەیان بەیەكتر لـەوی تریان گێڕاوەتەوە.

٣ – وەسفی ئەنسار دەكات بەوەی كە مەشغوڵی دنیابوون و دینداری و زانستیشیان جێهێشتووە بۆ ئەبوهورەیرە.

دەڵێم: ئەم وتەیەی ئۆزۆن تەنها لـێكدانەوەی كەسێكی كیناویی دلڕەقە، ئەگینا هیچ ئەو مانایەی نییە بەڵكو باسەكە زۆری گێڕانەوەیە وەكو دەفەرموێت: ( إِنَّكُمْ تَزْعُمُونَ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ يُكْثِرُ الحَدِيثَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

واتە: ئێوە وا گومان دەبەن كە ئەبو هورەیرە زۆر فەرموودە لـە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە.

ئیتر باسی هۆكارەكەی دەكات و دەفەرموێت من لـەبەر ئەوە زیاترم گێڕاوەتەوەو هاوەڵانی تریش خۆیان دان بەو ڕاستیەدا دەنێن و ئەبو هورەیرەش نەیوتوە ئەوان وازیان لـە سوننەت و ئاین هێناوە بە تەواوی و بۆ منیان جێهێشتووە، بەڵكو فەرموویەتی هاوەڵانی تر وەكو من نەیانتوانیوە بە تەنها خەریكی كۆكردنەوەو گوێگرتنی سوننەتبن لـەبەر سەرقاڵییان.
ئیتر نازانم بڵێم چی بە ئۆزۆن هاوەڵان خۆیان دانی پێدا دەنێن بەڵام ئۆزۆن ئینكاری دەكات؟!

هەروەها ئەمە دیسانەوە چەواشەو خیانەتێكی تری ئۆزۆنیش بەدیار دەخات كە لـەوەو پێش وتی سەرچاوەی سەرەكی داهات و بژێوی ژیانی هاوەڵان بریتی بووە لـە تاڵانی و

غەنیمەت، ئەوەتانێ خۆی وتەكەی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە بەوەی كە لەم فەرموودەیە باس لەوەكراوە هاوەڵان خەریكی ئیش و كاربوون بۆ دابینكردنی بژێوی!!

### بەڵگەی هەشتەم:

عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ، قَالَ: ذَهَبْتُ لأَنْصُرَ هَذَا الرَّجُلَ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ أَيْنَ تُرِيدُ؟ قُلْتُ: أَنْصُرُ هَذَا الرَّجُلَ، قَالَ: ارْجِعْ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «إِذَا التَقَى المُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالقَاتِلُ وَالمَقْتُولُ فِي النَّارِ»، فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا القَاتِلُ فَمَا بَالُ المَقْتُولِ قَالَ: «إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ»[١].

واتە: ئەحنەفی كوڕی قەیس فەرمووی: ڕۆشتم بۆ ئەوەی ئەو پیاوە سەر بخەم(عەلی كوڕی ئەبی تالیب) و "ئەبو بەكرە"م پێگەیشت و فەرمووی: چیت ئەوێ؟ منیش وتم: ئەمەوێ بچم ئەو پیاوە سەربخەم، وتی بگەڕێرەوە چونكە من لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە كە فەرموویەتی: "ئەگەر دوو مسوڵمان شمشێر بەرەو ڕووی یەكتر بكەنەوە ئەوا بكوژو كوژراو لە ئاگردایە، وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو بكوژەو ئەی كوژراو بۆ؟ فەرمووی: چونكە ئەویش پێداگربووە لەوەی براكەی بكوژێت.

ئۆزۆن ئەیەوێ چی بڵێت و چی ڕەخنەیەك بگرێت لەم فەرموودەیە چونكە ماناكەی تا بڵێی جوانەو ڕێگری دەكات لە ڕشتنی خوێن بەبێ تاوان؟ هیچی دەستنەكەوتووە لەم فەرموودەیە كە بیكاتە مایەی ڕەخنە، ناچار هاتوەو دەڵێت شەڕو كوشتاری هاوەڵان ئەچێتە چوارچێوەی ئەم فەرموودەیەو ڕەخنە دەگرێت لەوەی كە هاوەڵان تاوانبار نەبوونو بەڵكو ئەوانیش ئەبێت ڕەوانەی ئاگر بكرێن[٢].

دەڵێم: ئەگەر هاوەڵان نیازی یەكتر كوشتنیان هەبوایەو بۆ ئەوە دەرچوونایەو بەنیازی خوێن ڕشتن بوونایە ئەوا ئێمەش شەرمان نەدەكرد لەوەو هەمان وتەمان ئەبوو، بەڵام

---

[١] رواه البخاري (١/١٥)، برقم: (٣١).
[٢] ع:١٠٩ - ١١٠، ك: ١٩٠ - ١٩٢

هەموو ئەو ڕیوایەتانەی باسی شەڕەكان دەكەن ئەوە بەدیار دەخەن كە ئاشوبگێڕ و ئاژاوە چیەكان بەسەر سوپای پێشەوا عەلی و معاویەدا(ﷺ) دابەشبوون و ئەوان بۆ پیلانگێڕی چوونە هەردوو لاو دابەشبوون و لەوكاتەی دانووستان نزیك بویەوەو وەختبوو ڕێك بكەون، لەكاتێكدا زانیان ڕێككەوتن بە هیچ شێوەیەك لە بەرژەوەندی ئەوان نییە ئیتر بوونە هۆی هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگ.

پیلانەكەشیان بەوشێوەیە بوو كە لە هەردوولاوە ئەوان دەستی خۆیان بوەشێنن و هەم سوپای عەلی وابزانێت معاویە خیانەتی كردوەو هەم معاویەش وەها گومان بەرێت كە عەلی خیانەتی كردووە، بۆیە هەریەكێك لە معاویەو عەلی كە بینیان هێرشیان كراوەتە سەر ئیتر شەڕیان ڕاگەیاندو ئەو كارەساتانەی لێكەوتەوە.

هەر لەبەر ئەمەشە زانایان دەفەرموون هەردوو لایان لەسەر حەقبوون لە ئیجتهادیان و كوژراوی هەردوو لا بە ویستی خوای گەورە دەچێتە بەهەشتەوە، نەوەك ئەوان سووربوبێتن لەسەر كوشتاری یەك و ئێمەش بڵێین ئەچنە بەهەشتەوە، ئیتر نازانم ئەو هەموو چەواشەیە چیە كە ئۆززۆن دەیكات و بێ ڕێزیش دەكات بەرامبەر زانایان و بە چەندین وەسفی ناشرین وەسفیان دەكات، بەهەرحاڵ من داوای ئەدەب ناكەم لە ئۆززۆن بەرامبەر زانایان چونكە ئەو بەرامبەر پێغەمبەری خواو(ﷺ) هاوەڵان(ﷺ) و دایكی ئیمانداران نەیبوو ئیتر بەرامبەر زانایان چاوەڕوانی چیبم؟!

پاشان دوای سنووربەزاندنێكی زۆر ئۆززۆن دەڵێت: "هاوەڵان لە قسە ڕاست و دروستەكانی پێغەمبەر ئەوەیان دیوە كە بۆ سات و سەردەم و شوێنی خۆیەتی و نەك شتێك كە بۆ هەموو سەردەم و كاتێك دەبێت" ع: ١١٠-١١١، ك: ١٩٣

دەڵێم: بەمە ئیتر ئۆززۆن تەواو پەردە لەسەر خۆی ڕادەماڵێت و ئیتر پێویستی بەم هەموو شێرو ڕێویەی پێشوو نەبوو كە دەیوت: فەرموودە دەستكاری كراوەو وەكو خۆی نەگەیشتووە بە ئێمە، وا ئێستا بە ئاشكرا دەڵێت تەنانەت ئەوانەشی كە ڕاست و دروستن هاوەڵان بەس بۆ سەردەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەكاریان هێناوەو تەنانەت لەكاتێكدا دڵنیاش بوون كە وتەی پێغەمبەرە(ﷺ) دوای وەفاتی بەكاریان نەهێناوە!!

جا ئەم وتەیەی ئۆزۆن لەسەر ئەو فەرموودەی پێشووە، باشە تۆ بڵێی تەنها بۆ سەردەمی خۆی فەرمویبێتی ئەگەر دوو كەس مەبەستی كوشتنی یەكیان هەبێت ئەوا ئەچنە دۆزەخەوەو ئیتر دوای ئەوە ئەم حوكمە نەمابێت و هاوەڵانیش وەها تێگەیشتبن؟!

من گومانم نییە لەوەی كە ئۆزۆن یان زۆر نەزانە بە تێگەیشتن لە دەقەكان، یان زۆر كەسێكی خیانەتكارو شێوێنەرە!

پاشان ئۆززۆن ئەم فەرموودەیە دێنێ و دەڵێت هاوەڵان فەرموودەیان بە ئاین نەزانیوە، فەرموودەكەش[1]: "عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ قَالَ: يَوْمُ الخَمِيسِ وَمَا يَوْمُ الخَمِيسِ؟ ثُمَّ بَكَى حَتَّى خَضَبَ دَمْعُهُ الحَصْبَاءَ، فَقَالَ: اشْتَدَّ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَعُهُ يَوْمَ الخَمِيسِ، فَقَالَ: «ائْتُونِي بِكِتَابٍ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ أَبَدًا»، فَتَنَازَعُوا، وَلاَ يَنْبَغِي عِنْدَ نَبِيٍّ تَنَازُعٌ، فَقَالُوا: هَجَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: «دَعُونِي، فَالَّذِي أَنَا فِيهِ خَيْرٌ مِمَّا تَدْعُونِي إِلَيْهِ»، وَأَوْصَى عِنْدَ مَوْتِهِ بِثَلاَثٍ: «أَخْرِجُوا المُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ العَرَبِ، وَأَجِيزُوا الوَفْدَ بِنَحْوِ مَا كُنْتُ أُجِيزُهُمْ»، وَنَسِيتُ الثَّالِثَةَ"[2].

كورتەی ڕووداوەكە باسی ئەوە دەكات كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) كاتێك لەسەرە مەرگدایەو نەخۆشی زۆری بۆ دێنێ و ئازارێكی زۆری هەیە، داوای پەڕاوێك دەكات كە بیهێنن و چەند شتێكیان پێ بڵێ بۆ ئەوەی بینووسنەوە، و هاوەڵانیش هەندێكیان وەكو ئیمامی عومەر(رضي الله عنه) ڕای وایە كە لەو بارو زروفەدا پەڕاوەكە نەهێنرێت و ئەگەر هەرشتێك بێت ئەوا ڕوونكراوەتەوەو ئەگەر نوێش بێت ئەوا بەدڵنیاییەوە پێیان ئەگات، هەندێكی تر پێیان وایە كە ئەبێت بیهێنن بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەگوێی بكەن، ئیتر لەو كاتەدا جۆرێك لە ئاڵۆزی و شڵەژان ڕوو دەدات و دوایی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەند وەسێتێكیان بۆ دەكات و لەوانە دەفەرموێت هاوەڵ بڕیار دەران لە دوورگەی عەرەبی بكەنە دەرەوە.

**دەڵێم**: ئەمەش هەوڵێكی تری ئۆزۆنە بۆ ئەوەی مەرامی خۆی بێنێتە دی كە گوایە هاوەڵان فەرموودەكانی پێغەمبەریان(ﷺ) بە ئاین نەزانیوەو لایان بێبایەخ بووە، جا لێرەدا

---

[1] ع:١١١، ك:١٩٤ـ١٩٥

[2] رواه البخاري (٤/٦٩)، برقم: (٣٠٥٣).

پێش ئەوەی كە بێمە سەر وەڵامی ئەم ڕووداوە، دەڵێم پێویستە ئەم چەند خاڵە بهێنیتە یادی خۆت:

١ – فەرموودە بە دەقی ئایەتی قورئان واجبە شوێنكەوتنی و لە پێشتردا چەندین بەڵگەی حاشاهەڵنەگرمان لەوبارەیەوە باسكرد.

٢ – هاوەڵان لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) فەرموودەكانیان نووسیوەتەوەو ڕێگریشی نەكردووە لێیان.

٣ – هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەر بابەتێك بهاتایەتە پێشەوە پرسیاری ئەوەیان ئەكرد ئایا هیچ كەسێكیان فەرموودەیەكی لایە لەوبارەیەوە، جا ئەمەش چەندین جار لە پێشەوا ئەبوبەكرو عومەرەوە(ﷺ) هاتووە بە پێشچاوی هەموو هاوەڵانەوە پرسیاریان كردووەو زۆرێكی لە وتاری هەینیدابووە.

٤ – دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) چەندین كۆڕی هاوەڵان هەبوو كە فەرموودەیان دەگێڕایەوەو كەسیش ڕێگری لیٚ نەكردوون.

٥ – هەموو ئوممەت لەسەر ئەوەن كە فەرموودە بەڵگەیەو پێویستە شوێنی بكەوین.

جا ئیتر هەر شتێك پێچەوانەی ئەم هەموو بەڵگەیەبێت پێویستە ئەو بەلاوە بنرێت و ئاوڕی بۆ نەدرێتەوە.

لە وەڵامی ئەو چیرۆكەشدا دەڵێین: بەدڵنیاییەوە ئەو پێنج خاڵەی كە باسمانكرد بەسە بۆ ئەوەی كە وەڵامی ئۆزۆن و هاوشێوەكانی پێبدرێتەوەو ئەو گومانە لابدرێت كە گوایە هاوەڵان فەرموودەیان بە ئاین نەزانیوە، بەڵكو ئەوەی كە ڕوویداوە بەهۆی ترسیان لە ناجێگیری باری تەندروستی پێغەمبەری خوابووە(ﷺ) یان هەر شتێكی ترو پێشەوا عومەر(ﷺ) بەوە بیانوو دێنێتەوە كە قورئانیان بەسە.

هەروەها لەلایەكی تریشەوە ئەگەر ئەو وتەیە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی لە بابەتی حەڕام و حەڵاڵ بوایە ئەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەیفەرموو، چونكە دوای ئەوە وەسێتی كرد بە چەند شتێك و ئەگەر شتێك بوایە كە پێشتر باسی نەفەرمویێت ئەوا ئەوكاتە

ئەیفەرموو، یان كێ ئەڵێ ئەوەی كە ویستویەتی بیڵێ ئەو سێ وەسێتەی سەرە مەرگی نەبوبێت؟!

## ئافرەت لە فەرموودەدا!

ئۆزۆن ئەیەوێ بەناوی پێشەوا بوخاریەوە تانە بدات لە شەریعەتی پاك و بەرزی ئیسلام و هەندێك بابەت دەوروژێنێت كە پەیوەندی بە ئافرەتەوە هەیەو دەلێت:

"بەدەر لەو هەموو پینەو پەرۆیانەی زانا بەرێزەكان كردویانە كەسێك بڕوانێتە سەحیحی بوخاری و سەرچاوەكانی تریش بۆی دەردەكەوێت ئافرەت هاوشانی پیاو نیەو هەمیشە لە ڕیزی دواوەیە" ع: ١١٣، ك: ١٩٧

دەلێم: ئافرەت هەرگیز بەوشێوەیە نەبووە لە فەرموودەدا كە ئۆزۆن باسی دەكات و هەرگیز وەهاش وێنا ناكرێت، بەلكو ئافرەت ئەوپەڕی ڕێزو گەورەیی و قەدری هەیە لە ئیسلامداو پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەندین فەرموودەی هەیە دەربارەیان و ئەوپەڕی مافی پێیان داوەو ڕێزی لێناون هەر ئەوانن لە فەرموودەیەكدا بەهەشتیان لەژێرپێدایەو ئەوەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) كاتێك كەسێك دێت ئەیەوێ بچێت بۆ غەزا و ئەویش دەفەرموێت: دایكت ماوە؟ دەلێت: بەلێ، پێغەمبەریش(ﷺ) دەفەرمویت: خزمەتی قاچەكانی بكە، چونكە بەهەشت لەژێر پێیدایە. عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ جَاهِمَةَ السَّلَمِيِّ، أَنَّ جَاهِمَةَ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَدْتُ أَنْ أَغْزُوَ وَقَدْ جِئْتُ أَسْتَشِيرُكَ، فَقَالَ: «هَلْ لَكَ مِنْ أُمٍّ؟» قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَالْزَمْهَا، فَإِنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ رِجْلَيْهَا»[١].

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەخێوكردنی كچان و گەورەكردنیانی بە شێوەیەكی باش كردوەتە كەفیلی بەهەشت هەروەكو دەفەرموێت: عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ» وَضَمَّ أَصَابِعَهُ"[٢].

---

[١] رواه النسائي (١١/٦)، برقم: (٣١٠٤)، وصححه الألباني، مسند ابن أبي شيبة (٥٨/٢)، برقم: (٥٦٣)، السنن الكبرى للبيهقي (٢٧٢/٤)، برقم: (٤٢٩٧) ،والحاكم في المستدرك على الصحيحين (١١٤/٢)، برقم: (٢٥٠٢)، وصححه و وافقه الذهبي.

[٢] رواه مسلم (٢٠٢٧/٤)، برقم: (٢٦٣١).

واتە: هەركەسێك دوو كیژۆڵە بەخێوبكات تاوەكو گەورە دەبن ئەوا لە ڕۆژی دوایدا من و ئەو ئاوەهاین، پاشان پەنجەكانی نا بەیەكەوە.

ئاماژەیە بەوەی كە وەكو چۆن ئەو دوو پەنجە پێكەوەن ئەوا ئەو كەسە لەبەهەشتدا بەو شێوە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەبێت.

هەروەها لەفەرموودەیەكی تردا دەفەرموێت هەركەسێك چاكەیان لەگەڵدا بكات و لەگەڵیاندا باشبێت ئەوا ئەو دوو كچە دەیخەنە بەهەشتەوە: عن ابن عباس رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَا مِن مُسلم تُدركه ابْنَتَانِ فَيُحْسِنُ صحبتَهُما إلا أدخلتاه الجنة)[1].

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەیانچوێنێ بە گەوهەرو دەفەرموێت نەرم و نیانبن لەگەڵ گەوهەرەكاندا: (وَيْحَكَ ارْفُقْ بِالْقَوَارِيرِ)[2].

ئەمە دڵۆپێكە لەدەریای گەورەیی ئافرەت و وەسفی زۆریان لەسەرچاوەكاندا بە پێچەوانەی وتە بێ ماناكانی ئۆزۆن كە ئەیەوێت خوێنەرانی پێ چەواشە بكات، و كۆمەڵێك فەرموودەی هێناوەو ئەیەوێت لەسایەی ئەو فەرموودانەوە پێمان بڵێ كە ئافرەت مافی نیەو بە شتێكی بێزراو ناوی هاتووە، بەڵام ئەگەر بێیت و خوێندنەوەیەك بۆ كۆی فەرموودەكان بكەیت ئەبینیت كە ئەو شكۆو ڕێزەی ئیسلام بۆ ئافرەتانی دەستەبەركرد و ئەوەی كە پێغەمبەری خوا(ﷺ)پێی داون لە ماف هەرگیز نەدەبوونە خاوەنی ئەگەر خوای گەورە ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەی (ﷺ) نەناردایە، جا لەوە زیاتر لەسەر ئەم باسە ناڕۆین و ئەچینە لای وتەو بەڵگەكانی ئۆزۆن و بزانین چی لە ژێرسەردایە.

ئۆزۆن دەڵێت: "بانگخوازان بەتێكڕا سەركەوتووبوون بە تێكڕای ئاستەكانیانەوە لە چاندنی گرێی خۆبچوككردنەوە لە ناخی ئافرەتاندا لەبەرامبەر پیاواندا‌و ئەوەش بە تایبەتمەندی بزانن، تەنانەت تۆ دەبینی مامۆستاو ئەندازیار و زانای زەرە دان بەوەدا دەنێ

---

[1] الأدب المفرد للبخاري، ص: (٤٥)، برقم: (٧٧)، وحسنه الألباني.

[2] رواه أحمد في المسند (٢٠/٦٤)، برقم: (١٢٧٦١)، قال محققه: اسناده على شرط الشيخين، الأدب المفرد، ص: (١٤٠)، برقم: (٢٦٤)، وصححه الألباني .

كە پیاو لەو باشترەو(قوامە)ی هەیە بەسەریەوە ئەگەرچی پیاوەكە پێویستی بەكەمترین ئاستی زانستی بێت" ع: ١١٣-١١٤، ك: ١٩٧-١٩٨

دەڵێم: كەسێك سەیری ژیانی مرۆڤایەتی بە تێكڕا بكات ئەبینێت ژن و پیاو هاوژینی یەكترن و یەكتر تەواو دەكەن، سەبارەت بەو(قِوَامَة)ش كە ئۆزۆن باسی دەكات بەڵێ هەموو مسوڵمانێك بڕوای پێی هەیەو ئەوەش تەكلیف و ئەركە نەوەك بەخشش و ڕێزلێنانی پیاوان بەسەر ئافرەتاندا!!

هەروەها خوای گەورەش(ﷻ) لەقورئانی پیرۆزدا باسی دەفەرموێت: ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ...﴿٣٤﴾﴾النساء

ئەوەتانێ خوای گەورە لەو ئایەتەدا زۆر بە ڕوونی باسی فەرموو كە تەنها بریتییە لە بژێوی وەكو لە(وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ) دەردەكەوێت زۆر بە ئاشكرا، ئیتر ئەمە خۆ ئایەتی قورئانە نەوەك سەحیحی بوخاری و نەوەك فەرموودە!!

ئافرەتی مسوڵمان ئەركی ئەوەیە كە خێزان پەروەردە بكات و نەوەو وەچەی باش بنێرێتە كۆمەڵگەو ئەو كارەش گەورەترین و گرنگترین ئەركە كە ئەمڕۆ لە دنیای مادە هیچ بایەخ و ئەرزشێكی نەماوە و بۆیە ئاوەها وێران بوون، جا لەبەر ئەوە خوای گەورە ئەو ئەركەی خستوەتە سەرشانیان چونكە ئەوان توانایەكی لەڕادەبەدەریان هەیەو زۆر هێمن و لەسەرخۆن و ئەم تایبەتمەندیەش لە كەمترین پیاودا هەیە، لە كاتێكدا بوونی ئەم خاڵەش زۆر پێویستە بۆ پەروەردەو فێركردن لە گشت ئاستەكاندا، بۆیە دەبینین ئەم كارە دراوەتە ئافرەتان و ئەبێت ئەوان پێی هەستن و لەبەرامبەردا پیاوانیش هەڵدەسن بە دابینكردنی كەش و هەوایەكی ئارام و ئەوەی كە پێویستە لە گوزەران و ئەمەش بریتییە لەو(قوامە)یە، ئیتر من نازانم ئەمە بۆچی ئەبێت مایەی ڕەخنەبێت؟!

هەروەها لەلایەكی تریشەوە پیاوان سەرپەرشتی خێزانەكان دەكەن و دەیانپارێزن و ئەمەش شتێكی حاشا هەڵنەگرە كاتێك كە لە خێزانێكدا پیاو نەمێنێت بەتەواوی شیرازەی

خێزان تێك دەچێت لە ڕووی بەڕێوەبردن و مامەڵەكردن لەگەڵ ئەو شتانەی دێتە پێشەوە، ئەگەر ئافرەتیش لەناو خێزاندا نەما ئەوا ئەو خێزانە لەڕووی پەروەردەوە بۆشاییەكی گەورەی تێدەكەوێت و ئەمانەش پێویست بەبەڵگەهێنانەوە ناكات چونكە ڕۆژانە دەیبینین و دەیبیستین.

بەڵام ئۆزۆن گەزراوە بە بۆچوونی ڕۆژئاواو دابونەریتیان و وەكو چۆن ئەوان بەناوی ئازادی و مافی ئافرەتەوە هەموو ژنانیان لەماڵ هێنایە دەرەوەو ئیش و كاری ماڵیش و دەرەوەشیان پێ دەكەن و دوو هێندە كاروباری سەرشانیان قورسكردن!!

وا ئۆزۆنیش هاتووەو بووەتە هەڵگری ئەم بانگەشە پوچەی ڕۆژئاوا كە لە بارگرانی زیاتر شتێكی نەهێنا بۆ ئافرەتان؟

ئەمە لە كاتێكدا جمهوری زانایان دەفەرموون: تەنانەت خزمەتكردنی مێردەكەشی واجب نییە لەسەری و بەڵكو دەتوانێت خزمەتكارێك بگرێت، هەروەكو هاتووە: "لاَ خِلاَفَ بَيْنَ الْفُقَهَاءِ فِي أَنَّ الزَّوْجَةَ يَجُوزُ لَهَا أَنْ تَخْدُمَ زَوْجَهَا فِي الْبَيْتِ ... فَذَهَبَ الْجُمْهُورُ(الشَّافِعِيَّةُ وَالْحَنَابِلَةُ وَبَعْضُ الْمَالِكِيَّةِ) إِلَى أَنَّ خِدْمَةَ الزَّوْجِ لاَ تَجِبُ عَلَيْهَا لَكِنَّ الأَْوْلَى لَهَا فِعْل مَا جَرَتِ الْعَادَةُ بِهِ"[1].

واتە: خیلاف نییە لە نێوان زانایاندا كە ئافرەت دەتوانێت خزمەتكار بگرێت بۆ خزمەتی مێردەكەی لە ماڵەوە... جمهوری زانایان(شافیعی و حەنبەلی و هەندێك لە مالیكیەكان) ڕایان وایە كە خزمەتكردنی پیاو لەسەر ئافرەت واجب نییە بەڵام باشتر وایە عادەت چۆنە ئەویش وەها بكات.

وەكو دەبینین ئافرەت وەكو پادشا وایەو واجبە پیاو خزمەتی بكات، بەڵام لەسەر ئەو واجب نییە تەنانەت خواردنیش دروست بكات، ئەركی ئەو پەروەردەكردنی وەچەی باشە بۆ كۆمەڵگا بۆ ئەوەی وەكو كۆمەڵگە ئەورووپیەكان تووشی داڕوخانی ڕەوشت نەیەت!

---

[1] الموسوعة الفقهية الكويتية (١٩/٤٤)، صادر عن: وزارة الأوقاف والشئون الإسلامية – الكويت، الطبعة: (من ١٤٠٤ – ١٤٢٧ هـ)، الطبعة الثانية، دارالسلاسل – الكويت.

جا هەر لەو ڕوانگەیەوە بزانین ئۆزۆن دوای ئەوەی بانگی ئافرەتان دەكات  كە لەو كۆت و زنجیرە وەهمیەی كە خوڵقاندویەتی بێنە دەرەوەو ئەگەر پیاوان قسەیەكیان كرد با ئەوان دوان بكەن و بزانین بۆچی وا دەكات؟

دەڵێ: "دوا وتەم كە لێرەوە بە ئافرەتی بڵێم(كە پڕ بەدڵ خۆشمدەوێ لەبەرئەوەی دایك و خوشك و هاوسەرو كچمە **هاوڕێ** و هاوكارو ژیانمە" ع: ١١٤، ك: ١٩٨

وردە وردە وا ئۆزۆن دێت ئەیەوێ هانی ئافرەتان و پیاوانی مسوڵمان بدات كە هاوڕێی ڕەگەزی بەرامبەریشیان هەبێت و چی كێشەیەكی تێدایە با ئەوانیش هەروەكو ڕۆژئاوا بن و هیچ شیرازەیەكیان بۆ نەمێنێتەوە؟ با ئۆزۆن ئەم وتانە بۆ ئەو كۆمەڵگانە بكات كە دارِناوە لە ئیسلام و هەموو بەهایەك.

هاوڕێیەتی نێوان كچ و كوڕ لە هیچ شوێنێكی ئیسلامدا جێگەی نابێتەوەو ڕەوا نیەو سەردەكێشێت بۆ چەندەها جۆری خراپەو تاوان، بەڵام من سەیرم دێت لەوەی كە ئۆزۆن چەندە بێ شەرمەو بە ئاشكرا ئەم وتانە دەڵێت! سەیریش نییە چونكە ئەو گوێی بە هیچ شتێك نەداوە لە ئەلیف تاوەكو یائی كتێبەكەی و هەموو شتێكی خراپ و نەشیاوی كردووە.

بەڵام مافی خۆمە بپرسم ئایا ئۆزۆن بۆ هاوڕێگرتنی كچانو خۆشویستنیان چی بەڵگەیەكی لە قورئانی پیرۆزدا هەیە؟!

پاشان ئۆزۆن دێت و كۆمەڵێك بەڵگەی بۆمان هێناوە كە فەرموودە مافی ئافرەتی نەداوە:

## فەرموودەی یەكەم: فریشتە نەفرینی لە ئافرەت دەكات!!

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِذَا بَاتَتِ المَرْأَةُ مُهَاجِرَةً فِرَاشَ زَوْجِهَا، لَعَنَتْهَا المَلاَئِكَةُ حَتَّى تَرْجِعَ»[1].

واتە: ئەگەر ئافرەت شەو جێگەی مێردەكەی جێ بهێڵێت، ئەوا فریشتەكان نەفرینی لێ دەكەن تاوەكو ئەگەڕێتەوە.

ئۆزۆن كۆمەڵێك ڕەخنەی لەم فەرموودەیە هەیە[2]:

١ – فریشتە هاوكاری مێردەو پشتگیریان لێ دەكەن دژی ژنەكانیان و ژن پێویستە هەموو كات و بێ سێو دوو ئەبێت وەڵامی بداتەوەو، باشە ئەی ئەگەر پیاو دەستی نا بەڕووی ئافرەتەوە چی؟

دەڵێم: ئایا ئەم فەرموودەیە تەنها بۆ ئافرەتانەو پیاوان ناگرێتەوە؟ بۆ هەموو كاتێكەو هەرگیزو لە هیچ بوارێكدا ئافرەت بۆی نییە وەڵامی مێردەكەی نەداتەوە؟

لەوەڵامی ئەم وتانەدا دەڵێین:

ئەم فەرموودەیە لە كاتێكدایە كە پیاو تەواوی مافەكانی ئافرەت بداتو هیچ شتێك كە لەتواناشیدا هەیە نەیهێڵێتەوەو بۆی جێبەجێ بكات، لەبەرامبەردا ئەو ئافرەتەش بەبێ هیچ پۆزشێك و بەبێ هیچ هۆكارێك ئامادە نەبێت كە وەڵامی مێردەكەی بداتەوەو پشتی تێ بكات ئا لەوكاتەدا نەفرینی فریشتەكان دەیگرێتەوە.

باشە لەلای هەموو كەسێكی ژیر ئەم ئافرەتە تاوانبار نیەو شیاوی دووركەوتنەوە نییە لە ڕەحم و بەزەیی خودایی و كەوتنە بەر لەعنەت؟ بێگومان ئەو ئافرەتە ستەمكارەو شیاوی ئەونەفرەتەیەو خوای گەورەش دەربارەی كەسی ستەمكار دەفەرموێت: ﴿ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٨ ﴾هود

---

[1] رواه البخاري (٧/٣٠)، برقم: (٥١٩٤).

[2] ع: ١١٥، ك: ١٩٩-٢٠٠

جا ئەمە تەنها بۆ ئافرەتان نیەو بەڵكو پیاوانیش ئەگرێتەوە ئەگەر بێت و ئەوان بە پێچەوانەوە مافی خێزانەكانیان نەدەن، جا ئەم ڕووداوە زیاتر بەرۆكی ئافرەتان دەگرێت بۆیە خیتابەكە ڕووەو ئەوانە، ئەگینا هەردووكیان هەروەكو یەكن لەو سزایەدا، جا هەموو زانایانی ئەم ئوممەتە بەو شێوەیە تێگەیشتوون لە فەرموودەكەو كەس نەبووە كە بڵێت ئافرەتان پێویستە لە هەموو بوارێكدا و بەبێ مەرج و لەهەموو كاتێك پێویستە بەدەم داوای مێردەكانیانەوە بچن، ئیتر ئەم هەرایە لە پێناو چی؟!

٢ – فریشتە وەكو بیستوومانە خەریكی یادی خوای گەورەن بەڵام لەسەر زاری ئەبو هورەیرە خەریكی نەفرینكردنن لە ژن.

دەڵێم: ئۆزۆن یان هەموو تەمەنی قورئانی نەخوێندوەتەوە یان خەریكی سەفسەتەو چەواشەیە، ئەگینا فریشتەكانی خوای گەورە هەر لە قورئاندا چەندین كاری تریان بێجگە لە یادی خوای گەورە پێ سپێردراوەو یەكێكیش لەوانە بریتییە لە نەفرینكردن، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٦١﴾ ﴾البقرة

باشە تۆ بڵێی دوای ئەم ئایەتە ئۆزۆن و هاوشێوەكانی وەڵامیان چیبێت؟!

جا ئەوەی كە ئۆزۆن لەبارەی فەرموودەكەوە دەڵێت: " فەرموودەی هاوشێوەی ئەمەش زۆر هەیە كە هەموویان ئەمە دووپات دەكەنەوە كە سێكس لای ژن هەستێكی ئاژەڵانەیەو خاڵیە لە هەستی مرۆڤانەو پێویستە هەركات مێردەكەی وتی بێ سێ و دوو بێ دوودڵی هەركات مێردەكەی ویستی هەمیشە ئامادەبێت.." ع: ١١٥، ك: ٢٠٠

دوایی باسی ئەوە دەكات ئەی مافی ئافرەتەكە چی و بۆ باس نەكراوە؟

دەڵێم: ئەگەر ئۆزۆن بیەوێ هەر شتێك باس كرا بۆ ئافرەت پێویستە بۆ پیاوانیش باسبكرێت و ئەگەر بۆ پیاوانیش باسكرا ئەوا بۆ ئافرەتانیش باسكرێت، ئەوكات ئەبوو ئەوەی كە ئێستا هەیە لە قورئان و فەرموودە ئیستا دوو هێندەبوایە، بەڵكو هەمیشە دەقەكان ئەبێت كورت و پوختبن و مەودایەك بۆ ئەوە بهێڵنەوە كە حوكمی تری لێوە وەچنگ بێت و تەنها خیتابەكە ڕووەو ئەوەیان بكرێت كە زیاتر تووشی ئەو تاوانە بێت و

لەهەندێکی تریاندا کە هەردووکیان بەشدارن ئەوا باسی هەردوو لایان بکرێت، بۆ نموونە لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٢٩﴾ ﴾النساء

ئەبینین لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕوو لە پیاوانە بۆ دوو شت: ماڵی خەڵك خواردن و کوشتنی ناحەق، باشە تۆ بڵێی تەنها پیاوان ماڵی خەڵکی بخۆن و کوشتار بکەن و تا ئێستا ئافرەت نەیکردبێت و هەرگیز نەیکات؟ یاخود ئەگەر بیکات تاوانی لەسەر نییە وا خیتابەکە بە(واو)ی جەماعەیە بۆ کۆمەڵێك پیاو؟

نەخێر ئەم شێوازە تێگەیشتنە زۆر هەڵەیە بەڵکو ئەم دوو تاوانە زیاتر پیاوان دەیکەن بۆیە تەنها ناوی ئەوان هێنراوەو ئەگەر ئافرەتیش بیکات لەسەریان حەرامە وەکو چۆن حەرامە لەسەر پیاوان.

بەڵام لەم ئایەتەی تردا ئەبینین خوای گەورە ڕووی خیتاب دەکاتە هەردووکیان و دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ ...﴿١١﴾ ﴾الحجرات

چونکە لێرەدا هەردوو لایان ئەکەونە ناو ئەم تاوانەو زۆر بەرچاوەو بڵاوە لەناو هەردوولایان بۆیە خوای گەورە ناوی هەردوو لای هێناوە.

جائەمەش بریتییە لە بەلاغەی قورئان و وتەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەنها کەسانێك هەستی پێدەکەن کە شتێك لە بەلاغە بزانن نەوەك هەموو تەمەنیان خەریکی ئەندازیاری بوون ئێستا بیانەوێ لە زانستی شەرعیش قسە بکەن.

دەی بابەتی سەرجێیش بەهەمان شێوەیەو هەردووکیان مافیان بەسەر یەکترەوە هەیە، بەڵام لەبەر ئەوە ناوی ئافرەتان هاتووەو تایبەتکراونەتەوە، چونکە پیاوان زیاتر پێویستیان بەوانەو ئەوانیش زۆرتر پشت لە پیاوەکانیان دەکەن و وەڵامیان نادەنەوە.

هەروەها نابێت ئەوەشمان بیر بچێت کە ئەو فەرموودەیە بۆ کاتێکە کە ژن لای مێردەکەی بمێنێتەوەو هەموو مافەکانی خێزانی بدات، هەروەها تەلاق نەکەوتبێتە نێوانیان و

بە نیازی جیابوونەوە نەبێت، ئەگینا جیابوونەوە مافی ئافرەتەو كەس بۆی نییە ڕێگری لێ بكات.

**فەرموودەی دووەم: ئایا ئافرەت مافی بە ڕۆژوو بوونی نیە ؟!**

ئەم جارەیان فەرموودەیەكی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دێنێت و دەڵێت ئەوەتا لەم فەرموودەیە دەڵێت ئافرەت نابێ بە بێ مۆڵەتی مێردەكەی بە ڕۆژووبێت، دەقی فەرموودەكە: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لاَ تَصُومُ المَرْأَةُ وَبَعْلُهَا شَاهِدٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ»[١].

ڕەخنە لەم فەرموودەیە دەگرێت و دەڵێ: "ئافرەت تەنانەت مافی گرتنی ڕۆژووشی نییە بەبێ مۆڵەتی مێردەكەی، هەرچەندە ئەمە گشتگیرەو ڕەمەزانیش دەگرێتەوە بەڵام ڕەمەزان لە قورئاندا فەرز كراوە... بەڵام ئافرەت بۆی نییە لەوە زیاتر بەڕۆژووبێت بەبێ مۆڵەتی گەورەكەی(مێردەكەی)" ع: ١١٥-١١٦، ك: ٢٠١

دەڵێم: ئۆزۆن دیسانەوە ئاڵای نەزانی خۆی هەڵدەكات و خۆی دەناسێنێ بەتەواوی خەڵكی و پێمان دەڵێت من لە هیچ تێناگەم و هیچ شارەزاییەكم دەربارەی قورئان و سوننەت و مێژووی ئیسلام نیە، ئەگەر من شارەزابوومایە ئەوا دەمزانی كە ئەم فەرموودەیە باس لە ڕۆژووی سوننەت دەكات و بۆ ئەوەیە كە مافی یەكتر زەوت نەكەن و زۆر بە ڕوونی ئەمەش لە فەرموودەكانی تردا بەدی دەكرێت و ئەوەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: «إِنَّ لَكُمْ مِنْ نِسَائِكُمْ حَقًّا، وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا»[٢].

واتە: ئەی پیاوان بەڕاستی ئێوە مافتان بەسەر خێزانەكانتانەوە هەیەو ئەوانیش مافیان بەسەرتانەوە هەیە.

ئەو فەرموودەیەی كە ئۆزۆن ڕەخنەی لێ دەگرێت تەنها بۆ ئەو كاتەیە كە ئەو ئافرەتە بزانێت كە مێردەكەی بە ڕۆژدا پێویستی پێیەتی و لە كاتێكدایە كە پیاوەكەی ئامادەبێت وەكو لە ناونیشانی ئەو(باب)ەدا كە ئیمامی بوخاری فەرموودەكەی هێناوە زۆر بە ڕوونی

---

[١] رواه البخاري (٣٠/٧)، برقم: (٥١٩٢).

[٢] رواه ابن ماجة (٥٩٤/١)، برقم: (١٨٥١)، وحسنه الألباني والأرناؤوط، والسنن الكبرى (٢٦٤/٨)، برقم: (٩١٢٤).

دیارە، جا ئەگەر هات و زانی مێردەكەی پێویستی پێی نیەو یان لەلای نیە، ئەوا هیچ پێویست بەوە ناكات مۆڵەت وەرگرێت!

ئەمەش تەنها بۆ ئافرەتان نیەو بەڵكو پیاوانیش لەوە ئاگادارکراونەتەوە كە مافی خێزانەكانیان نەخۆن بە گرتنی ڕۆژووی زۆر هەروەكو پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەكاتێكدا بینی كە عوسمانی كوڕی مەزعون زۆر پەرستش دەكات ڕێگری لێكرد و پێی فەرموو: (فَإِنَّ لِأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِضَيْفِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَصَلِّ وَنَمْ)[1].

واتە: بەدڵنیاییەوە خێزانەكەت مافی بەسەرتەوە هەیە و میوانەكانت مافیان بەسەرتەوە هەیەو نەفسی خۆشت مافی بەسەرتەوە هەیە، بەڕۆژوو ببەو بیشی شكێنە، نوێژیش بكەو بشخەوە.

هەروەها بە عبداللە ی كوڕی عەمری فەرموو: (وَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقًّا)[2].

ئەمە شتێك نییە تەنها بۆ ئافرەتان بێت و پیاوان نەگرێتەوە بەڵكو سنوور بۆ هەردووكیان دانراوەو نابێت لەو سنوورە لابدەن.

جا بۆیە نابێت كەسیان مافی یەكتر پێشێل بكەن و نەیدەن، هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ژن و پیاویان زۆر لەخواترس و دیندار بوون لە گشت پەرستشەكاندا وێنەیان نەبوو، جا یەكێك لەو پەرستشانەش بریتی بوو لە ڕۆژوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمەی فەرمووە بۆ ئەوەی ئافرەتان لە گشت ساتێك بەڕۆژوو نەبن و ئاگایان لە مێردەكەیان نەمێنێت و بەمەش مێردەكانیان بكەونە ناو تاوانەوە، بەتایبەت بۆ وەها سەردەمێكی وەكو ئێستامان، جا ئەم یاساو ڕێسایە پیاوانیش دەگرێتەوەو ئەوەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) سنووریان بۆ دادەنیٚ هەم بۆ ڕۆژوو هەم بۆ شەونوێژ و لەم فەرموودەیەدا زۆر بە ئاشكرا بەدیار دەكەوێت، كە ئۆزۆن بێخەبەرە لێی لەكاتێكدا لە سەحیحەكەی ئیمامی بوخاریدایە(رحمه الله)، دەقی فەرموودەكە:

---

[1] رواه أحمد في المسند (٤٣/٣٣٥)، برقم: (٢٦٣٠٩)، وحسنه الأرناؤوط .

[2] رواه البخاري (٣/٣٩)، برقم: (١٩٧٥)، وأحمد في المسند (١١/٤٥١)، برقم: (٦٨٦٧)، وصححه الأرناؤوط .

عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ: جَاءَ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَدًا، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: «أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا، أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»[١].

واته: سێ پیاو هاتنه لای ماڵی خێزانەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)و پرسیاری عیبادەتی پێغەمبەریان(ﷺ) دەكرد، كاتێك هەواڵیان پێدرا لەو بارەیەوە وەك شتێك بلێی بەكەمیان زانی و وتیان: ئێمە لەكوێو پێغەمبەری خوا(ﷺ)لەكوێ كە خوای گەورە لە هەموو تاوانەكانی پێش و پاشی خۆشبووە[٢]، دانەیەكیان وتی: من بەردەوام شەونوێژ دەكەم، و دانەیەكی ترشیان وتی: هەموو ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبم و هەرگیز نایشكێنم، دانەیەكی تریان وتی: من هەرگیز ژن ناهێنم و بە هەمیشە دووردەگرم لە ئافرەتان، ئیتر لەوكاتەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات و فەرمووی: ئەوە ئێوە بوون ئەوەو ئەوەتان وت، سوێند بەخوا من لەهەمووتان زیاتر لەخوای گەورە ئەترسم و خۆپارێزترینیشتانم، شەونوێژ دەكەم و دەشخەوم، بەڕۆژووش دەبم و ڕۆژووش دەشكێنم، ژنیش دێنم، جا هەركەسێك لە ڕێبازی من لا بدات لە من نیە.

ئەبینین كە پێغەمبەری خوا(ﷺ)سنووری داناوە بۆ پیاوان بۆ ئەوەی كە لەگەڵ هەر یەكێك لەو مافانەدا وەكو پێویست مامەڵە بكات و هەر شتێك و لە شوێنی خۆیدا جێبەجێ بكات و مافی هیچیان نەدات بەوی تریان، ئەمەش هەم ژن و هەم پیاویش دەگرێتەوەو

---

[١] رواه البخاري (٢/٧)، برقم: (٥٠٦٣).

[٢] لە فەرموودەكەدا مەبنی مەجهولە، بەڵام بەو شێوەیە بیكەینە كوردی كەمێك ماناكەی جۆرێكە، بۆیە وشەی خوای گەورەمان هێناو كردمانە فاعل

هەردوو پێویستە ئاگایان لە مافی یەكتربێت، نەك وەكو ئەو ئاغایەتیەی كە ئۆزۆن وێنای دەكات!!

من تەحەددای ئۆزۆن دەكەم كە بتوانێ یەك نمونەمان بداتێ لە ژیانی پێشەوایانی ئەم ئوممەتە كە ئەم فەرموودەیەی پێشەوا بوخاری وای لێكردبن وەك ئاغاو دەرەبەگ مامەڵەیان لەگەڵ ئافرەت كردبێت و هەر فەرمانیان بەسەریاندا كردبێت، ئەوەتانێ گەورەترین زانای فەرموودە كە پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەلە(رحمه الله) هەروەكو ئیمامی مەروەزی لێوەی ئەگێڕێتەوە: ( سَمِعْتُ أَبَا عَبْدِ اللَّهِ، ذَكَرَ أَهْلَهُ، فَتَرَحَّمَ عَلَيْهَا، وَقَالَ: مَكَثْنَا عِشْرِينَ سَنَةً، مَا اخْتَلَفْنَا فِي كَلِمَةٍ)[١].

واتە: گوێم لێبوو باسی خێزانی كرد ڕەحمەتی بۆی نارد و پاشان فەرمووی: بیست دانە ساڵ پێكەوە ژیانمان بردە سەر، تەنانەت لەسەر یەك وشەش جیاوازی نەكەوتە نێوانمانەوە.

ئەوە ئەو زانا بەڕێزە كە پەروەردەی فەرموودەكانی پێغەمبەرە(ﷺ) و ئەمڕۆش سەیری ئەوانە بكە كە لاف و گەزافی مافی ئافرەت و ئازادی ئافرەت لێدەدەن، بزانە كامیانن كە بەڕاستی مافی ئافرەتیان داوەو لەگەڵیان باشبوون؟!

ئەمە تەنها نمونەی زانایەكە وا بە كرداری فەرموودەكانی بەرجەستە كردووە، ئەگەر بێت و سەیری ژیانی هەموو ئەو كەڵە زانایانە بكەین بە وردی ئەوكات زۆر بەباشی چەواشەكاریەكانی ئۆزۆنمان بۆ بەدیار دەكەوێت و ئەزانین چی لەژێر ئەم وتە ژەهراویانەی حەشارداوە!!

## فەرموودەی(سێیەم) و(چوارەم): ئافرەتان وەكو پەراسوو لارن!

پاشان ئۆزۆن دوو فەرموودەی تر دێنێت كە ناوەڕۆكی فەرموودەكان ئەوەیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت چاكبن لەگەڵ ئافرەتانداو ئەوان وەكو پەراسوو وان ئەگەر بتانەوێ ڕێكیان بكەنەوە ئەوا دەیانشكێنن.

---

[١] سير أعلام النبلاء (١١/٣٣٢).

دەقی فەرموودەی(سێیەم): عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «المَرْأَةُ كَالضِّلَعِ، إِنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَهَا، وَإِنِ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَفِيهَا عِوَجٌ»[1].

دەقی فەرموودەی(چوارەم): "وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا، فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاَهُ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ، فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا"[2].

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: "بەپێی ئەو دوو فەرموودەیەی ڕابوورد ئافرەت زۆر لارەو ئومێدی چاكبوون و ڕاستكردنەوەی بە هیچ جۆرێك لێ ناكرێت، دەبێت پیاو هەر بەو لارییە مامەڵەیان لەگەڵدا بكات" ع: ١١٧-١١٨، ك: ٢٠٥

دەڵێم: كەسێك سەیری ئەو وەسفانەی پێشوو بكات بۆ ئافرەت كە باسمان كردلەو كۆمەڵە فەرموودەی كە هاتبوون و هەمووی شان و شكۆی ئافرەتی بەرز دەكردەوە، لەگەڵ چەندین فەرموودەی تردا كە پێغەمبەر(ﷺ) وەسفیان دەكات بەوەی باشترین خۆشی دونیان و هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ)لەفەرموودەیەكی تردا پرسیاری لێ دەكەن كە خۆشەویسترین كەس لەلای كێیە؟ دەفەرموێت: عائشە، پاشان دەڵێت: ئەی لە پیاوان؟ دەفەرموێت: باوكی.

خێزانی خۆشەویسترین كەسێتی، هەروەها كە باسی خۆشەویستی پیاوانیش دەكات نافەرموێ ئەبو بەكر، بەڵكو دەفەرموێت باوكی عائشە!!

هەروەها چەندین ساڵ دوای وەفاتی خەدیجە كە خێزانی بوەو ئافرەت بووە، پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەیادی ناكات و باسی ئەكات و كاتێك كە ئەدرێت لەدەرگا رائەپەرێت و دەفەرموێت لە دان لەدەرگاكەی خەدیجە ئەچوو!!

ئافرەت ئەو كەسە یە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ جار پێشی دەخات بەسەر پیاودا...تاد

---

[1] رواه البخاري (٧/٢٦)، برقم: (٥١٨٤).

[2] رواه البخاري (٧/٢٦)، برقم: (٥١٨٥).

باشە ئەگەر بێت و كەسێك بیەوێ گەشتێك بەناو فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خۆشەویستدا بكات(ﷺ)، كە پڕیەتی لە وەسف و ستایش و گەورە سەیركردنی ئافرەت و پێدانی چەند قاتی پیاوان ماف و ...هتد، بكات و لەولاشەوە ئەم تەفسیرەی ئۆزۆن بكات، ئایا مافی خۆی نییە ڕەتی بكاتەوە؟!

ڕەنگە ئێستا تۆی بەڕێز بپرسیت: ئەی باشە چۆن لێی تێبگەین؟!

دەڵێم: ئەم فەرموودەیە تەنها چواندنێكی تێدایەو لەوە زیاتر نییە و باسەكە ئەوە نییە كە ئافرەتان لارن، هەروەكو چۆن لەوەو پێش باسی ئەوەمان كرد كە ئۆزۆن لە بابەتی(الرقمة) بەهەڵە چوو كاتێك وای زانی تانەدانە لە ئوممەت كاتێك چوێنراوە بەو پەڵە سپیە، بەهەمان شێوەش لێرەدا بە هەڵەدا چووە لەوەی بە تانە تێگەیشتووە! چۆن؟

دەڵێم: ئافرەت لێرەدا چوێنراوە بە پەراسوو لە یەك خاڵدا كە ئەویش: وەكو چۆن بتەوێ پەراسوو ڕێك بكەیتەوە ڕێك نابێتەوەو ئەشكێ و شتێكی ئەستەمەو بێگومان دەشكێت، بەهەمان شێوەش ئەگەر بتەوێ هەر شتێكت وت ئافرەت بەگوێت بكات و زۆری لێبكەیت ئەوا بەدڵنیاییەوە دەشكێت و نایەت بەو بارەداو ئەمەش سرووشتی گشت ئافرەتێكەو هەرگیز بە زۆر ناتوانرێ هیچیان پێ بكرێت و ناشیكەن.

كەواتە لێرەدا وێكچواندنەكە "زوو شكان و ناسكی"یە نەوەك لاری و خواری، كە ئەمە بەداخەوە ئۆزۆن و چەواشەكاران و هەندێك لە نووسەرەكانی خۆشمان وای بۆ ڕۆشتوون و فەرموودەكەیان ڕەت كردوەتەوە.

تەنها ئەوەی تێدایە كە ئەوان ناسكن و بەرگەی توندی و زبری ناگرن، هەروەكو چۆن لە فەرموودەكەی تردا فەرمووی: نەرم ونیانبن لەگەڵ گەوهەرەكاندا!

چونكە گەوهەر بەنرخەو لەدەستدانی شتێكی گەورەیەو پێویستە بەوپەڕی ورییاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێتو لە هەمان كاتیشدا ناسكن!

بەلاّم ئەو جۆرە لێكدانەوەو تێگەیشتن و وەسفكردنی ئافرەتان بە لاری و خواریی هەرگیز شیاو نییە بۆ وتەی ئەو پێغەمبەرەی(ﷺ) كە لەبارەی ئافرەتانەوە دەفەرموێت: (خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لأَهْلِهِ وَأَنا خَيْرُكُمْ لأَهْلِي مَا أكْرَمَ النِّساءَ إلا كَرِيمٌ وَلا أهانَهُنَّ إلاّ لَئِيمٌ)[1].

واته: باشترینتان ئەوانەن كە باشترینتانن بۆ خێزانەكانتان و من باشترینتانم بۆ خێزانەكانم، بەدڵنیاییەوە هیچ كەسێك رێزی ئافرەتان ناگرێت تەنها كەسە بەرێزەكان نەبێت و هیچ كەسێكیش بێ رێزییان بەرامبەر ناكات بێجگە لە كەسە بێ رێزەكان.

من زۆرم پێ سەیرە كەسێك بێت دوای ئەو هەموو فەرموودە راست و دروستەی پێغەمبەر(ﷺ) كە لەبارەی ئافرەتانەوە هاتووە، هەندێك مانای نەشیاو بداتە پاڵ سوننەت و مەرامی بۆگەنی خۆی بێنێتە جێ و تانەی لێ بدات، باشە تۆ بڵێی كەسێك ئەو هەموو رێزە دانێ بۆ ئافرەتان و بفەرموێ تەنها كەسی بێ رێز سووكایەتی بەئافرەت دەكات و ئێستا خۆشی بڵێ ئەوان لارن و هەر بەلاری دەمێننەوە؟!

بێگومان ئەمە لە رق و كینەی نەیارانی سوننەت زیاتر شتێكی تر نیەو فەرموودەكانیش زۆر روونن بۆ كەسێك بیەوێ وەكو خۆی لێیان تێبگات.

ئەمە سەرەرای ئەوەی كە ئافرەتان لە سروشتیاندا جۆرێك لە مل نەدان هەیەو هەموو ئەوانەی كە خوێندویانەو بەدوای ناسینی سروشتیان رۆشتوون باش دەرك بەو راستیە دەكەن و هەرگیز بەزۆر هیچ شتێكیان پێ ناكرێت و بەزۆر ناتوانیت هیچ بدەی بە گوێیاندا.

---

[1] كنز العمال (١٦/٣٧١)، برقم: (٤٤٩٤١)، الفتح الكبير للسيوطي (٢/٩٦)، برقم: (٦٢٠٧)، ت: يوسف النبهاني، الناشر: دار الفكر – بيروت / لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤٢٣هـ – ٢٠٠٣م، كشف الخفاء للعجلوني (١/٤٤٢)، برقم: (١٢٣٤)، تحقيق: عبد الحميد بن أحمد بن يوسف بن هنداوي، المكتبة العصرية، الطبعة: الأولى، ١٤٢٠هـ – ٢٠٠٠م.

ئێستا ڕەنگە كاتی ئەوەبێت وەڵامی پرسیارێك بدەینەوە كە بە مێشكی تۆی خوێنەری بەرێزدا دێت و ئەویش ئەوەیە: ئایا دەستەواژەی(فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ) ئافرەتان دروستكراون لە پەراسوو، تانەو كەمكردنەوەی بەهای ئافرەتان نیە؟

دەڵێم: نەخێر تانە نییە بەڵكو ئەوپەڕی مەدحە بۆ ئافرەتان و گرنگترین كاری ئافرەتان و بەرزترین پێگەیانی خستوەتە ڕوو!! ڕەنگە بڵێی: چۆن؟!

دەڵێم: خوای گەورە حەوای لە پەراسووی ئادەم(عليه السلام) دروستكرد بۆ ئەوەی پێگەی ئافرەت زۆر بەباشی بزانرێت چونكە ئەو پارێزەری كۆمەڵگەیە، هەروەها هەموو ژیانی مرۆڤایەتی بەندە بەدڵەوەو بەنەبوونی دڵ هەموو ژیان دەوەستێت و لەناو دەچێت، جا ئەو پەراسوەش پارێزەری دڵەو هەر ئەوە پارێزگاری لە دڵ دەكات و هۆكاری مانەوەیەتی و لەبەرامبەر هەر هێرشێكی دەرەكی دەیپارێزێت، دەی كاتێك كە ئادەم بینی لەو بەشە گرنگەی خۆی دروستبووە زیاتر لەلای گەورە ئەبێت و ڕێزی دەگرێت، ئەوەتا زۆر بە ڕوونی ئەم واتایە هاتووە لە تەوراتداو دەڵێت: "فَأوقعَ الرَّبُّ الإلهُ الضّلَعَ الَّتِي أَخَذَهَا مِنْ آدَمَ امْرأةً فَأتَى بِهَا آدَمَ، فقالَ: آدمُ هَا هذِهِ المرأة[1] عَظْمٌ مِنْ عِظَامِي وَلحمٌ مِن لَحمِي هذِهِ تُسمَّى امرأةً لأنَّهَا مِنِ امْرِئٍ أُخِذَتْ، وَلِذَلكَ يَتْرُكُ الرَّجُلُ أَبَاهُ وَأُمَّهُ وَيَلْزَمُ امْرَأَتَهُ فَيَصِيْرَانِ جَسَداً وَاحِداً"[2].

واتە: خوای گەورە لەو پەراسوەی كە هەڵیگرت لە ئادەم ئافرەتێكی دروستكردو هێنایە لای ئادەم، ئادەم وتی: ئەو ئافرەتە ئێسكێكە لە ئێسكەكانی من و گۆشتێكە لە گۆشتی من هەروەها پێی ئەوترێت(امرأە) چونكە لە(امرئ) وەرگیراوە[3]، جا بۆیە پیاو واز لە باوك و دایكی دێنێت و وابەستەی خێزانەكەی ئەبێت و ئەبنە یەك جەستە.

---

[1] نووسراوە (المرة) لەو چاپەی لای منە، هەڵەی چاپە.

[2] سفر التكوين، إصحاح:٢، رقم: ٢١-٢٤، (١١/١)، منشورات دار المشرق، بيروت، لبنان، سنة الطبع: ١٩٨٦.

[3] (كە بامانای پیاو دێت)

ئەبینین لێرەدا زۆر بەڕوونی هۆكارەكەی بەدیار دەكەوێت و ئەزانین كە دروستبوونی ئافرەت لە پەراسووی ئادەم ئەوپەڕی ڕێزە دراوەتە ئافرەت نەوەك عەیبەو كەم وكورتی!
جا دەكرێت ئەم دەقەی تەوراتیش وەكو خۆی مابێتەوەو دەستكاری نەكرابێت.

فەرموودەی پێنجەم:

عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: «خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ، وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ»[١].

واتە: باشترینی ئافرەت مەریەمە، باشترین ئافرەت خەدیجەیە.
دیارە ئەمە هەر یەكێكیان مەبەستی پێی سەردەمی خۆیانەو بەمانای ئەوە دێت كە مەریەم باشترینی ئافرەتی سەردەمی خۆی بووەو خەدیجەش باشترین ئافرەتی سەردەمی خۆی.

فەرموودەی شەشەم:

عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ: إِلا آسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ، وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ "[٢].

واتە: لە پیاوان زۆرێك كامڵ بوون، بەڵام لە ئافرەتان بێجگە لە ئاسیای خێزانی فیرعەون و مەریەمی كچی عیمران كەسێكی تر كامڵ نەبووە، هەروەها فەزڵی عائشەش بەسەر ئافرەتانی دونیاوە هەروەكو فەزڵی تریت(تشریب)[٣]ە بەسەر خواردنەكانی ترەوە.
پاشان ئۆزۆن لەسەر ئەم دوو فەرموودەیە كۆمەڵێك ڕەخنە دەگرێت و دەكرێت بەم شێوەیە دابەشی بكەین[٤]:

---

[١] رواه البخاري (٥/٣٨)، برقم: (٣٨١٥).
[٢] رواه البخاري (٤/١٥٨)، برقم: (٣٤١١).
[٣] وەرگێڕ (سەرید)ی كردووە بە قاورمەو وەها لێكیداوەتەوە!!
[٤] ع:١١٨-١١٩، ك:٢٠٧

١ – باسی فاتیمە نەهاتووە لەم فەرموودانەدا.

**دەڵێم:** ئەمە ڕەخنەیەكی زۆر لاوازەو تێكەڵێشە لەگەڵ چەواشەكاریدا و دەكرێت لە ئۆززۆن بپرسین: باشە كێ فەرموودەی یەكەمی گێڕاوەتەوە؟ مەگەر پێشەوا عەلی(رضي الله عنه) مێردی فاتیمە(رضي الله عنها) نەیگێڕاوەتەوە، ئەگەر ئۆززۆن ڕەخنە لەویش ناگرێت و بڵێ ناوی فاتیمەشت تێكردایە؟ هەروەها ئۆززۆن بیری كردووە كە باس لە فەزڵی خەدیجە دەكات و ئەویش دایكی فاتیمەیە، یاخود هەر نایزانێت؟

پاشان ئێمە بە ئۆززۆن دەڵێین ئەم چەواشەكاریەت لە پێناوی چی و بۆچی ئەتەوێ وای نیشان بدەی لەباسی ئافرەتاندا تەنها ئەم دوو فەرموودەیە هەیەو هیچ وەسفێكی فاتیمە نەكراوە؟ ئەی باشە ئۆززۆن گەر سەحیحی بوخاری خوێندوەتەوە بە تەواوی(یان هەر دیویەتی) و ئەو بابەتانەی ئەیهێنێت لەخەڵكی تری وەرنەگرتووە خۆی خاوەنێتی، بۆچی باسی ئەم فەرموودەیە ناكات كە دایكی ئیمانداران عائشە(رضي الله عنها) دەیگێڕێتەوە: «يَا فَاطِمَةُ، أَلاَ تَرْضَيْنَ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ سَيِّدَةَ نِسَاءِ هَذِهِ الأُمَّةِ»[1].

واتە: ئەی فاتیمە ئایا ڕازی نابیت ببیتە گەورەی ئافرەتانی بڕواداران، یان گەورەی ئافرەتانی ئەم ئوممەتە.

ئەگەر ئۆززۆن كەسێكی دادگەربوایەو ڕاستیەكانی ئاماژە پێدایە ئەوا ناونیشانی ئەم باسەی پێشەوا بوخاری یاداشت دەكرد، كە لە سەحیحەكەیدا دایناوە بەناوی: ( بَابُ مَنَاقِبِ فَاطِمَةَ عَلَيْهَا السَّلاَمُ)[2] كە تایبەتە بەو فەرموودانەی كە لە فەزڵی "فاتیمە"دا هاتوون.

٢ – تەنها دوو ئافرەت كامڵ بووە، بەڵام پیاو زۆری تێدا كامڵ بووە.

**دەڵێم:** ئەمە هەواڵێكەو پێغەمبەری خوا(ﷺ)داویەتی لەبارەی سەردەمی كۆنەوە كە تەنها ئەو دوانە لەسەردەمی خۆیاندا كامڵ بوون، جا ئەگەر ئۆززۆن بەڵگەیەكی هەیەو دەڵێت بەم بەڵگەیە ئافرەتی كامڵمان هەبووە لە پێش پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوا ئێمەش دەڵێین باشە وا تەسلیم بووین و ئێمەش هەمان ڕەخنەمان هەیە، بەڵام بە دڵنیاییەوە هەواڵێك لەلایەن

---

[1] رواه البخاري (٨/٦٤)، برقم: (٦٢٨٥).

[2] صحيح البخاري (٥/٢٩)

پێغەمبەری خواوە بێت بێگومان ڕاست و دروستەو جێگەی گومان و دوودڵی نییە بە هیچ شێوەیەك لەلای كەسی بڕوادار.

هەروەها بوونی ئافرەتی كامڵ وەكو لەفەرموودەكەدا ئاماژەی پێدەكات مانای وایە شتێك نییە ئیتر بوونی نەبێت و هەموو ئافرەتێك نوقسانبێت و هەرگیز كەمال لەواندا نەیەتە جێ، چونكە بوونی شتێك دەلالەتە لەوەی كە دووبارە بوونەوەی شتێكی مومكینەو ئەگەری ڕوودانی هەیە وەكو لە لۆژیكدا باسی لێوە دەكرێت بەڵكو هەر ئافرەتێك لە ئێستادا شوێن فەرمانەكانی خوای گەورەو پێغەمبەری خوا(ﷺ) بكەوێت بە دڵنیاییەوە ئەگاتە ئەو پلەی كەماڵە بەشەریەو هەمان ڕابیعەی عەدەویەو خەنساو زەینەب غەزالی و...، دووبارە دەكەنەوە خوای گەورە لە هەموویان ڕازیبێت، لەگەڵ چەندین ئافرەتی مەردی تر كە بەردەوام جێی فەخر و شانازی و ناوهێنانن بەوپەڕی ڕێزەوە.

٣ – عائشەی لەبەر شەرم پێوە لكێنراوە.

مەبەستی ئۆزۆن لەم ڕەخنەیە ئەوەیە ئەم فەرموودەیە دروستكراوەو هاوەڵان دروستیان كردووەو عائشەی تێدا نەبووە، یاخود دوایی ئەوان ڕووگێربوون كە عائشەی تێدا نەبێت و ئیتر ئەویشیان تێكردووە.

دەڵێم: ئەم وتەیەی ئۆزۆن تەنها بانگەشەیەو بانگەشەش پێویستی بەبەڵگەیە بۆ ئەوەی ببێتە جێگەی باس و خواس، جا لە ئێستاوە تاوەكو خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت ئۆزۆن ئازادە لەوەی بەڵگەیەك بێنێت و ئەم وتەیە پشتڕاستبكاتەوە، ئەگینا بە پێچەوانەوە ئەمەش ئەبێتە پەڵەیەكی ڕەشی تری خیانەت بەناوچەوانی خۆیی و تەواوی كتێبەكەشیەوە "جینایەت".

٤ – عائشە چوێنراوە بە خواردنێك كە زۆرینەی خەڵكی نایخۆن و فەزڵی نادەن بەسەر خواردنەكانی تردا.

مەبەستی ئۆزۆن ئەوەیە عائشە چوێنراوە بە(تشریب) و خەڵكی حەزی پێ ناكەن ئیتر ئەمە كەی وەسفە بۆی؟

دەلێم: ئۆزۆن تەنانەت ناتوانێت وەكو كەسێكی شارەزاو خوێندەوار لە دەقەكان تێبگات، ئێمە ئەزانین كە حەزی مرۆڤەكان جیاوازەو حەزی خواردن لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر دەگۆڕێت و عیبرەت بەو كەسەیە كە قسەكەی كردووەو خۆی حەزی بە چیە، بۆ نموونە كەسێك زۆر حەزی بە جۆرە خواردنێكەو فەزڵی ئەدات بەسەر هەموو خواردنێكدا، لەكاتێكدا كەسێكی تر هەر نایخوات و ڕەنگە لەسەر خوانەكەش هەستێ كاتێك ئەیبینێت، جا هەر یەكێكیان كاتێك باسی باشترین خواردن ئەكات پێویستە بەوشێوەیە لێی تێبگەین كە ئەو باسی ئەكات و خۆشترین خواردنە لای نەوەك بڵێم جا خۆ من حەزم پێی نیە!!

كاتێك كە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)دایكی ئیمانداران عائشە(رضي الله عنها) ئەچوێنێ بە سەرید(تشریب) لەبەر ئەوەبووە كە خۆشترین خواردنە لەلای خۆی و زۆری حەز پێی بووە، هەروەكو پێشەوا ئیبن عەبباس(رضي الله عنه) ئەگێڕێتەوە كە خۆشترین خواردن لەلای پێغەمبەر(ﷺ) بریتی بووە لە تشریب: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: « كَانَ أَحَبُّ الطَّعَامِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الثَّرِيدَ مِنَ الْخُبْزِ، وَالثَّرِيدَ مِنَ الحَيْسِ»[1].

٥ – باشترین و چاكترین مانای وا نییە كە دەچنە بەهەشتەوە چونكە زانا بەڕێزەكان كاتێك باسی(١٠) مژدەپێدراوەكە دەكەن تاكە ئافرەتێكی تێدا نیەو هەموویان لە پیاوانن.

دەلێم: ئۆزۆن بەنەزانی خۆی بەردەوام چاڵ بۆخۆی لێدەدات و ئەكەوێتە ناوی، بەردەوام پەردە لەسەر خۆی لادەبات و ئاستی خۆی بۆ هەمووان ئاشكرا دەكات و دەڵێ من كەسێكی نەزانم دەربارەی سوننەت و مێژووی ئسلامی، ئەگەر وانەبوایە ئەوا دەمزانی كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەنها بەو دە كەسەی نەفەرمووە دەچنە بەهەشتەوە، بەڵكو بۆیە هەواڵی ئەم دە كەسە ئاوەها بلاٌو بوەتەوە چونكە لەیەك فەرموودەو یەك كاتدا هاتووەو

---

[1] رواه أبو داود (٣/٣٥٠)، برقم: (٣٧٨٣)، الآداب للبيهقي، ص: (١٧٣)، بـرقم: (٤١٧)، شـعب الايمـان (٨/٧٢) برقم: (٥٥١٣)، وفي إسناده رجلٌ مجهولٌ . چەند هەڵەیەكی تێدابوو ڕاستم كـردەوە، (أحـب) فەتحـەی درابوویە، و (الثريد)یش زەممە، بەلاٌم ئەبێت پێچەوانە بكرێتەوە چونكە ئیسـمی "كـان" مەرفوعـەو "خبر"ەكەشـی مەنصوبە.

دەفەرموێت: عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: " أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ، وَالزُّبَيْرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعِيدُ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ فِي الْجَنَّةِ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ فِي الْجَنَّةِ "[1]

وەك بینیمان ناوی هەموویانی كۆكردوەتەوە لە فەرموودەكەداو بۆیە ئەم(١٠) كەسە بلاّوبوەتەوە ئەگینا لەو ژمارەیە زیاترن و ئافرەتانیشی تێدایە، لەو فەرموودانەی كە موژدەی بەهەشت دراوە بە ئافرەتان تێیدا:

ئەوەتا لەبارەی خەدیجەوە عائشە دەفەرموێت: (وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَشَّرَهَا بِبَيْتٍ فِي الجَنَّةِ)[2]. واتە: موژدەی مالّێكی پێدا لە بەهەشتدا.

چەندین فەرموودەی تر هاتووە، بەلاّم ئێمە تەنها ناوی هەندێكیان دەهێنین بۆ ئەوەی درێژ نەبێتەوە ئەوانیش:

لەبارەی فاتیمەشەوە دەفەرموێت: گەورەی ئافرەتانی بەهەشتە، هەروەها ئوم حەرام ی كچی مەلحان موژدەی بەهەشتی پێدرا، هەروەها ئوم ڕومانی كچی عامر، خێزانی ئەبوبەكری صدیق و دایكی عائشە موژدەی بەهەشتی پێدرا، هەروەها نوسەیبەی كچی كەعبی ئەنساریە، هەروەها ئوم ئەیمەن بەرەكەی كچی سەعلەبە و ... زۆرێكی تر لە ئافرەتان كە موژدەی بەهەشتیان پێدراوەو لە كتێبەكانی فەرموودەدا ناویان تۆماركراوە، بەلاّم ئۆزۆن یان نەیبیستووە یان ئەیشارێتەوە بە مەبەستێك!!

٦ – ئەبوو یەكەم جار باسی خەدیجەبێت.

ئۆزۆن دیسانەوە ڕەخنەیەكی تری بێتام ئەگرێت و وەكو لە پێشووتر فەرموودەكەمان هێنایەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) موژدەی مالّێكی پێداوە لە بەهەشتدا.

---

[1] رواه أحمد (٣/٢٠٩)، برقم: (١٦٧٥)، وقال محققه: إسناده قوي على شرط مسلم، وابن ماجة (١/٤٨)، برقم: (١٣٣)، وصححه الألباني، وأبوداود (٤/٢١٢)، برقم: (٤٦٥٠) وغيرهم.

[2] رواه الترمذي (٥/٧٠٢)، برقم: (٣٨٧٦) وصححه الألباني، وكذا في مسلم (٤/١٨٨٧)، برقم: (٢٤٣٣)، عن ابن أبي أوفى

بەلاّم لێرەدا ئەمەوێ جارێكی تر وەبیرتانی بهێنمەوەو پێشووتریش باسمان كرد، كە موژدەی بەهەشتدان لەلایەن پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وەحیەو خوای گەورە سرووشی بۆی كردووە، نەوەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەویستی خۆی دیاری بكات و خەلّكێك بخاتە بەهەشت و خەلّكێكیش بۆ دۆزەخ ڕەوانە بكات.

دواتر ئۆزۆن دەلّێت: "خاتوو عائشە بەم دوو فەرموودەیە ڕازی نەبوەو خۆی لە خەدیجە بەباشتر زانیوە" ع: ١١٩، ك: ٢٠٨

پاشان بەلّگەش بەم فەرموودەیە دێنێتەوە: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: اسْتَأْذَنَتْ هَالَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ، أُخْتُ خَدِيجَةَ، عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَعَرَفَ اسْتِئْذَانَ خَدِيجَةَ فَارْتَاعَ لِذَلِكَ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ هَالَةَ». قَالَتْ: فَغِرْتُ، فَقُلْتُ: مَا تَذْكُرُ مِنْ عَجُوزٍ مِنْ عَجَائِزِ قُرَيْشٍ، حَمْرَاءِ الشِّدْقَيْنِ، هَلَكَتْ فِي الدَّهْرِ، قَدْ أَبْدَلَكَ اللَّهُ خَيْرًا مِنْهَا "[١]

واتە: عائشە(ﷺ) فەرمووی: هالەی كچی خوەیلدی خوشكی خەدیجە داوای مۆلّەتی كرد بێتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەریش(ﷺ) لەدەرگادانی خەدیجەی كەوتەوە یاد و ڕاچلّەكی و فەرمووی: دەی "هالە"بێت، فەرمووی: منیش غیرەم كرد و وتم: بۆچی هەر یادی پیرەژنێك لە پیرەژنەكانی قورەیش دەكەیتەوە، كە(حَمْرَاءِ الشِّدْقَيْنِ)[٢]و دەمێكە مردووەو خوای گەورەش بۆی گۆڕیویت بە باشتر.

دەلّێم: سەرەڕای ئەوەی كە ئەم باسە هیچ پەیوەندیەكی دوور و نزیكی بە سەرباسەكەوە نییە كە ئۆزۆن دایناوەو ئەو فەرموودانەی كە كۆی كردوونەتەوە لە چەندین باسی جیاوازدایە بەلاّم وەكو وەلاّمێك بۆ ئۆزۆن دەلّێین:

ئەم وتەیەی عائشە(ﷺ) مەبەست پێی ئەوە نییە كە خۆی بەباشتر زانیبێت لە هەموو ڕوویەكەوە بەلّكو مەبەستی جوانی و گەنجی بووە، چونكە تەنها گەنجی هەیە لە بەرامبەر

---

[١] رواه البخاري (٥/٣٩)، برقم: (٣٨٢١).

[٢] دوو واتای هەیە: یان مەبەست پێی ئەوەیە ددانی لە دەمدا نەماوە، یاخود مانای ئەوەیە ڕەنگی مەیلەو سور ڕۆشتووە بەهۆی زۆری تەمەنەوە.

ئەو سیفەتانەی کە عائشە باسی دەکات کە هەمووی ئاماژەن بۆ ئەوەی کە خەدیجە(﵂) بەتەمەن بووە.

عائشە(﵂) لەکاتێکدایە کە سەرەتای تەمەنی بوەو هێشتا هێندەی تەمەن نەکردوە، هەروەکو پێشەوا قورتوبی و قازی عیاز ئەفەرموون، چونکە بە هیچ شێوەیەك نابێت غیرەکردن بگاتە ئەو سنوورەی ببێتە غەیبەتی کەسێکی تر، هەروەها پێغەمبەری خواش(ﷺ) لە هەندێك ڕیوایەتی تردا کە درێژەی چیرۆکەکە باس دەکەن، ئەوەی تێدا هاتووە نەهی کردووە لە عائشە.

هەروەها ئۆزۆن زۆر هەڵە تێگەیشتووە لە مانای فەرموودەکەو هیچ کاتێك ئەوەی تێدا نییە کە عائشە خۆی بەباشتر زانیبێت لە خەدیجە(﵂) هەروەها ئەوەشی کە ئۆزۆن دەڵێت عائشە بەو دوو فەرموودەیە ڕازی نیە، دەڵێین: باشە ئەمە چی وتەیەکە لەزاری ئۆزۆن دێتە دەرەوە؟ باشە مەگەر هەردوو فەرموودەکە دایکی ئیمانداران عائشە خۆی نایگێڕێتەوە؟ تۆ بڵێی فەرموودەیەك بگێڕێتەوەو بڕوای پێی نەبێت و لێی ڕازی نەبێت؟ ئەمە تەنها لە مەنهەجی ئۆزۆن بەدیار دەکەوێت و ئەبینرێ وەها قسەیەك[(١)].

پاشان فەرموودەیەکی تر دێنێت لەبارەی فەزڵی دایکی ئیمانداران عائشەوەو وەك شتێك بیەوێ خوێنەرانی وەها تێبگەیەنێت کە عائشە خۆی دروستی کردووە، بەڵام هەر ئەوەندە دەڵێم: تەنها ئەو فەرموودانەی کە لەفەزڵی عائشەدا هاتوون و هاوەڵانی تر گێڕاویانەتەوە ئیتر بەسە بۆی، تەنها ئەوەندە بەسە بۆ گەورەیی عائشە(﵂) کە خوای گەورە(ﷻ) لە سەرووی ئاسمانەکانەوە بە کەلامی خۆی کە ئەو قورئانەیە پاکێتی ئەو یەکلا بکاتەوە!!

## فەرموودەی هەشتەم: ئایا حەوا خیانەتی لە ئادەم کردووە؟!

---

(١) دایکی ئیمانداران عائشە خوای لێ ڕازیبێت خۆی ئەو دوو فەرموودەیەو لە چەندین شوێنی تردا فەزڵی خەدیجە باس دەکات و هەر لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، بێجگە لە کتێبەکانی تری فەرموودە.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ يَعْنِي «لَوْلاَ بَنُو إِسْرَائِيلَ لَمْ يَخْنَزِ اللَّحْمُ، وَلَوْلاَ حَوَّاءُ لَمْ تَخُنْ أُنْثَى زَوْجَهَا»[1]

واتە: ئەگەر بەنی ئیسرائیل نەبوایە گۆشت بۆگەنی نەدەكرد، ئەگەر "حەوا"ش نەبوایە ئافرەت خیانەتی لە مێردەكەی نەدەكرد.

ئۆزۆن ڕەخنە لەم فەرموودەیە دەگرێت و دەڵێت: "لەڕووی زانستی و كرداریشەوە گۆشت بۆگەن دەكات، بەڕای ئەبو هورەیرە وەك چۆن گۆشت بۆگەن دەكات وەهاش ئافرەت خیانەت لە مێردی خۆی دەكات، باشە چ ئافرەتێك خیانەت لە مێردی خۆی دەكا؟ ژنی زیناكارو داوێنپیس نییە مەگەر؟ " ع: ١٢٠، ك: ٢١٠

**دەڵێم**: ئۆزۆن گەورەترین خیانەت دەكات بەوەی كە وشەی "خیانەت"ی لێكداوەتەوە بە یەك جۆری خیانەت كە بریتییە لە داوێنپیسی، لەكاتێكدا ئێمە دەزانین كە خیانەت چەندین جۆری هەیەو واتایەكی گشتگیر و فراوانی هەیەو تەنها واتایەكی بریتییە لە خیانەتی نێوان ژن و مێرد. تەنانەت وشەی خیانەت لە زمانی عەرەبیدا لەم دواییەدا بەو كارە وتراوەو، عەرەب لە كۆندا بە كەسێك كە ناپاكی لە مێردەكەی دەكات وشەی خیانەتكاریان نەداوەتە پاڵ، بەڵكو وشەی سەختتریان بەكارهێناوە وەكو: (فُجُوْر، سِفَاح، دَعَارَة، بَغِي..).

ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە وشەكە بە كار نایەت بۆ داوێنپیسی لە زمانی عەرەبیدا مەگەر دوای باسكردنی وەسفێكیش وەكو: (الخيانةُ الزَّوجيةُ)!!

هەروەها لە زمانی عەرەبیدا ئەو وشەیە بە چەندین مانا دێت هەروەكو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ۝٥٨ ﴾الأنفال

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝٢٧ ﴾الأنفال

---

[1] رواه البخاري (١٣٢/٤) برقم: (٣٣٣٠).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ١٩ ﴾غافر

دیسانەوە دەفەرموێت: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمۡرَأَتَ نُوحٖ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٖۖ كَانَتَا تَحۡتَ عَبۡدَيۡنِ مِنۡ عِبَادِنَا صَٰلِحَيۡنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمۡ يُغۡنِيَا عَنۡهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَقِيلَ ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ١٠ ﴾التحريم

لەگەڵ چەندین ئایەتی تردا كە وشەی(خیانە) هاتووە، باشە ئۆزۆن پێمان ناڵێت كامەیان باسی داوێنپیسی و زینایە؟ ئەمە كەسێك داڵغەی بۆ ئەوە دەچێت و بەتەنها دایدەبڕێت بەسەر ئەو بابەتەدا كە خۆی كەسێكی خراپبێت و هیوام وایە ئۆزۆن بەدوربوبێت لەوەو تەنها لەبەر نەزانی خۆی كەوتبێتە وەها هەڵەیەكەوە.

بەهەر حاڵ ئەمە وەكو ئەوەی كە وشەكە دوورو نزیك پەیوەندی بەو مانایەوە نییە كە ئۆزۆن هێناویەتی و تەفسیری بۆ كردووە، ئەی باشە مەبەست بە فەرمووەدەكە چیە؟!

دەڵێم: وەكو دەبینین لە فەرمووەدەكەدا حەرفی(لولا) بەكارهاتووە كە بۆ(ئیمتناع)ەو یەكێك لەو شتانەی كە ئەم حەرفە ئەچێتە سەری دوو جوملەیە: (جملەی ئیسمی)و(جملەی فیعلی)، بوونی یەكەمیان هۆكاری نەبوونی دووەمە و هەمیشە پێویستمان بە تەقدیرێكیش هەیە ئەگەر بێت و جوملە ئیسمیەكە تەواو نەبوو[1]، بۆ نموونە دەڵێتی: (لَوْلا عَلِيٌ لَهَلَكَ عُمَرُ).واتە: ئەگەر عەلی نەبوایە عومەر تیا ئەچوو. پێویستت بە تەقدیرێك هەیە ئەویش ئەوەیە: (لَوْلا عَلِيٌ حَاضِرٌ لَهَلَكَ عُمَرُ)[2] واتە: ئەگەر عەلی ئامادە نەبوایە ئەوا عومەر تیا ئەچوو.

چونكە ئێمە لێرەدا ئەبینین(لولا) چوەتە سەر(عَلِيٌ) كە(مبتدأ)ەو(حَاضِرٌ) ئەبێتە خەبەر بۆی و بەبێ ئەو خەبەرە ماناكەی دروست و كامڵ نابێت و هەمیشە ئەبێت خەبەرەكەشی

---

(1) حاشية الدسوقي على مغني اللبيب (٢/١٥٠)، دار ومكتبة الهلال –بيروت–، ٢٠٠٨م.

(2) ئەمە لە بارەی دادوەریەكدا كە ئیمامی عومەر بڕیاریداو هەروەها ئیمامی عەلی بۆچونێكی تری هەبوو، ئیتر ئیمامی عومەر بۆچوونەكەی ئەوی لەلا پەسەندبوو، پاشان ئەم وتەیەی فەرموو.

هەبێت و تەقدیرێکی بۆ دانێین، هەروەها بوونی عەلیش بوەتە هۆی لەناونەچوونی عومەر(رضي الله عنه) .

دەی کەواتە بەهۆی زانینی حاڵ و زروف ڕووداوەکەوە ئەزانین چی تەقدیرێك دائەنێین بۆ ئەوەی ماناو مەبەستەکەی تەوابێت.

بۆ ئەم فەرموودەیەش دەڵێین: دەستەواژەی(وَلَوْلاَ حَوَّاءُ لَمْ تَخُن أُنْثَى زَوْجَهَا) ئەگەر حەوا(....) نەبوایە، ئەوا هەرگیز هیچ ئافرەتێك خیانەتی لە مێردەکەی نەدەکرد.

باشە ئەبێت چی دابنێین بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییەی سەرەوە پڕ بکەینەوە؟ ئایا چی شتێك هەیە گونجاوبێت بۆ ئەو شوێنە؟

لەوەڵامدا ئەوترێت: دروسترین ڕێگا ئەوەیە چیرۆکەکە وەکو خۆی بگێڕینەوەو بزانین حەوا چی شتێکی کردووە؟

کاتێك خوای گەورە خواردنی ئەو دارەی لە بەهەشتدا حەرامکردو فەرمووی لێی مەخۆن، لەوکاتەش ئیبلیس هەموو هەوڵێکی ئەوەبوو کە چۆن بتوانێت وایان لێبکات لەو دارە بخۆنو بۆ ئەم مەبەستەش شەیتان هاتە لای ئادەم و هەر وەسوەسەی بۆ دروست دەکرد و ئەویش وەڵامی نەدایەوەو پاشان شەیتان هەوڵیدا کار لە هەردووکیان بکات و، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴿٣٦﴾ ﴾البقرة:

بەڵام ئەوەی لە ئایەتەکەدا دەردەکەوێت ئەوەیە کە پێغەمبەر ئادەم وەڵامی شەیتانی نەداوەتەوە بە تەنها بەڵکو حەواش لەگەڵیدابوە، هەروەکو خوای گەورە دیسانەوە دەفەرموێت: ﴿ فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٖۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ

ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾الأعراف

وەكو بینیمان خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەفەرموێت كە وەسوەسەی كردووە بۆ هەردووكیان ئەوكات كەوتنە ناو سەرپێچی خوای گەورەوەو دارەكەیان خوارد، لێرەشەوە ئەوە بەدیار دەكەوێت كە حەوا پشتیوانی ئادەم نەبوبێت لەوەی كە بەگوێی شەیتان نەكەن و ئەو زووتر ڕازیبوبێت و كاریگەریشی لەسەر ئادەم هەبوبێت(خوای گەورەش زاناترە)، هەروەها لە تەوراتیشدا بەهەمان شێوە هاتوەو دەڵێت: (وَرَأَتِ المَرْأَةُ أَنَّ الشَّجرةَ طيِّبَةٌ للمَأْكَلِ وَشهيَّةٌ للعُيونِ وَأَنَّ الشَّجَرَةَ مُنيَةٌ للعَقْلِ فَأَخَذَتْ مِنْ ثَمرِهَا وَأَكَلَتْ وَأَعْطَتْ بَعْلَهَا أَيْضاً مَعَهَا فَأَكَلَ)[1].

واتە: حەوا وای بینی كە دارەكە بەكەڵكە بۆخواردن و بەرایی چاو ئەدات و هەروەها مەبەستی عەقڵیشە[2]، بۆیە لەبەرەكەی هەڵگرت و لێی خوارد و هەندێكی دایە مێردەكەی و ئەویش لێی خوارد.

ئێمە لێرە دەبینین كە هەموو تاوانەكە خراوەتە سەر حەواو ئادەمی لێ دەركراوە، ئیتر بەهۆی ئەوەوەبێت كە ئادەم(عليه السلام) بەهۆی حەواوە خۆی پێ نەگیرابێت، یاخود بەهۆی دەستكاری و تەحریفی جولەكەوە بۆ تەورات ئەم دەقە شێوێنرابێت.

بەهەرحاڵ ئەبینین كە هەردووكیان تاوانباربوون بە دەقی قورئان و تەوراتیش، هەروەها خوای گەورە كاتێك وەسوەسەكەی تەواو دایە پاڵ ئادەم نەیفەرموو لەدارەكەیان خواردو باسی ئەوە ناكات لەدارەكە خورابێت، بەڵكو خواردنی دارەكە دوای ئەوەبوو كە وەسوەسە كرا بۆ خێزانیشی،

تەنها لە سورەتی(طه) نەبێت كە ئەیداتە پاڵ ئادەم و باسی ئەوە دەكات كە ئادەم(عليه السلام) سەرپێچی خوای گەورەی كرد و باسی حەوا ناكات و دەفەرموێت: ﴿فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ

---

[1] سفر التكوين، إصحاح:(٣)، رقم: (٦)، (١١/١).

[2] واتە: ئامانجی عەقڵەو ئەیەوێ بەدەستی بهێنێت.

ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ ﴾طه

ڕەنگە لێرەدا پرسیارت بۆ دروست بێت و بپرسیت: باشە ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتەكانی تردا دژی یەكتر نین؟ ئەوەتانێ لێرەدا پاڵی دەداتە پاڵ ئادەم بەتەنهاو لەو ئایەتانەی تریش باسی ئەوەی فەرموو كە پێكەوە ئەنجامیانداوە، تاوەكو حەواش نەهاتە پاڵی تاوانەكەیان ئەنجام نەداوە؟

**دەڵێم**: نەخێر بە هیچ شێوەیەك دژی یەكتر نین و ئایەتەكانی پێشوو جێگیرن و چەند جارێك لە قورئانی پیرۆزدا دووبارە بوونەتەوەو ئەمە جێگیرە، بۆ وەڵامی ئەوەش كە خیتابەكە زیاتر ڕووەو ئادەمەو لێرەش بەتەنها ناوی هاتووە، لەبەر چەند خاڵێك:

١- لەبەر ئەوە زیاتر خیتابەكە ڕووەو ئادەمە چونكە ئەو پێش حەوا دروستبوەو تەنانەت ئاگاداری ئەوە هەبوو كە فریشتەكان كڕنووشی ڕێزیان بۆ برد و ئیبلیس نەیبرد و پاشان سوێندی خوارد كە بەردەوام دوژمنایەتیان بكات، بەڵام حەوا ئەم دیمەنانەی نەدیوە بۆیە لۆمە لەسەر ئادەم قورسترە.

٢- ئادەم(عليه السلام) نێردراو و پێغەمبەری خودایەو تەكلیفی ئەم قورسترەو وەكو هیچ كەسێكی تر نیەو ئەمان ئەبێت پێش هەموو كەسێك فەرمانبەرداری خوای گەورەبن.

٣- پێغەمبەر ئادەم(عليه السلام) یەكەم دروستكراوەو سەرچاوەی هەموو بونەوەرەوە حەواش بەشێكە لەو بۆیە زیاتر لۆمە ڕوو دەكرێتە سەرچاوە، هەروەكو چۆن بۆ خراپی و ناوزڕانی خێزانێك باوك تۆمەتبارە(بەدووربێت لە دایك و باوكمان ئادەم و حەوا)[1].

جا ئێستا ئێمە زانیمان ئەو خیانەتەی كە باسكراوە، بریتی بووە لەوەی كە پشتیوانی ئادەم نەبووە لەوەی كە ڕەتی ئەو خوارنە بكەنەوەو بەگوێی شەیتان نەكەن، و دواییش

---

[1] ئەمە تەنها وەكو نمونەیەك بۆ نزیككردنەوەی ئاستی تێگەیشتنمان، نەوەك خراپە پاڵدانە پاڵ ئادەم و حەواو ناشرین وەسفكردنیان، چونكە ئەوە پیشەی ئێمە نیە.

خوای گەورە بەهۆی تۆبەكردنی ڕاستگۆیانەیانەوە لێیان خۆش بوو، بەمەش ئەزانین كە تەفسیرەكەی ئۆزۆن تەفسیری كەسێكە نەترسی خوای گەورەی هەیە نە حورمەتی عەقڵ و ژیریی خوێنەرانی دەگرێت، ئەگینا چی كەسێكی ژیر هەیە ئەو دەقە بخوێنێتەوەو وەها گومانبەرێت كە پەنا بەخوای گەورە دایكی هەموو مرۆڤایەتی و دایكی پێغەمبەران و پیاوچاكان زینا بكەن؟

باشە هەر چی كەسێك هەیە ژیربێت و بڵێ حەوا داوێنپیسی كردووە لە كاتێكدا بێجگە لە ئادەم كە مێردێتی یەك مرۆڤی تر بوونی نەبووە لەو كاتەدا؟!

ئەم جۆرە وتانە تەنها لە ئۆزۆن و هاوشێوەكانی چاوەڕوان دەكرێت لە كاتێكدا كەسی ژیر تنۆك تنۆك عارەقی شەرم ئەڕێژێت!

" باشە چ ئافرەتێك خیانەت لە مێردی خۆی دەكا؟ ژنی زیناكارو داوێنپیس نییە مەگەر؟"

هەروەها مانای وا نییە كە هەموو ئافرەتێك خیانەت دەكات و ئەبێت تاوان بكات، بەڵكو مانای ئەوەیە كە حەوا بەشێوەیەكی وەها دروستكرابێت و تاوان ئەنجام بدات، ئەوا بێگومان عیسمەت بۆ هیچ كەسێكی تر نامێنێتەوەو گشت ئافرەتێكیش ئەگەری ئەوەی هەیە بكەوێتە ناو هەڵەوە، هەر لە زمانیشدا جێی دەبێتەوە لەبری خەبەرەكەی(لولا)بڵێین: (غَيْرُ مَعْصُوْمَةٍ) و بەم شێوەی دابنێین: (لَوْلاَ حَوَّاءُ غَيْرُ مَعْصُوْمَةٍ لَمْ تَخُن أُنْثَى زَوْجَهَا). واتە: ئەگەر حەوا وانەبوایە كە مەعسوم نییە ئەوا هەرگیز ئافرەت خیانەتی لە مێردەكەی نەدەكرد.

یانی كاتێك كە حەوا ئافرەتی یەكەمە بێ كەم وكورتی و هەڵە نەبووە، ئەوا چاوەڕوانی مەعسوم بوون لە هیچ ئافرەتێكی تر بە هیچ شێوەیەك مەكەن و هەرگیز ئافرەتێكی بەوشێوەیەتان دەست ناكەوێت كە مەعسوم بێت.

لەكۆتاییدا ئەمەوێت سەرنجی بەڕێزتان بۆ بابەتێكی گرنگ ڕابكێشم ئەویش ئەوەیە: كە مانای وا نییە كە ئەم فەرموودەیە تەنها بۆ ئافرەتانەو پیاوان ناگرێتەوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە پیاوانیش دەگرێتەوە چونكە باوكیشمان ئادەم بە هەمان شێوەبوو، بەڵام لێرەدا

كە باسی ئافرەت هاتووە بە تەنها دەكرێت لەبەر خاتری ڕووداوێكی تایبەت وترابێت و پەیوەست بووبێت بە ئافرەتانەوە بۆیە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)باسی ئافرەتانی كردووە بەتەنهاو باسی پیاوانی نەكردووە، ئەگینا فەرموودەگەلێكمان هەیە لەوبارەیەوە كە هەموو نەوەی ئادەم شیاوی هەڵەن و هەڵە دەكەن.

**فەرموودەی نۆیەم:**

**عَنْ أُسَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «قُمْتُ عَلَى بَابُ الجَنَّةِ، فَكَانَ عَامَّةَ مَنْ دَخَلَهَا المَسَاكِينُ، وَأَصْحَابُ الجَدِّ مَحْبُوسُونَ، غَيْرَ أَنَّ أَصْحَابَ النَّارِ قَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ، وَقُمْتُ عَلَى بَابُ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ»**[١].

ئۆزۆن ڕەخنەی لەبەشی كۆتایی فەرموودەكە هەیە كە زۆربەی ئەوانەی دەچنە دۆزخەوە ئافرەتانن.

---

[١] رواه البخاري (٧/٣٠)، برقم: (٥١٩٦).

فەرموودەی دەیەم:

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَضْحَى أَوْ فِطْرٍ إِلَى المُصَلَّى، فَمَرَّ عَلَى النِّسَاءِ، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ فَإِنِّي أُرِيتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ» فَقُلْنَ: وَبِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وَتَكْفُرْنَ العَشِيرَ، مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ»، قُلْنَ: وَمَا نُقْصَانُ دِينِنَا وَعَقْلِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَلَيْسَ شَهَادَةُ المَرْأَةِ مِثْلَ نِصْفِ شَهَادَةِ الرَّجُلِ» قُلْنَ: بَلَى، قَالَ: «فَذَلِكِ مِنْ نُقْصَانِ عَقْلِهَا، أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ» قُلْنَ: بَلَى، قَالَ: «فَذَلِكِ مِنْ نُقْصَانِ دِينِهَا»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری(ﷺ) فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) لە جەژنی قوربان بوو یان ڕەمەزان دەرچوو بۆ نوێژگەكە، تێپەڕبوو بەسەر ئافرەتانداو فەرمووی: ئەی كۆمەڵی ئافرەتان: خێرو چاكە بكەن من ئێوەم بینی كە زۆرینەی خەڵكی ئاگرن، وتیان: بەچی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: زۆر نەفرینی دەكەن و سپڵەیی دەكەن، نەمدیوە هێندەی ئێوە كەسانێك هەبێت كە(عەقل)یان كەمبێت لەگەڵ دینیان و كەچی ژیریی پیاوانی دامەزراو بەرن وتیان: كەمی ژیریی و ئاینی ئێمە لەكوێدایە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ فەرمووی: ئایا شایەتی ئافرەت نیوەی شایەتی پیاو نیە؟ وتیان بەڵێ، فەرمووی: دەی ئەوە لەبەر كەمبوونی ژیریەتی، ئایا ئەگەر كەوتە حەیزەوە واز لە نوێژ و ڕۆژوو ناهێنێت؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: دەی ئەوەش لە كەمی ئاینیەتی.

لەم فەرموودەیە ڕەنگە سێ شت جێگەی سەرنجی تۆی بەڕێزبێت و ئەوانیش:

١ – زۆربەی دانیشتوانی دۆزەخ ئافرەتانن.

٢ – كەمی ژیریی ئافرەتان.

٣ – كەمی ئاینی ئافرەتان.

## ئایا ئافرەتان زۆرینەی دانیشتوانی دۆزەخن؟!

---

[1] رواه البخاري (١/٦٨)، برقم: (٣٠٤).

دەڵێم: ئۆزۆن خۆشی وەڵامەكەی بەباشی دەزانێت، بەڵام هەر ئەیەوێ ملكەچی حەق نەبێت و ئەوەی لەلایەتی و كۆیكردوەتەوە لە نەیارانی ئیسلام دووبارە ئەمیش بیجوێتەوەو گوێ بۆ كەسیش نەگرێت بۆی ڕاست بكاتەوە، نەك گوێ ناگرێت بەڵكو ڕێگەشیان لێ دەگرێت كە وەڵام بدەنەوەو دەڵێت:

"هیوام وایە كەس نەڵێت لەبەر ئەوەی ژمارەی ژنان زیاترن لە پیاوان بۆیە زۆرینەی دانیشتوانی ئاگر پێك دێنن، چونكە فەرموودەكان باسی ئەوە دەكەن كە بەهۆی خیانەت و سپڵەیی و نوقسانی و ناتەواوی و فیتنەی پیاوان و ... كەم وكوڕیەكانی تر كە لە ئافرەتدا كۆبونەتەوە" ع: ١٢١، ك: ٢١٣

دەڵێم: ئەم وتەیەی ئۆزۆن تەواو سەركەشی و ملنەدانێكی ڕوونی پێوەدیارەو سەرەڕای تێكەڵكردنی بابەتەكان و چەواشەكردنێكی بەرچاو، چونكە ئەوەی لە باسی چوونە ئاگردا هاتووە بەتەنها(زۆری نەفرەتكردن و سپڵەییە بەرامبەر كەسوكار و مێرد)، ئیتر ئەو هەمووە زیادەی تر كە ئۆزۆن هێناویەتی پەیوەندی بەو بڕگەیەوە نییە وەكو لە دەقی فەرموودەكەدا دیارەو بەرچاوە.

هەروەها لەبارەی زۆری ژمارەی ئافرەتانەوە شتێكی حاشاهەڵنەگرەو تەنانەت ئۆزۆن خۆی نەداوە لە هێنانی ڕوایەتەكەی ئەبو هوەیرە چونكە تەواو لەوە زیاتر پەردەی لەسەر هەڵدەماڵراو ناچار ئەبوو كە دوابەدوای دەقی فەرموودەكە وتەی ئەبو هورەیرەش بێنێت، یاخود بیشارێتەوەو نەیهێنێ بەڵام كە خەڵكی چوونەوە سەر فەرموودەكەو ببینن و ئابڕووی زانستیی بۆ نەمێنێتەوە، جا باشترین ڕێگە لەلای ئۆزۆن ئەوەبووە كە ئەو ڕیوایەتە نەهێنێت لەبەر خاتری ئەم وتەیەی هاوەڵی خۆشەویست ئەبوهورەیرە(ﷺ) كە ڕاڤەی فەرموودەكەمان بۆ دەكات وەكو پێشەوا محمدی كوڕی سیرین(ﷺ) لێیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت پرسیاركراوە لە ئەبو هورەیرە: الرِّجَالُ فِي الْجَنَّةِ أَكْثَرُ أَمِ النِّسَاءُ؟ فَقَالَ أَبُو

هُرَيْرَةَ: أَوَ لَمْ يَقُلْ أَبُو الْقَاسِمِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ... لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ اثْنَتَانِ...»[١]

واته: پیاوان لـه بەهەشتدا زۆرترن یان ئافرەتان؟ ئەبوهورەیره فەرمووی: ئایا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەیفەرمووە: یەكەم كۆمەڵ كە دەچنە بەهەشتەوە لـەسەر شێوەی مانگن... بۆ هەر یەكێكیشیان دوو خێزان هەیە.

جا ئێمە لـێرە ئەبینین كە تەنها ژمارەیان لە ئاگردا نییە كە لە پیاو زیاترن، بەڵكو لـەبەهەشتیشدا بەهەمان شێوەیە، ئەمەش لـەبەر ئەوەی كە هەر لە بنەڕەتدا ژمارەیان زیاترە لـەپیاوان، نەوەك ئەوەی كە ئۆزۆن وێنای دەكات و دەیەوێت بەناوی داكۆكیكردن لـەمافی ئافرەتەوە ڕاستیەكان بشارێتەوە، ئەوەتانێ هاوەڵی خۆشەویست ئەبوهورەیرە بە ئاماژەی ڕاستەوخۆ لـەوبارەیەوە دواوەو زانایانی ڕاڤەكاری فەرموودەش وەكو پێشەوا ئیبن حەجەر و قازی عیاز و قورتوبی و ... لە كتێبەكانیاندا باسی ئەم دیاردەیان كردوەو بەرچاوڕوونبوون بەهۆی سوننەتی بەرزو پاك و وەحیی پێغەمبەری خۆشەویستەوە(ﷺ)، ئەوەتانێ ئەوان چەندین سەدە پێش ئێستا ئەم وتانەیان فەرمووە لـەكاتێكدا ئەم هەموو شەڕو شۆڕو پێكدادان و كوشتارەی كە ئەمڕۆ هەیە نەیانبینیوە كە هەمووی بەرۆكی پیاوانی گرتوەو زۆرێك لە پیاوان تێداچوون، ئەمە سەرەڕای ئەو هەموو ئیش و كارە قورسانەی كە لە ڕۆژئاوا بە كرێكاریان دەكرد و دەبوەهۆی مردنی ڕێژەیەكی زۆرو تەقینەوەی ئەو هەموو كارگەو لـێكەوتە بەرچاوەكانی كە هەمووی دەبوە هۆی لـەناوچوونی ڕێژەیەكی زۆری پیاوان بە كۆمەڵ.

دیسانەوە لـێرەش ڕەوایە ئاماژە بەوە بكەین هەرچی ئەو سیفەتانەیە كە باسكراوە بۆ ئافرەتان كە ئەبێتە هۆی چوونە ئاگریانەوە، ئەمە وەك شتێك پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئەمەی بینیوە كە لـەناو كۆمەڵی ئافرەتاندا باوەو بە ئێستاشەوە هەر هەیەو ئەبینرێت و بەڵكو زیاد بەسەر ئەوەشەوە غەیبەت و بوهتان و ... چەندین تاوانی تر كە ئافرەتانی پێ

[١] رواه مسلم (٤/٢١٧٨)، برقم: (٢٨٣٤).

ئەناسرێتەوەو ئەوان زیاتر تووشی ئەبن، بۆیە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ویستوویەتی بە ئاگایان بێنێتەوە، فەرموویەتی ئەوە هۆكاری چوونە دۆزەخەو خۆتانی لیّ بپارێزن نەوەك لەبەر ئەوە زۆرینەی ئافرەت بچێتە دۆزەخ وەكو ئۆزۆن وێنای دەكات، چەندین ئافرەتیش هەیە كە سیفەتی تری خەڵكی ئاگری هەیەو تاوانی گەورە ئەنجام ئەدات كە شیاوی چوونە ئاگرەو یەكێك لەو تاوانانەی كە لە فەرموودەكەشدا باسكراوە ئەنجام نادات، كەواتە ئەو تاوانانەی كە باسكراون هۆكاری زۆرێتیەكەی ئاگر نیە!

## ئایا ئافرەتان بیّ عەقڵن و ژیریان كەمە؟

**دەڵێم:** لەمانای ئەو فەرموودەیەدا زۆر كەس بەهەڵەدا ڕۆشتون و وا دەزانن كە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ئافرەتان بیّ عەقڵن و ژیرییان كەمە، بەڵام بە وردبوونەوە لە پرسیاری ئافرەتان: كە بۆچی عەقڵیان كەمە، پاشان وەڵامی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەوەی كە ئەوان لە شایەتیدا نیوەی پیاون تەواو ماناكەی بە دیار دەكەوێت.

باشە لە شایەتیدا گرنگترین شتێك مەگەر لەبەركردن نیە؟! بێگومان هەر ئەوەیەو لەبەر ئەوەش خوای گەورە دوو ئافرەتی بە شایەتێك هەژماركردووە چونكە ئەوان زووتر شتیان بیردەچێتەوە بەهۆی باروزروفی تایبەتی خۆیان و منداڵبوون و ...، كە ئەوەش ئەمڕۆ ئەبینین و بەرچاوەو ئەگەر سەیر بكەین زۆربەی ئەو بوارانەی كە پێویستی بەلەبەركردنە پیاوان پێشەنگن تێیدا.

جابۆیە دوو ئافرەت وەرگیراوە بە شاهیدێك چونكە ئەوان لەپێشن و ئامادەی لەبیرچوونەوەن و بەتایبەت لە كاتی بینینی ڕووداو و ئەو بابەتە هەستیارانەدا كە سۆزو عاتیفەیان ئەجوڵێنێت و بابەتی سۆز و عاتیفەش دەستی بەسەر ئافرەتاندا گرتوەو ئەوەش تایبەتمەندیەكە خوای گەورە پێیداون و ئەگەر ئەوەش نەبێت بێگومان ناتوانن بەرگەی بەخێوكردنی منداڵ و هەڵگرتنی ئەو هەموو ماندوبوون و بارگرانیە بگرن و گوێی نەدەنیّ، كە ئەمە هەرگیز بە پیاوان ناكرێت و هیچ پیاوێك ئەو توانایەی نیە، لەبەر ئەمەشە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ

﴿... فَرَجُلٌ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ .. ﴿٢٨٢﴾﴾البقرة

وەكو بینیمان خوای گەورە زۆر بەڕوونی هۆكارەكەیمان بۆ باس دەكات و دەفەرموێت: ئەگەر یەكێكیان بیری چوویەوە بۆ ئەوەی ئەوی تریان بیری بهێنێتەوە[١].

دەی ئێستا كاتی ئەوەیە بڵێین: عەقڵ بریتییە لە(لەبەركردن) لەوێدا نەوەك(ژیریی)، ئەوەتا لە زمانی عەرەبیدا هاتووە شتێكی بڵاوە بەمانای(الحِفْظ) یش دێت جا هەر جۆرێك لە جۆرەكانی بێت و لەبەركردنیش ئەچێتە ژێریەوە زمانی هۆزێكی عەرەبەو تەنانەت "لەبید"ی گەورە شاعیری عەرەبیش شیعری پێ وتووە، هەروەكو گەورە زانای زمانی عەرەبی "ئەبو هیلال ی عەسكەری" دەفەرموێت[٢]:

وَقَالَ بَعْضُهُمْ الْعَقْلُ الْحِفْظُ يُقَالُ عَقَلْتُ دَرَاهِمِي، أَي: حَفِظْتُهَا وَأَنْشَدَ قَوْلَ لَبِيْدٍ:

وَاعْقِلِي[٣] إنْ كُنْتِ لَمّا تَعْقِلي وَلَقَــدْ أفْلَـــحَ مَنْ كانَ عَقَــلْ

---

[١] شایەتی دوو جۆرە:

١– تەحەموڵ: بریتیە لەوەی كە بابەتێك هاتوەتە پێش و پێویستت بە شایەتە لەگەڵ خۆتی بەریت، ئا لەم كاتەدا تەنانەت بێدین و عەلمانیەكانیش كە ڕەخنە دەگرن، ئافرەت نابەن و پیاو دەبەن، كە هەر ئەمەشە پێویستە دوو ئافرەت ببرێت چونكە ترسی بیرچوونەوە لە ئارادایە.

٢– ئەدا: ئەمە ڕووداوێك ڕوویداوەو پێویستمان بە شاهیدە بۆ كەوتنی بابەتەكە بە لایەكدا، لەم كاتەیاندا ئەگەر هات و بابەتێك هاتە پێشەوەو تەنها ئافرەتێك شاهیدحاڵبوو ئەگەر هات و مەرجەكانی شاهێدی تێدابوو كە پێویستە لە شاهێدا هەبێت ئەوا مافەكە دەگەڕێنرێتەوە، بۆ نمونە: لە بابەتی شیرپێداندا شاهێدی یەك ئافرەت بەسە چونكە ئەمە ئیش و كاری خۆیانەو بیریان ناچێتەوە، ئەگەر چی ماوەیەكی زۆریشی بەسەردا تێپەڕێت.

[٢] الفروق اللغوية لأبي هلال العسكري، ص: (٨٣)، حققه وعلق عليه: محمد إبراهيم سليم، الناشر: دار العلم والثقافة للنشر والتوزيع، القاهرة – مصر.

[٣] لەهەندێك ڕیوایەتی شیعرەكەدا بە پیتی واو(واعلقي) و لەهەندێكی تریش بەبێ واو (اعقلي)، هەردوكیان هەر دروستە لەڕووی كێشی عەروزەوە، چونكە واو هەبوو دەكرێتە هەمزەی وەصل و واویش نەبوو ئەكرێتە هەمزەی قەتع و وەزنەكە ڕێك و پێك و بێ كێشەیە. نەوەك كەسێك ببینێت و وابزانێت هەڵەیە.

هەروەها لە چەندین فەرموودەی تردا هاتووە كە مەبەست پێی لەبەركردنەو تەنانەت ئەمەیان لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە كە ئۆزۆن لێی بێ خەبەرە، یان لایداوە چونكە بۆ ئەو بێ سەمەرە:عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ، قَالَ: «عَقَلْتُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَجَّةً مَجَّهَا فِي وَجْهِي وَأَنَا ابْنُ خَمْسِ سِنِينَ مِنْ دَلْوٍ»[1].

واتە: لەبەرم كردووە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) كە هەندێك ئاوی لەدەمی وەرداو پێیدا كردم ئەو كاتەی كە تەمەنم شەش ساڵبوو[2].

هەروەها عەمری كوڕی عاص(رضي الله عنه) ئەفەموێ: عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، قَالَ: " عَقَلْتُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَلْفَ مَثَلٍ "[3]

واتە: هەزار پەندم لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لەبەركردووە.

هەروەها پێشەوا حەسەنی كوڕی عەلی(رضي الله عنه) دەفەرموێت: "عَقَلْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعَوَاتٍ كَانَ يَدْعُو بِهِنَّ"[4].

واتە: هەندێك نزاو پاڕانەوەم لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)لەبەركردووە كە پێیان دەپاڕایەوە.

جا ئەگەر سەیر بكەی لەم فەرموودانەو لە چەندین شوێنی تریشدا لە كتێبەكانی فەرموودە[5]، وشەی(عقل) بەكارهاتووە بۆ لەبەركردنو ئەمەش ڕەوانترو ڕوونترە هەم لەگەڵ بابەتەكەدا كە شایەتیەو هەماهەنگیەكی تەواویشی لەگەڵ ئایەتە پیرۆزەكەدا كە باسی شایەتیەو لەگەڵ تەواوی فەرموودەكەدا هەیە، بەتایبەت دەستەواژەی پێشی خۆی كە

---

[1] رواه البخاري (٢٦/١)، برقم: (٧٧).

[2] كەی ئەو ڕۆژە بهاتایە مسوڵمانان لە پێغەمبەری خواوە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) فێربوونایە، ڕەوشتی خۆ بەكەمزانی و گرنگیدان بە منداڵان و هەموو دەوروبەر!!

[3] رواه أحمد (٣٤١/٢٩)، برقم: (١٧٨٠٥).

[4] فوائد الإمام الفاكهي، ص: (٢٧٥)، برقم: (١٠٣).

[5] المعجم الكبير للطبراني (٧٨/٣)، برقم: (٢٧١٤)، الدعوات للبيهقي (٥٥٤/١)، برقم: (٤٣٠)، مختصر قيام الليل للمروزي، ص: (٣٢)، بَابُ مَا يُدْعَى بِهِ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ ،السنن الصغرى للبيهقي (١٦٨/١)، برقم: (٤٣٥).

دەفەرموێت: نەفرین دەكەن و سپڵەن، چونكە ئەم دوو خەسڵەتە نایەتە جێ مەگەر لەدوای بیرچوونی فەزڵ و گەورەیی ئەو كەسەی كە نەفرینی لێ دەكەیت یاخود سپڵەیی بەرامبەر ئەو كەسەی كە چاكەی لەگەڵت كردووە كە هۆكاری سەرەكی بریتییە لە خرابی لەبەركردن ئەگەر واقیع بێت و ئەگەر بیریشی بێت بەڵام بێوەفابێت، ئەوا لە ڕووكەشدا هەروا دەردەكەوێت كە بیری چوەتەوەو وەها خۆی نیشان دەدات كە بیری نەماوە.

هەروەها پێشەوا "نەوەوی"(ﷺ) دەفەرموێت: " أَيْ أَنَّهُنَّ قَلِيلاتُ الضَّبْطِ"[1].

واتە: ئافرەتان لەبەركردنیان لاوازەو كەمە.

بەهەمان شێوەش لە پێشەوا "مازری"ەوە(ﷺ) ئەگێڕێتەوە لە لاپەڕەی دوای ئەو.

ڕەنگە خەڵكانێك وا گومان بەرن ئەم مەرجە تەنها بۆ ئافرەتانەو پیاوان هیچ مەرجێك بۆ شاهیدیدانیان دانەنراوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە هەردوو وەكو یەكن و ئەگەر پیاوێكیش لەبەركردنی خراپبێت یاخود كەسێكبێت درۆی لێ بینرابێت، یاخود تاوانی گەورە ئەنجام بدات، یان بەردەوام بێت لەسەر هەندێك تاوانی بچوكیش، ئەوا زانایان شایەتیەكیان ڕەت كردوەتەوەو لە هیچ بوارێك قسەیان لێ وەرنەگرتووە.

لەكۆتایشدا دەڵێم: ئەگەر ئافرەت كەم عەقڵبێت وەكو ئۆزۆن و هاوشێوەكانی دەڵێن، ئەوا هەرگیز پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمانی نەدەكرد كە نیوەی ئاین لە دایكی ئیمانداران عائشە(ﭬ) وەرگیرێت و دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) هەموو هاوەڵان و نەوەكانیان لە دەوری كۆنەدەبوونەوە بۆ ئەوەی ئاینی لێ وەرگرن، ئەگەر ئافرەت عەقڵ و ژیریی خەلەلی تێدابێت بەو شێوەی ئەوان وێنای دەكەن ئەوا هەرگیز پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لە سوڵحی حودەیبیە لەگەورەترین و چارەنووسسازترین پرسدا بە قسەی دایكی ئیمانداران ئوم سەلەمەی نەدەكرد، ئەگەر ئافرەت بەو شێوەبێت لەلای پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵان و گومانیان لە عەقڵی هەبوبێت ئەوا تاكە موسحەفێكی قورئان كە

---

[1] شرح النووي على مسلم (٢/٦٦).

هەبوو پێشەوا عومەر(ﷺ) وەسیەتی نەدەكرد لەلای حەفسە(ﷺ) [1] دابنرێت، لەگەڵ چەندین كاری گرنگی تر كە بە ئافرەتان سپێردراوە بە درێژایی مێژووی مسوڵمانان.

## ئایا ئافرەتان ئاینیان نوقسانە؟!

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا كە ئافرەتان ئاینیان نوقسانە بەو مانایەی كە هەڵناستن بە گوێڕایەڵی خوای گەورەو ئیمانیان قسەی لەسەرە؟

دەڵێم: ئەمە تەنها وتەی كەسێكە كە هیچ زانیاریەكی دەربارەی دەقە شەرعیەكان و زمانی عەرەبیش نەبێت، ئەگینا ئەو فەرموودەیە خۆی باسیكردوەو بە تەنها وردبوونەوە لە ماناكەی كە بۆچی ئیمانیان نوقسانە، ئیتر بەسە بۆ تێگیشتن لە مەبەست و ماناكەی.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ئەوان ئیمانیان كەمە لەبەر ئەوەی كە نوێژ ناكەن و ڕۆژوو ناگرن لە كاتی سوڕی مانگانەدا!

باشە ئەمە تۆ بڵێی سەرزەنشتبێت لەكاتێكدا بە ویست و فەرمانی خوای گەورەیە كە ئافرەتان دەكەونە سوڕی مانگانەوەو واز لەو دوو پەرستشە دێنن؟ تۆ بڵێی ئیمانیان كەم وكورتبێت بەهۆی شتێكەوە كە ئەوان لە دەسەڵاتی خۆیاندا نیە؟

نەخێر هەرگیز وەها شتێك لە ئیسلامدا جێگەی نابێتەوەو ئەوەتانێ قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾البقرة

باشە تۆ بڵێی، لەدوای ئەم دەقەی قورئانەوە ئیتر كەس وەها گومانێك بەرێت و ئافرەت تۆمەتبارو عەیبدار بكات بە شتێك كە لەدەسەڵاتیدا نیە؟ ئایا زانایانی ئیسلام لەو فەرموودەیە وەها تێگەیشتوون كە ئافرەت ئاین و دینی كەمە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە هەمووی دەڵێم: حاشا پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) وەها وتەیەك بفەرموێت بەو مانایەی كە ئۆزۆن و دووژمنانی ئیسلام و سوننەت تێیگەیشتوون، بەڵكو واتای فەرموودەكە ئەوەیە كە دین لەوێدا بەمانای(عمل) و(تكليف) دێت، و ئەوان

---

[1] ئەمیش موژدەی بەهەشتی پێدراوە كە ئافرەتە، وەكو دیاریەك بۆ ئۆزۆن.

تەكلیفیان بە كەمتر لەسەرە، بە بەراوردكردن لەگەڵ پیاواندا و تەكلیف لەسەر ئەوان كەمترە، نەوەك ئەوان ئاینیان لاوازبێت و ئیمانیان كەم و كورتی تێدابێت.

جا ئەمەش نە تاوانەو نە هۆی ئەوەیە كە پیاوان لەوان باشتربن، چونكە ئەمە شتێكە خوای گەورە وای ویستووەو ئەمەش هەروەكو كەسانی خاوەن عوزرو بەهانەن كە هیچ تاوانێكیان لەسەر نیە، وەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾ ﴾الفتح

جا وەكو بینیمان ئەو كەسانەی كە خاوەن بەهانەن هیچ تاوانێكیان لەسەر نیەو لە تەكلیفدا كەمتر تەكلیفیان لەسەرەو نەقس لە برِی كردەوەكانیاندا هەیە، بەڵام پاداشت بەگوێرەی ئەوەیە كە لەسەریانەو بۆیان دانراوە، بۆ نموونە كەسێكی كوێر لەسەری فەرز نەكراوە جیهاد بكات و بە نەكردنی سزا نادرێت لە دوارِۆژداو لە دونیاشدا جێگەی لۆمەو سەرزەنشتكردن نیە، دەی بەهەمان شێوەش ئەوەی كە دەفەرموێت ئافرەتان نەقس لە دینیان هەیە، بەو واتایەی كە كردەوەیان نەقسی تێدایەو كەمتر كردەوەیان لەسەرە لە چاو پیاواندا، رِەنگە خوای گەورە بەهۆی ناسكی سرووشتی ئافرەتان و لاوازیان لە چاو پیاواندا كەمتری لەسەر دانابن، ئەمەش لە چەندین فەرموودەی تردا هاتووە، كە ئیمان و دین بە كردەوە ناوزەند كراوە.

پاشان هیچ زانایەك لە زانایانی ئیسلام وەها تێنەگەیشتوون كە ئەمە تانەبێت بۆ ئافرەتان یاخود لۆمەكردنبێت، هەروەكو پێشەوا ئیبن حەجەر(رحمه الله) دەفەرموێت:

" وَلَيْسَ الْمَقْصُودُ بِذِكْرِ النَّقْصِ فِي النِّسَاءِ لَوْمَهُنَّ عَلَى ذَلِكَ"[1].

واتە: مەبەست بە باسكردنی كەم و كورتی لە ئافرەتدا لۆمەكردنیان نییە لەسەری.

[1] فتح الباري لابن حجر العسقلاني (١/٤٠٦).

هەروەها پێشەوا بەدرەدینی عەینی دەفەرموێت: " فَإنْ قُلْتَ: أَلَيْسَ ذَلِك ذَماً لَهُنَّ؟ قُلْتُ: لَا وَإنَّمَا هُوَ عَلَى مَعْنى التَّعَجُّبِ بأنَّهنَّ مَعَ اتِّصَافِهِنَّ بِهَذِهِ الْحَالةِ يَفْعَلْنَ بِالرَّجُلِ الحازِمِ كَذَا وَكَذَا"[١].

واتە: ئەگەر وتت: ئایا ئەوە سەرزەنشت نییە بۆ ئافرەتان؟ دەڵێم: نەخێر بەڵكو بە مانای سەرسوڕمان دێت لەوەی كە لەگەڵ ئەو لاوازیەی هەیانە، ئەوەو ئەوە بە پیاوان دەكەن.

ئەم وتەیەی ئیمامی عەینی(ﷺ) ئەوەی لێوە فێر دەبین كە ئەمە عەیبداركردن و سەرزەنشت نییە بۆ ئافرەتان، بەڵكو سەرسوڕمانی پێغەمبەری خۆشەویستە(ﷺ) لەوەی كە ئافرەتان سەرەڕای لاوازییان لە ڕووی هێزو ناسكی سرووشتیان، پیاوی بەهێزو بەتوانا لە خشتە دەبەن و بەروە هەڵدێری دەبەن.

كۆتا وتەش ئەكەین بە وتەی پێشەوا نەوەوی(ﷺ) كە دەفەرموێت: " فَإنَّ الدِّينَ وَالإِيمَانَ وَالإِسْلامَ مُشْتَرِكَةٌ فِي مَعْنًى وَاحِدٍ كَمَا قَدَّمْنَاهُ فِي مَوَاضِعَ وَقَدْ قَدَّمْنَا أَيْضًا فِي مَوَاضِعَ أَنَّ الطَّاعَاتِ تُسَمَّى إِيمَانًا وَدِينًا وَإِذَا ثَبَتَ هَذَا عَلِمْنَا أَنَّ مَنْ كَثُرَتْ عِبَادَتُهُ زَادَ إِيمَانُهُ وَدِينُهُ وَمَنْ نَقَصَتْ عِبَادَتُهُ نَقَصَ دِينُهُ ثُمَّ نَقْصُ الدِّينِ قَدْ يَكُونُ عَلَى وَجْهٍ يَأْثَمُ بِهِ كَمَنْ تَرَكَ الصَّلاةَ أَوِ الصَّوْمَ أَوْ غَيْرَهُمَا مِنَ الْعِبَادَاتِ الْوَاجِبَةِ عَلَيْهِ بِلا عُذْرٍ وَقَدْ يَكُونُ عَلَى وَجْهٍ لا إِثْمَ فِيهِ كَمَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ أَوِ الْغَزْوَ أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ مِمَّا لا يَجِبُ عليه لعذر وَقَدْ يَكُونُ عَلَى وَجْهٍ هُوَ مُكَلَّفٌ بِهِ كَتَرْكِ الْحَائِضِ الصَّلاةَ وَالصَّوْمَ"[٢].

واتە: ئاین و ئیمان و ئیسلام هاوبەشن لە مانادا وەكو لە چەندین شوێندا باسمان كردووە[٣]، هەروەها لە چەندین شوێندا باسمان كردووە كە گوێڕایەڵی و كردەوەی چاك پێی دەوترێت دین و ئیمان، جا كە ئەمە جێگیربوو ئیتر ئەزانین هەركەسێك پەرستشی زیادبوو ئەوا ئیمان و دینەكەشی زیاد دەبێت، هەركەسێكیش پەرستشی كەمبوو ئەوا دینەكەی كەم دەبێت، هەندێكجار كەمبوونی دین بەشێوەیەكە خاوەنەكەی تاوانبار دەبێت

---

[١] عمدة القاري لبدرالدين العيني (٣/٢٧٢).

[٢] شرح النووي على مسلم (٢/٦٨).

[٣] زۆر بە وردی باسی كردووە ئەتوانی بگەڕێیتەوە سەری لە هەمان كتێبدا (١/١٤٥).

وەكو كەسێك نوێژ و ڕۆژوو و بێجگە لەمانیش لەو پەرستشانەی كە واجبە لەسەری وازیان لێ دێنێت بەبێ هیچ بەهانەیەك، هەندێك جاریش بەشێوەیەكە كە تاوانی تێدا نییە وەكو كەسێك كە واز لە جەماعەت دێنێت یاخود غەزاكردن بەهۆی بەهانەیەكەوە كە وا دەكات واجب نەبێت لەسەری، یان هەندێك جار بەشێوەیەكە واجبە لەسەری تەركی بكات وەكو وازهێنانی نوێژ و ڕۆژوو لەلایەن كەسێكەوە كە لە سووڕی مانگانەدایە.

لێرەوە زۆر بەجوانی تێگەیشتین لە وتەی پێشەوا نەوەوی(ﷺ) كە چەندە بە شێوەیەكی جوان ڕوونی كردەوە كە نەقسی دین واتە نەقسی كردەوەو لە چەندین شوێنی قورئان و فەرموودەدا كردەوە ناوی دین و ئیمان و ئیسلامی لێنراوە، بۆ نمونە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ۝٥ ﴾البينة

وەكو بینیمان زۆر بەڕوونی نوێژ و ڕۆژوو پێی دەوترێت(دین) و ئافرەتانیش ئەنجامی نادەن لەكاتی سووڕی مانگانەداو بەمەش كەمتر لە پیاوان ئەنجام دەدەن.

بەلاَم پێویستە بزانین كە ئەوان تاوانبار نابن لەسەر نەكردنی نوێژو ڕۆژوو بەلَكو پاداشتیش دەدرێنەوە لەسەری، هەروەكو ئیمامی نەوەی(ﷺ) فەمووی ئەوان تەكلیفیان لەسەرە بە وازهێنان لەو پەرستشانەو بەمەش فەرمانی خوای گەورە بە جێ دێنن و پاداشت وەردەگرن لەسەری، نەوەك لۆمەو سەرزەنشتبێت وەكو نەیارانی سوننە هەولَی سەلماندنی دەدەن.

بەلَكو پاداشت وەردەگرێت لەسەر وازهێنان لە نوێژو ڕۆژوو كە لەوكاتەدا حەڕامە لەسەری ئەنجامی بدات، هەروەكو پێشەوا عەینی(ﷺ) دەفەرموێت: " يَنْبَغِي أَنْ يُثَابَ عَلَى تَرْكِ الْحَرَامِ "[1]. واتە: ئەبێت پاداشت وەرگرێت لەسەر وازهێنان لەو حەڕامە.

جا خۆشەویستانم من هیچ عەیبەیەكم نەدی لەم فەرموودەیەو هیچ تانەیەكم بەدی نەكرد كە یەخەی ئافرەتان بگرێت و ناشرینیان بكات و ئیتر حوكم و بڕیاریش لای ئێوەیە.

---

[1] عمدة القاري لبدرالدين العيني (٣/٢٧٢).

## فەرموودەی پانزەیەم: ئایا ئافرەتان شووم و بەدن؟

إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: " إِنَّمَا الشُّؤْمُ فِي ثَلاَثَةٍ: فِي الفَرَسِ، وَالمَرْأَةِ، وَالدَّارِ "[1].

ئۆزۆن لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: "ئافرەت سەرچاوەی بەدی و نەگبەتیە لەگەڵ ئاژەڵدا(ماین) و بێگیان(خانوو)دا وەك یەكن، ئەوە هیچ سەیر نەبێت چونكە لەفەرموودەیەكی تردا هاتووە كە: سەگ و ئافرەت گەر بەبەردەم نوێژخوێندا بڕۆن نوێژەكەی بەتاڵ دەكەنەوە" ع: ١٢٢، ك: ٢١٤ـ٢١٥

دەڵێم: ئۆزۆن هیچ كاتێك ئەمین نەبووە هەتاوەكو ئێستا پێی بڵێن بۆچی ئەمین نەبوویت و هەموو ئەو فەرموودانەی كە هاتووە لەوبارەیەوەو پاشان ناوی ئەو باس(باب)انەشی كە پێشەوا بوخاری فەرموودەكانی تێدا هێناوە بێنێت تاوەكو خوێنەر خۆی بڕیار بدات لەم بارەیەوە؟!

ئەم فەرموودەیە بە چەندین گۆو لەفزی جیا جیا هاتووە سەرەتا پێش هەموو شتێك ئەمەوێت ئەوە بڵێم كە لە بنچینەدا شوومی بە هیچ شتێكەوە نیەو ئاینی پیرۆزی ئیسلام هیچ شتێكی بە شووم و بەد دانەناوە بەو مانایەی كە زیان بێنێتە ڕێگەی مرۆڤەكان و چەندین فەرموودەمان لەو بارەیەوە هەیە: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ:«لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ[2]... وَفِرَّ مِنَ المَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنَ الأَسَدِ»[3].

---

[1] رواه البخاري (٤/٢٩)، برقم: (٢٨٥٨).

[2] بریتیە لە ئازادكردنی باڵندەیەك و فڕاندنی بەئاسماندا و ئەگەر بەلای ڕاستدا بڕۆشتایە ئەوا ئەو كارەی بەنیازبوون بیكەن ئەیانكرد و ئەگەر بەروە لای چەپیش بڕۆیشتایە ئەوا دەستیان تێی نەدەداو نەیانەدەكرد، ئەمە لەسەردەمی نەفامیدا بڵاوبوو.

[3] رواه البخاري (١٢٦/٧)، برقم: (٥٧٠٧).

واتە: نەخۆشی ناگوێزرێتەوە لە خودی خۆیداو هیچ شتێكیش شووم نیە، ڕا بكە لە كەسی تووشبوو بە نەخۆشی گولی بەشێوەی ڕاكردنت لە شێر[1].

لەم فەرموودەیەش ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە پێغەمبەر(ﷺ) بەشێوەیەكی گشتی بابەتی شوومی و بەدیی ڕەت كردوەتەوە ئیتر لە ئافرەت و بێجگە لە ئافرەتیش، بەهەمان شێوە ئەنەسی كوڕی مالیكیش ئەگێڕێتەوە: " لا عَدْوَى وَلا طِيَرَةَ"[2].

هەروەها لە فەرموودەیەكی تردا كە هەر لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنهما) ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: ذَكَرُوا الشُّؤْمَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنْ كَانَ الشُّؤْمُ فِي شَيْءٍ فَفِي الدَّارِ، وَالمَرْأَةِ، وَالفَرَسِ»[3].

واتە: باسی شوومی و بەدییان كرد لەلای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش فەرمووی: ئەگەر بێت و شوومی و بەدی لە شتێكدا هەبێت ئەوا لە ماڵ و ئافرەت و ماینداپە.

بەهەمان شێوە لە چەندین هاوەڵی ترەوە هەمان مانا هاتووە:

١ – عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ، فَفِي المَرْأَةِ، وَالفَرَسِ، وَالمَسْكَنِ»[4].

٢– أَخْبَرَ أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرًا، يُخْبِرُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ فَفِي الرَّبْعِ، وَالْخَادِمِ، وَالْفَرَسِ»[5].

---

[1] مەبەست لە نەگوێزانەوەی نەخۆشی ئەوەیە كە بەبێ ویستی خوای گەورە هیچ نەخۆشیەك لە خودی خۆیدا ناتوانێت هیچ شتێك بكات و بڕواتە گیانی كەسێكی ترەوە، وەكو لە سەردەمی نەفامیدا بە چەندین شێوە ئەم بیروباوەڕەیان هەبو سەبارەت بە نەخۆشی، بەڵام پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بۆی ڕاستكردنەوەو دواتریش پێی وتن كە نابێت پشت لە هۆكاریش بكەن و گوێی پێنەدەن.

[2] رواه البخاري (١٣٥/٧)، برقم: (٥٧٥٦)

[3] رواه البخاري (٨/٧)، برقم: (٥٠٩٤)، ومسلم (١٧٤٨/٤)، برقم: (٢٢٢٥).

[4] رواه البخاري (٢٩/٤)، برقم: (٢٨٥٩).

[5] رواه مسلم (١٧٤٨/٤)، برقم: (٢٢٢٧).

٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "لا طِيَرَةَ، وَالطِّيَرَةُ عَلَى مَنْ تَطَيَّرَ، وَإِنْ تَكُ فِي شَيْءٍ ففي الدار والفرس والمرأة"[١].

٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " لا عَدْوَى، وَلا طِيَرَةَ، وَالْعَيْنُ حَقٌّ "[٢].

لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت كە شومی و بەدی به هیچ شتێكەوە نیەو بەڵكو ئەو فەرموودەیەشی كە ئۆزۆن ڕەخنەی لێ دەگرێت ئەم فەرموودانەی تر ڕوونی دەكەنەوە كە لەو چوار هاوەڵەوە گێڕامانەوەو لە چەندین ڕێگەی تریشەوە هاتووە، كە باس لەوە دەكەن كە شوومی بە هیچ شتێكەوە نیەو ئەگەر هەبێت ئەوا بە ئافرەت و ماڵ و ماینەوەیە، چونكە ئەو سیانە زۆر جێی باس و خواسن لەناو خەڵكیداو بەهۆی گرنگی و زۆر بەكارهێنان و پێویستیەوە زۆر بەرچاون و چاویان لە شوێنە، هەرچی ئافرەتە هاوبەشی ژیانەو تاوەكو مردن لەگەڵ مێردایەو ئەگەر باش و گوێڕایەڵ و چاكبێت ئەوا گەورەترین و بەنرخترین بەخششەو جێی باسە، هەروەها سواریەكی باش كە لە ئەمڕۆدا سەیارە و هۆكارەكانی گواستنەوە دەكات و لەو سەردەمەدا بریتی بووە لە ئەسپ و ماین، ئەگەر كەسێك دانەیەكی باشی هەبێت و لەناو خەڵكدا دیاربێت ئەوا زۆر ئەبێتە جێی باس و هەمیشە باس دەكرێت، بەهەمان شێوەش بۆ خانوو و شوێنی حەوانەوە كە یەكێكە لەو شتە پێویست و گرنگانەی كە لە ژیانی ڕۆژانەدا زۆر گرنگیەكی تایبەتی هەیە، ئیتر من نازانم ئەبێت كێشەی فەرموودەكە لە كوێدابێت لەكاتێكدا هەمان مانا لە ئیبن عومەر هاتوەو بە هەمان شێوە دەفەرموێت:

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: ذَكَرُوا الشُّؤْمَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِنْ كَانَ الشُّؤْمُ فِي شَيْءٍ فَفِي الدَّارِ، وَالمَرْأَةِ، وَالفَرَسِ»[١].

---

[١] صحيح ابن حبان (٤٩٢/١٣)، برقم: (٦١٢٣)، وقال محققه: إسناده حسن، وكذلك وافقه الأرناؤوط في حاشية المسند(١٦٠/٤٣)، وصححه الألباني في موارد الظمآن (٣٨/٢)، برقم: (١١٩٥)، وشرح مشكل الآثار للطحاوي (٩٨/٦)، برقم: (٢٣٢٣).

[٢] المسند (٢٦٩/١٥)، برقم: (٩٤٥٤)، وقال محققه حديث صحيح،

واتە: باسی شوومی و بەدیان كرد لەلای پێغەمبەر(ﷺ)و ئەویش فەرمووی: ئەگەر بێت و شوومی و بەدی لە شتێكدا هەبێت ئەوا لە ماڵ و ئافرەت و مایندایە.

ئەوەتانێ زۆر بە ڕوونی ئەم فەرموودەیە ڕاڤەی فەرموودەی پێشوو دەكات كە هەمان ڕاویەو خۆی ئەمەی تریشیان دەگێڕێتەوەو نابێت هەندێك لە فەرموودەكانی بێنین و هەندێكیشی واز لێبێنین بە ویستی خۆمان، لێرەشەوە بێجگە لە خەجاڵەتی كێشان هیچ شتێكی تر بۆ ئۆزۆن و هاوشێوەكانی نەمایەوە.

هەروەها زانایانی ئیسلام ڕەحمەتی خوایان لێبێت وایان فەرمووە كەسیان نەیانوتووە ئافرەت شتێكی بەدە، ئەوتا زانایانی وەكو:

پێشەوا تەبەری دەفەرموێت: نەفی شوومی و بەدی دەكات و هەروەك ئەوەی بلێی ئەگەر كەسێك لەم ماڵەدابێت زەیدەو زەیدیشی تێدا نەبێت، كەواتە زەیدی تێدا نەبێت ئەوا بێگومان هیچ كەسێكی تریشی تێدا نیە.[2]

پێشەوا تەحاوی دەفەرموێت: "فَلَمْ يُخْبِرْ أَنَّهَا فِيهِنَّ ، وَإِنَّمَا قَالَ إِنْ تَكُنْ فِي شَيْءٍ فَفِيهِنَّ أَيْ: لَوْ كَانَتْ تَكُونُ فِي شَيْءٍ ، لَكَانَتْ فِي هَؤُلاءِ ، فَإِذَا لَمْ تَكُنْ فِي هَؤُلاءِ الثَّلاثَةِ ، فَلَيْسَتْ فِي شَيْءٍ"[3]

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی نەداوە كە شومییان تێدایە بەڵكو فەرموویەتی ئەگەر شوومی هەبێت ئەوا لەواندایە، دەی مادام لەوانەشدا نییە كەواتە شومی و بەدی لە هیچدا نیە[4].

هەروەها پێشەوا خەتتابی دەفەرموێت: بەهۆی زۆری بەكارهێنان و پێویستی خەڵك و چاولەسەربوونەوەیە.

هەروەها لەفەرموودەیەكی تردا پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرموێت: عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدِ ابنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى

---

(1) رواه البخاري (٨/٧)، برقم: (٥٠٩٤)، ومسلم (١٧٤٨/٤)، برقم: (٢٢٢٥).

(2) تهذيب الاثار للطبري، مسند علي (٣٢/٣)، تحت رقم: (٨٨).

(3) أعلام الحديث للخطابي (١٣٧٩/٢)، تحت رقم: (٦٤٣).

(4) شرح معاني الآثار للطحاوي (٣٠٤/٤)، تحت رقم: (٧١٠٤).

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "أَرْبَعٌ مِنَ السَّعَادَةِ: الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ، وَالْمَسْكَنُ الْوَاسِعُ، وَالْجَارُ الصَّالِحُ، وَالْمَرْكَبُ الْهَنِيءُ، وَأَرْبَعٌ مِنَ الشَّقَاوَةِ: الْجَارُ السُّوءُ، وَالْمَرْأَةُ السوء، والمَسْكَنُ الضَّيِّقُ، والمَرْكَبُ السوء"[1].

واتە: چوار شت لە خۆشبەختی نەوەی ئادەمن، ئافرەتی چاك، خانووی فراوان، دراوسێی چاك، سواریەكی باش، هەروەها چوار شتیش لە بەدبەختیەوەیە: دراوسێی خراپ و ئافرەتی خراپ و خانووی تەسك و سواریی خراپ.

ئەم فەرموودەیە تەواو كۆكە لەگەڵ فەرموودەكەی پێشوودا و پێكەوە تەواو مانایەكی ڕاست و دروستیان لێوە بەدەست دێت، هەروەها ئێمە بۆمان هەیە بپرسین باشە چۆن ئافرەت بەد و خراپە و شوومە لەكاتێكدا پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرموێت: عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: " إِنَّمَا حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنْيَاكُمُ النِّسَاءُ وَالطِّيبُ وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلاةِ "[2].

واتە: بەتەنها ئافرەتان و بۆنی خۆش لەلام خۆشەویست بوون لە دونیاو، ڕۆشنایی چاوەكانیشم لە نوێژدایە.

باشە لە دونیادا تۆ بڵێی شتێك لەلای پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشەویست بێت و هەر خۆشی بفەرموێ شتێكی شوومە؟!

یان دەكرێت بە شێوەیەكی تریش وەڵامی ئۆزۆن و هاوشێوەكانی بدەینەوەو بڵێین: فەرموودەكە باسی هەموو ئافرەتان ناكات بەڵكو ئەو ئافرەتانەی كە خراپن و نەگونجاون لەگەڵ پیاودا، ئەمەش شتێك نییە لەلای كەس شاراوەبێت كە ئافرەتی خراپ چی بەكۆمەڵگە دەكات پێش وێرانكردنی خێزان، ئەمەش بەگوێرەی فەرموودەی دوای خۆی

---

[1] صحيح ابن حبان (٩/٣٤٠)، صحيح على شرط البخاري كما قال الشيخ شعيب الأرناؤوط، والحاكم في المستدرك (٢/١٥٧)، برقم: (٢٦٤٠)، وصححه و وافقه الذهبي.

[2] السنن الكبرى للبيهقي (٧/١٢٤)، برقم: (١٣٤٥٤)، وكنز العمال (٧/٢٨٨)، برقم: (١٨٩١٣)، وصححه الحافظ الزيلعي في تخريج الأحاديث والآثار الواقعة في تفسير الكشاف للزمخشري (١/١٩٦)، والسيوطي في مناهل الصفا، ص: (٥٥)، والحافظ العراقي في المغني، ص: (٤٦٦).

كە پێشەوا بوخاری هێناویەتی و خۆشمان هێنامان كە دەفەرموێت: (وَأَرْبَعٌ مِنَ الشَّقَاوَةِ: الْجَارُ السُّوءُ، وَالْمَرْأَةُ السوء..)، دەی كەواتە ئەوانەیان شومی و بەدییان پێوەیە كە خراپەكارن و خراپە دەهێننە رِێگەی مێردەكەیان.

هەروەها پێشەوا ئیبن حەجەر بۆ چوونی پێشەوا "سوبكی" دەهێنێتەوە كە دەفەرموێت:

"پێشەوا بوخاری ئەو فەرموودەیەی هێناوە: (بەجێم نەهێشتووە لەدوای خۆم تاقیكردنەوەیەك لەدوای خۆم لە تاقیكردنەوەی ئافرەتان قورسترِبێت)[1]، دوابە دوای فەرموودەكە، ئەمەش ئاماژەیە بە تایبەتی بەدی و لەوەی كە دەیهێنن لە دوژمنایەتی و تاقیكردنەوە، نەك بەو شێوەیەی كە زۆر خەلَك لێی تێگەیشتووە كە لە پاژنەیاندا بەدی هەیەو كاریگەرییان هەیە، كە ئەمە شتێكە تاكە زانایەكیش شتی وا نالَێت، هەركەسێك بلَێت ئافرەتان هۆكاری شەرِن ئەوا كەسێكی نەزانەو لە شەریعەتدا واژەی كوفر دراوەتە پالَ ئەوكەسەی باران ئەداتە پالَ ئەستێرە، ئەبێ حالَی ئەو كەسە چۆنبێت كە شەرِ و خراپە ئەداتە پالَ ئافرەتان لە كاتێكدا ئەو هیچ هۆكارێك نیە".[2]

بەمەش بۆمان دەردەكەوێت كە فەرموودەكە هیچ كێشەیەكی تێدا نیەو كێشە لە تێگەیشتن و ئاستی زانستی ئۆزۆندایە!!

پاشان ئۆزۆن دەیەوێت وتەكەی پشت رِاست بكاتەوە بەوەی كە ئافرەت هاوشانی ئاژەلاَنە، دەلَێت: لەفەرموودەیەكی تردا هاتووە كە سەگ و كەر و ئافرەت گەر هاتوو بە بەردەم نوێژخوێندا رِۆشتن ئەوا نوێژ بەتالَ دەكەنەوە و ئەوەتانێ ئەمە وا لە خاتوو عائشە دەكات سەراپا ئەم بیركردنەوەیە رِەت بكاتەوە وەك لەم فەرموودەی تردا هاتووە[3]:

## فەرموودەی دوانزەیەم: ئافرەتو ئاژەلَ پێكەوە ناویان هاتووە!

---

[1] واتە: قورس لەسەر پیاوان.

[2] فتح الباري (٩/١٣٨).

[3] ع:١٢٢ ـ ك: ٢١٤ـ٢١٥

عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، ذُكِرَ عِنْدَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاَةَ الكَلْبُ وَالحِمَارُ وَالمَرْأَةُ، فَقَالَتْ: شَبَّهْتُمُونَا بِالحُمُرِ وَالكِلاَبِ، وَاللَّهِ «لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي وَإِنِّي عَلَى السَّرِيرِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ مُضْطَجِعَةً، فَتَبْدُو لِي الحَاجَةُ، فَأَكْرَهُ أَنْ أَجْلِسَ، فَأُوذِيَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْسَلُّ مِنْ عِنْدِ رِجْلَيْهِ»[1].

فەرموودەكە باس لەوە دەكات كە دایكی ئیمانداران عائشە فەرموویەتی: ئێمەتان چواندووە بە گوێدرێژ و سەگ، پاشان باسی ئەوە دەكات كە ئافرەت نوێژ بەتاڵ ناكاتەوە گەر بەبەردەم نوێژخوێندا بڕوات.

دەڵێم: جارێ پێش هەموو شتێك فەرموودەی یەكەم پێشەوا شافیعی بە لاوازی داناوەو وەری نەگرتووە، هەروەها پێشەوا بوخاری یش نەیهێناوەو ئەمەی لەلا ڕاست بووە كە دایكی ئیمانداران ڕەخنە دەگرێت، باشە لەكاتێكدا پێشەوا بوخاری ئەم فەرموودەیەی هێناوە كە ڕەخنە لە بۆچوونی یەكەم دەگرێت كە ئۆزۆن ڕای وایە ئافرەت چوێنراوە بە ئاژەڵ، باشە خۆ ئەو دژەكەی هێناوە ئیتر بۆچی ئەبێت پێشەوا بوخاری تۆمەتبار بكرێت؟!

هەروەها پێشەوا بوخاری لەژێر ناونیشانی(بَابُ مَنْ قَالَ: لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ)، واتە: باسی ئەوانەی كە وتویانە: هیچ شتێك نوێژ بەتاڵ ناكاتەوە.

ئەمە وەكو باسكردنی ئەو خیلافەی كە هەبووە لە نێوان هاوەڵاندا ئایا هیچ شتێك نوێژ بەتاڵ دەكاتەوە یاخود نا، نەوەك چواندنی ئافرەت بە ئاژەڵ بەو شێوەی كە ئۆزۆن وێنای دەكات.

ئەم بابەتە خیلافێكی زۆری لەسەرەو لە كتێبەكانی ڕاڤەی فەرموودەو فیقهیش باسكراوە، كە ئایا سوترە واجبە یاخود سوننەتە؟ ئایا نوێژ بەتاڵ دەبێتەوە بە ڕۆشتنی شتێك بەویدا ئیتر پیاوبێت یان ئافرەت یان ئاژەڵ؟

نامانەوێ زۆر لەسەر ئەو بابەتە بڕۆین چونكە زۆر درێژ دەبێتەوە ئەگەر باسی وتەكان و بۆچوونی ڕاست و دروست بكەین، بەڵام تەنها لەسەر ئەوە ئەوەستم كە من نازانم ئەم

---

[1] رواه البخاري (١٠٩/١)، برقم: (٥١٤).

وتەیە بە چی شێوەیەك گەیشتووە بە دایكی ئیمانداران وا فەرموویەتی ئێمەتان چواندووە بە سەگ و گوێدرێژ.

من وانابینم هەروا بەوەندەی پێی وترابێت ئەم شتانە نوێژ بەتاڵ دەكەنەوە ئیتر وا تێگەیشتبێت كە چوێنراون بە ئاژەڵ، تەنها بەوەندەی كە ناویان پێكەوە هاتووە!!

چونكە لەو فەرموودەكەدا تەنها باسی حوكمە نەوەك چواندنیان بە یەكتر، هاتنیشیان پێكەوە وا ناخوازێت كە چوێنرابن بە یەكتر، و دایكی ئیمانداران عائشە زۆر لەوە ئاستی تێگەیشتنی باشترە كە تەنها بەوەندە وەها گومانێك بەرێت، بەڵكو پێ دەچێت وتەكەی بە شێوەیەكی تر پێگەیشتبێت و ئەویش ئەو كاردانەوەی هەبووبێت، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ١٤ ﴾آل عمران

باشە تۆ بڵێی لێرەش هەر بەهەمان شێوەبێت و چوێنرابن بە یەكتر وا لە پاڵ یەكتردا هاتوون؟!

نەخێر ئەمە تەنها كەسێك ئەو گومانە دەبات كە لە وتەكان بەباشی تێنەگات و حاڵی نەبێت وەكو ئۆزۆن، ئەگینا لەوەو پێشیش ئێمە فەرموودەی ترمان هێنایەوە كە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لەپاڵ بۆنی خۆش و نوێژدا باسی كردوون!!

نە ئەمە پیاهەڵدانە كە لە پاڵ نوێژدا هاتوون و نە ئەوەش لۆمەیە كە لە پاڵ ئاژەڵدا هاتوون، بەڵكو هەر یەكێك لەم دوانە بۆ ئەوە سوودیان لێ ئەبینرێت كە لە یەكەمیاندا لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشەویستن و لەوەی دووەمیشدا ئەوەیە كە نوێژ بەتاڵ دەكەنەوە.

جا ئەگەر بڕوانیتە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی تریش زۆر بە ڕوونی ئەوە دەبینیت، هەروەها جمهوری زانایانی ئوصول ڕایان وایە كە پێكەوە هاتنی هەرشتێك یەك

حوكمیان ناداتیێ هەروەكو پێشەوا شەوكانی(رحمه الله) دەفەرموێت: "وَأَنْكَرَ دَلالَةَ الاقْتِرَانِ الْجُمْهُورُ فَقَالُوا: إِنَّ الاقْتِرَانَ فِي النَّظْمِ لا يَسْتَلْزِمُ الاقْتِرَانَ فِي الْحُكْمِ"[١]

واتە: جمهوری زانایان بەڵگەی پێكەوە هاتنیان ڕەت كردوەتەوەو فەرموویانە: پێكەوە هاتن لـە دەقدا خواستنی یەكێتی حوكمی تێدا نیە.

## فەرموودەی سیانزەیەم: ئایا ئافرەتان فیتنەن؟!

عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ»[٢].

واتە: لـەدوای خۆم تاقیكردنەوەیەكم بە جێ نەهێشتووە لـە ئافرەتان زیانیان زیاتربێت بەسەر پیاوانەوە.

ئۆزۆن دەڵێ: "فیتنەو خراپەی ژنان خراپترین خراپەیە بۆ سەر پیاوان، پیاوان بنیادنەری شارستانییەتەكان و كۆمەڵگەو فاتیحی وڵاتان و ڕزگاركەری بەندەكانن، ژنانیش فیتنەو خراپەكار" ع: ١٢٣، ك: ٢١٦

دەڵێم: ئەم فەرموودەیە گەورەترین موعجیزەو هەواڵی ڕاستی پێغەمبەری خۆشەویستە(ﷺ) و ئەگەر كەسێك بڕوانێتە حاڵی ئەمڕۆی خەڵكی ئەوا ئەبینێت زۆرترین هۆكاری بە هیلاكچوونیان بریتییە لـە ئافرەتان و دوژمنانی ئاینیش باش دەركیان بەو ڕاستیە كردوەو، ئەوەتانێ هەموو ڕیكلامێكیان كردووە بە ئافرەت و پێشكەشكارەكان هەمووی ئافرەت و هەر شتێكیش ئەفرۆشن لـە دنیای عەلمانی و مادەگەرایی هەر وێنەی ئافرەتی لـێ دەدەن، بۆیە ئەوان وەكو كاڵایەك بازرگانی بە ئافرەتەوە دەكەن، باشە پێم ناڵێن بۆچی؟

وەڵامەكەی ڕوونە چونكە ئافرەتان سەرنجڕاكێشن و خەڵكی شەیدای خۆیان دەكەن!!

---

[١] إرشاد الفحول للشوكاني (٢/١٩٧).

[٢] رواه البخاري (٧/٨)، برقم: (٥٠٩٦).

بەلآم گەورەترین كێشەی ئۆزۆن و وەرگێڕ و ڕەخنەگران لە ئیسلامی مەزن، نەزانیانە بە زمانی عەرەبی و ئەگەر ئەوان بیانزانیایە لە چەندین شوێنی قورئان و سوننەتدا(فتنة) بۆ تاقیكردنەوە هاتووە ئەوا ڕەخنەیان نەدەگرت، ڕەنگە باشیش بزانن بەلآم مەبەستیان هەبێت لەو شێواندنە، ئەوەتانێ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ﴿١٠٢﴾ ﴾البقرة

باشە ئەگەر بەو لێكدانەوەی ئۆزۆن و هاوشێوەكانی بێت، تۆ بلێی مەبەست چیبێت بەوەی كە ئەو دوو فریشتەیە(فتنة)بن؟!

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَاعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾الأنفال

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾الأنبياء

لەم ئایەتەی تردا پێمان نالێن: یانی چی لە شەڕ و خێریشدا فیتنە هەیە، بێجگە لەوەی كە خۆشی و ناخۆشی هەردووكیان تاقیكردنەوەی خواییە؟!

بەلێ بێگومان ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە ئافرەتان گەورەترین تاقیكردنەوەن و كەمترین كەسیش خۆیانی لەبەردەمدا ڕادەگرن و تووشی تاوان و خراپەكاری نابن، نەك ئافرەتان بەلآو ئاشووب و شەڕبن وەكو ئۆزۆن و نەیارانی ئیسلام و سوننەت وێنای دەكەن!!

## فەرموودەی چواردەیەم:

فەرموودەی جابر(رضي الله عنه) كە دەفەرموێت: يَقُولُ: تَزَوَّجْتُ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَا تَزَوَّجْتَ؟» فَقُلْتُ: تَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا، فَقَالَ: «مَا لَكَ وَلِلْعَذَارَى وَلِعَابِهَا»

فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، فَقَالَ عَمْرٌو: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «هَلا جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ»[1].

مانای فەرموودەمە ئەوەیە: کە جابر(ﷺ) دەفەرموێت کاتێك ژنم هێنا هاتمە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێم وت و ئەویش فەرمووی: هاوسەرگیریت لـەگەڵ چیدا کردووە؟ ئەویش فەرمووی: بێوەژن، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ئەی بۆ کچێکت نەهێناوە تاوەکو یاری لـەگەڵ بکەیت و یاریت لـەگەڵ بکات؟

پاشان لـە درێژەی ڕووداوەکەدا هاتووە کە پێشەوا بوخاری ئەیگێڕێتەوەو لـە جابری کوڕی عبداللە و دەفەرموێت: فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ هَلَكَ، وَتَرَكَ بَنَاتٍ، وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَجِيئَهُنَّ بِمِثْلِهِنَّ، فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً تَقُومُ عَلَيْهِنَّ وَتُصْلِحُهُنَّ، فَقَالَ: «بَارَكَ اللَّهُ لَكَ»[2].

واتە: عبداڵلە مردو کۆمەڵێك کچی بەجێهێشت، منیش پێم خۆش نەبوو هاوشێوەی خۆیان بهێنم، ئیتر ئافرەتێکم هێنا کە سەرپەرشتییان بکات و پەروەردەیان بکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە بەرەکەتی خۆی بڕێژێتە سەرت.

ئۆزۆن تەنها بەشی یەکەمی دێنێت و پاشان بە شێوازێکی بازاڕانە دەکەوێتە ناو هەندێك وشەی نەشیاو بەرامبەر پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەڵێت و ئەگەر کەسێك بیەوێ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لـە ڕێگەی ئەم کتێبەوە بناسێت ئەوا وێنەیەکی ناشرینی بۆ دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە:

"بەدەر لـەو ناکۆکیەی لـەناو دەقەکاندا هەیە، بەڵام هەموو تەئکید لـەوە دەکەنەوە کە پێغەمبەری بەوپەڕی سووربوون سوربووە[3] لـەسەر ئەوەی بزانێت کە جابری هاوەڵی کچی هێناوە یاخود بێوەژن، پێغەمبەر بەداخبووە لـەوەی کە جابر کچی نەهێناوە، چونکە ماچی کچ زۆر جیاوازە لـە هی بێوەژن" ع: ١٢٤ ـ ك: ٢١٩

---

[1] رواه البخاري (٥/٧)، برقم: (٥٠٨٠).

[2] وۆاه البخاري (٦٦/٧)، برقم: (٥٣٦٧).

[3] (كان حريصا كل الحرص)، ص:١٢٤!! بەڵام وەرگێڕ ڕێك بەو شێوە وەری نەگێڕاوە.

**دەڵێم:** مرۆڤ كە بێ شەرم بوو ئیتر هیچی لەگەڵدا ناوترێت و داوای ئەوەشی لێ ناكرێت كە بەئەدەبەوە قسە بكات، بەڵام بۆ وتەكانی ئۆزۆن **دەڵێم:**

١ – ئەو جیاوازیانە چین لە دەقەكاندا هاتوون بێجگە لەوەی كە بە مانا فەرموودەكە گێڕدراوەتەوە لە هەندێك شوێندا موڕادیف بەكارهاتووە كە یەك مانایان هەیە، بێجگە لە هەڵەیەك نەبێت كە وەكو پێشەوا ئیبن حەجەر دەفەرموێت، هەڵەیەك هەیە لە وشەی(لِعابها) كە كراوە بە(لُعابها) كە ماناكەی لە یاریەوە گۆڕیوە بۆ(لیكی دەم)و ئەمەش پێچەوانەی تەواوی گێڕانەوەكانی ترە، جا ئۆزۆن ئەگەر بیوتایە كامەیە دژیەكی و جودایی لە گێڕانەوەكان، ئەوا بۆمان ڕوون دەكردەوە چونكە زۆر ڕوونن گشت دەقەكان

٢ – باشە پێمان ناڵێ بە چیا زانی كە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) زۆر سووربووە كە بزانێت كچی هێناوە یاخود بێوەژن؟ لە چی شوێنێكدا ئاماژە بە شتی وا كراوە وا عەلامەی ئۆزۆن پەی پێ بردوەو هەموو ئوممەت بێ خەبەرن لێی؟

ئەمە سەرەڕای تانەدان لەكەسایەتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئەوەشی لێ دەخوێنرێتەوە كە زۆر دەستی بەتاڵ بوەو هاتووە بزانێت هاوەڵان خەریكی چین و چاودێری كردوون، وەك مرۆڤە بێ ئیش و كارەكانی ئەمڕۆ.

٣ – باشە لەكوێدا ئاماژە بە داخ و خەفەتی پێغەمبەری خۆشەویست كراوە(ﷺ)، وەك ئۆزۆن باسی دەكات و خەریكی چەواشە كارییە؟

٤ – باشە ئەم سنوور بەزاندن و شێوازە بازاڕیەی لەكوێ هێنا، ئەگەر خەیاڵی شەهوانی خۆی نەبێت گوایە ماچی كچ و بێوەژن زۆر جیاوازن؟

بەڕاستی ئۆزۆن ئەیەوێت بەناوی پێشەوا بوخاری و ڕەخنە لەوەوە لەكەسایەتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بدات، ئەگینا هەموو مرۆڤێكی ژیری و عاقڵ باش دەزانێت كاتێك كە جابر دەستەیەك خوشكی هەیەو باوكی نەماوە، هەروەها خۆشی كەسێكی گەنجەو سرووشتی هەموو گەنجێكیش ئەوەیە حەز بە هاوتەمەنی خۆی یاخود منداڵتر دەكات نەك سەرووی تەمەنی خۆی یاخود بێوەژن!!

بۆیە پێغەمبەری خواش(ﷺ) پرسیاری كرد لە جابر كە بۆچی كچی گەنجی نەهێناوە تاوەكو هاودەمی یەكتربن؟ ئەویش دەفەرموێت: لەبەر دەستە خوشكەكەم بۆ ئەوەی كەسێك نەهێنم وەكو خۆیان بێت و هێشتا تەواو كامڵ نەبوبێت و پێكەوە نەیانكرێت بەڵكو كەسێك بێنم كە ببێتە مامۆستایان و پەروەردەشیان بكات.

ئیتر من نازانم ئۆزۆن بۆچی كە خۆی گەزراوە بە هەندێك بیرۆكەو خەیاڵی پووچ و ئەیەوێ هەمان شت دابرێ بەسەر پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)؟!

## فەرموودەی پانزەیەم:

ئۆزۆن فەرموودەیەكی دوورو درێژ دێنێت، كە باس لەوە دەكات ئافرەتێك خۆی پێشكەش بە پێغەمبەری خۆشەویست دەكات(ﷺ) و ئەویش نایكاتە هاوسەری خۆی، پاشان یەكێك لە هاوەڵان هەڵدەستێ و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)بیكە بە هاوسەری من و پاشان دوای ئەوەی كە هیچ شتێك شك نابات بیكاتە مارەیی، پێغەمبەری خواش(ﷺ) دەفەرموێت: برۆ ئەوا كردمە هاوسەرت بەوەی كە لەبەرتە لە قورئانی پیرۆز، و قورئانەكە دەكاتە مارەیی ئەو ئافرەتە.

ئۆزۆن ڕەخنەی لەبەشی كۆتایی هەیەو دەڵێت: (فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ القُرْآنِ)[1].

دەڵێت: "(برۆ لەسەر ئەو قورئانەی كە لاتە دام پێت)، مەگەر ئافرەت ئاژەڵە یان شمەك و كەلوپەل بەوجۆرە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت" ع: ١٢٦ ـ ك: ١٢٢

دەڵێم: ئەوەی كە ئۆزۆن ڕەخنەی لێی گرتووە ئەم گۆیە: (مَلَّكْتُكَهَا)و وا تێگەیشتووە كە بەو مانایە دێت كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی كردمە موڵكت!!

دەڵێم: سەرەڕای ئەوەی زانایانی فەرموودە هەر لەكۆنەوە قسەیان لەسەر ئەو گۆیە كردوەو فەرموویانە(زَوَّجْتُكَهَا) ڕاست و دروستەو ئەوی تریان لاوازەو تەنانەت ئیمامی ئیبن

---

[1] رواه البخاري (٦/١٩٢)، برقم: (٥٠٣٠).

تین فەرموویەتی: " أَجْمَعَ أَهْلُ الْحَدِيثِ عَلَى أَنَّ الصَّحِيحَ رِوَايَةُ زَوَّجْتُكَهَا وَأَنَّ رِوَايَةَ مَلَّكْتُكَهَا وَهْمٌ "[1].

واتە: زانایانی فەرموودە هەموو كۆكن لەسەر ئەوەی كە ریوایەتی(زَوَّجْتُكَهَا) سەحیحەو ریوایەتی(مَلَّكْتُكَهَا) وەهمە.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە ئەو ڕیوایەتە ڕاست و دروستیش بێت هیچ كێشەیەكی تێدا نیەو بە مانا گێڕدراوەتەوەو چەندین مورادیفی تریشی هەیە كە هەموویان بە واتای هاوسەرگیری بەكار هاتوون وەكو: (أنكحتكها) و(زوجتكها) و(ملكتكها) و(أنكحتك) و(أملكتكها) و...

ئۆزۆن پێم نالێ كێ وەها تێگەیشتووە كە وەكو كاڵاو شمەك مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت؟ بەڕاستی ئەم وتانە تەنها لە كەسێكی وەكو ئەو چاوەڕوانی بیستنیانین.

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: " ئەی باشە بۆ ئافرەتانی ئەمڕۆ ڕازی نابن كە مارەییەكەیان قورئانبێت و ئەو سوننەتە جێبەجێ بكەن" ع: ١٢٦، ك: ٢٢٢

دەڵێم: ئەوانەی كە مارەیی كەمیان كردوەو مارەییەكەیان بریتی بووە لە قورئانی پیرۆز زۆر زیاترن لەوەی كە ئۆزۆن بیری لێ دەكاتەوە، بەڵام ئۆزۆن ئەو شتانەی بەرچاو ناكەوێت چونكە ئەوەی ئەو تێكەڵیانەو ئەیانبینێت ئیسلامێكی ئەمریكی مادەویستەو هەرگیز شتی وای لێ چاوەڕوان ناكرێت!!

پاشان ئۆزۆن دیسانەوە دەیەوێت بداتەوە لە كەسایەتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)و دەڵێت: "دوا جار هەندێك فەرموودە باس لەوە دەكەن كە پێغەمبەر ژنەكانی هەڵبژردووەو بەتایبەت دەستی خستووەتە سەریان و كامە جوان نەبوبێت نەیوستووە، بگرە بەپێی

---

[1] فتح الباري (٩/٢١٥).

هەندێك گێڕانەوە(سەفییە) کە خاتوونێکی هۆزی قورەیزەو بەنی نەزیر بووە[(١)]، لە دوحیەی کەلبی سەندەوەو کردیە ژنی خۆی(بڕوانە: بوخاری کتاب الصلاه)" ع: ١٢٨، ك:٢٢٣

دەڵێم: ئۆزۆن دیسانەوە وەك هەمیشە مادام بەس نووسیویەتی بوخاری کتابی فلاّن و بابەکەی نەنووسیوە لەگەڵ ژمارەی لاپەڕەدا ئەوا بزانە کە خیانەتێکی ئۆزۆنی لەوێدا هەیە، بەتایبەت ئەگەر بەوشێوەیەبێت کە بڵێ(کتاب الصلاة) کە یەکێکە لە گەورەترین کتێبەکانی سەحیحەکەی و ژمارەیەکی زۆر فەرموودە لە هەر بابێکیدا هەیە و خوێنەر بە ئاسانی ناتوانێت بیدۆزێتەوە، مەگەر کەسێك پێشتر بینیبێتی و زانیاری دەربارەی هەبێت، جا هەر کە ئەوەتان بینی خێرا بزانن ئۆزۆن ترسی ئابڕووچوون و فەزح بوونی هەیەو خیانەتێك لە ئارادایەو دەیەوێت بیشارێتەوە!!

من لێرەوە بۆ چەندین جار کە لە پێشتریش و ئێستاش دەیلێمەوە بە تەحەدداوە ئەگەر هەموو ئەوانەی کە دەستیان لەو کتێبەدا هەیە بە نووسەور و وەرگێڕو ئەوەشی پێیدا چوەتەوە... ئەگەر توانیان ئەو درۆیانە پشت ڕاست بکەنەوە ئەوا مافیان پێ دەدەم هەر شتێك بلێن، بەڵکو ئەوەی لای پێشەوا بوخاری هاتووە ئەوەیە کە هاتە لای پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) و وتیان ئەو ئافرەتێکی بە ناوبانگەو لە گەورەکانی هۆزی خۆیەتی بۆیە شیاوە ببێتە هاوسەری خۆت[(٢)]. ئیتر با ئەم خیانەتەشی بچێتە پاڵ ئەوانی ترو زیاتر ڕووی ڕاستەقینەی بەدیارکەوێت.

## فەرموودەی شانزەیەم:

---

[(١)] ئەگەر مەبەستی ئەوەبێت کە باسی نەسەبی باوك و دایکی بکات ئەوا دەبوو باوکی پێش بخات کـە لـە هـۆزی بەنی نەزیر بوەو دایکیشی لە بەنی قورەیزە بووە، یان ئەوەیە ئۆزۆن هەر نەیزانیوە، یاخود نەسەب لای ئۆزۆن هی سەری دایکە بۆیە پێشی خستووە .

بەڵام ئەوەی من بۆیچووم ئۆزۆن مەبەستی ئەوە نیە بەڵکو هەڵەی وەرگێڕە، چـونکە ئـۆزۆن نووسـیویەتی (سـیدة قريظة والنضير)، واتە گەورەی ئەو دوانە، نەوەك نەسەبی بگێڕێتەوە بۆیان!!

[(٢)] رواه البخاري (٨٣/١) برقم: (٣٧١)، بَابُ مَا يُذْكَرُ فِي الفَخِذِ، فتح الباري لابن حجر (٤٦٩/٧).

دیسانەوە ئۆزۆن فەرموودەیەكی تر دێنێت كە لە وەرگێڕانەكەدا(٤) لاپەڕەی گرتووەو تەنها تیشك ئەخاتە سەر ئەم بەشەی كە دەڵێت: "لاَ يَحِلُّ لامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، إِلا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا "[1]

واتە: حەڵاڵ نییە بۆ ئافرەتێك كە بڕوای بە خوای گەورەو ڕۆژی دوایی هەبێت، ئیحداد بكات بۆ مردویەك لە سێ ڕۆژ زیاتر، مەگەر بۆ مێرد چوار مانگ و دە ڕۆژ.

ئۆزۆن دەڵێت: "ژن جگە لە مێرد نابێت بۆ هیچ كەسێك لە سێ ڕۆژ زیاتر تازیەباربێت" ع: ١٢٨، ك: ٢٢٦

پاشان دەڵێت: "بەم شێوەیە لەفەرموودەكەوە ئەوە دیارە، كە ژن بۆی نییە تازێباری كوڕ یان كچ یان برا یان دایك و ...هتد ببێت، تەنها سێ ڕۆژ نەبێت و لەوە زیاتر حەرامە. وەك ئەوەی هەست و سۆزەكانی مرۆڤ بە ڕۆژ و شەو دیاری بكرێت! هەروەك ئەوەی كە بۆنخۆشی و گوڵاو و كل و بەرگ، لە تازێباری و پەژارە، كەم یان زیاد بكات" ع: ١٢٨ـ١٢٩، ك: ٢٢٨

دەڵێم: ئۆزۆن زۆر نەزانانە یاخود چەواشەكارانە وشەی ئیحدا شیكاری دەكات و بە تازیێ و خەمخواردنی نیشان دەدات، لە كاتێكدا(ئیحداد) بریتییە لە خۆنەڕازاندنەوەو جلی جوان نەپۆشین و چاونەڕەشتن و...هتد، كە لەسەردەمی نەفامیدا ئەبوو ژنەكانیان بۆ ماوەیەكی دووردرێژ ئەو كارە بكەن كە هەندێك جار دەگەیشتە ساڵ و زیاتریش لە ساڵ، بەڵام ئیسلام هاتوو كردیە سێ ڕۆژ تەنها بۆ مێرد نەبێت لەبەر ئەوەی برینەكەی زیاترە تاوەكو چوار مانگ و دە ڕۆژ ڕێگەی پێدراوە بەو شێوەیەبێت.

بەڵام وەكو بینیمان ئیحداد بریتی نییە لە خەمخواردن و تازێباری و فرمێسك ڕشتن، بەڵكو ئەو لە سنوور دەرچونەیە كە باسمانكرد، هیچ كەسێكی عاقڵ لە مسوڵمانان نەیداوەتە پاڵ ئاین و بڵێ خەمخواردن و فرمێسك ڕشتن بۆ مردنی كەسانی نزیك حەرامەو

[1] رواه البخاري (٥٩/٧)، برقم: (٥٣٣٤).

قەدەغەیە تاوەكو بگاتە ئەوەی كە فەرموودەی لەسەربێت یاخود زانایان بفەرموون، ئیتر من نازانم ئەم هەرایەی ئۆزۆن لە پای چی؟!

ئۆزۆن دێت وەها نیشان دەدات كە ئەو فەرموودەیە هیچ بەهایەكی بۆ هەست و سۆز نەهێشتوەتەوەو تەنها سێ ڕۆژی داناوە بۆ خەمباری و وەك شتێك بلێی هەست و سۆز دیاری بكرێت!!

بەلاَم هەر خۆی وتەكانی خۆی هەلّدەوەشێنێتەوەو فەزحی خۆی دەكات و دەلێت ئەو ماوەی كە قورئان باسی كردووە(چوارمانگ و دە ڕۆژ) ئەوە ئاسانكاریی بوە بۆ ئەوكاتە، لەچاو ئەوەی كە لەسەردەمی نەفامیدا هەبوو، ئیتر پێویست ناكات ئافرەت ئەو ماوەیە چاوەڕوانی مێردەكەی بكات چونكە:

"ئەمڕۆش لەگەلّ پەرەسەندنی خۆرئاوادا ئاسانكاری زیاتر بۆ ژن كراوەو ماوەی تازێباریەكەی تەنها بە چەند سەعاتێك و لەگەلّ دەرچوونی ئەنجامی شیكاریی دوو گیانیدا لە تاقیگە كۆتایی دێت" ع: ١٢٩، ك: ٢٢٨

دەلێم: ئۆزۆن سەرەڕای ئەوەی كە هەلّە تێگەیشتبوو لە فەرموودەكە یان ئەیویست چەواشەكاری بكات، بەلاَم وا خۆی فەزح كرد و ئابرووی زانستی بۆ خۆی نەهێشت، نەك سێ ڕۆژ بەلّكو ئەو هیچ بەهایەكی بۆ هەست و سۆز نەهێشتەوەو تەنها چەند سەعاتێكی هێشتەوە بۆ ئەوەی بزانرێت دوای شیكاری ئەو ئافرەتە دووگیانە یاخود نا!! ئاخر من دەلێم: چ ئافرەتێك ئەتوانێت دوای چەند مانگێكیش مێرد بكاتەوە چ جای بگاتە چەند سەعاتێك؟!

زۆر بە دەگمەن شتی وا ڕێك دەكەوێت چونكە ئەوان وەكو ئۆزۆن بێ هەست و سۆز نین و نازانم خێزانی ئۆزۆن دوای مردنی بڕیاری دابێت بە سەعاتێك دوای دەرچوونی

ئەنجامی شیكاریی مێرد بكات بە هاوڕێ پیاوەكەی كە لە ئێستادا هەیەتی وا ئۆزۆن بە كێشەی نابینێ ژن و پیاو هاوڕێیەتی بكەن[1]!!

لەدوای ئەو فەرموودانەی كە باس لە ئافرەت دەكات، تا بتوانێت سووكایەتی بە هاوەڵێ خۆشەویست ئەبو هورەیرە دەكات(ﷺ) و تانەو تەشەر دەدات بەو بیانووەی كە زۆربەی ئەم فەرموودانە ئەو گێڕاویەتیەوە، تەنها ئەوەندە دەڵێم: ئۆزۆن و ئەو هاوەڵە بەڕێزە لەلای خوای گەورە بە یەك دەگەنەوەو مافی خۆی وەردەگرێتەوەو هەرگیز مافی بە زایە ناچێت لە بارەگای ئیلاهی.

پاشان ئۆزۆن دێتە مەیدان و ئەیەوێ بە بۆچوونی فاسدی خۆی ئەم ئایەتەمان بۆ تەفسیر بكات و دەڵێت: ئایەتی(قوامە) مەبەست پێی تەنها ئەوە نییە كە پیاو قوامەی هەبێت بەسەر ئافرەتەوە چونكە كۆتایی ئایەتەكە بەم شێوەیە هاتووە: (بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ)، ئۆزۆن دەڵێت بە نونی نسوە نەهاتووە كە بۆ كۆمەڵێ ئافرەتانەو بلێ: ( بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضِهِنَّ) واتە: پیاوان بەسەر ئافرەتاندا!!

ئۆزۆن مەبەستی ئەوەیە كە جاری واش هەیە پیاو لە كۆمپانیایەكدا ئیش دەكات و ئافرەتێ: خاوەنیەتی ئەوا ئەو ئافرەتە قوامەی بەسەر ئەو پیاوەوە هەیە، وەكو خۆی ئەو نمونەیە دێنێتەوە[2].

دەڵێم: ئۆزۆن نەزانە بە زمانی عەرەبی هەر ئەوەش وای لێكردووە بكەوێتە ناو ئەو هەڵە گەورەیەوەو بە چەند خاڵێك ڕێگەی لێ دەگرین، ئەو هات و ویستی لە ڕێگەی زمانەوە بیسەلمێنێت، بەڵام وا هەر بە زمان هەڵەكەی ڕوون دەكەینەوە بە چەند خاڵێك:

١ - وابزانم تاوەكو ئێستا نەیزانیوە لە زمانی عەرەبیدا خیتاب بۆ پیاوان دێت و بەڵام هەم ژن و هەم پیاویش دەگرێتەوە، هەروەكو لە(نوێژ و ڕۆژوو...) زۆر بابەتی تردا بەدیار

---

[1] ئەمە وەكو سووكایەتی بۆ خێزانی ئۆزۆن نایڵێم، ڕەنگە خێزانی ئافرەتێكی بەڕێزبێت، بەڵام وەكـو باسـكردنی ئۆزۆن و مەنهەجی خوارو دژ یەكی ئەم وتەیە دەڵێم، هـەروەها زۆر بـە ئاشـكرا بانگەشـەی ئەوەشـی كـرد كـە كێشەی نیە ژن و پیاو هاوڕێی ڕەگەزی بەرامبەریان هەبێت!

[2] ع: ١٣٠، ك: ٢٣٠

دەكەوێت كە خیتاب بە واوی كۆمەڵی پیاوانەو لەسەر هەردوكیشیان واجبە ئەنجامی بدەن.

٢ – ئۆزۆن كە دەڵێت بۆچی زەمیری دووەم بۆ ئافرەتان نەهاتوەو(هن) بەكار نەهاتووە، ئەی خۆ بەم شێوەش نەهاتووە: (بَعْضَهُنَّ عَلَى بَعْضِهِم)، واتە هەندێك ئافرەتان بەسەر پیاوانەوە!! وا ئۆزۆن ئافرەتانیشی تیٚ دەكات كە گوایە(قوامە)یان بەسەر پیاواندا هەیە.

٣ – هەروەها دوا بەدوای ئەوە خوای گەورە باسی هۆكاری قیوامە دەكات، كە هەم دیسانەوە بە هەر بۆ پیاوانە بەبیٚ ئافرەتان ئەویش: (وَبِمَا أَنْفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ)، وەكو بینیمان بە واوی جەماعەی موزەكەر هێناویەتی و پاشانیش بە(هم) كە زەمیری غائبە بۆ پیاوان.

بەمەش تەفسیرەكەی ئۆزۆن هەڵدەوەشێتەوەو مانایەكی بۆ نامێنێتەوە، جا باشتر وابوو ئۆزۆن خۆی لە تەفسیری لوغەوی نەدات چونكە ئەوە ئیش و كاری ئەو نیەو لیٚی نازانێت!!

پاشان ئۆزۆن بەردەوام دەبێت لەسەركەشی و ملنەدان بۆ حەق و چەواشەكاری و گومانێكی تر دروست دەكات و دەڵێت: "لێرەوە پرسیارێك دێتە پێشەوە، تەنها بۆ ئافرەتانی پابەند بە ئاینەوە، ئایا قەبوڵیانە نیو موچەی پیاوێك وەربگرن ئەگەر لە هەر پلەیەكدان؟ لێرەدا باسی ئەوەش دەكەین كە خوێنی ژنی بە هەڵە كوژراو نیوەی خوێنی پیاوانە بە پێی ڕای فوقەها، ئایا ئافرەتان بەمە ڕازی دەبن؟ "[1] ع: ١٣١، ك: ٢٣١

دەڵێم: بەم وتەیە ئۆزۆن تەواو نەزانی خۆی دەسەلمێنێت، چونكە زۆرێك لە زانایان باسی حیكمەتی ئەم تەشریعەیان كردوەو ئەوپەڕی دادپەروەری بەرژەوەندی ئافرەتانیشی تێدا ڕەچاو كراوە، باشە چۆن؟

وەلاَم: جاریٚ لە پێشدا ئەبێت ئەوە بزانین كە لە كوشتنی بەئەنقەستدا ئەگەر ئافرەتبێت و مندالْبێت، ئەوا وەكو یەكن و كەسوكاری ئافرەتی كوژراو بۆیان هەیە داوای كوشتنەوەی پیاوەكە بكەنەوە بە بیٚ جیاوازی لە نێوانیاندا، بەلاَم لە كوشتنی هەڵەدا

[1] هەندێك كورتم كردوەتەوە رِیَك دەقی وتەكانی ئۆزۆنم نەهێناوە، بەلاَم بە ئەمانەتەوە هێناومە.

جمهوری زانایانی هاوەڵان و شوێنكەوتوان و زانایانی ئوممەت لەسەر ئەوەن كە دیەی خوێنی ئافرەت نیوەی خوێنی پیاوانەو ئەمەش لەبەر خاتری ئافرەتان و ڕەچاوكردنی حاڵیانە نەك بەكەم سەیركردنی خوێنی ئافرەتان، چونكە لە هەردوو حاڵەتەكەدا هەر ئافرەتان قازانج دەكەن و ڕەچاوی حاڵی ئەوان كراوە، ئێمە ئەگەر سەیر بكەین كوشتنی بەهەڵەی ئافرەتان تەنها لەلایەن ئافرەتەوەیەو كەم جار پیاو ئەبێتە هۆی كوشتنی ئافرەتان بەهەڵە، چونكە هەڵسوكەوت و دانیشتنی پیاو لە ئیسلامدا لەگەڵ پیاودایەو ئافرەتیش لەگەڵ ئافرەت، نەك ئەم تێكەڵیەی كە ئەمڕۆ هەیەو ئافرەت سرووشتی پیاوی وەرگرتوەو وەكو ئەو مامەڵە دەكات و هەروەها پیاویش بە هەمان شێوە، بەهۆی تێكەڵی بەردەوامیانەوەو ئەمەش لە ئیسلامدا شتێكی وەرگیراو نیە.

بەهەرحاڵ كوشتنی ئافرەت بە هەڵە لەلایەن ئافرەتەوەیەو شەریعەتی ئیسلامیش ئەو حاڵەی ئەوانی لەپێشچاوگرتوەو قورسی نەكردووە لەسەریان، چونكە ئەبێت خۆشیان دیەكە بدەن و كۆكردنەوەی ئەو ڕێژە پارەیەش بۆ ئافرەتان ئاسان نیەو ناتوانن بە ئاسانی ئەو پارەیە بدەن.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە پارەكە بۆ ئافرەتەكە نامێنێتەوەو بەڵكو بۆ مێرد و میراتگرانی دەبێت، چونكە خۆی مردوەو هیچ سودێكی بۆ ئەو تێدا نیە، بەڵام لەولاشەوە ڕەچاوی حاڵی ئەو ئافرەتی تێدا كراوە كە دیەكە دەدات و لەسەری قورس نابێت.

هەروەها ئەوەشمان بیر نەچێت كە شەرعیەتی دیە لە كوشتنی هەڵەدا لەبەرامبەر خوێن نییە بەڵكو لەبەرامبەر ئەو زیانەیە كە لە كەس و كاری كوژراو كەوتووە.

بەهەمان شێوە كاتێك كە دیەی پیاو بە زۆرتر دانراوە هەر لە بەرژەوەندی ئافرەتدایە، چونكە دوای مردنی پیاوەكەی ئەو ئەبێتە میراتگری پارەكەو بۆ ئەو و منداڵەكانی دەبێت و بەمەش دەبینین لە هەردوو حاڵەتەكەدا لەبەرژەوەندی ئافرەتانە، ئەم شەریعەتەش تەنها كەسانی سادەی وەكو ئۆزۆن ڕەخنەی لێ دەگرن ئەگینا لەلای كەسی ژیر ئەوپەڕی دادپەروەریە.

ئۆزۆن بەوەندە ناوەستێت بەڵكو فەزڵی ئافرەت دەدات بەسەر پیاواندا و چەند بەڵگەیەك دێنێتەوەو تەنانەت ئایەتیش دروست دەكات بۆ مەرامی بۆگەنی!!

ئۆزۆن ئەم ئایەتە دێنێتەوە: ﴿ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ﴾آل عمران

دەڵێت: "دەبینین كە ئەوەی(موستەسنا)(هەڵاوردەكراو)ە لە پێشدا كورە و كەواتە كچ بە نرخترەو بەڕێزترە تاوەكو كوڕ، هەروەكو وتەی خوای گەورە(وَلَيْسَ الأَعْمَى كالبَصِيْرِ) " ع: ١٣١، ك: ٢٣١-٢٣٢

دەڵێم: هەم دیسانەوە ئۆزۆن دەمی كوتایەوە لە شتێك كە لێی نازانێت ئەویش بریتییە لە بابەتی زمانی عەرەبی، ئای چەندە خۆشە مرۆڤ كاتێك شتێك نازانێت بێدەنگبێت لە ئاستیدا.

پێش ئەوەی وەڵامی ئەوەی بدەمەوە ئەمەوێت بڵێم: ئۆزۆن تەنها درۆ مابوو بەدەم قورئانەوە بیكات وا ئەویشی كردو دەستی دایە ئایەت دروستكردن بۆ مەرامی گڵاوی خۆی، هەموو قورئان بگەڕێن و ببینن ئایا ئەم ئایەتە(وَلَيْسَ الأَعْمَى كالبَصِيْرِ) بوونی هەیە لە قورئاندا؟! هەرگیز وەها ئایەتێك بوونی نیەو بۆ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دانەبەزیوە، بەڵام نازانم ئۆزۆن لە ئەمریكاوە لای برا زەوق سەلیمەكانی، موسحەفێكی تایبەتیان بۆ ڕەوانە كردبێت و لەوێدا هەبێت!

پاشان ئەمەوێت ئەوە بڵێم: كە ئۆزۆن و هاوشێوەكانی زۆر باسی گەڕانەوە بۆ قورئان دەكەن و تەنانەت ئاگاداری قورئانیش نین، بەڵام من وای بۆ دەچم كە ئۆزۆن خۆی بە ئەنقەست ئەمەی كردبێت، چونكە هەرچەندە ئایەتی هێناوە هەمووی داوەتە پاڵ سوڕەتەكەیی و ژمارەكەشی نووسیوە تەنها ئێرە نەبێت، بەڵام وەرگێڕی بەستەزمان و ئەوەشی پێداچوونەوەی بۆ كردووە نەیانزانیوە كە چی لە ئارادایە، ئیتر هەر ئەمە بەسە بۆ نەزانی هەرسێكیان!!

بۆ ئەو بەڵگە لارو لەوێرەی ئۆزۆنیش دەڵێم مەرج نییە هەركامێكیان لە پێشەوە هاتن ئیتر ئەوەیان نرخ و بەهای كەمتربێت تا ئەوەی دووەم، ئەوەتانێ خوای گەورە

دەفەرموێت: ﴿ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾ص

ئەوتانیّ لێرەدا ئیستفهامی ئینكاریەو بەمانای نەفی دێت، هەروەها ئەوانەی كە كردەوەی چاكە دەكەن لە پێشی ئەوانەوە هاتووە كە خراپە دەكەن، وئەوانەشی كەسی خۆپارێزن لە پێش كەسی خراپ و تاوانبارەوە هاتووە!!

من تەفسیرێكی بەلاغی ئایەتەكەی پێشوو دەكەم و ڕوونی دەكەمەوە كە بۆچی كوڕ لە پێشەوە هاتووە، بەلاّم ئەمە تەنها بۆ ئەوكەسانەیە كە دەزانن بەلاغە چیە نەك ئۆزۆن و وەرگێڕ و كۆمەڵی ئەوان!

ئایەتەكە باسی دایكی مەریەم دەكات كە وتی ئەی خوای گەورە من ئەوەی لە سكمدایە دەیكەمە نەزر بۆ خزمەتی تۆو پەرستشی تۆو خزمەتی بەیت، بەلاّم كاتێك زانی كە كچەو كوڕ نیەو كچیش پێویستی بەوەیە چاودێری بكرێت و ناتوانێت بەتەنها جێی بهێڵێت و پێویستە بەردەوام چاودێری بكرێت، ئەویش فەرمووی ئەی خوای گەورە هەرگیز كوڕ و كچ وەكو یەك نین!!

ئەمە لە بەلاغەدا پێی دەوترێت پێشخستنی ئەوەی كە دەتەویّ لە پێشدا باسی بكەیت و بەلاتەوە گرنگە، هەروەكو خەتیبی قەزوینی لە باسی پێشخستن و هۆكارەكانیدا دەفەرموێت: "تَقْدِيمُ الْمُسْنَدِ إِلَيْهِ فَلِكَوْنِ ذِكْرِهِ أَهَمَّ"[1].

لەبەر ئەوە پێش خراوە بەسەر كچدا چونكە لەلای خێزانی عیمران كوڕ گرنگتربووەو هەندێك جاریش پێشخستن بۆ گرنگی باسەكەیە، نەوەك بەو شێوەی كە ئۆزۆن باسی دەكات، هەروەها ئەمە وتەی ئەو ئافرەتەشە نەوەك بڕیاری خوای گەورە كە یەكێكیان فەزل بدات بەسەر ئەوی تریاندا.

---

[1] تلخيص المفتاح، ص: (٢٨)، المطبوع مع المطول للتفتازاني، تصحيح وتعليق: أحمد عزو عناية، دار الكوخ للطباعة والنشر، ط: الأولى، ١٣٨٧.

خێزانی عیمران حاڵەدا كوڕی بەلاوە گرنگتربووە، چونكە ئەو چاودێریەی كە كچەكە ئەیەوێت كوڕ پێویستی نیەو ناتوانن بە ئاسانی كچ دابنێن لە شوێنێكی چۆڵدا، بۆیە كوڕەكەی لە كەلامدا پێش خستووە، ئەمەش لە گشت كتێبەكانی بەلاغەدا باس دەكرێت كە تەقدیم یاخود تەئخیر لەبەر چیەو چەندین هۆكاری گرنگی هەیە، ئیتر پێویستی بەوە نەدەكرد ئۆزۆن ئایەتی بۆ دروست بكات!!

## ئۆزۆن و بانگەشەی سفوری!!

دوای ئەوەی ئۆزۆن لە باسی ئافرەت دەبێتەوەو بەڵگە بێ بنەماكانی باس دەكات ئەم جارەیان ئەیەوێت ئافرەتانی مسوڵمانان بەرەو سفوری و پۆشاكی ناشەرعی بەرێت و بانگەشەی ئەوە دەكات كە حیجاب واجب نیەو پێویست نیە، ئەم بانگەیەش شتێكی تازە نیەو چەندین كەسی تری فاسقی بەناو مسوڵمان پێش ئۆزۆن پێی هەستاون ئەویش هەمان شەكری ئەوان دەشكێنێتەوەو دەڵێت: " پێویستە ئاماژە بدەینە ئەوەی كە پێی دەوترێت باڵاپۆشی شەرعی، كە ئەمە لەم ڕۆژگارەدا دیارترین شتە ئافرەتی مسوڵمان دیل دەكات و دووری دەخاتەوە لەكارو ژیان و كۆمەڵگەو پراكتیزەكردنی مافەكانیەوە، كە هەندێ جار دەگات بەكردنی بە بەندكراوی ماڵی خۆی ـ بەپاساوی ئەوەی كە هەموو شتێكی ئەو عەورەتە هەر لەدەنگیەوە تا بنی پێی ـ كە لەم بارەیەوە لە سەحیحی بوخاریدا هیچ فەرموودەیەك نەهاتووە باسی بكات یان قسەیەكی لەبارەوە بكات، ئەمە جگە لەوەی كە حیجاب لە زماندا بریتییە لە(ساتر) یان(بەربەست)، نەك پۆشاكی سەر!" ع: ١٣٢، ك: ٢٣٢

پاشان دەڵێت: "سەبارەت بەوەی كە لە قورئانداو لە هەردوو سورەتی نور و ئەحزابدا هاتووەو وەك پێویستكاری حیجاب دراوەتە قەڵەم، تێگەیشتن لە وشەو دەستەواژەكانی و بەستنەوەی بە بۆنەكانی هاتنیانەوەو جێبەجێكردنی جێنشینان بۆیان، هەمووی ئەوە دەگەیەنێت كە باڵاپۆشی پێویست نییە هەروەها هیچ سزایەك باس نەكراوە بۆ ئەو ژنەی كە دەستبەرداری باڵاپۆشی دەبێت." ع: ١٣٣، ك: ٢٣٣ـ٢٣٤

دەڵێم: ئۆزۆن هیچ گومانێكی نەهێشتەوە بۆ ئەوەی كە هەموو بڕوایەكی تەواومان هەبێت كە دەستێكی تێكدەرەو ئەیەوێت سەرتاپا ئایین و ڕەوشتی خەڵكی نەهێڵێت و ئافرەتان لە پۆشتەییەوە بەرەوە سفوری و ڕووتی بەرێت، من نازانم ئۆزۆن لەم بانگەشەیەی بێجگە لە تێركردنی ئارەزوو بازان چی شتێكی تری دەست دەكەوێت؟ ئەگەر مەبەستی ئەوەیە ئافرەتان بەهۆی حیجابەوە كۆت و بەند كراون و ئەو هاتووە بۆ ئەوەی ڕزگاریان بكات ئەوا پێی دەڵێم: خەسارەت مەندبوویت لە چەند ڕوویەكەوە:

١ – هیچ ئافرەتێكی پۆشتەو بە حەیاوحیشمەت كە پۆشاكی شەرعی ئەپۆشێت، بەهۆی وتەكانی تۆو هاوشێوەكانتەوە سارد نابێتەوەو لای نادات.

٢ – بەپێی ئەم بانگەشەیەی خۆی بێت ئەوا نەخێزانی و نە كچەكانی حیجابی شەرعیان لەبەر نیەو ناپۆشن، ئیتر ئۆزۆن چۆن دەزانێت كە كۆت و زنجیری كردوون؟ خۆ ئۆزۆن خۆی تاقی نەكردوەتەوە تا بزانێت وایە یان نا؟!

٣ – زۆر ئافرەتی پۆشتەو حیجابمان هەیە كە بەو جلە پاك و جوانەیانەوە لە چەندین پۆستی گرنگدان و كاری ڕۆژانەی خۆیان جێبەجێ دەكەن، ئیتر ئەم وتە بێ مانایانەی ئۆزۆن لە پێناو چی؟!

هەروەها ئۆزۆن كە سەحیحی بوخاری نەخوێندوەتەوە با لەخۆیەوە قسە نەكات و نەڵێ فەرموودەی تێدا نییە لە بارەی پۆشاكی شەرعیەوە، ئەوتانێ پێشەوا بوخاری باسێكی تایبەتی داناوە لەسەری و ئەو ئایەتەی سورەتی نوری هێناو ناوی ناوە: ( بَابُ(وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ) ﴿النور: ٣١﴾) و فەرموودەیەكی زۆر ڕوونیشی هێناوە لە دایكی ئیمانداارانەوە: "عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: " يَرْحَمُ اللَّهُ نِسَاءَ الْمُهَاجِرَاتِ الْأُوَلَ، لَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ: (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ) ﴿النور: ٣١﴾ شَقَّقْنَ مُرُوطَهُنَّ فَاخْتَمَرْنَ بِهَا"[١]

هەروەها پێشەوا ئیبن حەجەر دەفەرموێت لەبارەی دەستەواژەی(فَاخْتَمَرْنَ): "فَاخْتَمَرْنَ أَيْ غَطِّيْنَ وُجُوهَهُنَّ وَصِفَةُ ذَلِكَ أَنْ تَضَعَ الْخِمَارَ عَلَى رَأْسِهَا.."[٢]

واتە: خیماریان كرد بەو مانای دەموچاویان شاردەوە، چۆنیەتیەكەشی بەوشێوەیە كە خیمار لەسەر سەری دانێت.."

جا ئەگەر كەسێك بگەڕێتەوە بۆ سەحیحی بوخاری ئەوا زۆر فەرموودە دەبینێت لەسەر پۆشاكی شەرعی بۆ ئافرەتان و زیاتر چەواشەكاری و نەزانیی ئۆزۆنیشی بۆ دەردەكەوێت.

---

[١] رواه البخاري (٦/١٠٩)، برقم: (٤٧٥٨).

[٢] فتح الباري (٨/٤٩٠).

پاشان من نازانم ئۆزۆن چۆن شەرمی نەكردووە دوای ئەو هەموو ئایەتەی قورئان كە باس لە پۆشاكی شەرعی و پۆشتەیی دەكات، بەناوی تانەدان لە فەرموودەوە ڕاستەوخۆ ئەو هەموو ئایەتە پیرۆزانەش پەك بخات؟

ئەوتانیٚ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾النور

هەروەها لەبارەی ئافرەتی بە تەمەنەوە كە نیازی مێردیان نەماوە لەبەر تەمەن دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾ ﴾النور

هەروەها دەفەرموێت دەرباری ئافرەتان بە گشتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ ﴾الأحزاب

ئیتر ئێمە واز لە هەموو فەرموودەكان دێنین و قسەیان لەسەر ناكەین و نایانهێنین و تەنها ئەم ئایەتانەی قورئانی پیرۆز بەسە بۆ كەسێك بڕوای پێی هەبێت، هەروەها لەبارەی سزاشەوە ئەم ئایەتانە هەموو فەرمانن و ئایەتیش زۆرە لەبارەی سزای كەسێكەوە سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەو پێغەمبەرەكەی بكات، هەروەها لەفەرموودە ڕاست و

دروستەكانیش فەرموودە زۆرە لە بارەی سزایانەوەو ڕەنگە هەر ئەوەندە بەسبێت كە ئەو ئافرەتە سافیرانە بۆنی بەهەشت ناكەن.

بەلآم لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە ئۆزۆن بیری چوەتەوە كە لەوەوپێش خۆی باسێكی سەربەخۆی دانابوو لەسەر هۆیەكانی دابەزین و ئەیوت ئەمانە وا ئەكەن لە دەقە پیرۆزەكان كە ببنە دەقێكی مێژوویی و بانگەشەی لادانی هۆیەكانی دابەزینی دەكرد، بەلآم وا ئێستا خۆی دەلێت: ئەو ئایەتانەی سوڕەتی نور و ئەحزاب گەر بەستمانەوە بە **بۆنەكانی هاتنیانەوە ئەوا ئەزانین حیجاب واجب نیە!!**

سەیركەن چۆن خوای گەورە چەواشەكاران لەسەر زاری خۆیان فەزح دەكات و ئابڕووی زانستی بۆ خۆیان ناهێڵنەوەو هەموو چەوتی و نیازی خراپ و بۆگەنیان بە نەزانی خۆیان بۆ تێكڕای خەڵكی ئاشكرا دەكەن!!

هەروەها ئەو ئایەتە زۆر ڕوونەو خوای گەورە دەفەرموێت بە خێزانی باوەڕداران بڵێ ئیتر نازانم لەو دەقە گشتگیرتر ئەبێ چیبێت؟! هەروەها ئەوەی كە ئۆزۆن ئەیلێ جێبەجێكردنی جێنشینان بۆ ئایەتەكە وەك ئەوەی كە خەلیفەكانی ڕاشدین خێزانەكانی خۆیان سافیرەبوبێتن و پۆشتە نەبوبێتن یاخود بە واجبیان نەزانیبێت، جا ئێمە پێمان خۆشە ئۆزۆن نیو بەڵگەی سەحیحمان بداتێ ئەگەر لە باخەڵی خاڵییدا تیایەتی!

دواتر ئۆزۆن فەرموودەیەك دێنێت لە سونەنی ئەبو داود و وەك شتێك بڵێی تەنها ئەو فەرموودەیە هەبێت لەسەر پۆشاكی شەرعی و دەلێت: ئەوە سەحیحی بوخاری بوو كە لەلای هەموو مسوڵمانان جێی قەبوڵەو پریەتی لە دژیەكی و لەوەو پێش هەندێكیمان باس كرد، تۆ بڵێی حاڵی سونەنی ئەبو داود چۆن بێت كە گوێی نەداوە بە هێنانی فەرموودەی سەحیح بە تەنها. ع: ١٣٢، ك: ٢٣٢-٢٣٣

**دەڵێم**: ئێمە لە درۆو خیانەت و چەواشەكاری و نامەردی ئۆزۆن زیاتر شتێكمان نەدی و بەرچاو نەكەوت كە بەرامبەر خوای گەورەو پێغەمبەرەكەی و هەموو ئوممەتی ئیسلامی كردی و لەسەری هەمووشیانەوە پێشەوا بوخاری، ئۆزۆن و هاوشێوەكانی هەر بەوشێوە

سەرشۆڕ دەبن و پێشەوا بوخاریش هەر سەری بڵند و كتێبەكەشی بە دووەم پەرتووكی ئەم ئیسلامە دانراوەو دادەنرێت بە درێژایی ژیان، با نەیارانیشی قەڵسبن!

سونەنەكەی پێشەوا "ئەبو داود"یش بەڵێ فەرموودەی لاوازی تێدایە، بەڵام ئەمە شتێك نییە كە ئۆزۆن دۆزیبێتیەوە، بەڵكو زانایانمان فەرموودە لاوازەكانیان دەرهێناوەو ڕوونیان كردوەتەوە، هەروەها یەكێكە لەو كتێبانەی كە زۆرترین فەرموودەی ڕاستی تێدایە لەبارەی ئەحكامەوەو هەموو زانایانی ئوممەت وەریان گرتوەو كاریان پێی كردووە، ئیتر چاوەڕوانی ئەوە نین بزانین فەرموودەناسی سەردەم ئۆزۆن بڕوای پێیەتی یاخود نا، چونكە ئەو كێشەی لەگەڵ قورئانیش هەیە!!

پاشان لە كۆتاییدا ئۆزۆن شیعری شاعیرێكی كوەیتی ئەهێنێتو وەسفێكی زۆری دەكات و بیری كردووە كە ئەو ئافرەتەش لەچك بەسەرەو خۆی تاوەكو توانی بەوپەڕی دواكەوتوویی و كۆت و بەندی وەسف دەكرد لەچك و حیجاب، بەڵام لێرەش ئەو ئافرەتە بە كەسێكی هۆشیارو ژیر وەسف دەكات[1]، لە هەمووی كێشەتر ئەوەیە كە سوعاد سەباح لەكاتی شەڕی ئێران و عێراقدا وەسفێكی لەڕادەبەدەری سەدامی كردوەو هۆنراوەیەكی درێژی بەسەردا دەخوێنێتەوە كە دەڵێی بۆ پێشەوا عومەری نووسیوە هێندەی وەسف و سەنا تێدایەو دواتریش لێی پاشگەز بویەوەو وتی من نەمنووسیوەو بۆ سەدامم نەوتووە لەكاتێكدا عێراقیەكان شاهیدن كە وتویەتی.

ئێستاش تۆ بیرێك لە ئۆزۆن و نووسینەكەی بكەرەوە، پێشەوا بوخاری و تەواوی هاوەڵان و فەرموودەناسان و..هتد، هەموو تێكڕا ڕەت دەكاتەوە، بەڵام بەڵگە بە شیعری ئافرەتێكی لەوشێوەیە دێنێتەوە!!

---

[1] ع:١٣٣، ك:٢٣٤

## بەڵێ كۆیلایەتی لە ئیسلامدا هەبووە!

ئۆزۆن ئەم بابەتە ئەورووژێنێت لە ژێر ناونیشانی(سەحیحی بوخاری و فەرموودەی دژبەیەك)!

لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە لە دابەشكردنی بەشەكانی كتێبەكەیدا تەنها خۆی سەر لەخۆی دەردەكات و زۆر جار ناونیشان و پێكهاتەو ناوەڕۆك زۆر لەیەك جوودان، بۆ نموونە سەیری ئەم فەرموودانەی سەرەتا بكەن و ببینن لەگەڵ كوێی ناونیشانەكەدا یەك دێتەوە كە دژبەیەكییە!!

لەسەر بابەتی كۆیلە لە ئیسلامدا دوو فەرموودە دێنێت ئەوانیش:

### فەرموودەی یەكەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «نِعْمَ مَا لِأَحَدِهِمْ يُحْسِنُ عِبَادَةَ رَبِّهِ وَيَنْصَحُ لِسَيِّدِهِ»[١].

واتە: باشترین شتێكە كە یەكێكیان هەیبێت(كۆیلەكان) پەرستشی پەروەردگاری باش بكات و گوێڕایەڵی گەورەكەشی بكات.

### فەرموودەی دووەم:

عَنِ الزُّهْرِيِّ، سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ المُسَيِّبِ، يَقُولُ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «لِلْعَبْدِ المَمْلُوكِ الصَّالِحِ أَجْرَانِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلاَ الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالحَجُّ وَبِرُّ أُمِّي، لَأَحْبَبْتُ أَنْ أَمُوتَ وَأَنَا مَمْلُوكٌ»[٢].

---

[١] رواه البخاري (٣/١٤٩)، برقم: (٢٥٤٩).

[٢] رواه البخاري (٣/١٤٩)، برقم: (٢٥٤٨).

واتە: بۆ كۆیلە دوو پاداشت هەیە، سوێند بەخوا ئەگەر جیهاد لە ڕێگەی خواو حەج و چاكەكردن لەگەڵ دایكم نەبوایە پێم خۆشبوو من بمرم و كۆیلەبم.

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: " پێغەمبەر ئەمە وەسف دەكات بەوەی كە چاكترینە، و ئەبو هورەیرەش هانمان دەدات بۆ كۆیلایەتی" ع: ١٣٦، ك: ٢٣٩

دەڵێم: كەس ناتوانێت ئینكاری ئەوە بكات كە ئیسلام هات تاوەكو مرۆڤەكان لە كۆیلایەتی و بەندەی بەندەكان دەرباز بكات و بیانكاتە بەندەی ڕاستی خوای گەورە بە تێكرا، هەروەها سزای سەختیشی داناوە بۆ كەسێك كەسێكی ئازاد بكات بە كۆیلەو هەروەكو هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: " قَالَ اللَّهُ: ثَلاَثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ: .. وَرَجُلٌ بَا عَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ.. "[١].

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: سێ كەس هەن كە من دژیانم لە ڕۆژی دواییدا: ".. پیاوێك كەسێكی ئازاد بفرۆشێت و نرخەكەی بخوات".

ئەمە شتێكی باوبوو لە سەردەمی نەفامیدا كە لەبری قەرز منداڵی كەسی قەرزاریان دەفرۆشت وەكو كۆیلەو پارەكەیان هەڵدەگرت لەبری قەرزەكە، پێشەوا بوخاریش باسێكی تایبەتی لەسەر داناوە بەناوی(بَابُ إِثْمِ مَنْ بَا عَ حُرًّا)[٢]، واتە: باسی تاوانی كەسێك ئازادێك بفرۆشێت! جا ئەگەر بێت و ئۆزۆن كەسێكی دادگەربوایە ئەبوو هەموو ئەو باباتانەی كە لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە بیانهێنێت نەك تەنها بە ویستی خۆی هەندێكیان هەڵبژێرێت!!

هەرچی كۆیلایەتیە بەهۆی شەڕەوە لە ئیسلامدا مایەوە، ئیتر وەكو یاسایەك لە بەرامبەر ئەوەی كە یاسای ئەو كاتە وەها بووەو سیاسەتی شەڕ لەوكاتەدا وابووە كە دیلەكانی شەڕ بكرێنە كۆیلە لەبری كوشتنیان وەكو كافران دەیانكوشتن، یان هەر تەشریعێكی جێگیرەو ماوەتەوە، بەڵام من لێرەدا نامەوێت بچمە ناو درێژەی ئەو بابەتەو موناقەشەی

---

[١] رواه البخاري (٣/٨٢)، برقم: (٢٢٢٧).

[٢] صحيح البخاري (٣/٨٢).

بۆچوونەكان كە ئایا ئێستا ماوەتەوەو جێگیرە یاخود تەنها بۆ ئەو كاتە بووە، بەڵام ئەمەویێت ئەوە بڵێم: ئەگەر وەكو خۆی جێبەجێ بكرێت ئەوا من لـە ئێستاشدا پێم باشترە بە هەزاران قات لـە سجنی تاغوت و ملهوڕان كە هیچ بەهایەكی مرۆڤانەیان بۆ دیلی بەرامبەر نەهێشتوەتەوە!!

تاوەكو ئێستاش زیندانەكانیان پڕە لـە كەسانێك كە لـەبەر فیكر گیراون و مافی ژیانیان بۆ نەهێشتوونەتەوە، هەر لـە ئەمریكاو ئەوروپاو هەموو ئەو گەورە درۆزنانەی كە لاف و گەزافی مافی مرۆڤ و ئازادی ڕا دەربڕین لـێدەدەن!

تەنانەت ئەو كۆیلایەتیەی سیستەمی ئیسلامی(بەو مافانەی كە باسیان دەكەین) زۆر پێم باشترە لـە ژیانی ئازادێتی لـە ئێستای زۆربەی وڵاتانی جیهاندا!!

ئیسلام زۆر مافی داوە بە كۆیلـەكان كە ئەمڕۆ لـە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا نییە بۆ هاوڵاتیانیشی، هەروەها لـە ڕۆژئاواش بۆ هەندێكیان هەیەو بۆ هەندێكیشیان نیە، بۆ نەیارانیشی "گوانتانامۆ"ی كردووەتە خەڵات!!

هەندێك لـەو مافانەی كە ئیسلام داویەتی بە كۆیلـە:

١ – هاوبەشكردنیان لـە مرۆڤایەتی و كردنیان بە برای یەكتر.

٢ – پێدانی ئەو جل و بەرگ و پۆشاكەی كە خۆیان دەیپۆشن.

٣ – هەرخواردنێكیش كە خۆیان دەیخۆن ئەوەیان پێ بدەن.

٤ – كاری قورسیشیان بەسەردا نەدەن و ئەگەر كاری قورسیشیان پێدان پێویستە یارمەتیان بدەن.

هەموو ئەمانە لـەم فەرموودەیەدا هاتووە: " هُمْ إِخْوَانُكُمْ، جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ جَعَلَ اللَّهُ أَخَاهُ تَحْتَ يَدِهِ، فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلاَ يُكَلِّفُهُ مِنَ العَمَلِ مَا يَغْلِبُهُ، فَإِنْ كَلَّفَهُ مَا يَغْلِبُهُ فَلْيُعِنْهُ عَلَيْهِ "[1].

---

[1] رواه البخاري (١٦/٨)، برقم: (٦٠٥٠).

جا ئەگەر ئێمە سەیری مێژووی ڕەشی ئەوروپا بکەین دەبینین هاولاَتیانی کەم دەرامەت و هەژارو کرێکاری خۆیان کە بە ملیۆنەهایان دەمردن بەهۆی کاری قورسەوە کە بەرگەیان نەدەگرت لە ژێریدا، ئیتر ئێمە چۆن داوایان لێبکەین مافی خەلکی تر بدەن[1]؟!

٥ – لێدان و ئازاردانیان بە هەموو شێوەیەك قەدەغەیەو زلەیەك یاخود پیاکێشانێکیان کەفارەتەکەی بریتییە لە ئازادکردنیان، هەروەکو لەم فەرموودەیەدا هاتووە: عَنِ ابْنِ عُمَرَ(رضي الله عنه): «مَنْ لَطَمَ مَمْلُوكَهُ، أَوْ ضَرَبَهُ، فَكَفَّارَتُهُ أَنْ يُعْتِقَهُ»[2].

٦ – پاراستنی خوێن و گیانی، هەر وەکو لەم فەرموودەیەدا هاتووە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرموێت: عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ، وَمَنْ جَدَعَهُ جَدَعْنَاهُ»[3].

واتە: هەرکەسێك کۆیلەکەی بکوژێت ئەوا دەیکوژینەوەو هەرکەسێکیش شوێنێکی کەل بکات ئەوا کەلی دەکەینەوە[4].

٧ – مافی ئەوەیان هەیە خۆیان بکڕنەوەو ئازاد بن و پێویستە گەورەکەشیان هاوکارییان بکات و تەنانەت زەکاتیش بەشێکی دانراوە بۆ ئەوان و بۆ ئەو مەبەستە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا

---

[1] بە گوێرەی نووسینەکانی ڕۆبەرت کۆنکوێست، تەنها ئەوەی کە لە یەکێتی سۆڤیەت ڕوویداوە لەمردنی کرێکار ملیۆنەهای تێپەڕاندووە، هەندێکی تریش ڕەتی دەکەنەوەو دەلێن نەگەیشتووەتە ئەو ئاستە، جا تۆ وەرە ئیتر دلت بە کوێی مێژووی ئەمانە خۆشبێت و چۆن بڕوا بە بانگەشەی ئەمڕۆشیان دەکەیت؟!

[2] رواه مسلم (٣/١٢٨٧)، برقم: (١٦٥٧).

[3] رواه أبو داود (٤/١٧٦)، برقم: (٤٥١٥)، وابن ماجة (٢/٨٨٨)، برقم: (٢٦٦٣)، والترمذي (٣/٧٨)، برقم: (١٤١٤) وقال: حديث حسن غريب من هذا الوجه، ، وصححه ابن الملقن في البدر المنير (٤/٦٩)، والصنعاني في الفتح السماوي (٣/١٥٩١) برقم: (٤٧٢٧)، وصححه الغماري في الهداية في تخريج أحاديث البداية (٨/٤٢٣)، دار عالم الكتب، بيروت – لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤٠٧ هـ – ١٩٨٧ م.

[4] وەك بڕینی گوێ یان لووت ...

لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ النور

هەروەها بەكردارییش هاتووە هەروەكو لە چیرۆكی ئەنەسی كوڕی مالیك كاتێك كە یارمەتی كۆیلەكەی نەدا بۆ ئازادبوون، پێشەوا عومەر(ﷺ) فەرمانی پێی كرد كە یارمەتی بدات و ئەویش هەستا بەوكارەو پاشان ئازادبوو.

لەگەڵ چەندین مافی تردا كە هەرگیز لە هیچ یاسایەكی تردا بێجگە لە ئیسلام بوونی نیەو نابینرێت!

چەند نمونەیەكی كرداریی هاوەلان(ﷺ) لەبارەی مامەڵەیان لەگەڵ كۆیلەدا:

پێشەوا عوسمانی كوڕی عەففان(ﷺ) كاتێك لەبەر تاوانێك ئەدات لە كۆیلەیەك و گوێی كەرت ئەبێت، عوسمان دێت و دەڵێت: وەرە پێشەوە تۆڵەی خۆت بكەرەوە چونكە بەرگەی سزای قیامەت ناگرم، ئەویش بە لەسەرخۆیی كەمێك بریندارى دەكات، پاشان پێشەوا عوسمان دەڵێت: بە توندی تۆڵەی خۆت بكەرەوە، پاشان كۆیلەكەش دەڵێت: قوربان منیش لە هەمان ڕۆژ دەترسم كە تۆ لێی دەترسیت!!

هەروەها هاوەڵی بەرێز عبدالرحمن ی كوڕی عوف(ﷺ) هیچ كەس جیای نەدەكردنەوە لە كۆیلەكانی چونكە هەمان پۆشاكی خۆیی دەدا پێیان و تەنانەت لە ڕێگەو بانیش پێشیان نەدەكەوت!!

سەلمانی فارسی خۆی هەویری دەشێلا(كاتێك پێشەواو ئەمیریش بووە)و لەوكاتە هاتنە لای و پێیان وت قوربان ئەوە چی دەكەیت؟ فەرمووی خزمەتكارەكەم ناردووە بۆ كارێك و پێم خۆش نیە دوو كاری پێبكەم!!

پێشەوا عورمەری كوڕی خەتتاب(ﷺ) كاتێك خەڵكانێكی بینی كۆیلەكانیان جیاكردوەتەوەو لەگەڵ خۆیاندا نانیان نادەنێ توڕەبوو وتی: ئەمانە چی خەڵكانێكن وا ئەو خزمەتكارانەیان جیاكردوەتەوە؟ پاشان فەرمووی: بڕۆنە پێشەوەو نانیان لەگەڵ بخۆن!

تەنانەت زانایانی ڕۆژئاوا شاهێدی ئەوە دەدەن كە حاڵی كۆیلە لە ئیسلامدا بە شێوەیەك بووە كە جێی باوەڕ نیە بۆ كەسانێك كە گەورەیی ئەم ئیسلامەو پەروەردەی بەرزی

هاوەڵانیان نەبینیبێت، بۆ نموونە "گۆستاڤ لۆبۆن"ی گەورە نووسەر و مێژوو نووسی فەرەنسی دەڵێت: "بەڕاستی ئەوەی کە من دەیبینم گوزەرانی کۆیلە لەلای مسوڵمانەکان شتێکی جیاوازە لەوەی کە لای خاچپەرستان هەبووە، حاڵی کۆیلە لە ڕۆژهەڵات زۆر باشتربووە لە حاڵی خزمەتکارەکان لە ڕۆژئاوا، چونکە کۆیلەکان لە ڕۆژهەڵاتدا بەشێك بوون لە خێزان، هەروەها توانیویانە هاوسەرگیری لەگەڵ کچی گەورەکانیان بکەن هەندێك جار وەکو بینیمان لە پێشتر، هەروەها توانیویانە بەرزترین پلە بەدەست بێنن، و عەرەب کۆیلایەتی بە عەیبە نەزانیوە، هەروەها پەیوەندی ئەوان بە گەورەکانیانەوە زۆر زیاترە لە پەیوەندی خزمەتکار بە گەورەکەی لە ڕۆژئاوادا"[١].

هەروەها لە یەکێك لە مێژوونووسەکانی خۆیانەوە(مسیو ئەپو) ئەگێڕێتەوە کە: "مسولْمانەکان هەرگیز بە چاوی کەم و سووك سەیری کۆیلەیان نەکردووە، تەنانەت گەورەی دەسەڵاتدارانی نەوەی عوسمان کە دەسەڵاتداری بەرێزی ئیسلامن و جێگەی ڕێزن لەلایان **کۆیلەبوون**، ئەوان کۆیلایەتیان بەوە نەبینیوە کە لە بەهایان بێنێتە خوارەوە..."[٢].

هەروەها دوای ئەویش باسی مەمالیك دەکات کە کۆیلەبوون و حوکمی میصریان کردووە، بەڵێ حوکمی میصرو شامیان کردووە بۆ نزیکی(٦٠٠) ساڵ!! لەکاتێکدا لە بنەچەدا کۆیلەبوون و هەموو مسوڵمانانیش ملکەچیان بوون و فەرمانبەرداریان بوون لەکاری چاکەدا!

ئەمە لەکاتێکدایە کە تاوەکو ئێستا لە وڵاتانی جیهان ئەم مافە دەستەبەر نەکراوەو بانگەشەی ئازادی ڕەهاشیان کرداریان بە درۆی دەخاتەوە!!

---

[١] حضارة العرب لغوستاف لوبون، ص: (٣٨٦-٣٨٧)، ترجمة: د.عادل زعيتر، مؤسسة الهنداوي للتعليم والثقافة - مصر -، ٢٠١٢م

[٢] حضارة العرب، (٣٨٧).

مافی خۆمانە بپرسین بۆچی تاوەكو ئێستاش لە ئەمریكا شیوعیەت قەدەغەو بقەیەو شیوعیەك بۆی نییە خۆی كاندید بكات بۆ پۆستی سەرۆكایەتی و لە ئەڵمانیاش نازیەت و لە زۆر وڵاتی تریش وەكو عێراقی خۆمان بەعسیەت و[1] ...؟!

سەرەڕای ئەمانە هەمووی ئیسلام هەوڵی ئەوەی داوە كە ڕزگاریان بكات هەروەكو یەحیای كوڕی سەعید دەفەرموێت: عومەری كوڕی عبدالعزیز ناردمی بۆ كۆكردنەوەی زەكات و دابەشكردنی، دابەشكرد تاوەكو كەس نەما وەریبگرێت لێم، منیش چووم كۆمەڵێك كۆیلەم پێ كڕی و ئازادم كردن!!

بەڵام ئەگەر تۆ سەیر دەكەیت لە فەلسەفەو مێژووی هەموو وڵاتاندا بە شێوەیەكی تربووە، هەرچی "ئەفلاتون"ە بە پێویستیەكی كۆمەڵایەتی زانیوە بوونی كۆیلە، هەروەها "ئەرستۆ" ئافرەت و كۆیلەی بە چینێ خواروو مرۆڤی ئاسایی و پیاو هەژماركردووەو وتویەتی هەر بۆ كاركردن باشن[2].

نازانم چۆن خەڵكی ئەو هەموو خەڵكەی هیندستانیان بیر چویەوە كە ئینگلیز كردنی بە كۆیلە؟!

نەك ئەوەندە بەڵكو "بەهادور شاه"ی كۆتا دەسەڵاتداری هندستان كە مسوڵمانبوو كردیانە زیندانەوە بۆ ماوەیەكی زۆر و برسیان كرد و هیچیان پێ نەدا، پاشان سەری هەرسێ كوڕەكەیان بۆ ناردە ژوورەوە بۆ ئەوەی بیخوات لە ساڵی(١٨٥٧)!

ئەی چی دەربارەی هیندیە سوورەكانی دانیشتوانی سەرەكی و بنچینەیی ئەمریكا كە خەڵكی ئەمریكای ئەمڕۆ هەموویانی كرد بە كۆیلەو زۆرێكیشیانیان دوورخستنەوە بۆ شوێنە دوورەكان؟

---

[1] مەبەستمان ئەوە نیە ڕەوایەتی بدەین بەو بیركردنەوە سیاسیانەو پێمان دروستبن، بەڵكو مەبەستمان پێی درۆی ئازادی ڕەهایە

[2] المدخل إلى علم الاجتماع العام لأحمد طاهر مسعود، ص: (٢١٨)، دار جليس الزمان للنشر والتوزيع

ئەی چی دەربارەی ڕەش پێستەکانی ئەمریکا کە خراپتر لە کۆیلە مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن تاوەکو ئەم ساڵانەی دواییش بۆیان نەبوو لە چێشتخانەکانی سپی پێستەکاندا نان بخۆن؟!

ئەی چی خەبەرە لەو ملیۆن زنجیە ئەفریقیەی کە ڕاگوێزی ئەمریکا کران و کران بە کۆیلەو نزیکی نۆ ملیۆنیشیان لە کاتی گواستنەوەدا لەبەر دووری ڕێگەو برسێتی و نەبوونی ڕێگاو ترازانیانە سەر یەك دەمردن لە ساڵانی(١٦٦١-١٧٧٤)؟!

مەگەر فەڕەنسیەکان نەبوون لە جەزائیردا نەك خەڵکی مسوڵمانیان کردە کۆیلەو خزمەتکار، بەڵکو یارییان پێ دەکردن و سەگیان تێ بەردەدان و پارچە پارچە لێیان دەکردنەوەو خۆشیان پێ دەکەنین بەدیاریانەوەو کاتیان بەسەر دەبرد و زیاتر لە دە ملیۆن مسوڵمانیان کوشت و خێرو بێری وڵاتەکەشیان دزین؟!

مەگەر مێژوونووسی خۆیان دیلاس کاساس باسی ئەوە ناکات کە ئیسپانیەکان بەندیەکانی هیندیە سوورەکانیان کۆت و زنجیر دەکرد و سەگەکانیان تێ بەردەدان و تێرگۆشتیان دەکردن لە گۆشتی مرۆڤ و بەو حاڵەش خۆشیان ڕادەبواردو پێدەکەنین بەو کەساسیەی هیندییەکان؟!

لە کۆتاییدا دەڵێم: ئێمە کتێبەکەمان سەبارەت بە کۆیلایەتی نییە تاوەکو زۆر بەدرێژی باسی ئەو دیاردەیە بکەین و، وتەکانی "ئەفلاتون" لە( المدينة الفاضلة) بێنین و ببینین چی سووکایەتیەك دەکات پێیان، هەروەها شیکاری وتە بێ ماناکانی "ئەرستۆ" کە لەوبارەیەوە بە شێوەیەکی زۆر نامرۆڤانە دواوە، هەروەها وتەکانی "تۆماس هۆبس" ی گەورە فەیلەسوفی ئینگلیزی کە کۆیلایەتی بە بەشێکی گرنگی دیاردەی کۆمەڵایەتی داناوەو نەك هەر کۆیلە بەڵکو تەواوی مرۆڤەکانی بە ئاژەڵێکی بێ نرخ و دڕندە وەسف کردووە[١]، لەولاشەوە با وتەکانی "هیگڵ" بوەستێ کە عەقڵی کۆیلەی لە خواروی سەیدەکەیەوە داناوە چونکە ئەو لە مردن دەترسێت و گەورەکەی ناترسێت، یان ئەوەی کە "کارل

---

[١] ڕەنگە ئەمە وەسفێکی جوانبێت بۆ خۆیان و کاتی پەلاماردانی گشت وڵاتان و دزینی سەروەتیان!!

ماركس" باسی دەكات بۆ پێشكەوتنی ئابووری ئەمریكا پێویستە كۆیلایەتی بمێنێت ئەگینا ئابووری ئەو وڵاتە لەو كاتەدا بەرەو داڕووخان و پووكانەوە دەچێت، یان چەندین وتەی تری بێ مانا لە سەرانی كوفر و بێ دینی و نا مرۆڤایەتی و ...

ئەگینا ئەهاتین شیكاری ئەم بابەتانەمان هەمووی دەكرد و بەتەواوی ڕووی ڕاستی لێدەرانی لاف و گەزافی مرۆڤایەتیمان دەردەخست و داواشمان لەخوای گەورەیە ئەو دەرفەتەمان بۆ بڕەخسێنێت بە شێوەیەكی فراوان لێیەوە بدوێین!

نازانم ئۆزۆن و هاوشێوەكانی خەجاڵەت بوون یان نا؟ بەڵام ئێستا كاتی ئەوەیە وەڵامی ئەو دوو فەرموودەیەشی بدەمەوەو بڵێم:

پێشەوا بوخاری كاتێك لە سەحیحەكەیدا باسێكی زۆری مافی كۆیلە دەكات بەسەر خاوەنەكەیەوەو تەنها فەرموودەی یەكەمیش بەسە كە هێنامانەوەو چوار خاڵی زۆر گرنگی تێدابوو لەبارەی مافی كۆیلەكانەوە، پاشان دێت ئەو فەرموودانەش دێنێت كە لای ئۆزۆن مایەی ڕەخنەیەو دەفەرموێت پێویستە كۆیلەش ئەو ئەركانەی لەسەر شانیەتی جێبەجێی بكات كە گوێڕایەڵی گەورەكەیەتی، ئیتر نازانم چ كەسێكی عاقڵ ڕەخنەی هەیە لەو فەرموودەیە؟!

بەڵام ئۆزۆن وەك هەمیشە خیانەت دەكات و وای نیشان دەدات باشترین كەس كۆیلەیەو هەموو ببن بە كۆیلە، بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: (نِعْمَ مَا لِأَحَدِهِمْ) واتە: باشترین كارێك كە یەكێك لەوان هەیبێت واتە لە كۆیلەكان نەوەك تەواوی مسوڵمانان و تەواوی كارەكانیان، بۆیە لە ڕاڤەی فەرموودەكەش وشەی(كۆیلە)م خستە نێو كەوانەوە بۆ ئەوەی ئەو چەواشە كارییەی ئۆزۆن ڕوون بێتەوە بۆ خوێنەران!

هەرچی فەرموودەی دووەمیشە تەنها ئەو بەشەی كە دەفەرموێت: (لِلْعَبْدِ الْمَمْلُوكِ الصَّالِحِ أَجْرَانِ)، واتە: بۆ كۆیلەی چاك دوو پاداشت هەیە، تەنها ئەمە وتەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و ئەوەكەی تری وتەی ئەبوهورەیرەیە(رضي الله عنه) و ئەمەش لە زانستی(مُصْطَلَحُ

الحَدِيْثِ) پێی دەوترێت(الْمُدْرَج) كە وتەی هاوەڵەكەیەو تێكەڵی فەرمووده‌كە بووە بەهۆی ڕاویەكەوە[1]، بەڵام ئەمە تەنها كەسانی سادەی وەكو ئۆزۆن هەستی پێ ناكەن ئەگینا كەسی بەرچاو ڕوون بە فەرموودە، بەهۆی قەرینەوە دەیناسێتەوەو دەزانێت كە تێكەڵی فەرموودەكە بوەو وتەی ڕاویەكەیە، لێرەشدا قەرینەی زۆر دیار هەیە كە چاكەكردنە لەگەڵ دایك و هەموو دەزانین كە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دایكی نەماوە تاوەكو چاكەی لەگەڵ بكات بەڵكو وتەی ئەبو هورەیرەیە، هەروەها مەرتەبەی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) زۆر لەوە گەورەترە لەلای خوای گەورە تاوەكو ئاوات بەو دوو پاداشتەی كەسی كۆیلە بەرێت!!

پاشان ئەوەی ئۆزۆن تێیگەیشتووە گوایە ئەبو هورەیرە هانمان دەدات بۆ كۆیلایەتی، تەنها تێگەیشتنی كەسێكی سادەیە ئەگینا هیچ ئاماژەیەكی بۆ شتی وا تێدا نیە، بەڵكو ماناو مەبەست پێی ئەوەیە كە بزانین كۆیلە لەلای خوای گەورە ڕێز و بەهای هەیەو نەوەك ستەمیان لێ بكرێت و مافیان پێ نەدرێت، بەڵكو بەهۆی لاوازیانەوە هیچ پەردەیەك نییە لە نێوان ئەوان خوای گەورەو خێرا وەلآمیان ئەداتەوە ئەگەر ستەمیان لێ بكرێت.

هەروەكو پێشەوا ئیبن حەزم دەفەرموێت: "وَرُبَّ عَبْدٍ جِلْفٍ خَيْرٌ مِنْ خَلِيفَةٍ قُرَشِيّ عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى"[2]

---

[1] قال الحافظ ابن الصلاح (رحمه الله تعالى): " النَّوْعُ الْعِشْرُونَ: مَعْرِفَةُ الْمُدْرَجِ فِي الْحَدِيثِ وَهُوَ أَقْسَامٌ: مِنْهَا: مَا أُدْرِجَ فِي حَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ كَلَامِ بَعْضِ رُوَاتِهِ، بِأَنْ يَذْكُرَ الصَّحَابِيُّ أَوْ مَنْ بَعْدَهُ عَقِيبَ مَا يَرْوِيهِ مِنَ الْحَدِيثِ كَلَامًا مِنْ عِنْدِ نَفْسِهِ، فَيَرْوِيَهُ مَنْ بَعْدَهُ مَوْصُولًا بِالْحَدِيثِ غَيْرَ فَاصِلٍ بَيْنَهُمَا بِذِكْرِ قَائِلِهِ، فَيَلْتَبِسَ الْأَمْرُ فِيهِ عَلَى مَنْ لَا يَعْلَمُ حَقِيقَةَ الْحَالِ، وَيَتَوَهَّمَ أَنَّ الْجَمِيعَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ."مقدمة ابن الصلاح، ت: نور الدين عتر، الناشر: دار الفكر– سوريا، دار الفكر المعاصر – بيروت، سنة النشر: ١٤٠٦هـ – ١٩٨٦م.

[2] المحلى بالآثار لابن حزم (٢٣٢/١٢)، دار الفكر –بيروت– بدون سنة النشر ورقم الطبعة.

واتە: چەند كۆیلەی بێ نەوا هەیە كە لای خوای گەورە زۆر بەرێزترە لە خەلیفەیەكی قورەیشی!

بەڵێ ئەوەیە ماف و بەهای كۆیلە لە ئیسلامداو هەر وتەیەك هەبێت و بكرێت لە هەر لایەكەوە ئەوا بێگومان ئیسلام لێی بەرییەو پێشەوا ئەبوهورەیرەش بەم وتەیەی تەواو ئەیسەلمێنێت كە هەموو لە یەك ئاستی كۆمەڵایەتی و ئاییدان و جیناییەتی لە ئیسلامدا نییە بەو مانایەی كە دوژمنانی ئیسلام وێنای دەكەن!

## فەرموودەیەكی تر

پاشان ئۆزۆن فەرموودەیەكی تر دێنێت: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا القَاسِمِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «مَنْ قَذَفَ مَمْلُوكَهُ، وَهُوَ بَرِيءٌ مِمَّا قَالَ، جُلِدَ يَوْمَ القِيَامَةِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ كَمَا قَالَ»[١].

واتە: هەركەسێك بوختان بكات بۆ كۆیلەكەی لەكاتێكدا ئەو پاكە لەو بوهتانە، ئەوا لە قیامەتدا شەلاقی لێ دەدرێت، مەگەر بەوشێوەیەبێت كە وتویەتی.

ئۆزۆن ڕەخنە دەگرێت و دەڵێت: "فەرموودەكە زۆر ڕوون و ئاشكرایە گەورەو ئاغای كۆیلە پێویست ناكات چوار شایەت بێنێت كاتێك كە كۆیلە یان كەنیزەكی خۆی تۆمەتبار دەكات و لەم دنیایەدا ئاغا سزای لەسەر نیە، بەڵكو تەنها لە قیامەتدا لە جیاتی ئەوەی بخرێتە دۆزەخەوە، تەنها بە چەند دارێك لێی دەرباز دەبێت، گەر قسەكەی درۆبوبێت، دەشزانین كە ئەم بوختانە بۆ بەندەكە دەشێت سزای مەرگ بەدوای خۆیدا بهێنێت، ئەمەش ئەوپەڕی لایەنگیری و پشتگیری ئاغاو گەورەكانەو لایەنگیری كۆمەڵایەتی و جیاكارییە لە نێوان سەروەر و كۆیلەدا." ع: ١٣٧، ك: ٢٤٠

---

[١] رواه البخاري ٨/١٧٥)، برقم: (٦٨٥٨).

دەڵێم: ئۆزۆن لەبری ئەوەی لەم فەرموودەیەوە ئەوە فێربوایە كە ئیسلام ئەوپەڕی ڕێزی لە كۆیلە گرتووەو ئەوپەڕی مافی پێداوەو باسی ئەوە كراوە ئەگەر كەسێك تۆمەتێك بداتە پاڵ كۆیلەكەی ئەوا لە قیامەتدا هەروا مافەكەی بەزایە ناچێت بەڵكو سزا هەیە بۆ ئەو كەسە، پاشان كێ دەڵێت لە دۆزەخدا سزا نادرێت و ئەو شەلاقانەی لێ نادرێت باشە چ شتێك وای لە ئۆزۆن كرد كە بڵێت ناچێتە دۆزەخەوە؟!

زۆربەی زانایان ڕایان وایە كە ئەگەر هات و گەورەیەك كۆیلەكەی خۆی تۆمەتبار بكات ئەوا لە دونیادا حوكمی لەسەر نیە، بەڵام ئۆزۆن وای تێگەیشتووە كە ئەمە جیاكاری و چینایەتیە، دەڵێم ئەمە ئەوپەڕی ڕێزو شكۆیە بۆ كۆیلەكان و ئەم حوكمە هاوتایە لەگەڵ هەمان حوكم ئەگەر هاتوو باوكێك كوڕەكەی خۆی تۆمەتبار كرد ئەوا لە دونیا حەددی لەسەر جێبەجێ ناكرێت!!

بەڵام من نەمدیوە بە تایبەت بەڵگەیەكی سەحیح(لە قورئاندا هیچ كە نەهاتووە) لە سوونەتدا سزا باسكرابێت بۆ باوكێك ئەگەر كوڕەكەی خۆی تۆمەتباركرد لە دوا ڕۆژدا چی لێ دەكرێت، بەڵام وا بە پێچەوانەوە بۆ كۆیلە بەڵگە هاتوەو باسی تۆڵە دەكرێت لەبری كۆیلەكە بۆ ئەوەی كەس نەتوانێت ستەمیان لێ بكات بە هیچ جۆرێك!!

باشە ئۆزۆن دەتوانێت بڵێ ئەمەی تریش چینایەتی و جیاكارییە لە نێوان كوڕ و باوكدا؟!

هەروەكو گۆستاڤ لۆبۆن وتی ئەوان وەكو ئەندامێكی خێزانەكەیان مامەڵەیان لەگەڵ كۆیلەدا كردوەو ئەوەتا زۆر بەڕوونی بەدیار دەكەوێت لە شیعرێكی سەعیدی كوڕی هاشمی خالیدی كە لە هەندێك ڕیوایەتیدا دەگاتە پانزە بەیت و بۆ كۆیلەكەی نووسیوەو لە سەرەتاكەیدا دەڵێت:

مَـــا هُـــوَ عَبْـــدٌ لَكِنَّـــهُ وَلَـــدٌ     خَوَّلنيـــهِ الْمُهَـــيْمِنُ الصَّـــمَدُ
وَشَـــدَّ أَزْرِيَ بِحُسْـــنِ صُـــحْبَتِهِ     فَهـــو يَـــدي والـــذّراعُ والعَضُـــدُ

وەكو بینیمان دەڵێت ئەو كۆیلە نیەو بەڵكو كوڕە و بەخشش و دیاری خوای گەورەیەو پشتی گرتووم و بەهێزی كردووم بە یاوەری باشی و هەر ئەوە بەڕاستی دەست و مەچەك و قۆڵی منە!!

بەڵێ هەندێك لە زانایان فەرموویانە لەبەر ئەوەی ئەو لە خوار پلەی گەورەكەیەوەیە بۆیە حەدی لێ نادرێت، بەڵام ئەم وتەیە هیچ جێگەی قەبوڵ نیەو زۆر دوورە لەگەڵ ڕۆحی ئەو دەقانەی پێشوو، بەهەمان شێوەش پێشەوا ئیبن حەزم زۆر بە توندی وەڵامی ئەو بۆچوونە دەداتەوەو چەندین بەڵگەی بەهێز دێنێتەوەو دەفەرموێت: وتەیەكی زۆر هیچە بوترێت كۆیلە لەخوار ئاستی گەورەكەیەوەیە، پاشان باسی ئەوەش دەكات كە جاری وا هەیە كۆیلەیەك لای خوای گەورە پلەی بەرزترە لە خەلیفەیەكی قورەیشی[1].

پاشان ئەوەی كە ئۆزۆن دەڵێت هەندێك جار ئەو بوختانە مەرگ بەدوای خۆیدا دێنێت، پێمان خۆشە ئۆزۆن ئەو ئەگەرە باس بكات و پێما بڵێت ئەوە چی كاتێكە بوختان بۆ كۆیلەو قەزفكردنی بە تاوانێك مەرگ بەدوای خۆیدا دێنێت؟ هێندەی من بزانم بێجگە لە(قصاص) و(ڕیدە) هیچ حاڵەتێكمان نییە كە كۆیلەی تێدا بكوژرێت و ڕەجمیش شمولی ئەوان ناكات نەوەك وەها گومانێك بەرن، جا داوامان لە ئۆزۆن و هاوەڵانیەتی ڕوونكردنەوە بدەن!

پاشان ڕەخنە لەوە دەگرێت كە فەرموودەیەك هەیە باس لەوە دەكات كە كۆمەڵێك لە نەوەی ئیسرائیل(جولەك) بوون بە مشك و مەسخكراون[2].

---

[1] ئەمەشم وەك ئەوە هێنا كە پێویستە ئێمە ئەمین بین و هەڵەی هیچ كەس نەخەینە سەر شانی ئیسلام، كاتێك زانایەك بۆچوونێكی هەیە ماڵ نیە بەسەر ئیسلامەوەو پێویستە بەیان بكرێت بەڵام بە زانست و بە ئەدەبەوە نەوەك دەرگا بكرێتەوە بۆ هەموو كەس!!

[2] ع:١٣٧ـ١٣٨، ك: ٢٤٢ـ٢٤٣

**دەڵێم:** ئەمە ڕەتکردنەوەی قورئانی پیرۆزیشە ئەگەر بێت و ئەو بڕوای بە خودی مەسخ نەبێت ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعۡتَدَوۡاْ مِنكُمۡ فِي ٱلسَّبۡتِ فَقُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ۝٦٥ ﴾البقرة

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا عَتَوۡاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنۡهُ قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ۝١٦٦﴾الأعراف

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلۡ هَلۡ أُنَبِّئُكُم بِشَرّٖ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيۡهِ وَجَعَلَ مِنۡهُمُ ٱلۡقِرَدَةَ وَٱلۡخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَۚ أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ۝٦٠﴾المائدة

## كۆمەلێك فەرموودەی دژ بەیەك!

سەرەڕای ئەوەی كە ئۆزۆن ئەو گشتە باسەی هێنا كە هیچیان پەیوەندی بە ناونیشانەكەیەوە نەبوو كە بریتیبوو لە دژیەكی لە ناو فەرموودەكاندا، بەلاّم وا ئێستا دێتە سەر باسی ئەوەو لەلای ئەو دەكاتە فەرموودەی پێنجەم:

فەرموودەیەكی سەحیحی بوخاری دێنێت كە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لەخوای گەورەوە دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: لەبەهەشتدا شتانێكم ئامادەكردووە بۆ بەندەكانم نە چاو دیویەتی و نە گوێ بیستویەتی و نە بەخەیاڵ و دلّە خورپەی كەسیشدا هاتووە. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ اللَّهُ «أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ»[1].

پاشان ئۆزۆن ڕەخنە دەگرێت بە هێنانی فەرموودەیەكی ترو دەیەوێت وەها نیشان بدات كە وتەی ئەبو هورەیرەیەو دەلێت: "پاشان ئەبو هورەیرە وتەكەی خۆی هەلّدەوەشێنێتەوەوەو باس لە دارێك دەكات لە بەهەشتدا كە سوارێك بە سەد ساڵ سێبەرەكەی نابڕێت.

هەروەها بە پێی گێڕانەوەی ئەو نێوان مالّی پێغەمبەر(د.خ) و مینبەرەكەی باخێكە لە باخەكانی بەهەشت." ع: ١٣٨، ك: ٢٤٣ـ٢٤٤

مەبەستی ئەوەیە باشە كەس شتەكانی بەهەشتی نەبینیوەو بەگوێش نەیبیستوەو بە خەیالّیشیا نەهاتووە، چۆن باسی ئەو دارە كراوە، یان چۆن باسی ئەوە دەكرێت نێوان مالّ و مینبەرەكەی باخێكە لە باخەكانی بەهەشت و ئەبینرێت؟

[1] رواه البخاري (٤/١١٨)، برقم: (٣٢٤٤).

دەڵێم: دەكرێت وەڵامی ئۆزۆن بە دوو شێوە بدەینەوەو پێی بڵێین كە ئەو فەرموودەیە لەگەڵ ئەو هەواڵانەدا هیچ ناكۆكی و دژیەكیەكیان تێدا نیە، بەڵكو كێشەكە ئاستی ماریفیتانە:

١ – ئەوەی كە لەبەهەشتدا دانراوە كەس ئەسڵەكەی نازانێت چۆنەو ناشتوانێت بە خەیاڵ پەی پێ بەرێت، لەبەر ئەوەی دوو ژیانی جیاوازن سەرتاپا، بۆیە دەبێت هەموو شتەكانیشیان جیاوازبن، ئەگینا لە قورئانیشدا هاتووە كە ترێی تێدایەو هەناری تێدایەو ... بەڵام تەنها ناوەكەیان یەكێكەو هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت وێنای بكات یان پەی بە حەقیقەتەكەی ببات، ئەمە سەرەڕای ئەوە لە قورئانیشدا ئەم فەرموودەیە پشتڕاستكراوەتەوەو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٧ ﴾السجدة

باشە تۆ بڵێیت ئۆزۆن ئەو ئایەتەش ڕەت بكاتەوە بەو بیانوەی لە قورئاندا باسی حۆری و میوەو ... هتد، كراوە؟! وا لەم ئایەتەی تریش باسی ئەوە هاتووە كە شتانێكی تێدایە هیچ كەسێك نایزانێت؟ ئەگەر ڕەتی كردەوە ئەوا ئەوپەڕی نەزانیەو باسمان كرد تەنها ناو هێنانی بەس نییە و پێوانەكان لە ژیانی ئێستاو ئەولادا گۆڕاوە هەروەكو چۆن كات لێرەو لەوێدا گۆڕاوە، ئەگەر ڕەتیشی نەكردەوە ئەوا دەڵێین هەمان وەڵام بەسە بۆ ئەو دوو فەرموودەیەش!

٢ – ئەگەر هەموو باس و خواس و چۆنیەتی ئەو دارەش بهاتایە ئەوا هیچ گرفتێك ڕووی نەدەدا، چونكە هێشتا زۆر شت ماوە كە نەزانراوەو نازانرێت لە بەهەشتدا، بۆ نموونە ئەگەر بێت و من بڵێم كۆمەڵێك شتم هەیە هەرگیز نەتدیوەو وێنەكەشیت نەبینیوەو بۆشت باس نەكراوە، پاشان خۆم باسی هەندێكیانت بۆ بكەم ئایا ئەوە پێی ئەوترێت دژیەكی یاخود من مەبەستم پێی ئەوكاتەبوو كە پێم نەوتبویت و وا خۆم پێم وتیت و هەواڵی هەندێكیانم پێت دا، بەڵام ئەو بڕەی كە پێم وتووی نەفی ئەوەی تر ناكات كە ماوەو وا هێشتاش هەندێكی ترم لایە كە نە نیشانم داویت و نە پێشم وتوویت، كەواتە تۆ نە دەیانبینیت و نە دەیانبیستی!!

جا ئەمە تەنها نمونەیەكی دنیایی سادەبوو ئەگەر ئۆزۆن و هاوبیرانیشی بیانەوێ زیاتریان پێ دەڵێین بە ویستی خوای گەورە.

جا بۆیە كاتێك باسی ئەو دارە كراوە، ئێمە تەنها گەورەییەكەیمان بۆ باسكراوەو تەواوی شێوازەكەی نازانین، هەروەها بوونی زانستیشمان بە هەموو حەقیقەتەكەی فەرموودەكە ڕەت ناكاتەوە چونكە بەهەشت چەندین شتی تری تێدایە كە باس نەكراوە!

سەبارەت بەو فەرموودەیەشی كە باسی نێوان ماڵ و مینبەری پێغەمبەری خۆشەویست دەكات، مانای وا نییە كە ئەوە ڕێك باخێكی بەهەشتە، بەڵكو مەبەست پێی بەرەكەتی ئەو شوێنەو پەرستشكردنە تێیدا كە دەتگەیەنێتە بەهەشت، ئیتر نازانم كێ هەیە لە غەیری ئەم تەفسیرە تەفسیرێكی تری بۆ بكات؟!

پاشان ئۆزۆن بە شێوەیەكی تر دێتە پێش و ڕەتی كەرامات دەكاتەوەو ئەیەوێ كەرامات و موعجیزە تێكەڵ بكات و ئەم فەرموودەیە دێنێت كە دەكاتە فەرموودەی شەشەم:

پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) باسی ئەوە دەفەرموێت كە سێ كەس بە منداڵی قسەیان كردووە، یەكێكیان پێغەمبەر عیسا(عليه السلام) و دانەیەكی تر جورەیج و یەكێكی تریشیان بریتی بووە لە منداڵێكی بەنی ئیسرائیل[1].

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: بەپێی ئەبو هورەیرە دوو موعجیزەی تر سەرباری قسەكردنی عیسا دەكات كە لە قورئاندا هاتووە...لێرەدا ڕاڤەی فەرموودەكە بەو شێوەی كە لە سەرچاوەكاندا هاتووە دەخەینە ڕوو بۆ ئەوەی بزانین كە موعجیزە تەنها بۆ پێغەمبەران نیەو دەرگاكەی هەمیشە كراوەیە بۆ پیاوچاكان و ئەولیا ئەگەرچی پێچەوانەی زانستیش بێت"

ع: ١٤٠، ك: ٢٤٧

دەڵێم: بەڕاستی خیانەت لەدوای خیانەت و چەواشە لەدوای چەواشەو نەزانی لەدوای نەزانی لەم كتێبەدا بەرجەستەیە، ئەگینا هەموو دەزانین موعجیزە هی پێغەمبەرانەو كەراماتیش خوای گەورە لەسەر دەستی پیاوچاكان دەری خستوەو دەری دەخات و

[1] رواه البخاري (٤/١٦٥)، برقم: (٣٤٣٦).

شتێكیش نییە كە مسوڵمانان ڕەتیان كردبێتەوە بێجگە لە موعتەزیلەو هەندێكی تر لەوانەی كە كاریگەری ئەوانیان لەسەرە، باشە قسەكردن بە منداڵی گەورەترە یاخود ئەو خەوە دوورو درێژەی ئەسحابولكەهف كە لە قورئاندا باسكراوە؟ قسەكردنی منداڵێك گەورەیە یاخود بوونی منداڵ لەلایەن مەریەمەوە بەبێ باوك؟ یاخود چەندین نمونەی تر كە هەموومان دەیانزانین، بەڵام كەسێكی مادیگەرای وەكو ئۆزۆن ئەم شتانە ناچێتە عەقڵیەوە چونكە گەزراوە بە خەیاڵاتی پوتی فەلاسیفەی ڕۆژئاوا كە هیچ بەهایەكی مرۆڤ بوونیان نەهێشتەوە!!

هەروەها بۆ ئەوەشی كە ئۆزۆن دەیەوێت كەرامات و موعجیزە بخەینە ژێر حوكمی زانستی سەردەمەوە، باشە مەگەر زانستی مرۆڤ لەوەو پێش باسمان نەكرد كە لەوپەڕی سنووردارییدایەو ناتوانێت پەی بە زۆر شت بەرێت؟

هەروەها بابەتی موعجیزەو كەراماتیش لە غەیبەوەیەو ئەودیوی زانستەو زانستیش ئەگەر ئۆزۆن مەبەستی زانستی تەجریبیە ئەوا هەرگیز نە پەی پێ دەبات و نە دەتوانێ باسی لێوە بكات، مەگەر تەنها شوێنەوارێك جێ بهێڵێت و لەسەر ئەو شوێنەوارە قسە بكات، جا ئەگەر بەم بیانووە كەرامات ڕەت دەكاتەوە ئەوا زەنگێكی تەواو ڕوونیشە بۆ ئەو موعجیزانەی كە لە قورئاندا هاتوون و بابەتی قسە كردنی منداڵێش كە لەم فەرموودەیەدا هەیە ئەگەر بە پێی وتەی ئۆزۆن بێت: ئەگەر زانست پشتڕاستی كردوەتەوەو دەكاتەوە ئەوا بڕوامان پێی هەیەو ئەگەر ڕەتیشی كردوەتەوە كەی كێشەیە ئەو ئایەتەی قورئانیش ڕەت بكرێتەوە، كە باسی قسەكردنی پێغەمبەر عیسایە، بەڕاستی هەر ئەمەیە ئۆزۆن ئەیەوێ پێی بگات لە تەواوی كتێبەكەی نەوەك تانەدان لە پێشەوا بوخاری بەتەنها!!

پاشان ئۆزۆن فەرموودەی ئیسراو میعراج دێنێت كە ژمارەیەكی زۆر لاپەڕەی بۆ تەرخان كردووە و هەوڵێكی زۆر دەدات و خۆی ماندوو دەكات كە گوایە دژیەكی تێدایەو، ئەویش تەنها لەوە بەدەر نییە كە لە ناوی پێغەمبەرەكاندا پاش و پێش هەیە بە گوێرەی بینینی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بۆیان، ئەمەش هیچ لە بابەتەكە ناگۆڕێت كامیان لە پێش كامیانەوە هاتبێت، چونكە فەرموودەكە بە مانا گێڕدراوەتەوەو ئاساییە كە لە

چیرۆكێكی درێژدا هەندێكی پێش هەندێكیانی بكەوێت، بەلاّم با ئۆزۆن بێت و جیاوازیەكی جەوهەری یاخود دژیەكیەكمان بۆ بێنێت كە هەرگیز ناتوانێت شتی وا بكات و پێی ناكرێت ئەگینا وەها رەخنەیەكی نەدەگرت[1].

پاشان ئەوپەڕی بیٚ ڕێزی و بیٚ ئەدەبی دەكات و ئەوەی كە شیاو نییە لـە دەقەكە وەرگیرێت و ناگونجێت هەولّی بۆ دەدات و دەلّیٚ: " مووسا ژمارەی نوێژەكان بۆ خودای تاك و تەنهاو(ئاگادار لـە هەموو شتێك) ڕاست دەكاتەوە" ع: ١٤٣، ك: ٢٥٤

**دەلّێم:** ئەم وتەیە تەنها بەسەر زاری كەسێكی سنوور بەزێندا دێت و وەها خەیالّێكیش تەنها هەر شیاوی ئەوەو هەر ئەویش دەزانێت تەفسیری وەها بكات و گویٚ نەدات بەوەی كە بەرامبەر كیٚ قسە دەكات!

ئەوەی لـەو چیرۆكەدا هەیە كە خوای گەورە(ﷻ) لـەسەرەتاوە پەنجا ڕكات نوێژی فەرموو بە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) خۆی هەر عیلمی بەوە هەبوو كە كەمی دەكاتەوە پێش ئەوەی پێغەمبەر موسا(عليه السلام) لـە دایك ببێت.

بەلاّم ئەم چیرۆكە گەورەترین وانەی لێوە فێر دەبین كە شەریعەت بەگوێرەی توانای ئێمە دانراوەو شتێكی تێدا نییە ئێمە توانای ئەنجامدانیمان نەبێت بە تێكرا، هەروەها لـە لایەكی تریشەوە بەزەیی خوای گەورە بە بەندەكانی و دانانی جۆرەهای ئاسانكاریی لـەسەریان، هەروەها لـەلایەكی تریشەوە بەزەیی پێغەمبەران(عليهم السلام) بۆ ئومەتانی تریش بێجگە لـە ئومەتی خۆیان، ئەوەتا پێغەمبەر موسا(عليه السلام) كاتێك بینی كە بەنی ئیسرائیل كەمتەرخەم بوون لـە پەرستش و گوێرایەلّی خوای گەورە ترسا لـەوەی ئومەتی پێغەمبەری خوا محمدیش(ﷺ) بە هەمان شێوەیان بەسەر بێت و بۆیان جێبەجیٚ نەكرێت، بۆیە بەزەیی خۆیی نیشانداو فەرمووی بە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بگەڕێوە لای خوای گەورەو داوای كەمكردنەوەی لێبكە بە چەند جارێك تاوەكو بوو بە پێنج ڕكات، ئەمەی كە ڕوویداوە تەنها بۆ ئەوەی كەسانی وەكو ئۆزۆن كە سادەن لـە ڕەحم و بەزەیی و تەدەڕوجی

---

[1] ع:١٤٣، ك: ٢٥٣-٢٥٤

شەریعەت تێبگەن، بەڵام هەر لە خودی ئەو دەقانەدا كێشەیان بۆ درووست دەبێت كە بۆ خۆیان هاتووە!

بەڕاستی ئەگەر لە تەواوی چیرۆكەكە ورد ببینەوە زۆر شتمان بۆ ڕوون دەبێتەوەو تەنها یەك خاڵی تر باس دەكەین و دەیكەینە كۆتایی باسەكە، ئەویش ئەوەیە دڵسۆزی لە ڕادەبەدەری پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بۆ ئوممەتەكەی لە كاتێكدا چەندین جار ئەچێتەوە لای خوای گەورەو داوای كەمكردنەوەی لیّ دەكات سەرەڕای قورسی وتەو بڕگەكان لەو مەقامەدا كە لەبەرامبەر خوای گەورەو ڕووەو ئەوبێت وتەكان و داوای كەمكردنەوەی لیّ بكرێت بۆ چەند جارێك، بەڕاستی تەنها كەسانێك لەوە تێدەگەن كە خوای گەورە وەكو خۆی بناسن و بەگەورەی ڕاگرن!!

پاشان ئۆززۆن دەڵێت: "ئەگەر موسا دەخالەتی نەكردایەو نوێژەكانی ڕاست نەكردایەتەوە كام لە ئێمە دەرفەتی هەبوو لە ڕۆژێكدا پەنجا ڕكات نوێژ بكات" ع: ١٤٣، ك: ٢٥٥

دەڵێم: ئەم وتەیەی ئۆززۆن یانی چی "ئەگەر پێغەمبەر موسا دەخالەتی نەكردایە.." لە گریمانەیەك زیاتر نیەو بەتەنها لای ئۆززۆنو هاوشێوەكانی نرخی هەیە، پێغەمبەر موسا(عليه السلام) هات و دڵسۆزی خۆشی نیشانداو خوای گەورە ئەوی كردبووە هۆكاری كەمكردنەوەو لە زانستی خوای گەورە ئەوە هەبوو كە نوێژ كەمدەكرێتەوەو ئەو چیرۆكەشی كە باسی لێوەكرا ئەبێتە هۆكاری، ئیتر یانی چی ئەگەر پێغەمبەر موسا نەبوایە كیّ بۆی دەكرا؟! وەكو ئەوە وایە كەسێك بێت ڕەخنە بگرێت لە خوای گەورەو بڵێت: باشە ئەگەر خوای گەورە پێغەمبەرانی نەناردایە ئێمە چۆن ڕێگەی خۆمان بدۆزیبایەتەوە؟! ئەمە دوای ئەوەی كە خوای گەورە زیاتر لە سەد هەزار پێغەمبەری ناردووە!!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە وشەیەكی تری ناشرین لە زاری ئۆززۆن هاتوتە دەرەوە كە دەڵیّ پێغەمبەر موسا ڕاستینەكردایەتەوە، كە ئەمەش ئەوپەڕی بیّ ئەدەبیە بەرامبەر زاتی پاكی خوای گەورە!!

هەروەها ئۆزۆن تەواو پەردەی لەسەر خۆی هەڵماڵی و سەرەڕای خیانەتەكانی باس لە سستی ولاوازی خۆشی دەكات لەمەڕ پەرستش و دەڵێت كام لە ئێمە ڕۆژی پەنجا نوێژی بۆ دەكرێت، لە كاتێكدا خواناسان و بەندە ڕاساڵەكانی خوای گەورە ڕۆژانە زۆر زیاتریان لەوە كردوەو بەڵكو زۆرێكیان تەنها دوو ڕكاتی شەونوێژەكەیان چوەتە سەرووی سەد ڕكات نوێژی بەپەلەی ئێمەوە كە خۆشمان نازانین چی دەڵێین، لۆمەی ئۆزۆن مەكەن چونكە ئەو بڕوای بەوە نییە هاوەڵان كەسانی وەكو عبداللە ی كوڕی زوبەریریان تێدابووە، خەڵكی وەكو عوروەیان تێدابوە، تەنانەت لە نوێژدا قاچی دەبڕنەوەو بەخۆی نازانێت، چونكە هێندە ئاگای لە نوێژەكەی بووەو دڵی بەخوای گەورەوە پەیوەست بووە، بەڵێ ئەوان نوێژیان لە هەموو شتێك لەلا شیرینتربووەو ئەو بڕوای بەو مێژووە گەشە نیە.

ئەو ڕەخنە لە پێشەوا بوخاری دەگرێت لە كاتێكدا هیچ فەرموودەیەكی نەنووسیوتەوە ئیلا دوای دوو ڕكات نوێژ نەبێت، ئەو لە نوێژدا چەندین زەردەواڵە پێوەی دەدات بەڵام نوێژەكەی نابڕێت!

منیش هاوڕام و دەڵێم ئەوە زۆر قورسە لەسەر كەسێك ئەوە حاڵی بێت، واز لە سوننەت و ڕێبازی هاوەڵان و پیاوچاكان بهێنێت‌و ڕۆژئاوا سەرمەشقی بێت‌و لەسەر سوننەت و ڕێبازی ئەوان بڕوات!!

## فەرموودەی شەفاعەت!

ئۆزۆن ئەم فەرموودە دووروودرێژە دێنێت كە باس لەوە دەكات كە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) شەفاعەت دەكات و چەند ڕەخنەیەك دەگرێت[1]:

١ – ئەم فەرموودەیە ئەوەی تێدایە كە پێغەمبەر سەرداری هەموو مرۆڤە، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا كە دەڵێ موسا یەكەم كەس زیندوو دەكرێتەوە، یان دەڵێ یونسی كوڕی مەتا باشترینی خەڵكە.

**دەڵێم:** هیچ گومانێك لەوەدا نییە كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) باشترینی پێغەمبەرانەو هەموو ئوممەت لەسەر ئەوە كۆكن و بەدەقی قورئانیش خوای گەورە لە چەندین ئایەتدا باسی ئەوەی فەرمووە فەزڵی هەندێكیانی داوە بەسەر هەندێكی تریاندا، هەروەكو دەفەرموێت:

﴿ * تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ ۖ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ ۚ ﴿٢٥٣﴾﴾البقرة

بەڵام ئەوەی كە دەفەرموێت پێغەمبەر موسا یەكەم كەسە بەخەبەردێت چی بەڵگەیەكی تێدایە بۆ ئەوەی كە باشترینی خەڵك بێت؟ باشە خۆ ئادەم(عليه السلام) یەكەم كەسە دروستكراوە، دەكرێت كەسێك یەكەم كەسبوو لە شتێكدا ئیتر باشترینی خەڵكی بێت؟!

ئەوەشی كە هاتووە لە بارەی پێغەمبەر یونسەوە(عليه السلام) مەبەست پێی باشترین كەسی سەردەمی خۆیبووە، هەروەكو لە قورئانیشدا باسی ئەوە دەكات كە خوای گەورە فەزڵی بەنی ئیسرائیلی داوە بەسەر هەموو گەلاندا دواتریش باسی ئەوە دەفەرموێت كە ئوممەتی پێغەمبەر محمد(ﷺ) باشترینی ئوممەتانە، ماناكەی بەو شێوەیە كە نەوەی ئیسرائیل لەكاتی خۆیدا باشترینی خەڵكبوون بەڵام خوای گەورە لێی سەندنەوە چونكە شیاوی ئەوە نەبوون، بەڵام هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) باشترینی خەڵك بوون تاوەكو لە دنیادابوون و هەر بەو شێوەیە مانەوە.

---

[1] ع:١٤٥، ك:٢٦١

جا پێغەمبەر یونس(عليه السلام) هەر بەو باشیە مایەوەو باشترینی كەسی سەردەمی خۆییوو، بەلاّم ئەم باشێتیە(كە لە هەموو كەس باشتربێت) سنووردارەو تەنها بۆ سەردەمی خۆیەتی.

٢ –دەلێت: "هەروەها فەرموودەكە باسی ئەوە دەكات، كە خوا لە ئادەم تورەیە، لەبەر ئەوەی لە بەهەشتدا بەگوێی نەكردووە. لە موسا تورەیە چونكە كەسێكی كوشتووە، بەلاّم تورەیی لە عیسای كوڕی مەریەم بێ هۆیە؟ تەنها تورەیەو تەواو؟ " ع: ١٤٥، ك: ٢٦١

دەڵێم: بێ شەرمی و خیانەت لای ئۆزۆن زۆری تێپەڕاند و ئێستە لامان ئاساییە كە شت بداتە پاڵ فەرموودەكەو تێیدا نەبێت، بەڵكو ئەوەی لە فەرموودەكەدا هاتووە تەنها ئەمەیە لە گشت ئەو پێغەمبەرانەوە: (إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ)[1].

واتە: پەروەردگارم تووڕەبووە ئەمڕۆ بە تووڕەبونێك كە هەرگیز وا تورە نەبوەو وەهاش تووڕە نابێت.

بەڵێ ئەوەی كە هاتووە هیچیان نافەرموون خوای گەورە لە ئێمە تووڕەیەو هیچ بەڵگەیەكیش لەسەر ئەوە نەهاتووە، بەڵكو تورەیی و خەشمی خوای گەورە بۆ ئەو تاغوت و ملهوڕانەی دونیایە لەوان تووڕەیە، هەروەكو خوای گەورە خۆی دەفەرموێت لە چەندین ئایەتی قورئاندا: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ ١٦ ﴾الشورى

هەروەها خوای گەورە باسی ترسناكی دیمەنی ئەو ڕۆژەمان بۆ دەفەرموێت: ﴿ يَوۡمَ هُم بَٰرِزُونَۖ لَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنۡهُمۡ شَيۡءٞۚ لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَۖ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ١٦ ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ١٧ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ

[1] رواه البخاري (٦/٨٤)، برقم: (٤٧١٢).

ٱلۡأٓزِفَةِ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ غافر

خوای گەورە لە ترسناكی ئەو ڕۆژەو ناڕەحەتیەكانی بمانپارێزێت، بەڕاستی ئەو ناڕەحەتیە وای لەو پێغەمبەرانە كردووە بترسن لە تەنها تاوانێك كە كردوویانە، یاخود پێغەمبەر ئیبراهیم(ﷺ) لەوسێ درۆیەی كە كردویەتی[١]، هەروەها پێغەمبەر عیسا(ﷺ) ئەترسێت لە تاوانێك كە نەیكردووە، چونكە شوێنكەوتوانی تاوانێكی زۆر گەورەیان ئەنجامداوەو ئەویش شەرم دەكات لە بارەگای خوای گەورە بێتە گۆ، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ المائدة

ئەمەیە هۆكاری سەرەكی، لەبری ئەوەی ئۆزۆن پەندی لێوەرگرێت و بەخۆدا بچێتەوەو ترسی ئەو ڕۆژە دایچڵەكێنێت بەڵام خەریكی چەواشەكارییە، پەنا بەخوای گەورە لە ڕەقبوونی دڵ و كارنەكردنی ژیری!

دوابەدوای ئەمە دیسانەوە ئۆزۆن بەبیانووی ئەوەی كە هەندێك فەرموودە لەگەڵ زەوقی سەلیم و بەهای بەرزی مرۆڤدا ناگونجێن دەست دەكاتەوە بە تانەدان و قسەی بەرزو نزم و ئەمجارەیان هەندێكی تر فەرموودە دێنێت و قسەیان لەبارەوە دەكات.

[١] لە زنجیرەی نەیارانی سوننەت بە وردی باسی ئەو سێ درۆیەمان كردووە كە تەنها لە زمانەوانی پێی دەوترێت درۆو لێی دواوین بە وردی، لە باسی (فەرموودەگەلێك پێچەوانەی قورئانە)!!

فەرموودەی نۆیەم:

عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ، وَأَبَا سَعِيدٍ حَدَّثَاهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى نُخَامَةً فِي جِدَارِ المَسْجِدِ، فَتَنَاوَلَ حَصَاةً فَحَكَّهَا، فَقَالَ: «إِذَا تَنَخَّمَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَخَّمَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ، وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ، أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ اليُسْرَى»[1].

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڵغەمێكی بینی بە دیواری مزگەوتەوە، چەوێكی هەڵگرت و كڕاندی و پاشان فەرمووی: ئەگەر كەسێكتان بەڵغەمی كرد با ڕووەو پێشی خۆی نەیكات و ڕووەو ڕاستیش نەیكات، یان بیكاتە لای چەپیەوە یاخود بیخاتە ژێر قاچی چەپیەوە.

لەسەرەتاوە ئۆزۆن مەبەستیەتی ئەگەر عەیبەیەك هەبوو ئەبوهورەیرەی(رضي الله عنه) پێ ناشرین بكات ئەگینا ئەوەتانێ هەر بەو سەنەدە دوو هاوەڵ گێڕاویانەتەوە بەڵام ئۆزۆن بە ئەنقەست ناوی ئەبو سەعیدی(رضي الله عنه) لاداوەو تەنها ئەبو هورەیرەی هێشتوەتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر شتێك لە ئارادابێت تەنها ئەبوهورەیرەی پێ ناشرین بكات(لە كاتێكدا ئەمەشی بۆ ناچێتە سەر)، ئەمە لە كاتێكدا هەر پێشەوا بوخاری لە زۆرێكی تر لە هاوەڵانی وەكو ئەنەس و دایكی ئیمانداران و... دەگێڕێتەوە!!

پاشان ئۆزۆن دەڵێت: "ئەم فەرموودەیە ئەوە دەردەخات كە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگە دەدات تف و بەڵغەم بكرێتە ناو مزگەوت" ع: ١٤٦، ك: ٢٦٢

دەڵێم: ئەمە وتەی گێرفانی خۆیەتی ئەگینا پێغەمبەری خۆشەویس(ﷺ) بەو ڕەهاییە نەیفەرموەو بەڵكو ئەوە تەنها بۆ كاتی پێویستە بۆ نموونە كەسێك لە نوێژدابێت كە نوێژەكەی نابڕێت و ناچارە بەڵغەمێكی تووشهات بكات(كە چارێكی نیەو زۆری بۆ هاتووە)، ئەگینا فەرموودەی سەریح هەیە لەوبارەیەوەو دەفەرموێت: «الْبُزَاقُ فِي المَسْجِدِ خَطِيئَةٌ وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا»[2].

---

[1] رواه البخاري (١/٩٠) برقم: (٤٠٨).

[2] رواه مسلم (١/٩١) برقم: (٤١٥).

واتە: تفكردن لەناو مزگەوت تاوانەو كەفارەتەكەشی شاردنەوەو لادانیەتی.

پاشان ئۆزۆن دەست دەكات بە وتەی نابەجێ و پرسیاری بێ ماناو سەفسەتەو دەڵێت: "باشە زانایانی بەڕێز چی دەڵێن بۆ ئەمڕۆ ئایا تف بكرێتە سەر ئەو هەموو فەرشانەی لە ناو مزگەوتدایە؟ ئایا ئەگەر كرا دواتر بەو ئامێرە پێشكەوتووانە پاكبكرێتەوە یان بە چەو؟ هەموو ئەمانە ئەوە دەردەخەن كە ئەم فەرموودانە بەسەر كەسانێكدا جێبەجێ دەبن كە ژێریان چەوەو پەلی خورما سەقفیانەو دیوارەكانیشیان قوڕ" ع: ١٤٦، ك: ٢٦٣

دەڵێم: ئەمە تەنها مشاغبی و شەڕكردنە لەگەڵ دەقەكاندا بەبێ هۆكار ئەگینا هەموو كەسێك دەزانێت ئەوەی لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێت ئەوەیە كە لە كاتی پێویستیدا لەنوێژدا دەتوانیت تف بكەیت، بەڵام ئێستا مادام فەرش ڕاخراوە پێویستە بكرێتە ناو كلێنسكێك یاخود پارچە پەڕۆیەك، ئیتر ئەم ژاوە ژاوە چیە؟!

پاشان پێشەوا بوخاری تۆمەتبار دەكات بەوەی كە لەدوای ئەوەی كە مزگەوتەكان ڕاخەریان تێدابووەو ئەو لەسەردەمی عەبباسیەكاندا ژیاوە، نەدەبوو ئەو فەرموودەیە بگێڕێتەوە.

دەڵێم: ئەگەر كەسێك ناوی كتێبەكەی پێشەوا بوخاری بزانێت ئیتر وەها وتەیەكی بێ مانا لەزاری نایەتە دەرەوە!

خۆشەویستانم، پێشەوای فەرموودەناسان بوخاری كتێبەكەی ناوناوە: (الجامعُ المسندُ الصَّحيحُ الُمختصَرُ مِنْ أمورِ رَسُولِ اللهِ صلّى اللهُ عليه وسلّم وَسُنَنِهِ وَأَيَّامِهِ)

لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت پێشەوا بوخاری هەرشتێك بە ڕاست و دروستی لە كاروباری پێغەمبەری خواوە(ﷺ) هاتبێت هەر لە سوننەت و ژیانی ڕۆژانەی ئەوا باسی كردووەو هێناویەتی، بڕگەی(وَأَيَّامِهِ) زۆر ئاماژەیەكی ڕوونەو پێویستی بە هیچ ڕاڤەیەك نیە، بەڵام ئەمەوێت ئەوە بڵێم: ئەم فەرموودەیە سەرەڕای شەرعیەتی تفكردن بۆ پێویستی ئەوەشی تێدایە كە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) خۆی بەڵغەمەكە لادەبات و پاكی دەكاتەوە، كە نە ڕاگەیاندن هەبوە تاوەكو نان و پیازی پێوە بخوات وەكو كاربەدەستە دووڕوەكانی ئەمڕۆو لەسەرووی هەموشیانەوە ئەوانەی ڕۆژئاوا، جا ئەگەر ئەمە سەرۆكی

وڵاتێكی زلهێزبوایە هەموو كامێراكان بەشوێنیەوەبوون و وێنەیان دەگرت، بەڵام ئەوەی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئۆزۆن بەنیازە بیكاتە تانە بەسەریەوە!!

**فەرموودەی دەیەم:**

پاشان ئۆزۆن دێت و باسی فەرموودەی مێشەكەمان بۆ دەكات و ڕەخنە دەگرێت.

**دەڵێم:** لەوەو پێش وەڵامی ئەممان دایەوەو پێویست ناكات جارێكی تر بگەڕێینەوە سەری، بەڵام ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێ بكەم، دوو وتەی ئۆزۆنە.

یەكەمیان: وشەی(الذُّباب) ئۆزۆن بە جەمع تێگەیشتووە، چونكە لە ڕاڤەو لێكدانەوەكەیدا دەڵێت: "ئەم فەرموودەیە باس لەوە دەكات دەكرێ چەن مێشێك بچنە ناو شلەو خۆراكەوە..." ع: ١٤٧، ك: ٢٦٥

ڕەخنە لە "سِيبَوَيْه" دەگرێت بەڵام تاوەكو ئێستاش جیاوازی ناكات لە نێوان مفرد و جەمع، كە سەرەتایی ترین بابەتی زمانی عەرەبیەو، زانایانی زمانەوانی لە دێر زەمان باسی ئەوەیان كردووە هەروەكو پێشەوای زمان خەلیلی فەراهیدی دەفەرموێت: " وَيُجْمَعُ الذُّبَابُ عَلَى أَذِبَّةٍ، فِإنْ كَثُرَ فَهُوَ الذِّبَّانُ "[1].

واتە: (لذُّبَابُ) لەسەر(أَذِبَّةٍ) كۆدەكرێتەوە، ئەگەر بێت و زۆربێت ئەوا دەبێتە(الذِّبّانُ).

هەروەها خوای گەورە لە مەقامی تەحەددای ئەوانەی كە هاوار لە غەیری خۆی دەكەن دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ٧٣﴾الحج

سەیركەن و ورد ببنەوە خوای گەورە دەفەرموێت ناتوانن مێشێك دروست بكەن ئەگەر هەموویان كۆببنەوە پێكەوە، مادام لێرە مەقامەكە مەقامی تەحەدداو بچوككردنەوەی

---

[1] العين للخليل بن أحمد الفراهيدي (١٧٨/٨)، معجم مقاييس اللغة لابن فارس (٣٤٨/٢)، المحكم والمحيط الأعظم لابن سيده (٥٥/١٠).

ئەوانە ئەبێت تاكە میشێك بەكاربێت نەوەك كۆمەڵێك مێش، بەڵام ئەوەی جێی داخە بانگەشەی بەرگریكردن لە قورئان دەكات و هیچی لیٚ نازانێت، هەروەها ڕەخنە لە گەورەترین زانای زمانەوانی دەگرێت بەخەونی حوشتریی خۆی بەلاٚم شارەزایی بە سەرتایی ترینی بابەتەكانی نیە[1].

دووەم: ئەوەیە ئۆزۆن دەڵێت "یەكێك باسی ئەوەی دەكرد كە ئەم فەرموودەیە زانست پشتڕاستی كردوەتەوەو لە ڕۆژنامەیەكی ولاٚتی چیندا هاتووە(ناوی ڕۆژنامەكە نابات)" ع: ١٤٦، ك: ٢٦٤

دەڵێم: سەیركەن و ورد ببنەوە چۆن ئۆزۆن ئەو بەشەی خستوەتە ناو كەوانەوە، یانی كوانیٚ بەڵگە؟

ئەمە ئەو شتەیە كە من چاوەڕوانی بووم ئۆزۆن بیلێت وا لەكۆتاییدا وتی! ئەی باشە خوێنەری خۆشەویست ئێمەش مافی ئەوەمان نییە بپرسین ئۆزۆن كوانیٚ بەڵگەكانت بۆ ئەو هەموو سووكایەتی و وتە ناشیاوانەی وتت دەربارەی هەركەسێك ڕۆژێك لە ڕۆژان خزمەتی ئەم ئاینە پاكەی كردبێت[2]؟!

پاشان ئۆزۆن فەرموودەیەكی تر دێنێت كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر كەسێكتان نانی خوارد با با پەنجەكانی نەسڕێت تاوەكو ئەیلیٚسێتەوە یاخود كەسێك بۆی دەلیٚسێتەوە.

بەهەرحاڵ ئەم فەرموودەیە ئەگەر بێت و لە بارو زروفێكی تایبەتدا نەبوبێت ئەوا ئەبێت ئەوەمان بیربێت كە ئێستا ئەوەی ئێمە دەیبیستین هی نزیكی(١٥٠٠) ساڵ پێش ئێستایە!!

---

[1] سوێند بەخوای گەورە تاوانی "سیبویە"ەكەم خوێندەوە گریانم دەهات بۆ ئـۆزۆن وا خـۆی كردووەتـە مایـەی پێكەنین بۆ ئەوانەی كە شتێكی كەم لە زمانی عەرەبی دەزانن نەوەك گەشـتبێتنە ئاسـتی تێگەیشـتن لـە كتێبـەكانی ئیمامی عەرەبی "سیبویە"، بەداخەوە كتێبەكەمان ئەوە نەبوو باسی هەڵـە نـەحویی و ڕێزمانیـەكانی ئـۆزۆن بكـەین ئەگینا پڕی بوو لـە هەڵەی ڕێزمانی و بەلاغی، (مەبەستمان كتێبە عەرەبیەكەیە نەوەك ئەم وەرگێڕانە كە لـە كتێبـە عەرەبیەكە هەژارترە)!!

[2] داوام وایە بگەڕێیتەوە بابەتی "ئۆزۆن و قەیرانی سەرچاوە" و جارێكی تر بیخوێنیتەوە، لەسەرەتای كتێبەكەدا!!

لەوەو پێش باسی ئەوەمان كرد كە مێژوو بە پێوانەی ئەمڕۆ ناپێورێت و حوكمی لەسەر بونیاد ناكرێت.

هەروەها بەباشی ئەزانم تیشك بخەمە سەر چەند وتەیەكی ئۆززۆن[١]:

١ – دەڵێت ئەم فەرموودەیە ناسراوە بە فەرموودەی(البزازة) و وەرگێڕیش كردویەتیە(سیپاڵگۆڕینەوە)، من تەحەددای نووسەر دەكەم بیسەلمێنێت كە لە هیچ سەرچاوەیەكدا ئەم فەرموودەیە وای پێ وترابێت، هەر لە بنەڕەتتدا ئەو مانایانەی كە(بزازة) هەیەتی لەگەڵ هیچ ئاماژەیەكی فەرموودەكەدا نایەتەوە(چونكە دیارترینیان بریتییە لە قوماش فرۆش)!!

هەروەها بە هیچ شێوەیەكیش ئەو مانایایەی كە وەرگێڕ هێناویەتی جێی نابێتەوەو لە هیچ سەرچاوەیەكی زمانی عەرەبی شتی وا نەهاتووە، ئیتر كتێبێك نووسەرەكەی ئۆززۆن بێت ئەبێت وەرگێڕەكەشی هەروابێت، ئۆززۆن ئایەتی دروستكرد، ئیتر ئەمە چۆن ناكات؟!

٢ – پاشان ئۆززۆن دەست دەكاتە تانەدان ودوای ئەوەش دەڵێت: چەند جوانە ئەوانەشی كە زەوقێكی سەلیمیان هەیە ڕازییان بكەین، بەپێچەوانەی هاوەڵان.

دەڵێم: باشە ڕازییان بكە وا تۆ خەریكی ئەو كارەیت و ئیسلامت تەواو سەرەوژوور كردووە هەر لەبەر ڕازیبوونی ئەوان ئەگەر هەر خۆشت ئەوان نەبیت!!

﴿ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾ ﴾البقرة

بەڵام هەر ئەوانەی ئۆززۆن ئەمڕۆ پێیان دەڵێت خاوەن زەوقی سەلیم دوێنێ بە میزی خۆیان ددانیان ئەشۆرد و پادشاكانیشیان ساڵی جارێك خۆیان دەشۆرد و شتێك نەبوو لای ئەوان پێی بوترێت سابوون و پاككەرەوە، بەڵام كێشەی ئۆززۆن ئەوەیە لێپێچینەوەی ئێمە دەكات بە هەزاران ساڵ بەڵام مێژووی ئەوانی بیر كردووە!!

---

[١] ع:١٤٧-١٤٨، ك:٢٦٥-٢٦٦

هەروەها دەمەوێت ئاماژە بەوەش بكەم فەرموودەكە بە زۆر ڕیوایەت هاتووەو هیچیان ئەو زیادەی تێدا نییە(أَوْ يُلْعِقهَا)، واتە: یان كەسێك بۆی بلیێسێتەوە.

ئەو زیادەیەش هەروەكو پێشەوا بەیهەقی دەفەرموێت(أو) كە هاتووە بۆ گومانە لە ڕاویەكەوەو ئیبن حەجەر لێوەی دەگێڕێتەوە: " قَالَ الْبَيْهَقِيُّ: إِنَّ قَوْلَهُ " أَوْ" شَكٌّ مِنَ الرَّاوِي ثُمَّ قَالَ فَإِنْ كَانَا جَمِيعًا مَحْفُوظَيْنِ فَإِنَّمَا أَرَادَ أَنْ يُلْعِقهَا صَغِيرًا أَوْ مَنْ يَعْلَمُ أَنَّهُ لَا يَتَقَذَّرُ بِهَا وَيُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ أَرَادَ أَنْ يُلْعِقَ إِصْبَعَهُ فَمَهُ فَيَكُونُ بِمَعْنَى يَلْعَقُهَا يَعْنِي فَتَكُونُ أَو للشَّكّ"[(١)]

واتە: بەیهەقی دەڵێت: وشەی "یان" گومانە لە ڕاویەكەوە و ئەگەر بێت و هەردوو واژەكە هاتبێت ئەوا مەبەست پێی ئەوەیە منداڵێك بیلیێسێتەوە كە بێز ناكاتەوە، یان كەسێك كە بزانرێت بێز ناكاتەوە، هەروەها دەكرێت مەبەستی پێی ئەوەبوبێت پەنجەكانی خۆی بسویێ بە دەمیدا، ئەوكات "یان"ەكە بۆ گومانە.

واتە بە گوێرەی تەفسیری دووەم هەردوو واژەكە یەك مانایان هەیەو ئەوكات كۆكە لەگەڵ تەواوی دەقەكانی تردا كە تەنها ئەوەی تێدایە خۆی بیلیێسێتەوە، نەوەك بیدات بە كەسێكی تر.

ئەگەر لە حاڵەتێكدا بڵێین شتی وا بوەو زانایانیش كردوویانە لە سەردەمی خۆیاندا.

خۆ كەسیان نەهاتوون بڵێن: سوننەتە با هەموو كەس بیكات، وەكو ئۆزۆن دەڵێت كێ دەڵێت سوننەتە با پەنجەی هاوڕێكەی بلیێسێتەوە!

بەڵكو ئەوەتا پێشەوا نەوەوی دەفەرموێت: "مَعْنَاهُ - واللهُ أَعْلَمُ - لايَمْسَحُ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَها فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ فَحَتَّى يُلْعِقَهَا غَيْرُهُ مِمَّنْ لايَتَقَذَّرُ ذَلِكَ كَزَوْجَةٍ وَجَارِيَةٍ وَوَلَدٍ وَخَادِمٍ يُحِبُّونَهُ وَيَلْتَذُّونَ بِذَلِكَ وَلايَتَقَذَّرُوْنَ"[(٢)].

واتە: ماناكەی - خوای گەورەش زاناترە - دەستی نەسڕێت تاوەكو نەیلیێسێتەوە خۆی یاخود بێجگە لەخۆی لەوانەی كە بێزی لێ ناكەنەوە وەكو خێزان یان كەنیزەك ومنداڵ و خزمەتكار، خۆشیان دەوێت و چێژ لەوە دەبەن و بێزی لێ ناكەنەوە.

---

(١) فتح الباري لابن حجر العسقلاني (٥٧٨/٩).

(٢) شرح مسلم (٢٠٦/١٣)، فتح الباري (٥٧٨/٩).

لەوەوپێشیش وتەی پێشەوا ئیبن حەجەر و بەیهەقیمان گێڕایەوەو هەموو زانایان كۆكن لەسەر ئەوەی كە وتمان، بەڵام لێرەدا پێمان خۆشە بپرسین:

باشە ئۆززۆن ئەگەر ئەمەی بەلاوە پیسەو بە زەوقی سەلیمی نازانێت و بێزی لێ دەكاتەوەو بە هۆی گواستنەوەی میكرۆب و نەخۆشی دەزانێت وەكو ئاماژەی ڕاستەوخۆی پێ دەكات، ئەی باشە وەڵامی چیە بۆ ئەو زەوق سەلیمانەی ئەمڕۆ لە وڵاتانی ڕۆژئاوا كە لایان ئاساییە ئەگەر هەر شوێنێكی خێزانیان بلێسنەوە؟

باشە پەنجە لێسانەوە هۆكاری گواستنەوەی نەخۆشی بە زۆری تێدایە یاخود چەندین شوێنی تر؟!

پاشان ئۆززۆن ئەم فەرموودەیەی هێناو دایە پاڵ پوختەی سەحیحی بوخاری و ناوی بابەكەی نەهێناوەو تەنها نووسیویەتی: (أخرجه البخاري في المختصر ٧٣ ـ كتاب الأطعمة)[1] دەزانن بۆچی؟

وەڵام: چونكە دواتر دەڵێت لەناو هاوەڵاندا دەسڕ نەبووەو ئەگەر ناونیشانەكە بێنێت ئەوا بەدیار دەكەوێت و دەستەكەی كەشف دەبێت!

چونكە پێشەوا بوخاری لە ژێر ناونیشانی(بَابُ لَعْقِ الأَصَابِعِ وَمَصِّهَا قَبْلَ أَنْ تُمْسَحَ بِالْمِنْدِيلِ).

واتە: باسی لێسانەوەی پەنجەكان و مژینیان پێش سڕینیان بە دەسڕ[2]!!

ئۆززۆن هەر ئەو خیانەتە ناكات بەڵكو ئەم خیانەتەی وەكو پێشەكی و ڕێخۆشكاركردووە بۆ ئەم خیانەتەی تری كە قرتاندنی دەقی فەرموودەیەكی ترەو ئەیەوێ بڵێ هاوەڵان دەسڕیان بەكار نەهێناوەو دەڵێت: "وەكو جابری كوڕی عبدالله باسیان دەكات و دەڵێت: جاران لەسەردەمی حەزرەتدا، بێجگە لە لەپ و قۆڵ و ژێرپێی خۆمان دەسڕمان شك نەدەبرد، دواییش نوێژمان دەكرد و دەستنوێژمان نەدەگرت" ع: ١٤٨، ك: ٢٦٥ـ٢٦٦

---

(١) ع:١٤٧، ك:٢٦٤

(٢) صحيح البخاري (٨٢/٧)!!

بەڵام ئەگەر دەقی فەرموودەكەی وەكو خۆی بهێنایە ئەوا هەموومان تێدەگەیشتین مەبەست پێی چیە، فەرموون ئەوەش دەقی فەرموودەكە: عَنْ سَعِيدِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ سَأَلَهُ عَنِ الوُضُوءِ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ؟ فَقَالَ: «لاَ، قَدْ كُنَّا زَمَانَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ نَجِدُ مِثْلَ ذَلِكَ مِنَ الطَّعَامِ إِلَّا قَلِيلًا، فَإِذَا نَحْنُ وَجَدْنَاهُ لَمْ يَكُنْ لَنَا مَنَادِيلُ إِلَّا أَكُفُّنَا وَسَوَاعِدَنَا وَأَقْدَامَنَا، ثُمَّ نُصَلِّي وَلاَ نَتَوَضَّأُ»[1].

واتە: سەعیدی كوڕی حارس دەفەرموێت پرسیاری كردووە لە جابری كوڕی عبداللە لەبارەی دستنوێژەوە دوای خواردنێك كە ئاگری بینیبێت، ئەویش فەرمووی: نەخێر، ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) وێنەی ئەو خواردنەمان نەبوو زۆر بەكەمی نەبێت، جا ئەگەر بێت و ئێمە ئەو خواردنەمان لابوایەو دەسڕمان نەبوایە بێجگە لە دەست و قۆڵ و پێمان، پاشان نوێژمان دەكرد و دەستنوێژمان نەدەگرتەوە.

جا سەیركەن ئۆزۆن چۆن دەستكاری دەقەكەی كردوەو بەویستی خۆی گۆڕیویەتی و لە مەبەست لایداوەو جابر مەبەستی ئەوەبووە ئەگەر لەوكاتەدا دەسڕیان لانەبێت بەڵام ئۆزۆن وای لەدەقەكە كردووە كە هەر دەسڕیان نەبووە.

وەرگێڕیش هاوبەشیی ئۆزۆنی كردوەو شاگردێكی بەوەفای بوەو تەنها بەو خیانەتەی مامۆستاكەی ڕازی نەبوەو، وشەی: ( وَأَقْدَامَنَا) ی كردووە بە "ژێرپێمان" ئاخر بۆ خاتری خوا ئەمە لەكەیەوە بووە بە ژێرپێ؟!

ئەمەش تەنها دیمەنەكە ناشرینتر دەكات لەو دیمەنەی كە ئۆزۆن وێنای دەكات، بەڕاستی كەسێك وەریگێڕاوە لە هەمان قوتابخانەی ئۆزۆن گەورەبوەو كەسێكی وەكو ئەو دوانەش پێیدا چووەتەوە!!

پاشان ئۆزۆن فەرموودەیەكی تر دێنێت كە پیاوێكی دەشتەكی دێتە لای پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) و پرسیاری لێ دەكات: كەی قیامەتە؟، ئەویش سەیری بچوكترینیان دەكات و دەفەرموێت: پێش ئەوەی ئەمە پیر ببێت ئەوا قیامەتتان دێت.

---

[1] رواه البخاري (٨٢/٧)، برقم: (٥٤٥٧).

ئەبینین پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) وەڵامێكی دەداتەوەو تێشی دەگەیەنێت كە كەس نایزانێت و ئاگاداری ئەوەشی دەكاتەوە كە هەر كەسەو بە مردنی خۆی قیامەتیەتی و پیاوە دەشتەكیەكەش كە زۆر جار نموونە بەبێ عەقڵی بهێنرێتەوە لە ئەمڕۆی دنیای عەولەمەدا ئەوا نموونە بە دەشتەكی دێننەوە، بەڵام ئەو دەشتەكیە زۆر زوو تێگەیشت و ئۆزۆنیش دانیشتوەو وا دەزانێت مەبەست پێی قیامەتی گەورەیە!

هەروەها ئەوەی ئۆزۆن دەڵێت: ئەگەر مەبەست پێی قیامەتی ئەو پیاوەیە ئەمڕۆ سوودی بۆ ئێمە چیە[1]؟

دەڵێم: سوودەكەی ئەوەیە پێویستە مرۆڤ بزانێت كە تەمەنی كورتەو ئیتر هەر خیانەت و چەواشەكارییەك كە كردویەتی و دەیكات تۆبەیەكی ڕاستگۆیانەی لێ بكات و ئیتر دەقەكان نەشێوێنێت!!

پاشان ئۆزۆن ئەو فەرموودەیە دێنێتەوە كە ئەبو سەعلەبەی خوشەنی(ﷺ) پرسیار لە پێغەمبەری خۆشەویست دەكات(ﷺ) دەربارەی قاپ و قاچاخی ئەهلی كتاب، كە ئەوان بەكاری بێنن؟ پێغەمبەری خواش(ﷺ) دەفەرموێت: ئەگەر بێجگە لەوەتان دەستكەوت ئەوا بەكاری مەهێنن و ئەگەر تەنها ئەوە هەبوو ناچاربوون دوای شۆردنی بەكاری بێنن.

پاشان ئۆزۆن وەكو سیفەتی هەمیشەیی خۆی دەست دەكات بە سەفسەتەو وتەی بێ ماناو دەڵێت ئەی باشە ئەمڕۆ ئێمە لە ئوتێل و فندقەكاندا چی بكەین؟ ئایا داوا بكەین دووبارە بیشۆرنەوە یاخود بڵێین خۆمان دەیشۆرین؟ یان هەر لەم ئوتێلانە دووربكەوینەوە؟ ع: ١٤٩، ك: ٢٦٩

دەڵێم: ئەوەی لە فەرموودەكەدا هاتووە باس لە شۆردنی قاپ و قاچاخیان دەكات چونكە ئەوان گوێ نادەن بە حەرام و حەڵاڵ و مەی و بەرازو چەندین حەرامی تێدا دەخۆن و دەخۆنەوە، بۆیە پێویستە بشۆردرێت.

[1] ع:١٤٨، ك:٢٦٧

بەلاّم ئەگەر پاكبوو ئیتر مسولّمان بەكاری هێنابوو یان ئەهلی كتاب یان كافری ئەسلی، لای جمهوری زانایان دروستەو هیچ كێشەیەكی نیە.

سەبارەت بە ئوتێلەكانیش بنچینە لە هەموو ئوتێل و خواردنگەیەكدا ئەوەیە كە قاپێك بەكارهێنرا بشۆردرێت، ئیتر كە خۆیان قاپەكان دەشۆرن پێویست بە هیچ دوودلّیەك ناكات و كەسیش داوای ئەوەی نەكردووە دووبارە بشۆردرێتەوە یان خۆیان پێی هەستن یان دووربكەونەوە لەو شوێنانە، وەكو ئۆزۆن دەلّێت!!

ئەوەی پێم سەیرە: لەوەو پێش باسی ئەوەی دەكرد و هەولّی دەدا بمانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی كە هاوەلاّن گوێیان نەداوە بە پاك و خاوێنی و دەسڕیان نەبووە، بەلاّم وا ئێستا ڕەخنە دەگرێتەوە لە شۆردنەوەی قاپ و قاچاخێك كە ترسی ئەوەی هەیە بەرازی تێدا خورابێت، باشە ئەگەر فەرموودەكە بیوتایە مەیشۆرنەوە، ئۆزۆن نەدەهات ئەم فەرموودەیە بكاتە پالّپشتی فەرموودەی پێشوو بلّێ ئەبینن كە چۆن گوێیان بە پاكوخاوێنی نەداوەو بۆ ئێرەش بەدوای شتێكی تردا دەگەڕا؟!

پاشان ئۆزۆن دەلّێت: "سەحیحی بوخاری پڕە لە فەرموودە كە لە زۆربەی بوار و ئاستەكاندا دژ بە یەكن، من تەنها بەشێكی كەمم لێرەدا باس كردووە. خۆ گەر بمانەوێ بە وردی و قولّی بچینە ناو بابەتەكەوە بە پشتبەستن بە زانستی بەلاغەت و ڕەوانبێژی، بەڕاستی پێویستمان بە چەندین بەرگ كتێب دەبێت" ع: ١٥٩ ـ ك: ٢٦٩

دەلّێم: ئۆزۆن زۆری لە فەرموودە زانی و لێی حالّی بوو ئەوجا ئەیەوێت وەكو پسپۆڕی بەلاغەو بەیان خۆی دەرخات و بێت دەقەكانیشی پێ هەلّسەنگێنێت، نازانم بۆچی بەلاغە وەهای بەسەر هاتووە هەر نەزانێك ویستی خۆی گەورە بكات ئەوا لاف و گەزافی پسپۆڕی تێیدا لێ دەدات؟!

بەلاّم ئۆزۆن ئەگەر توانیبای تەنها یەك لاپەڕەی كتێبەكەی بەرێك و پێكی و بە شێوەیەكی ئەدەبی و بەكارهێنانی بەلاغە بنوسیایە ئەوكات ئەمانووت بەلّێ دەتوانێت چەندین بەرگی تریش بنووسێت!

واز لە بەلاغە بێنەو بۆ خۆی، بەڵام خۆزگە ئەو هەڵەی ڕێزمانی نەكردایەو دارشتنەكەی تەواوبوایە!

باشە هەر چەند دێڕێك پێش ئێستا ئۆزۆن نەبوو نووسیبوی: "وماذا تفعل في المطاعم والفنادق المنتشرة في كافة أرجاء المعمورة" ع: ١٤٩

باشە بۆ خاتری خوا ئەی ئەو كەسانەی كە شارەزای زمانی عەرەبی و بەلاغەو بەیانن پێمان ناڵێن: " المعمورة " سیفەتە بۆ چی و بۆچی ئا لەم دوایەوە هاتووە؟

ئەگەر بڵێ سیفەتە بۆ " أرجاء " ئەوا ئەبوو وەكو یەك بن یان بە ناسراوی یان بە نەناسراوی هەردووكیانی بهێنایە، ئەگەر بڵێت: سیفەتە بۆ " المطاعم والفنادق" ئەی ئەو هەموو دابڕان و نێوانە بە تێكڕای هەموو زەوق سەلیمانی بەلاغە شتێكی لاواز و ڕەكیك نییە بەبێ ئەوەی مەبەستێكی لە پشتەوەبێت، سەرەڕای ئەوەی ئەبێتە سیفەت بۆ دوو شت ئەوانیش " المطاعم" و"الفنادق" ئەی بۆچی سیفەتەكە تاكەو نەكراوە بە موسەننا و بوترێت: "المَعمُوْرَتَيْنِ"؟!

سوێند بەخوا كاتێك ئەم وتەیەی ئۆزۆنم بینی كە باسی بەلاغە دەكات پێكەنینم هات و وتم باشە ئەمە حاڵێتی لە بابەتە سەرەتاییەكانی زمان ئەی تۆ بڵێی لە بەلاغەو بەیان حاڵی چۆنبێت وا بانگەشەی بۆ دەكات[1]!!

مەگەر ئۆزۆن نییە یەك پەرە دوای ئەو بانگەشە گەورەیە دەڵێت:

"رأينا في الأحاديث الواردة سابقا أمثلة على ذلك" لا: ١٥٢ پەراوێزی(١)

باشە لەبەرامبەر "رأي" ئەبێت بڵێ: "أمثلة" یان "مثال" كوان ئەوانەی عەرەبی دەزانن وەرن ئەم كوفرە زمانەوانیەی ئۆزۆن ببینن!!

باشە هەر ئۆزۆن نەبوو نووسیبووی: "لم يقبل الرسول الكريم ـ حسب البخاري ـ إلا باتباع الناس له" لا: ٨٥

---

[1] زانستی عەروز و قافیە كۆتا زانستە لە زماندا دەخوێنرێت و پێش ئەوانیش بەلاغە بە هەر سێ جۆرەكەیەوە (معانی،بدیع، بیان)، بەڵام ئۆزۆن كاتێك ژماردویەتی تەنها بەیان و مەعانی باس كردووە لە عەرەبیەكەداو وەرگێڕ نەیهێناوە!

باشە ئەو باسی بەلاغە دەكات بۆ ڕەچاوی ئەوە ناكات كە كورتبڕبێت و "يقبل" بە خۆی تەعەدا دەكات و بنووسێت: "لم يقبل الرسول..إلا اتباع" ئیتر ئەم درێژكردنەوەیە چیە؟!

هەر ئەو نەبوو لە فیعلی "أشار" بە پیتی "لام" تەعەدای كردبوو، لە كاتێكدا پاراو ئەوەیە بە "إلى" تەعەدای پێ بكرێت؟ نووسیویەتی: "هناك الكثير من الأحاديث التي أشرنا لبعضها" لا: ٤١

باشە ئەو نەیدیوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا﴾ مريم: ٢٩

دەی كەواتە ئەبوو بنووسێت: " أشرنا إلى بعضها "!

باشە هەر ئەو نییە نووسیویەتی: "من يبحث الأحاديث المتعلقة بالمرأة.." لا: ١١٣

لە كوێن ئەوانەی كە عەرەبی دەزانن با پێمان بڵێن: "يبحث" بە خۆی تەعەدا دەكات یان بە حەرفێكی جەڕ و ئەبێت لەوێدا بڵێت: "من يبحث عن الأحاديث.."؟!

باشە هەر ئەو نییە دەڵێت: "تعارض كثير من آيات الذكر الحكيم من ذلك الحديث" پ: ٣، لا: ٩٢

باشە ئەی هاوار "مع ذلك الحديث" یان "من ذلك الحديث"؟!

ئەمە تەنها چەند نمونەیەكی كەمە لەو هەڵەو پەڵە زۆرە زمانەوانی و ڕەوانبێژییانەی كە زەكەریا ئۆزۆن كردویەتی، خۆزگە ترسی درێژبوونەوە نەدەبوو، هەموویم بهێنایە بۆ ئەوەی خوێنەر باش بزانێت ئەم كەسە تەنها بانگەشەیەو هیچی تر، ئەمە حاڵیەتی و باسی نووسینی چەندین بەرگیش دەكات لە ڕەخنەی بەلاغەیی، ئەمە حاڵیەتی و كتێبی تاوانی "سیبویە" دەنووسێت كە لە هەموو كتێبەكەدا ئەلیف بۆ یائی نەزانیە[1].

پاشان ئۆزۆن چەند فەرموودەیەك دەهێنێتەوە كە گوایە دژی یەكن و تەنها ئاماژەیان پێ دەكات و لەسەریان ناوەستێ، جا ئەگەر لەسەریان بوەستایە بێگومان ئێمەش پشتگوێمان

---

[1] ئۆزۆن هەموو كتێبەكانی چەواشەو خیانەتە، خۆزگە دەرفەت دەبوو وەڵامی تاوانی شافیعی و سیبوەیهەكەشم بدایەتەوە، چونكە چی خیانەت و نەزانیەك لێرەدە بەرجەستەیە، لەوێدا نەزانی زیاتر و خیانەتێكی بێ شوماریشی كەڵەكە كردووە.

نەدەخست، بەڵام لەترسی ئەوەی كە كتێبەكە لەوە درێژتر نەبێتەوە ناچارین وازیان لێ بێنین[١].

بەڵام تەنها یەك فەرموودەیان دەهێنین كە لەسەری وەستاوەو دەڵێت: حیكمەت و ئامانج لەم فەرموودەیە چیەو دەیەوێت چیمان پێ بڵێت؟ حدیث جابر قال: ( كنا نعزل والقرآن ینزل)

واتای فەرموودەكە: (جابر) دەڵێت: ئێمە وەختی خۆی دەچووینە لای خێزانەكانمان و لەكاتی ئاوهاتنەوەدا ئاوەكەمان فڕێ دەدایە دەرەوەی منداڵدانی فڕێ دەدا(بۆ ڕێگەگرتن لە زگپڕبوو)، قورئانیش پەیتا پەیتا دەهاتە خوارەوە." ع: ١٥١، ك: ٢٧١

دەڵێم: كێشەكە لە تێگەیشتنی عەلامەی زمانەوان و ڕەوانبێژ ئۆزۆندایەو ئەگەر ئەو لە زمانی عەرەبی تێگەیشتبا نەك پسپۆڕی بەلاغەبێت و لە بواری نەقدا دەستی باڵای هەبێت و چەند بەرگێك بنووسێت، ئەوا تێدەگەیشت كە بابەتەكە چیە!!

جابر(رضي الله عنه) پرسیاری ئەوەی لێ دەكەن ئایان ڕێگەگرتن لە منداڵبوون كارێكی شیاوە؟ ئەویش دەفەرموێت ئێمە ئەو كارەمان دەكرد و قورئانیش دادەبەزی، یانی ئەگەر حەرام و یاساغ بوایە ئەوا ئایەتی لەسەر دەهات و قەدەغەی دەكرد، یان پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی دەكرد!!

بەڵام وەرگێڕیش(ینزل) ی كردووە بە پەیتا پەیتا بۆ ئەوەی مەرامی ئۆزۆن زیاتر بێتە جێ و ئەو مانایەی بداتێ: كاتێك ئەوان خەریكی كاری ژن و مێردایەتی خۆیانن قورئان هاتووەتە خوارو لەو مەقامەدا هاتووە!!

ئیتر من نازانم و ئێوە خۆتان بڕیاری هەڵسەنگاندنی ئاستی زانستی ئەم كتێبە بدەن و من تەنها ئەتوانم قسەی لەسەر بكەم!

---

[١] هەرچی ئەو فەرموودانەشە كە ڕەخنەی هەیە لێیان یاخود باسی حاڵەتی تایبەتە، یان كێشەكە لە تێگەیشتنی ئۆزۆندایەو ئەگەر خوای گەورەش دەرفەتی ڕەخساند بە درێژیی بە بابەتێكی دەنگی بڵاوی دەكەینەوەو لە یوتیوبەكەشی خۆشمان دایدەنێین لەگەڵ فەیسبووك.

## لە نێوان ئێستاو ڕابردوودا

لەژێر ئەم ناونیشانەدا ئۆزۆن دوای ئەوەی هێرشێكی زۆر دەكاتە سەر مسوڵمانان و دەڵێت ئەوان ڕابردوو بە پیرۆز ڕادەگرن و قسەكردن لەسەری بڤەیەو هەركەسێك قسەی لەسەر بكات ئەوا پاڵدەدرێتە پاڵ بەكرێگرتەیی و ... بەڵام ئەو ـ پشتی بەخوای گەورە بەستووەـ باكی بە هیچ شتێك نیەو مەبەستیشی ڕاستی دەركەوتنە[1].

دەڵێم: كەس نەیوتووە مێژوو پیرۆزەو نابێت قسەی لەسەر بكرێت، بەڵام وتوومانە درۆ بەدەم "مێژوو"وە مەكەن و هەڵبەستراوەكان لە ڕاستەكان جیا بكەنەوەو لاوازەكانمان لێ مەكەن بە جێگیرر و یەقین، هەروەها پشت لە ڕاستەكان مەكەن و دان بنێن بە چاكەی هاوەڵان و شوێنكەوتووان و كارە چاكەكانیاندا، بەڵام نەمانوتووە ئەوان مەعسوم و بێ هەڵەن!!

جا ئۆزۆن فەرموودەیەك دێنێتەوە كە ئەبو عومەیر یاری بە باڵندەیەك كردووەو پاشان ئەوە باس دەكات كە حوكم و بڕیارە شەرعیەكان كە لەو فەرموودەوە دەركراون دەگەنە چل بڕیار یاخود پەنجا بڕیار، ڕەخنەش لەوە دەگرێت كە بیر لەوە نەكراوەتەوە كە ئەو باڵندەیە ڕەنگە بمرێت بەدەستی ئەو شیرەخۆرەیەوە!

دەڵێم: ئەمجارەیان ئۆزۆن وەكو پارێزەر لە مافی ئاژەڵ دێتە پێشەوەو ئەیەوێ مافەكانی ئاژەڵمان پێ بناسێنێت، بەڵام ئەو بێ ئاگایە لەوەی كە هەموو زانایانی ئیسلام لەسەر پێدانی مافی ئاژەڵ كۆكن زۆر لەوە زیاتر كە ئەمڕۆ لە ڕۆژئاوا هەیە، كە ئەوان بەهای مرۆڤی غەیرە خۆیان لەلا نییە چ جای بگاتە بەهای ئاژەڵ!!

ئەبێت ئۆزۆن باش ئەوە بزانێت مسوڵمانەكان پەروەردەی ئەو سەحیحی بوخاریەن كە تێیدا هاتووە ئافرەتێك لە بەر كۆتكردنی پشیلەیەك و بێ خۆراككردنی دەچێتە دۆزەخەوە!

---

[1] ع:١٥٤، ك:٢٧٤

پیاوێك لەبەر ئاودانی سەگێك دەچێتە بەهەشتەوە! سوپای مسوڵمانان نزیكی مانگێك دوا دەكەون چونكە باڵندە لانەی كردووە لەسەر خێمەو چادرەكانیان و ئەوانیش ئامادە نین خۆیان كۆبكەنەوەو لانەیان بشێوێنن!!

ئەبێت ئۆزۆن ئەو باسە ڕوو بكاتە ڕۆژئاوا كە تاوەكو ئێستا لە وڵاتی ئیسپانیا ژمارەی ئەو گایانەی كە بوونەتە قوربانیی حەزی ئەوانو یاری پێكردنیان(٧٢٠٠) گایە!!

ئەمە لەكاتێكدا ئیسلام ڕێگەی گرتووە لەوەی كە بكرێنە نیشانەو بدرێن بەشەڕداو بەدیاریانەوە دابنیشن بۆ ڕابواردن و كات بەسەربردن!

ئەگەر ئۆزۆن ئەمانەت پارێزیەو بچوایەتەوە سەر سەحیحی بوخاری ئەوا زیاتر لە پێنج بابی دەبینی لەسەر ئاژەڵ و مافەكانیان، هەروەها سەبارەت بەوەشی كە "ئەو زەرنەقوتەیە كێشەی نییە بخرێتە بەردەستی ئەو شیرەخۆرەیەو ئازاری بدات و زانایان بیریان لەوە نەكردوەتەوە"!

دەڵێم: دیسانەوە وتەی باخەڵی خۆیەتی و ئەوەتانێ پێشەوا قورتوبی دەفەرموێت: "الَّذِي رُخِّصَ فِيهِ لِلصَّبِيِّ إِمْسَاكُ الطَّيْرِ لِيَلْتَهِيَ بِهِ وَأَمَّا تَمْكِينُهُ مِنْ تَعْذِيبِهِ وَلَا سِيَّمَا حَتَّى يَمُوتَ فَلَمْ يُبَحْ قَطٍّ "[1].

واتە: ئەوەی كە ڕووخسەتی پێدراوە گرتنی باڵندەیە بۆ ئەوەی منداڵ یاری پێبكات، بەڵام زاڵكردنی منداڵەكە بەسەریداو ئازاردانی بەتایبەت بگاتە ئەوەی مردار ببێتەوە هەرگیز ڕێگەی پێنەدراوە.

دواتر ئۆزۆن فەرموودەیەك دێنێت و ئەیەوێ وەكو تانەیەك لەوەی كە زانایانی ئیسلام كردوویانەو حوكم و سوودی فەرموودەكانیان دیاریكردووە، هەڵدەستێ بە پێدانی كۆمەڵێك حوكم و بە ویستی خۆی هەندێك تەفسیریی بێ مانای ئەداتێ كە لە(٢٥) خاڵدا كۆیكردوەتەوەو ئێمەش لەسەر هەندێك لەو خاڵانە دەوەستین.

---

[1] فتح الباري (١٠/٥٨٦)، كوثر المعاني للشنقيطي (١١/٤٤٥)، مؤسسة الرسالة، بيروت ،الطبعة: الأولى، ١٤١٥ هـ - ١٩٩٥ م.

دەقی فەرموودەكە ئەوەیە كە حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) مەی دەخواتەوەو سەرخۆش دەبێت و پاشان چەند وشترێكی عەلی كوڕی ئەبی تالیب ی برازای سەردەبڕێت بەبێ پرس[١].

ئۆزۆن(٢٥) خاڵ باس دەكات كە هەموویان ئاماژەی ڕاستەوخۆی پێدراوەو هیچ پێویست بەوە ناكات بكرێتە خاڵ و پێی بوترێت دەرهێنانی حوكم، هەروەها ئەوەی لێوە دەرهێناوە گوایە دروستە مەی بخورێتەوە ئەمە لە كاتێكدا ئەو ڕووداوە هی كاتێكە هێشتا مەی قەدەغە نەكراوە لەگەڵ چەندین وتەی تری بێ مانا وەكو دروستی گریان بۆ وشتری كوژراو و..."[٢]

بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر سەیری كتێبەكانی فەرموودە بكەین سوود و حوكمێكی بەرچاویان دەرهێناوە كە هەرگیز كەسانی وەكو ئۆزۆن بە لاشیا ناچن و هەندێكیشیان بەلێ هەر وەكو ئۆزۆن دەڵێت پێویستی نەدەكرد بكرێت بەخاڵ، بەڵام پێویستیش بەو هەرایەی ئۆزۆن ناكات كە وا نیشان دەدات هەمووكاروبارو خزمەتی ئەو زانایە تەنها ئەو خاڵە بووەو لێی گەورە دەكات!

بەڵام ئەوەی كە پێویستە لەسەری بوەستین ئەم چەند خاڵەیە:

٢٢ – نابێت حەدی مەی بەسەر سەرخۆشدا جێبەجێ بكرێت ئەگەر سەرخۆشەكە مامی پێشەوا یاخود دادوەربوو[٣].

دەڵێم: ئەمە ئیتر بەسە بۆ ئەوەی بزانێت ئۆزۆن لەوپەڕی نەزانی و نەشارەزاییدایە بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، چونكە هەموو مسوڵمانێك دەزانێت كە حەمزە لە نیوەی شەوالی ساڵی(٣)ی كۆچی لە ئوحود دوای ئەوەی(٣١) كەسی لە كافران كوشت شەهید

---

[١] رواه البخاري (٤/٧٨)، برقم: (٣٠٩١).
[٢] ع:١٥٦-١٥٧، ك:٢٧٨-٢٨٠
[٣] ع:١٥٧، ك:٢٨٠

كرا[١]، هەروەها سورەتی مائدەش كە باسی حەرامبوونی مەی تێدایە بەیەكجاری ساڵی(٨)ی كۆچی هاتە خوارەوە یانی نزیكی(٥) ساڵ دوای وەفاتی حەمزە[٢]، باشە تۆ بلێی ئۆزۆن مەبەستی ئەوەبێت لە گۆڕەكەی ئەو كەڵە پیاوەی ئیسلام دەربهێنێت لەسەر شتێك كە لەسەردەمی خۆیدا تاوان نەبوەو حەدی لێبدرێت؟!

ئەم جۆرە وتانە هەر شیاوی ئۆزۆنەو لە هیچ كەسێكی شارەزا ناوەشێتەوە بیانكات!!

٢٣ – گەر مامی دادوەر وشتری كوشت یان شتی تر نابێت غەرامە بكرێت[٣].

دەڵێم: لەفەرموودەكەدا شتی وا نیەو بەڵكو ئەگەر فاتیمەش دزی بكات ئەوا یاسای ئیسلام ئەوەیە دەستی ببڕێت و ئەوەش دەقی فەرموودەی پێشەوا بوخارییە، بەڵام ئەوەی كە لە فەرموودەكەدا هاتووە ئەوەیە حەمزە سەرخۆشبوەو پێغەمبەری خۆشەویستیش(ﷺ) قسەی لەگەڵ نەكردووەو گەڕاوەتەوە چونكە لە كاتی بێ ئاگاییدا هەر شتێك بلێیت بێ سوودە، بەڵام دواتر وەكو لە فەرموودەی تردا هاتووە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) غەرامەی كردووەو پارەی دوو وشتری لێی سەندووە[٤]، بەڵام ئەگەر واشمان دانا غەرامە نەكراوە، لەبەر ئەوە نەبووە كە مامی پێشەوایە، بەڵكو عەلی برازای خۆیبوەو حەتمەن لێی خۆشبووە لەبەر ئەوەی مام لە شوێنی باوكە، یان خۆیان ڕێك كەوتوون.

---

[١] أسد الغابة في معرفة الصحابة لابن الأثير (٢/٥٠)، ت: خليل مأمون شيحا، دار المعرفة ـ بيروت ـ ، ط: الرابعة، ١٤٣٠هـ.

[٢] بەداخەوە زۆرێك لە عەلمانیەكان و نەیارانی سوننەت پێیان وایە قورئان مەی حەرامی نەكردووە، بۆ ئەو بابەتەش بگەڕێرەوە سەر نووسراومان، بەڵگە لە كەلامی حق لەسەر حەرامی عارەق!

[٣] ع: ١٥٧ـ١٥٨، ك: ٢٨٠

[٤] فتح الباري (٦/٢٠١)، ارشاد الساري للقسطلاني (٤/٢١٠)، برقم: (٢٣٧٦)، و (٥/١٩١)، برقم: (٣٠٩٢).

٢٤ – ڕەوایە مامی پێشەوا یان دادوەر سزاكان نەیگرێتەوە، دەشێت ئەم ڕەوایەتییە بۆ ئەو كەسانەش بێت كە لە پایەی ئەودان وەك خاڵ یان باپیر[١]!!

ئەمەش وتەی باخەڵی خۆیەتی و باسمان كرد كە غەرامە كراوەو بە هیچ شێوەیەك جیاكاری لە جێبەجێكردنی سزادا نییە لە ئیسلامدا، هەرچەندە ئۆزۆن هەوڵی ئەوەش بدات و خۆی ماندوو بكات و بیەوێ بەڵگە بێنێتەوە تەنها نیو بەڵگەشی دەست ناكەوێت.

پاشان بەگاڵتەجاری و شێوازێكی بازاڕئامێزانەو دوور لە ماریفەت لەدوای خاڵەكان دەڵێت: "لەبەر ئەوەی من لە ئاستی ئیمامی شافیعیدا نیم و ئەو توانایەی ئەوم نییە بۆ هەڵێنجانی بڕیاری شەرعی لەدەقەكان هەر ئەوەندە باس دەكەم و لێرەدا دەیبڕێنمەوە" ع: ١٥٨، ك: ٢٨١

دوای ئەوە دەڵێت: "گەر سزاو حەدی خواردنەوەی مەی جێی مشتومڕە(ئەمە گەر سزایەكی بۆ دانرابێت هەر) ئەی سزای سەربڕینی وشتر و كوشتنی چەندە؟ " ع: ١٥٨، ك: ٢٨١

دەڵێم: ئەوەی مایەی پێكەنینە ئۆزۆن لە دەقە عەرەبیەكەدا نووسیویەتی(دیة الابل)!! باشە ئەی گرۆهی عاقڵان وشتر خۆی دەكرێت بە دیە یاخود خۆشی دیەی هەیە؟! باشە توخودا تا ئێستا بیستووتانە وشەی(دیة الابل)؟! پاشان ئەوەی لەم كارەی سەیرترە ئەوەیە دەستەواژەی(دیة الإبل)ی بە(أسنان الإبل) ڕاڤە كردووە لە پەراوێزی(١)ی لاپەڕە(١٥٨) وەرگێڕی بەستەزمانیش هێناویەتی لە پەراوێزی لاپەڕە(٢٨١)!

ئەم هەڵە ڕوونانە تەنها بۆ ئەوەیە بە خوێنەران بڵێت من هیچ پاشخانێكی زانستیم نیەو وا بەهەر هۆكارێك بێت تینم بۆ هاتوەو لەسەر ئیسلام دەنووسم، ئەگینا هەر كەسێك كە شارەزاییەكی كەمی لە كتێبە فیقهیەكان هەبێت و تەنها بۆ جارێكیش سەحیحی بوخاری

---

[١] ع:١٥٨، ك: ٢٨١

بینیبێت ئەوا دەزانێت(أسنان الإبل) تەمەنی وشترەكانەو جیاكراونەتەو پۆلێن كراون بەسەر چەندین ناودا وەكو: (الْحُوَارُ) و(الْفَصِيلُ) و(بِنْتُ مَخَاضٍ)و(ابْنَةُ لَبُونٍ)...، هتد.

جا وەكو وتمان نە دیەی هەیەو نە پێشی دەوترێت ئەسنان، ئەوەش جێی ئەسەفە داویەتیە پاڵ سەحیحی بوخاری، ناحەقی مەگرن هەر بەوشێوەیە تێگەیشتووە لە پێشەوا بوخاری(رحمه الله) بۆیە ڕەخنەی لێ دەگرێت، ڕاستی فەرموو پێشەوا عەلی كاتێك فەرمووی:

## هەركەسێك بە شتێك نەزانبێت دووژمنایەتی دەكات!!

دەگەڕێمەوەو بە ئۆزۆن دەڵێم: تۆ وشتر و مرۆڤت تێكەڵكردووەو بە یەكت هەژماركردوون یان ئەوە سەرەنجامی هەركەسێكە كە بیەوێ تانە لە ئیسلام بدات خوای گەورە ئەوەی بەسەر دێنێت كە ڕاست و چەپی خۆی لەیەك نەكاتەوە!

ئەگینا مرۆڤ كاتێك دەكوژرێت پێویستە لە دیەكەیدا وشتر بدرێت یاخود پارە ئەگەر داوای كوشتنەوە نەكەنەوە لە كوشتنی بەئەنقەستدا، بەڵام كوشتنی وشتر غەرامەی هەیە نەك دیە!

بۆ ئەوەشی كە دەڵێت: سزای مەیخواردنەوە جێی مشتومڕە یان ئەگەر هەر سزاشی بۆ دانرابێت.

دەڵێم: تێربووین لە بیستنی چەواشە با ئەمەشی بێتە سەر و بەوپەڕی ناچاریەوە وەڵامی ئەم وتە لاوازەش بدەینەوەو بڵێین: سزاو حەددی مەی ئیجماعی لەسەرە نەوەك جێی مشتومڕبێت، هەروەكو قازی عیاز و مونزیری و بێجگە لەوانیش ئیجماع نەقڵ دەكەن و دەفەرموون: "أَجْمَعُوا عَلَى وُجُوبِ الْحَدِّ فِي الْخَمْرِ وَاخْتَلَفُوا فِي تَقْدِيرِهِ فَذَهَبَ الْجُمْهُورُ إِلَى الثَّمَانِينَ"[1].

واتە: زانایان یەكدەنگن لەسەر حەدی مەیخۆر و خیلافیان هەیە لەسەر بڕەكەی و جمهوری زانایان دەفەرموون: هەشتا دارە.

وەكو بینیتان حەددەكە نەك خیلاف بەڵكو ئیجماعی لەسەرە بەڵام بڕەكەی لەبەر ئەوەی كە فەرموویانە تەعزیریەو دراوەتە پاڵ پێشەوای بڕواداران و ئەو دیاری دەكات، بەیەكدەنگی لەسەردەمی پێشەوا عومەر هەشتا دار جێگیر كراو، ئەم هەوڵەی ئۆزۆنیش بۆ گومان دروستكردن نەزۆك بوو.

---

[1] إكمَالُ الْمُعْلِمِ بفَوَائِدِ مُسْلِم للقاضي عياض (٥/٥٤٠)، فتح الباري (١٢/٧٢)، عون المعبود لشرف الحق العظيم آبادي (١٢/١٢٤)، تحفة الأحوزي للمباركفوري (٤/٦٠٠)، نيل الأوطار للشوكاني (٧/١٧٦).

پاشان دەڵێت: "هەروەها ئیمامی بوخاری ئەم فەرموودەیەی لە باسی فەرزی پێنج یەکدا هێناوە، بۆ نا، چونکە پێنج یەك و فەرزی پێنج یەك لە تالاَنی گرنگترین کاری تالاَنیەکانی فەرمانڕەوایە، مەگەر عوسمانی کوڕی عەففان پێنج یەکی هەموو تالاَنیەکانی ئەفریقای نەبەخشیە زاواکەی خۆی(مەروان کوڕی حەکەم)؟! " ع: ١٥١، ك: ٢٨١

دەڵێم: وا بەرەو كۆتاییەكەی دەڕوات و هەوڵدەدات زۆرترین خیانەت بكات و بڕوا بەخوێنەرانی بكات، بەلاَم بە ویستی خوای گەورە پەردەی لەسەر هەڵدەماڵین و نایەڵین بەسەریەوە بچێت و پێی دەڵێین: پێشەوا بوخاری تەنها لە باسی پێنج یەك(خمس) نەیهێناوە بەڵكو یەكێك لەو بابانە بریتییە لە پێنج یەك چونكە وشترەكانی پێشەوا عەلی لە ماڵی پێنج یەك وەری گرتبوو بۆیە لەو بابەش هێناویەتی، ئەگینا لە چەندین بابی تریشدا پێشەوا بوخاری هێناویەتی وەكو: (بَابُ مَا قِيلَ فِي الصَّوَّاغِ)[1] و(بَابُ شُهُودِ الْمَلَائِكَةِ بَدْرًا)[2]...هتد

پاشان ئۆزۆن ئەگەر سوكایەتی بە پێنج یەك دەكات، ئەوا گاڵتەی بە قورئانی پیرۆز كردووە چونكە خوای گەورە بە دەقی قورئان واجبی كردووە، وەكو دەفەرموێت:

﴿ ۞ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٤١﴾الأنفال

پاشان ئۆزۆن ئەیەوێت بە خیانەتێكی تر كتێبەكەی نابووتتر بكات ئەویش باسی چیرۆكی عوسمانی كوڕی عەفان و پێدانی خومسی ئەفریقایە، تەنها باسی كردووە بێ ئەوەی سەرچاوەكەی بێنێت، بەلاَم لەسەرچاوەكانی مێژوودا بەم شێوەیە هاتووە:

---

[1] صحيح البخاري (٣/٦٠).

[2] صحيح البخاري (٥/٨٠).

١ – لە هەندێك كتێبدا بەبێ سەنەد باسكراوە لەلایەن مێژونووسە نوێیەكانەوە كە چەندین سەدە دوای ڕووداوەكە تۆماریان كردووە[1].

٢ – یان لە ئەبی میخنەفەوە گێڕدراوەتەوە یان واقیدی یان محمدی كوڕی هیشامی كەلبی یان ئیسحاقی كوڕی یەحیای كوڕی تەلحەی تێدایە، بە تێكڕای بۆچوونی زانایان ڕیوایەتەكانیان وەرنەگیراوە:

**یەكێك لە سەنەدەكان:**

" وَحَدَّثَنِي عَبَّاسُ بْنُ هِشَامٍ الْكَلْبِيُّ عَنْ أبيه عن لوط بن يحيى بن أَبِي مِخْنَفٍ عَمَّنْ حَدَّثَهُ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ أَخَا عُثْمَانَ مِنَ الرَّضَاعَةِ وَعَامِلَهُ عَلَى الْمَغْرِبِ، فَغَزَا إِفْرِيقِيَّةَ سَنَةَ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ فَافْتَتَحَهَا وَكَانَ مَعَهُ مروان بن الحكم، فابتاع خُمُسَ الْغَنِيمَةِ بِمِائَةِ أَلْفٍ أَوْ مِائَتَيْ أَلْفِ دِينَارٍ، فَكَلَّمَ عُثْمَانَ فَوَهَبَهَا لَهُ، فَأَنْكَرَ النَّاسُ ذَلِكَ عَلَى عُثْمَانَ"[2].

گێڕانەوەكە لاوازەو وەرناگیرێت لەبەر ئەوەی:

١ – "هیشامی كەلبی" تێدایە كە ڕافیزی بوەو درۆی هەڵبەستووە: ئەحمەدی كوڕی حەنبەل دەفەرموێت: وانازانم كەس شتی لێ وەرگرتبێت، دارەقوتونی دەفەرموێت: وازیان لە گێڕانەوەكانی هێناوە، ئیبن عەساكر دەفەرموێت: ڕافیزی بوەو جێی متمانە نیە، زۆرێكی تریش فەرموویانە ڕیوایەتەكانی وەرناگیرێت[3].

٢ – ئەویش لە "ئەبو میخنەف"ەوە لەوەپێش چەند جارێك باسمانكرد كە حاڵی چۆنە: ئەبو میخنەف لوتی كوڕی یەحیا ڕافیزەبوەو ناسراوە بەدروستكردنی ڕیوایات، تۆ بڵێی

---

[1] المختصر في أخبار البشر لابن شاهنشاه (١/١٦٧-١٦٨)، المطبعة الحسينية المصرية، الطبعة: الأولى، تأريخ ابن الوردي (١/١٤٤)، دار الكتب العلمية – لبنان / بيروت،الطبعة: الأولى، ١٤١٧هـ – ١٩٩٦م.

[2] جمل من أنساب الأشراف للبَلَاذُري (المتوفى: ٢٧٩هـ)، (٥/٥١٤ـ٥١٥)، تحقيق: سهيل زكار ورياض الزركلي، الناشر: دار الفكر – بيروت –، الطبعة: الأولى، ١٤١٧ هـ – ١٩٩٦ م.

[3] لسان الميزان لابن حجر العسقلاني (٦/١٩٦).

ڕیوایەتێك ئەم دوانەی تێدابێت و باس لە عوسمان و بەنی ئومەیە بكات و كەسێكی عاقڵێش وەریبگرێت؟!

هەروەها پێشەوا تەبەریش[1] لە سەنەدەكەیدا "ئیسحاقی كوڕی یەحیای كوڕی تەلحە" تێدایە كە ئەویش حاڵی خۆشتر نیەو: یەحیای كوڕی مەعین دەفەرموێت: لاوازە[2]، ئیبن موبارەك و، وەكیع فەرمویانە لەبەركردنی باش نیە[3]، یەحیای كوڕی سەعیدی قەتتان دەفەرموێت: وەك ئەوە وایە هیچ نەبێت، ئەحمەد و نەسائی دەفەرموون: فەرموودەی لێ وەرناگیرێت[4].

هەروەها ئیبن عەساكر بەلاوازی دەزانێت و دەفەرموێت: " بَلَغَنِي مِنْ وَجْهٍ لا يَثْبُتُ "[5]. واتە: لە ڕێگەیەكەوە پێم گەیشتووە كە جێگیر نیە.

هەروەها ئیبن ئەسیر ناكۆكیەكی لە ڕادەبەدەر باس دەكات لەسەر گێڕانەوە جۆربەجۆرەكانی ئەو ڕووداوە بەبێ سەنەد[6].

نازانم ئیتر ئۆزۆن دڵی بە كوێی كتێبەكەی خۆشەو هەمووی گێڕانەوەی درۆو وتەی ناڕاست و خیانەت و چەواشە، ئەگەر كتێب نووسین بەو شێوەیەبێت ئەوا هەموو كەس توانای سەدان بەرگ كتێبی هەیە لە ماوەی ساڵێكدا بینووسێت!

---

[1] تأريخ الطبري (٤/٣٤٥).

[2] تأريخ ابن معين (٣/١٧١)، برقم: (٧٥٥)، ت: د. أحمد محمد نور سيف، الناشر: مركز البحث العلمي وإحياء التراث الإسلامي – مكة المكرمة، الطبعة: الأولى، ١٣٩٩ – ١٩٧٩

[3] التأريخ الكبير للبخاري (١/٤٠٦)، برقم: (١٢٩٨)، دائرة المعارف العثمانية، حيدر آباد – الدكن،طبع تحت مراقبة: محمد عبد المعيد خان.

[4] ميزان الاعتدال للذهبي (١/٢٠٤)، تهذيب التهذيب لابن حجر (١/٢٥٤)، مطبعة دائرة المعارف النظامية، لهند، الطبعة: الطبعة الأولى، ١٣٢٦هـ.

[5] تأريخ دمشق لابن عساكر (٣٤/٣٢١).

[6] الكامل في التأريخ (٢/٤٦٥).

پاشان دەڵێت: " كۆتایی: پاش ئەم هەوڵ و خستنە ڕووە، لەوانەیە پەرچەكردارەكان بەرامبەری جیاوازبن، هەندێك پێیان شتێكی باش و پەسەندبێت و هەندێكیشی سەرلەبەری ڕەت بكەنەوەو قبوڵی نەكەن، هەندێكیش بێدەنگی و بێلایەنی هەڵبژێرن.

ئەنجامەكان هەرچۆنێكبێت كۆڵم پێ نادەن لە ڕاستگۆیی لەگەڵ خوداو نەتەوەكم لە گەڵ خۆم ئەوەی كە لە نووسینی ئەم كتێبەدا هەمیشە هاوڕێم بوو. " ع: ١٥٩، ك: ٢٨١-٢٨٢

دەڵێم: بێگومان كۆمەڵێكی زۆر باشیش دەبێت كە سەرلەبەری كتێبەكەت ڕەت بكاتەوە، چۆن ڕەتی ناكاتەوە لەكاتێكدا ئەوەی كە دوژمنێكی قین لەدڵی چەواشەكار نەیكردبوو كردت، ئەوەی شتی بێ بنەمابوو وەكو متەواتیرو قەتعی نیشانتداو وێنات كرد و حەقیقەتەكانیشت شاردەوە؟!

بێگومان ئەوەی بڕوات پێ دەكات هەروەكو خۆتەو، ئەوەشی كە دەوەستێ یان لەبەر ئەوەی حەقیقەت نازانێ و ئاستی زانستی ئەوەندە نییە ڕاست و چەوت لێك جیا بكاتەوە، یاخود كەسێك نییە كە خێری پێوەبێت بۆ ئەم ئیسلامە لە كاتێكدا بێدەنگبێت لەبەرامبەر ئەو هەموو خیانەت و چەواشەكاریەی تۆ ئەنجامت دا!!

سەیرە من تاوەكو ئێستا نەمزانیوە ڕاستكردن لەگەڵ خوای گەورەو نەتەوە بەدرۆو خیانەت و چەواشەبێت، ئەمەم تەنها لە سیاسیەكی فێرگای ماكیاڤێلی بیستووەو بینیوە، نەك كەسێكی دیندار و بۆ خوا سوڵحاو و ڕاستگۆ!!

پاشان كۆتایی باسەكەی بە فەرموودەیەك دێنێت و دەڵێ: "ئەگەر عەلی كوڕی ئەبی تالیب خۆی دان بەوەدا بنێ كە ئەوەی پابەندكاری ئێمەیە تەنها قورئان و ئەوەی لەو پەڕاوەدایە كە خوێندویەتیەوەو هیچی دیكە نیە، ئیتر پێشەوا بوخاری ئەو هەموو فەرموودەی بۆچی كۆكردوەتەوە؟ " ع: ١٥٩، ك: ٢٨٢

دەڵێم: دیسانەوە كێشەی ئۆزۆن ئەوەیە تەنها نیوەی فەرموودەیەكی هێناوەو بەتەنها گێڕانەوەیەكی وازی هێناوە، ئەگەر بێت و تەواوی ڕیوایەتەكانی بخوێندایەتەوەو دەقی پرسیارەكەی بهێنایە كە لە ئیمامی عەلی(ﷺ) كراوە، ئەوكات هیچ كێشەیەك لەئارادا نەبوو، هەروەها خوێنەرانیش زۆر بەباشی تێدەگەیشتن لە بابەتەكەو ئەیانزانی كە ئەم چیرۆكە چۆنە!

ئەمەش دەقی فەرموودەكە: عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ مِنَ الوَحْيِ إِلَّا مَا فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ ...»[١].

واتە: ئەبو جوحەیفە(ﷺ) دەفەرموێت: وتم بە عەلی(ﷺ) : ئایا هیچ شتێكتان لەلایە لە وەحی بێجگە لە كتێبی خوای گەورە؟

پاشان پێشەوا عەلی(ﷺ) دەفەرموێت نەخێر هیچ شتێكمان لەلا نییە بێجگە لە قورئان و ئەوەی لەم پەڕاوەدایەو پاشان چەند فەرموودەیەكی پەڕاوەكەش دەخوێنێتەوە.

من پێش ئەوەی ئەم فەرموودەیە ڕاڤە بكەم بە ئۆزۆن دەڵێم: باشە وا لێرەدا دەڵێ: شتێك كە وەحی بێت بێجگە لە قورئان، پێشەوا عەلیش(ﷺ) چەند فەرموودەیەك دەخوێنێتەوە كە ئەویش هەر لە وەحیە، ئایا ئەمە سەرتاپا كتێبەكەی ئۆزۆن هەڵناوەشێنێتەوە كە دەیوت سوننەت وەحی نیە؟

پاشان ئەگەر سوننەت بە هیچ شێوەیەك نەنووسراوەتەوە ئەم پەڕاوەی پێشەوا عەلی ناودەنێن چی؟!

هەروەها ئەوەی كە پێشەوا عەلی دەفەرموێت و ئۆزۆن هێناویەتی ئەوەیە: (وَاللَّهِ مَا عِنْدَنَا مِنْ كِتَابٍ يُقْرَأُ إِلَّا كِتَابُ اللَّهِ، وَمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ).

---

[١] رواه البخاري (٤/٦٩)، برقم: (٣٠٤٧).

واتە: سوێند بەخوا هیچ كتێبێكمان لەلا نییە بیخوێنینەوە بێجگە لە كتێبی خوای گەورەو ئەم پەڕاوە[1].

جا وردبەروە لەوەی كە پێشەوا عەلی(رضي الله عنه) دەفەرموێت: بیخوێنینەوە نەك پێوەی پابەندبین وەكو ئۆزۆن وتەكەی وا لێدەكات!!

واتای فەرموودەكە: ئەوەی كە لە فەرموودەكەوە دیارە ئەوەیە كە پرسیار لە پێشەوا عەلی كراوە(رضي الله عنه) كە خودی خۆی چی شتێكی لەلایەو نووسرابێتەوە، نەك ئەوەی كە لەلای هەموو هاوەڵان چونكە یەكێك لە ڕیوایەتەكان زۆر بە ڕوونی ئاماژە بەوە دەكات و دەفەرموێت: "وَقَالَ مَرَّةً: مَا لَيْسَ عِنْدَ النَّاسِ؟"[2]. واتە: ئەوەی كە لەلای خەڵكی نیە!

هەروەها ئەگەر بێت و مەبەستیش پێی ئەوەبێت كە بێجگە لە قورئان شتێكی تر نییە كە ئایین بێت و پێویست نییە پێوەی پابەندبین، ئەی باشە خۆ هەر لەو پەڕاوەدا چەندین فەرموودە هەیە، ئەگەر ئەو چەند فەرموودەیە ئایین بێت چی ڕێگرێك هەیە لەوەی كە فەرموودەكانی تر كە لای هاوەڵانی ترە ئایین بێت؟ یان خۆ هەموو فەرموودەكانی پێشەوا عەلی(رضي الله عنه) تەنها ئەوە نەبووە كە لەو پەڕاوەدا بووە، ئەی چی دەربارەی ئەو فەرموودانەی كە خودی خۆی لەبەری كردووە؟

ئەی باشە ئەگەر فەرموودە ئایین نەبووە وەكو چەندین جار وتمانەو دەیڵێینەوە، بۆچی ئەو هەموو پەڕاوەی تری هاوەڵانیان بۆ لەناو نەداوە؟ كە بە ئاشكرا فەرموودەیان گێڕاوەتەوە لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە پەڕاوەكانیانەوە؟ یان چی دەربارەی ئەو هاوەڵانەی كە فەرموودەیان نەنووسیوەتەوەو پشتیان بە لەبەركردن بەستوەو ئەوەشی كە لایانبوە گەیاندویانەوەو گێڕاویانەتەوە بێ ئەوەی كەس ڕێگریان بێت؟

---

[1] رواه البخاري (٩/٩٧)، برقم: (٧٣٠٠)
[2] رواه البخاري (٩/١١)، برقم: (٦٩٠٣)، و(٩/١٢)، برقم: (٦٩١٥)

ئەمانە هەمووی بەلایەك، ئەی چی دەڵێن ئۆزۆن و هاوشێوەكانی بەو هەموو ڕیوایەت و گێڕانەوانەی كە گەیشتوونەتە ئاستی متەواتیر لەبارەی جێنشینانەوە كە چەندین جار بابەتێك هاتوەتە پێش فەرموویانە كێ فەرموودەیەكی پێغەمبەری(ﷺ) لەلایە؟

هەروەكو ئەبو بەكر لەبارەی میراتی جەدەوە فەرمووی كێ فەرموودەیەكی لەلایە و موغیرەی كوڕی شوعبە و محمدی كوڕی مەسلەمە هەستان و فەرموویان پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) سێ یەكی دەدایە، ئیتر ئەویش لێی وەرگرتن، هەروەها عومەری كوڕی خەتتاب لەبارەی دیەوە فەتوایەكی داو پاشان زەحاكی كوڕی سوفیان فەرموودەیەكی بۆ گێڕایەوەو لە بۆچوونەكەی خۆی پەشیمان بویەوە!

ئەمانەو چەندین نمونەی تر كە هەموو ئوممەت دەم بەدەم گێڕاویانەتەوەو كەسیش ئینكاری نەكردووە بەلاَم وا لەم كۆتاییەوە نەیارانی سوننەت و ڕۆژهەلاَتناسان و شاگردانیان ئەیانەوێ ئاینەكەمان بشێوێنن، بەلاَم زۆر دوورە بۆیان بچێتە سەر!

## ئۆزۆن كێیە؟

ئەوەی كە هەیە دەربارەی ژیانی تەنها ئەوەندە دەزانین كە ناوی زەكەریا ئۆزۆنەو خەڵكی سوریایەو ئەندازیارە.

سەرەڕای ئەوەی ئەندازیاری و قسەكردن لە سەر بابەتە قوڵەكانی شەریعەتیان نەوتووە، بەڵام ئەوەی گرنگتربێت لەلای ئێمە ئەوەیە: دەمەوێت ئەوە بڵێم من گومانم لە مسوڵمانبوونی ئۆزۆن هەیەو وا دەزانم كە یەكێكبێت لە قەڵەم بەدەستە ناڵخۆرە بێ ویژدانەكان!

ئەمەش دوای وردبونەوەم لە نووسراوەكانی و خوێندنەوەیان بە وردی چاوم بە كۆمەڵێك وتەی كەوت كە زۆر حاشاهەڵنەگرن بۆ ئەوەی كە دەیڵێم.

بۆ نموونە زەكەریا ئۆزۆن لە كتێبی(الإسلام هل هو الحل؟)[1]دا دەڵێت: " ئاین با هەر ئاینێكبێت ـ ئیسلامی، جولەكە، مەسیحی ـ ئاسمانی بێت یان بێجگە لەو، گشتی بێت یاخود تایبەت، هیچ شوێنێك بۆ ئاین نییە لە سیاسەتی وڵاتدا وەكو لە بابەتەكانی كتێبەكەمان بینیمان، عەلمانیەت مانای كوفر و بێدینی ناگەیەنێت یان هاوبەش بڕیاردان، بەڵكو ڕێزی هەموو ئاینەكان و دابونەریتە باوەكان دەگرێت و بەها ڕۆحی و ئیمانی و ئەخلاقیەكەشیان بەكەم نازانێت، بەڵام پێیان دەڵێت: هەمووتان لەدووری سیاسەت و دەسەڵات و نیشتیمانبن... لە دووری شوێنە گشتیەكانی نیشتیمان و وڵات بمێننەوە سەرەتا لەشەقام تاوەكو دەگاتە قوتابخانەو زانكۆو خەستەخانە و كارگە، كۆتاییش بە هەر دەزگایەكی گشتی"[2]

زۆر سەیرە بەلامەوە ئۆزۆن وەها بانگەشەیك دەكات و لەولاشەوە باسی ئەوە دەكات كە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ قورئان!

---

[1] ئەم كتێبەی وەكو تەواو كاری هەرسێ كتێبی تاوان (تاوانی بوخاری، تاوانی سیبویە، تاوانی شافیعی) نووسیوەو تێدا زۆر بە ڕوونی دەڵێت ئیسلام چارەسەر نیەو بەكەڵكی دەوڵەتداری نایەت!!

[2] الإسلام هل هو الحل لزكریا أوزون، ص: (١٤٦)، ریاض الریس للكتب والنشر، ط: الأولى /٢٠٠٧م.

باشە چەند ئایەتی قورئان هەیە لـەسەر ئەوەی بڕیارو یاسادانان تەنها بۆ خوای گەورەیە؟ چەند ئایەت هەیە لـەسەر بێباوەڕی یان فاسقی یان ستەمكاری كەسێك كار بەبەرنامەی خوای گەورە ناكات؟ چەند ئایەتمان هەیە لـەسەر لە ئیسلام دەرچوونی كەسێك كە یاسایەك دابنێت بێجگە لە یاسای پەروەردگارو شەریعەتی ئەو؟ ئیتر یانی چی عەلمانیەت بە مانای كوفرو بیّ دینی نایەت؟

مەگەر هەموو زانایانی ئوممەت لـەسەر ئەوە كۆك نین كەسێك تەشریعێك بكات موخالیف بێت بە تەشریع و یاسای خوای گەورە پێی كافر دەبێت؟

بەڵیّ: ئۆزۆن هاتووە ئیسلامێكی ئەمریكیمان بۆ نمایش بكات كە تەنها لە بابەتی حەیز و نیفاسدا قسە بكات، هەروەكو پیاوی مەردی ئەم ئیسلامە "سەید قوتب"(رحمه الله) دەفەرموێت، بەڵام لە مەڕ حوكمو سیاسەتو دەوڵەتداری بێدەنگو دوورە پەرێز.

ئەو ئیسلامەی ئۆزۆن باسی دەكات جیایە لەو ئیسلامەی كە خوای گەورە دەفەرموێت، دروستكراوەكان موڵكی خۆیەتی و هەر ئەویش حوكم دەكات و تەنها بڕیار هی ئەوە:
﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٥٤﴾الأعراف

هەروەها جیاوازە لەو ئیسلامەی كە تەشریع و یاسادانان شەریكدانانە بۆ خوای گەورە:
﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٢١ ﴾الشورى

دیسانەوە جیاوازە لەو ئیسلامەی كە گوێرایەڵی تەشریع و یاسای پێچەوانە بە شەرع هاوەڵبڕیاردانەو ئەو كەسەشت وەكو خوا پەرستووە، لە كاتێكدا لە سەرپێچی خوای گەورەدا گوێڕایەڵی یاساكانی ئەو دەكەیت و وەكو ئاین شوێنی دەكەویت و كردووتە بە بەرنامەی ژیان، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣١ ﴾التوبة

ئەم ئایەتانەو دەیان ئایەتی تر كە لـەسەر ئەوە هاتوون پێویستە تەشریع و یاسادانان بۆ خوای گەورەبێت و هیچ كەسێك مافی یاسادانانی نیەو بێگومان كافر دەبن، سەبارەت بەو كەسانەشی كە حوكم بەو یاسایانە دەكەن لـە قورئاندا بەم شێوەیە باسیان لێوە كراوە:

- ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾المائدة:
- ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾المائدة
- ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾المائدة

جا حاڵی ئەو كەسەش بەدەر نییە لـەو سێ حاڵەتەو بە گوێرەی ئەو كردەوەی دەیكات و چۆنیەتیەكەی یەكێك لـەو سێ حوكمە(كوفر، فیسق، زوڵم)ی بەسەردا دەدرێت.

ئیتر با ئۆزۆن و هاوشێوەكانیشی هەر خەریكی ژاوەژاوبن!!

پاشان دەڵێت: " بەڵێ وازمان لێبێنن با كۆمەڵگایەكی ئازادی عەلمانی دیموكراتی چاكەخواز دروستبكەین"[١].

نەخێر ئۆزۆن لـە ڕوانگەی قورئانەوە ئەو قسانە ناكات و ئیسلام هەرگیز وەها كەسانێكی پەروەردە نەكردووە، بەڵكو لـە ژێر ڕۆشنایی كتێبی پیرۆز "ئەوەی هی قەیسەرە وازی لێ بێنە بۆ قەیسەر و ئەوەش هی خوایە وازی لێ بێنە بۆ خوا" وەها قسەیەك دەكات و داوای دورە پەرێزی ئایین دەكات لـە وڵات و دەسەڵات و گشت پێگەكان!

نەك تەنها لـە دەسەڵات بەڵكو لـە شەقام و قوتابخانەو زانكۆو تەواوی شوێنە گشتیەكان نە باسی ئایین بكرێت نە بۆنی ئایین بێت!

ئاخر ئەمە وتەی كەسێكی مسوڵمان و ئاییندارە یان وتەی ڕۆژهەڵاتناس و ئەتایستێكی قین لـەڵە بەرامبەر ئیسلام؟!

پاشان ئۆزۆن باسی ئەوە دەكات كە حەزكردن بە مردن و هەستی گیانفیدایی، وڵاتان بەرەو دواوە دەبات، پاشان ڕوو دەكاتە یابان و ئەو فڕۆكەوانانەی كە گیانی خۆیانیان بەخشی بە وڵاتی یابان دژی ئەمەریكاو دەڵێت: "سەرەتاكەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری

---

[١] الإسلام هل هو الحل، ص: (١٤٧).

جەنگی جیهانی دووەم كاتێك كە فڕۆكەوانە گیانبەخەشەكان جێبەجێیان كرد دژی هاوپەیمانان و ئەمریكیەكان، بەڵام بووە هۆی هەرەسهێنانی وڵاتی یابان كاتێك یەكێكبوو لە بەهێزترین وڵاتەكانی جیهان"[1]

سەیركەن چۆن ئەگری و ئەكرۆزێتەوە بۆ ئەمریكای خوێنمژ، بەڵام ڕووداوەكانی ناكازاكی و هێرۆشیماش وەك ئەوەی هەر ڕووی نەدابێت، قەیناكە مادام ئەمریكا ئەنجامیداوە تاوان نیەو كوشتن بەدەستی ئەمەریكیەكان ئێشی نیە!!

پاشان هۆكاری دارووخانی یابان ئەوە نەبوو، بەڵكو ئەو لەشەری بەردەوامدابوو لەگەڵ زۆر بەرەی گەورەی جیهانی، ئەم كردەوە فیداكارییانەش بەرەنجامی ئەوەبوو كە تەواو خۆیان لە لاوازیدا بینیەوە، بۆیە هەستان بەم كارە.

پاشان ئۆززۆن وەك پیاوی كەنیسە دێتە پێشەوەو خەریكی موژدەدان دەبێت و دوای ئەوەی لە كتێبی(لفق المسلمون) تاوەكو دەتوانێ لۆمەی كۆمەڵگەی مسوڵمانان دەكات بە درێژایی مێژوو، هەروەها بە دواكەوتوومان لەقەڵەم دەدات لە هەموو قۆناغەكاندا پاشان ئەم وتانە دەڵێت: " مسوڵمانەكان لە كۆن و لە ئێستاشدا زۆر دوورن لە نوێگەریی ئایینی خودا..كوشتن وسەربڕینی خەڵكی بێتاوان ئازایەتیە.. لەكۆتاییدا: ناتوانم سوپاسی سەرچاوەی ئاینە ئاسمانیەكان نەكەم كە پێشی ئیسلام كەوتووە، بەتایبەت مەسیحیەكانی ڕۆژئاوا كە بەڕاستی مافیانە گەیشتوون بەو پلەو پایەو دەسەڵاتە چونكە ئەوان زۆر بەباشی خوای گەورەیان ناسیوەو لەئاینەكەیان باشترین ئاینی سەدەی بیست و یەكیان هێناوەتە بەر، لە خۆشەویستنی خوداو خۆشویستنی مرۆڤ"[2]

من هیچ هەڵوێستەیەكم لەسەر وتەكانی نیەو تەنها گلەییەكم لە ئۆزۆن هەیە: ئەویش بۆچی پێناسەی خۆیی بۆ نەكردین هەر لەیەكەم كتێبیداو بیوتایە من ئەمەم پێیەو بەمەوە هاتووم؟

---

[1] الإسلام هل هو الحل، ص: (١٤٧).

[2] لفق المسلمون لزكريا أوزون، ص: (٢٠٧-٢٠٩)، رياض الريس للكتب والنشر، ط: الأولى /٢٠٠٨م.

چونكە خۆی باش دەزانێت كە ئەم جۆرە بانگەوازە: "ڕاستەوخۆ لێدانی ئیسلام و پیرۆزییەكانی و ڕەتكردنەوە قەبوڵناكرێت، بەڵكو پێویستە قۆناغ قۆناغ بێتە پێشەوە"

بۆیە ناچار ناسنامەی خۆیی شاردوەتەوەو بە ئاشكرا نەیوتووە من چیم و بۆچی هاتووم!

ئەگەر كەسێك بڕوانێتە كاولكارییەكانی ڕووسیاو ئەمریكاو شەڕە خاچییە پیرۆزەكانیان ئیتر باش دەزانێت كامەیە خۆشەویستی مرۆڤ!! كامەیە بەهای مرۆڤ بوون!!

ئێستاش زۆر بەجوانی بۆت دەركەوت كێشەی ئۆزۆن نە لەگەڵ فەقیهەكانمان و نە فەرموودەناسەكانمان و نە زانایانی زمانەوانی و نە هەندێك لە هاوەڵانە، بەڵكو كێشەی ئۆزۆن لەگەڵ خودی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) و ئیسلام و پەیامی ڕاستیەتی(قورئانی پیرۆز)[1]!

---

[1] ئەگەر كەسێك كتێبی "لفق المسلمون" و "الإسلام هل هو الحق" بخوێنێتەوە ئەوا هیچ گومانێكی نامێنێت لەوەی ئۆزۆن هیچ پەیوەندیەكی دوور و نزیكی بە ئیسلامەوە نیەو كەسێكی دڵسۆزی ئیسلام و مسوڵمانان نیە بەڵكو هەر خودی ئاینەكەی لا ڕەتكراوەیەو بە دواكەوتوویی دەزانێت و دەڵێت هۆكاری دواكەوتنی كۆمەڵگەی عەرەبیە!

زۆر جێی ئەسەفە كە خەڵكانێكی مسوڵمانی خۆمان كەوتونەتە ژێر كاریگەری ئەم كتێبە لاوازەو بڵاوكردنەوەی، بەبێ ئەوەی بزانن هەم بابەتەكە نازانستیەو هەم نووسەرەكەش كەسێكی بەم شێوەیە... هیوام وایە ئەمە ببێتە پەند بۆ هەر نووسەرێكی ترو كتێبێكی تری تازە كە دێتە مەیدان و ویستی گومان درووستكردنی هەیە!!

## پێشەوا بوخاری(رحمه الله) كێیە؟

ناوی تەواوی" أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ بَرْدِزْبَهْ، وَقِيلَ بَذْدُزْبَهْ[1]"یەو لەساڵی(١٩٤ك) لەدایك بووەو لە منداڵیدا كوێربوو، دوای كوێربوونی دایكی زۆری خەفەت دەخوارد و دەپاڕایەوەو نزای دەكرد تاوەكو پێغەمبەر ئیبراهیمی لەخەوندا دی و موژدەی چاكبوونەوەی چاوی كوڕەكەی پێداو بەیانی بەخەبەر هات سەیر دەكات چاوی چاك بوەتەوە.

## دینداریی و پەیوەندیی بەخوای گەورەوە:

لە پێشەوا بوخاریەوە(رحمه الله) زۆر شتی سەرسوڕهێنەر دەگێڕنەوە لەمەڕ پەیوەندی بەردەوامی بەخوای گەورەوە، هەروەكو لێوەی دەگێڕنەوە كە دەفەرموێت: هیچ فەرموودەیەكم دانەناوە لە سەحیحەكەمدا ئیلا دەستنوێژم شۆردوەو دوو ڕكات نوێژم كردووە.

محمدی كوڕی ئەبی حاتەم دەفەرموێت: پێشەوا بوخاری(رحمه الله) بانگكرا بۆ باخچەی یەكێك لە هاوەڵانی و كاتی نوێژی نیوەڕۆ هات و پێشنوێژی بۆ كردن و پاشان هەستایەوە بۆ نوێژی سوننەت و زۆری پێچوو، دوای تەواوبوونی هەندێك لە پۆشاكەكەی هەڵماڵی و بە یەكێكیانی فەرموو سەیری پشتی بكات بزانێت هیچ شتێك دەبینێت؟ كاتێك سەیریان كرد بینیان زەردەواڵە لە شانزە یان حەڤدە شوێن پێوەی داوەو شوێنەكەی دیارە! فەرموویان: ئەی بۆ نوێژەكەت نەبڕی؟ فەرمووی: لە سورەتێكدابووم پێم خۆشبوو تەواوی بكەم[2].

---

[1] ئەو وشەیە بە زمانی ئەوكاتەی ناوچەكە بە مانای جوتیار دێت یان ئەوكەسەی شتێك دەچێنێت.

[2] تأريخ بغداد للخطيب البغدادي (٣٢٢/٢)، ت: الدكتور بشار عواد معروف، الناشر: دار الغرب الإسلامي – ،بيروت،الطبعة: الأولى، ١٤٢٢هـ – ٢٠٠٢ م

هاوەڵانی دەفەرموون: هەموو شەوێك شەونوێژی كردووەو قورئانی خوێندوەو بەردەوام یادی خوای گەورە(ﷻ) لەسەر زمانی بووە.

هەروەها سەبارەت بە ڕۆژووگرتنی سوننەت و بەخشینی لە پێناوی خوای گەورە، كە چەندین جار تەواوی سامانەكەی بەخشیوە، هەر مەپرسە!

## ماندووبوون و گەڕانی بەدوای فەرموودەدا:

لەگەڵ دایكی و برایەكی دێنە مەككە بۆ حەج و دوای تەواوبوونیان براكەی لەگەڵ دایكی دەگەڕێتەوەو ئەو دوا دەكەوێت بەهۆی وەرگرتنی فەرمودەوە و گەڕانی بە ناوچە جیاجیاكاندا، كە لە(١٨٠٠)كەسەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، لە زۆربەی ناوچە جیاجیاكانی خاكی بەرفراوانی دەوڵەتی ئیسلامی، ئەوانیش:

(مەككە، مەدینە، بەلخ، ڕەی، هەرات، نیسابور[١]، عەسقەلان، ناوچەكانی شام، ناوچەكانی حیجاز، ناوچەكانی عێراق، ...هتد)، دەتوانن ئەم شوێنانە لەسەر ئەم نەخشەیە ببینن و بزانن چی ماندووبوون و ئەركێكی كێشاوە و لە بوخاراوە تاوەكو كوێ ڕۆشتووە، كە زۆرێكی بە پێ بڕیوە ئەو ڕێگا سەخت و دژوار و بیابانی وشك و گەرمە:

---

[١] ئەوتريَت ناوي نەيشابوورة و كراوة بة نەيسابوور.




لەم نەخشەیەوە بڕوانە بۆ "بوخارا" لە بەشی ڕاستی سەرەوەو ببینە تاوەكو كوێ ڕۆشتووە بۆ فەرموودەو هەموو ئەو ناوچانەش كەم شوێنی هەیە بە شارو دێهاتیەوە شوێن پێی ئیمامی بوخاری نەدیبێت!

## ئاستی لەبەركردنی:

هاوەڵانی دەگێڕنەوە: سەیرمان هات كە پێشەوا بوخاری لەگەڵماندا دێت بۆ بەسرەو دێتە لای ئەو زانایانەی فەرموودەی لێ وەردەگرین بەڵام هیچ شتێك نانووسێتەوە و پێمان وت: باشە تۆ لەگەڵمان دێیت و هیچ شتێكیش نانووسیتەوە!

تا ڕۆژێك پێی وتین(كە شانزە ڕۆژی بەسەردا تێپەڕیبوو): زۆرتان لێكردم و پێداگریتان كرد ئادەی ئەوەی نووسیوتانە بیخوێننەوە بەسەرمدا، دوای ئەوەی كە ئێمە خوێندمانەوە، ئەو پانزە هەزار لەوەی كە ئێمە نووسیبوومان زیاتری لەبەركردبوو، پاشان ئێمە هاتین و لەبەری ئەو نووسیمان و نووسراوەكانمان ڕاست دەكردەوە، ئیتر لەوێوە زانیمان كە هیچ كەسێك پێشی ناكەوێت.

ئیبن عەدی دەگێڕێتەوە: كاتێك پێشەوا بوخاری(ﷺ) هاتوەتە بەغداد و زانایانی فەرموودەش ناوبانگیان بیستووە، ویستیان تاقی بكەنەوەو بۆیان دەركەوێت ئاستی

لەبەركردنی چۆنە، سەد فەرموودەیان هێناو سەنەد و مەتنەكانیان تێكەڵكرد و دایان بە دە كەسی جیاو كاتێك كە پێشەوا بوخاری هات، هەركەسێك و دە فەرموودەی لێپرسی تاوەكو سەد دانەكە تەواو بوو، هەر كامێكیان فەرموودەكەی لێ دەپرسی، پێشەوا بوخاری دەیفەرموو: نەمبیستووە.

تاوەكو هەموو فەرموودەی خۆیانیان تەواو كرد، پاشان ڕووی كردە كەسی یەكەم و هەر دە فەرموودەكە كە بە تێكەڵی بۆی خوێندبووەوە، ئیمامی بوخاری وەكو خۆی بۆی خوێندەوەو پاشان فەرمووی بەو شێوەیە نیەو ڕاستەكەی پێ وت، پاشان ڕووی كردە هەموویان دانە دانەو گشت فەرموودەكانی بە تێكدراوی و بە ڕاستیشەوە بۆ خوێندنەوە، تاوەكو هەموان دانیان نا بە ئاستی لەبەركردنیدا!

## مەرجی وەرگرتنی فەرموودە لەلای پێشەوا بوخاری(رحمه الله) :

پێشەوا بوخاری(رحمه الله) لەكاتی وەرگرتنی فەرموودەدا كۆمەڵێك مەرجی هەبووەو فەرموودەیەك ئەو مەرجانەی تێدا نەبوبێت ئەوا وەری نەگرتووە، ئەو مەرجانەش:

١ – عەدالەتی گێڕەرەوەكانی: واتە كەسانی متمانەپێكراو و ڕاستگۆبووبن و ناسراو نەبوبێتن بەوەی كە تاوانی گەورەیان هەبوبێت و بە ئاشكراش تاوانی بچوكیان ئەنجام نەدابێت.

تەنانەت لەسەر ئەم خاڵە پێشەوا بوخاری فەرموودەی كەسێك ڕەت دەكاتەوە لەكاتێكدا سەفەرێكی دوورو درێژی كردووە بۆ ئەو فەرموودەیە بەتەنها، بەڵام كاتێك دەبینێت ئەو كەسە تورەكەیەكی بەدەستەوەویەو ئەیەوێت ئاژەڵەكەی بخەڵەتێنێ بەوەی وابزانێت عەلەفی تێدایەو هیچیشی تێدا نیە، بۆیە دەفەرموێت: ئەو ئامادەی درۆبێت لەگەڵ ئەو ئاژەڵەدا چۆن متمانەی بخەمە سەر بۆ فەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم)؟! فەرموودەكەی لێ وەرناگرێت و دەگەڕێـەوە.

٢ – زەبت و لەبەركردن: ڕاویەكە بەوە نەناسرابێت كە لەبەركردنی باش نیەو هەواڵەكان تێكەڵ دەكات.

٣ – اتصال السند: سەنەد و ڕێچەی فەرموودەكە پچڕانی تێدا نەبێت لەسەرەتاوە تاوەكو كۆتایی فەرموودەكەو هەر ڕاویەك لەوەی سەروو خۆی بیستبێت.

٤ – شاز نەبێت: هەم سەنەد و هەم مەتنی پێچەوانەی كەسێكی لەخۆی بەهێزترو متمانەپێكراوتر نەبێت.

٥ – فەرموودەكە هیچ هۆكارێك(علة)ی تێدا نەبێت كە ببێتە هۆی ڕەتكردنەوەی[١].

ئیمامی بوخاری ئەوەشی بەمەرج گرتووە كە پێویستە ڕاوی ئەو كەسەشی دیبێت كە فەرموودەكەی لێوە دەگێڕێتەوەو تۆماری دەكات لە كتێبەكەیدا، بەڵام ئیمامی موسلیم فەرموویەتی تەنها بەوەندەی لەسەردەمێكدابوون، یاخود كراوە یەكتر ببینن و ئەگەری هەبووە ئیتر بەسەو تۆماری كردووە، بەمەش فەزڵی بوخاریی دراوە بەسەر موسلیمدا ڕەحمەتی خوای گەورە برژێت بەسەر هەردووكیاندا.

## وەفاتی:

ئەم ئیمامە خۆشەویستە(رحمه الله) دوای ئەوەی سامانێكی زۆری زانست و ماریفەتی بۆ ئوممەتی ئیسلامی بەجێهێشت لەدوای خۆی، دوای تەمەنێكی پڕ لە سەروەری و شەونخونی و ماندووبوونێكی بێ وێنە، دوای ڕشتنی خوێن و عارەقێكی زۆر، دوای خەرجكردنی هەموو سەروەت و سامان و تەمەنی لاویی بۆ خزمەتی ئیسلام و مسوڵمانان، ئەم زانا خۆشەویستە گەڕایەوە لای خوای گەورە لە(٣٠) ڕەمەزانی ساڵی(٢٥٦ك)، لە دووری نزیك و دۆستانی و بە نامۆیی لە دوای ئەوەی كە كاربەدەستی ئەوكات داوای لێ دەكات بەتایبەت دەرسی پێ بڵێت، ئەویش ڕازی نابێت و پێی دەڵێت: دەبێت بێیتە ناو خەڵكیەوە، بەپێچەوانەی خەڵكی ئەمڕۆ كە لە خوایانە كاربەدەستان ئاوڕێكیان لێ بدەنەوە!!

---

[١] ئەمەش زانستێكی تایبەتەو دەخوێنرێت لە فەرموودەدا كە پێی دەوترێت (علل الحديث) و زۆرێك لەزانایان كتێبیان تێدا نووسیوە.

ئیتر ئەویش لە ڕقا دەربەدەری دەکات و لە لادێیەکی سەمەرقەند دوای ئەوەی نەخۆشی زۆری بۆ هێناوە، دەڵێت خوایە گیان بمگەڕێنەوە لای خۆت حەزم بە دیدارتە، ئیتر لەو کاتەدا وەکو تەواوی پیاوچاکان خوای گەورەش وەلامی داواکەی دەداتەوەو ئەم زاتە گەورەیە دەگەڕێنێتەوە لای خۆی.

ستایشی زانایانی ئوممەت لەسەری:

زانایان بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر وەسفیان کردووەو قەدر و گەورەیی ئەم ئیمامەیان بیر نەکردووە، بەلام ئێمە هەندێکیان دەگێڕینەوە لەبەر زۆری ستایشەکان:

ئیمامی ئەحمەد: خۆراسان وێنەی ئیمامی بوخاری نەخستوەتەوە.

ئەبو حاتەمی ڕازی: بوخاری زاناترینی ئەوانەیە کە هاتوەنەتە عێراق.

ئیمامی موسلیم پێی دەفەرموێت: ڕێگەم بدە با قاچەکانت ماچ بکەم ئەی مامۆستای مامۆستاکان و گەورەی فەرموودەناسان و دکتۆری فەرموودەکان.

زەهەبی: بوخاری شەیخی ئیسلامە، سەرداری زیرەکی و لەبەرکردن و زانست و زوهد و پەرستش بووە.

هەروەها دەفەرموێت: لەدوای خۆی وێنەی خۆی بەجێ نەهێشتووە.

ئیبن کەسیر: ئیمامی بوخاری سەرداری فەرموودەناسانی سەردەمی خۆی و، چاولێکراوە لەگشت سەردەمێك و پێشکەوتووبوو بەسەر هەموو کەسێکی سەردەمی خۆی.

بەڕاستی زۆر لەوە زیاتری شایستەیەو خوای گەورە گۆڕەکەی پڕ نوور و بەرەکەت بکات و بوخاریەکی تریش لەم سەردەمە بخولقێنێت بۆ بەرگریکردن لە سوننەتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)[١].

من لێرەدا شتێکی کەمم باسکرد لە ژیانی ئیمامی بوخاری و ئەگەر بمانەوێ مافی خۆی پێ بدەین ئەوا ئەبێت چەند بەرگێکی لەسەر بنووسین، بەلام لێرەدا هەر ئەوەندە دەتوانین

---

[١] ژیاننامەکەی ئیمامی بوخاریم بە کورتی وەرگرتبوو لە کتێبی: سیر أعلام النبلاء (١٢/٣٩١-٤٧١).

بۆ ئەوەی لەوە زیاتر كتێبەكەمان درێژ نەبێتەوەو لە كۆتایشدا **دەڵێم:** ئەمە ئەو كەسەبوو كە ئۆزۆن "**تاوان**" دەداتە پاڵی و هەموو ڕێزی ئەو بۆ پێشەوا بوخاری و ماندوو بوونی ئەوەیە كتێبێك لە ڕۆژهەڵاتناسان و نەیارانی سوننە كۆپی بكات و نووسینەكانی ئەوان كۆبكاتەوەو ناوی بنێت "تاوانی بوخاری"!!

بەڵام لەو لاشەوە دەڵێت "**برا هیندۆسیەكان**" هەروەها دڵی ژان دەكات بۆ بتپەرستان و هەموو كەسێكی تر با ئەو پەری سەرلێشێواو و گومڕابێت، با بت پەرست بێت و چەندین خوای جیاواز بپەرستێت، لای ئەو ڕێزی تایبەتیان هەیە، بەڵام پێشەوا بوخاری و تێكڕای زانایانی ئیسلامی هەر لەسەرەتای كتێبەكەیەوە ڕەوانەی دۆزەخ كرد و چەند ئایەتی كۆتایی سورەتی ﴿**الأحزاب**﴾ی دابڕی بە سەریاندا!!

ئەو چەند دێڕەی كە لەسەر ئۆزۆن و ئەوەشی كە لە سەر پێشەوای ئوممەت بوخاری(رحمه الله) نووسیم، خستمە كۆتاییەوە بۆ ئەوەی بڕیار دانت لە هەڵسەنگاندنی كتێبەكە بە شێوەی عاتیفەو سۆز نەبێت بەڵكو لەسەر بنەمای بەڵگەبێت، بۆیە هیچیانم نەخستە سەرتاوە.

## كۆتایی:

هێرشكردنە سەر سوننەت هێرشكردنە بۆ سەر قورئان، چونكە سوننەت ڕاڤەكاری قورئانەو هەر بیانوویەك كە ئەهێنرێتەوە بۆ ڕەتكردنەوەی سوننەت ئەگەر لێی وردبینەوە ئەوا ڕاستەوخۆ یەخەی قورئانی پیرۆزیش دەگرێتەوە، بۆیە هەرگیز وا گومان نەبەی بە پشتكردنە سوننەت دەتوانیت ڕزگارتبێت لە لۆمەو تانەی دوژمنانی ئیسلام.

بەداخەوە ئەمڕۆ لەبەر ئەوەی خەڵكانێك توانای ئەوەیان نییە لە دەقەكانی سوننەت تێبگەن و ڕاڤەیان بكەن و بەدوایاندا بچن و ڕاست و لاواز لەیەكتر جیا بكەنەوە، هەر لەدوورەوە خێرا بڕیاری ئەوەیان داوە كە سوننەت پشتگوێ بخەن و ئاوڕی بۆ نەدەنەوە، بەڵام نازانن بەو كارەیان پێگەی شەریعەتیان لەقكردووەو ناتوانن وەكو خۆی تێی بگەن و دەرگا دەكەنەوە بۆ هەواو ئارەزوو، لەهەمان كاتیشدا لەقكردنی پایەی ئیسلامە ...

گوێ بگرە بۆ ئەم وتە زێڕینەی ڕۆژهەڵاتناسی نەمساوی "لیوبۆلد ڤایس"[1] ئەو خۆی باش تێگەیشتووە لەو پیلانەی كە هەیە لەسەر ئیسلام و مسوڵمانان، چونكە خۆی لەناو پیلانەكەدا ژیاوەو دیویەتی، دەڵێت: "سوننەت ئەو هەیكەلە ئاسنییەیە كە قەڵای ئیسلامی لەسەر وەستاوە، ئەگەر تۆ هەیكەلی هەر خانوویەكت ڕووخاند، ئایا تووشی سەرسوڕمانت دەكات، ڕووخانی ئەو خانوەو ترازانی وەكو خانوویەك لە گەڵای دار؟"[2]

لێرەوە پێویستە زۆر بە ئاگایانەترو بابەتیانە تر سەیری گومانی نەیارانی سوننەت بكەین و هەر بانگەوازێك كە دەكرێت بۆ ڕەتكردنەوەی بزانین زەنگی ئاگادارییە بۆ لێدانی ئیسلام بە گشتی، جا ئەگەر ئۆزۆن بێت یان هەركەسێكی تر، ئەوا باش بزانە یان وەكو ئەو تەواوی ئیسلامی قەبوڵ نیەو شەڕەكەی سەرەتای لە فەرموودەوە دەست پێدەكات تاوەكو

---

[1] ڕۆژهەڵاتناسێكی نەمسایی بوو پاشان مسوڵمان بوو پاشان ناوی خۆی گۆڕی بۆ محمد ئەسعد خاوەنی زۆر كتێبە، كە زۆر زانیاری گرنگی تێدایەو پێویستە بخوێنرێنەوە.

[2] الإسلام على مفترق الطرق لمحمد أسد (ليوبولد فايس)، ص: (٨٧)، ترجمة: د.عمر فروخ، دار العلم للملايين، بيروت، الطبعة السادسة، ١٩٨٥م.

پێگەی جێگیر دەبێت و پاشان بەوپەڕی هێزیەوە پەلاماری تەواوی پیرۆزییەکانی ئایین دەدات و هیچ بەهایەکیان بۆ ناهێڵێتەوە، یان بە نەزانیەوە کەوتوەتە ناو ئەو گێژاوەو بەخۆی نەزانیوە.

براو خوشکی خۆشەویستم!

باش بزانە کە هیچ گومانێکیان نییە کە وەڵامی شیاو نەبێت بۆی، بۆیە پێویستە لەکاتی بیستنی هەر وتەیەکیان خێرا بچیت و بەدواداچوون بکەیت، من بانگت ناکەم بۆ تەقلید و شوێنکەوتنی کوێرانە، پێشت ناڵێم چاوی خۆت بگرەو مەخوێنەوە!!

**بەڵام پێت دەڵێم:** خۆت شارەزای ئاینەکەت بکەو بەدواداچوون بکەو خێرا تەسلیمی هەر وتەیەك مەبە کە دەیبیستیت و مەبەرە کۆیلەی ڕازاوەیی وشەو بریقەداریی بانگەشەکان، چونکە زۆر ماری ڕەنگاو ڕەنگ و بریقەدار ژەهری کوشندەیان حەشار داوە!

لەکۆتاییدا داوام لەخوای گەورەیە لە هەڵەو کەم وکورتیەکانمان ببورێت و هەر کارێك دەیکەن لەربەر خاتری خۆی بێت و مەحرومان نەکات لە بینینی زاتی پاکی خۆیی و پێغەمبەری خۆشەویست و تەواوی یارانی...

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

موحتاجی نزای خێرتان

مەروان

## سەرچاوەكان


١. القرآن الكريم

٢. الإحسان بترتيب صحيح ابن حبان، لابن بلبان، ت: الأرنؤوط، مؤسسة الرسالة ـ بيروت ـ ط: الأولى ١٤٠٨هـ

٣. الاتقان للسيوطي، ، اعتنى به: مصطفى شيخ مصطفى، مؤسسة الرسالة، ط: ١ /١٤٣٢هـ.

٤. الإحكام في أصول الأحكام لابن حزم ، ت: أحمد محمد شاكر، الناشر: دار الآفاق الجديدة، بيروت

٥. الآداب للبيهقي، اعتنى به وعلق عليه: أبو عبد الله السعيد المندوه، الناشر: مؤسسة الكتب الثقافية، بيروت – لبنان

٦. أدب الطلب للشوكاني، المحقق: عبد الله يحيى السريحي، الناشر: دار ابن حزم – لبنان / بيروت، الطبعة: الأولى، ١٤١٩هـ.

٧. إرشاد الساري لشرح صحيح البخاري، لشهاب الدين القسطلاني، الناشر: المطبعة الكبرى الأميرية، مصر، الطبعة: السابعة، ١٣٢٣ هـ.

٨. إرشاد الفحول للشوكاني، ت: الشيخ أحمد عزو عناية، دمشق ـ كفر بطنا ـ الناشر: دار الكتاب العربي، الطبعة: الطبعة الأولى ١٤١٩هـ – ١٩٩٩م.

٩. أساس البلاغة للزمخشري، ت: محمد باسل عيون السود، دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان –، ط: الأولى، ١٤١٩ هـ.

١٠. أسد الغابة في معرفة الصحابة لابن الأثير، ت: خليل مأمون شيحا، دار المعرفة ـ بيروت ـ ، ط: الرابعة، ١٤٣٠هـ.

١١. الأسرار المرفوعة في الأخبار الموضوعة للملا علي القاري، ، المحقق: محمد الصباغ، الناشر: دار الأمانة / مؤسسة الرسالة – بيروت

١٢. الإسلام على مفترق الطرق لمحمد أسد(ليوبولد فايس)، ، ترجمة: د.عمر فروخ، دار العلم للملايين، بيروت، الطبعة السادسة، ١٩٨٥م.

١٣. الإسلام هل هو الحل لزكريا أوزون، رياض الريس للكتب والنشر، ط: الأولى /٢٠٠٧م.

١٤. الاصابة في تمييز الصحابة لابن حجر العسقلاني، تحقيق: عادل أحمد عبد الموجود وعلى محمد معوض، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت–، الطبعة: الأولى – ١٤١٥ هـ.

١٥. الإصابة لابن حجر العسقلاني، ط: السعادة ـ القاهرة ـ ط: الأولى ١٩١٠ه.

١٦. أصول الفقه لمحمد المظفر، الناشر: مؤسسة النشر الاسلامي التابعة لجماعة المدرسين بقم، بدون سنة نشر ومكانه. أصول الفقه لآية الله الحسين الحلي، مطبعة ستارة–قم–، الطبعة الأولى ١٤٣١هـ.

١٧. أضواء على السنة المحمدية لأبي رية، ، دار المعارف، ط: السادسة.

١٨. الأغاني، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت – الطبعة: الأولى، ١٤١٥ هـ.

١٩. الاقتراح في بيان الاصطلاح لابن دقيق العيد، دار الكتب العلمية –بيروت– .

٢٠. إكمال المعلم، للقاضي عياض، الدكتور يحْيَى إِسْمَاعِيل، الناشر: دار الوفاء للطباعة والنشر والتوزيع، مصر، الطبعة: الأولى، ١٤١٩ هـ – ١٩٩٨ م.

٢١. الأنوار الكاشفة للمعلمي، ، المطبعة السلفية ومكتبتها / عالم الكتب – بيروت– سنة النشر: ١٤٠٦ هـ / ١٩٨٦ م

٢٢. البحر المحيط لأبي حيان، ت:صدقي محمد جميل، الناشر: دار الفكر – بيروت

٢٣. البحر المحيط للزركشي، الناشر: دار الكتبي، الطبعة: الأولى، ١٤١٤هـ – ١٩٩٤م.

٢٤. البخاري ت: محمد زهير بن ناصر الناصر، الناشر: دار طوق النجاة(مصورة عن السلطانية بإضافة ترقيم محمد فؤاد عبد الباقي)، الطبعة:

٢٥. البداية والنهاية، عام النشر: ١٤٠٧ هـ – ١٩٨٦ م.

٢٦. البداية والنهاية لابن كثير ، ط: دار إحياء التراث، ت: علي شيري، الطبعة: الأولى ١٤٠٨، هـ – ١٩٨٨ م .

٢٧. البداية والنهاية لابن كثير، ط: دار إحياء التراث، ت: علي شيري، الطبعة: الأولى ١٤٠٨، هـ – ١٩٨٨ م.،

٢٨. البداية والنهاية لابن كثير، ت: أحمد ملحم، دار الكتب العلمية، ط: الخامسة، ١٩٨٨م.

٢٩. البدر المنير في تخريج الأحاديث والأثار الواقعة في الشرح الكبير، لابن الملقن، ت: مصطفى أبو الغيط وغيره، الناشر: دار الهجرة للنشر والتوزيع – الرياض– السعودية –، الطبعة: الاولى، ١٤٢٥هـ–٢٠٠٤م.

٣٠. البرهان للزركشي، ت: مصطفى عبد القادر عطا، دار الكتب العلمية –بيروت –، ط:٢/ ٢٠١١م.

٣١. بروتوكولات حكماء الصهيون، ضاثي ضوارقم، دار الكتاب العربي، بقيروت –لوبنان–

٣٢. تأريخ المدينة لابن شبة، حققه: فهيم محمد شلتوت، طبع على نفقة: السيد حبيب محمود أحمد – جدة، عام النشر: ١٣٩٩ هـ

٣٣. تأريخ ابن الوردي ، دار الكتب العلمية – لبنان / بيروت، الطبعة: الأولى، ١٤١٧هـ – ١٩٩٦م.

٣٤. تأريخ ابن معين، ت: د. أحمد محمد نور سيف، الناشر: مركز البحث العلمي وإحياء التراث الإسلامي – مكة المكرمة، الطبعة: الأولى، ١٣٩٩ – ١٩٧٩

٣٥. تأريخ الاسلام للذهبي، ت: الدكتور بشار عوّاد معروف، الناشر: دار الغرب الإسلامي، الطبعة: الأولى، ٢٠٠٣ م

٣٦. تأريخ الثقات لأبي الحسين العلجي، دار الباز، الطبعة: الطبعة الأولى ١٤٠٥هـ–١٩٨٤م.

٣٧. تأريخ الطبري، الناشر: دار التراث – بيروت –، الطبعة: الثانية – ١٣٨٧ هـ.

٣٨. التأريخ الكبير للبخاري، دائرة المعارف العثمانية، حيدر آباد – الدكن، طبع تحت مراقبة: محمد عبد المعيد خان.

٣٩. تأريخ بغداد للخطيب البغدادي، ت: الدكتور بشار عواد معروف، الناشر: دار الغرب الإسلامي –، بيروت، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢هـ – ٢٠٠٢ م

٤٠. تأريخ تدوين السنة وشبهات المستشرقين، للدكتور حاكم المطيري، الناشر: جامعة الكويت، ٢٠٠٣م،

٤١. تأريخ خليفة بن خياط، ت: د. أكرم ضياء العمري، الناشر: دار القلم ، مؤسسة الرسالة – دمشق ، بيروت، الطبعة: الثانية، ١٣٩٧.

٤٢. تأريخ دمشق لابن عساكر، ت: عمرو بن غرامة العمروي، الناشر: دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع، عام النشر: ١٤١٥ هـ – ١٩٩٥ م.

٤٣. تأويل مختلف الحديث لابن قتيبة، ت: نور الله شوكت بيكر، مؤسسة الرسالة –بيروت–، ط:١، ١٤٢٩هـ.

٤٤. تحفة الأحوزي للمباركفوري دار الكتب العلمية – بيروت

٤٥. تخريج الأحاديث والآثار الواقعة في تفسير الكشاف للزمخشري، للحافظ الزيلعي(المتوفى: ٧٦٢هـ)، المحقق: عبد الله بن عبد الرحمن السعد، الناشر: دار ابن خزيمة – الرياض، الطبعة: الأولى، ١٤١٤هـ.

٤٦. تدريب الراوي للسيوطي، حققه: أبو قتيبة نظر محمد الفاريابي، الناشر: دار طيبة

٤٧. تذكرة الحفاظ للذهبي، دائرة المعارف العثمانية، ط: ١٩٥٧م.

٤٨. تعليق أحمد شاكر على ألفية السيوطي، المكتبة العلمية، بدون سنة النشر ومكانه.

٤٩. تفسير الطبري ت: التركي، دار هجر للطباعة والنشر والتوزيع والإعلان، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢ هـ - ٢٠٠١ م.

٥٠. تقييد العلم للخطيب أبي بكر البغدادي، ت: يوسف العش، دار إحياء التراث ـ مصر ـ ط: الثانية١٩٧٤م.

٥١. التكميل لابن كثير، ت: د. شادي بن محمد بن سالم آل نعمان، الناشر: مركز النعمان، اليمن، الطبعة: الأولى، ١٤٣٢ هـ.

٥٢. تلخيص المفتاح، المطبوع مع المطول للتفتازاني، تصحيح وتعليق: أحمد عزو عناية، دار الكوخ للطباعة والنشر، ط: الأولى، ١٣٨٧.

٥٣. تهذيب التهذيب، لابن حجر، تصوير الكتاب الإسلامي ـ بيروت ـ، ط: الأولى ١٩٠٧م.

٥٤. تهذيب التهذيب لان حجر، مطبعة دائرة المعارف النظامية، لهند الطبعة: الطبعة الأولى، ١٣٢٦هـ.

٥٥. تهذيب الكمال للمزي، ت:د. بشار عواد معروف، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت–، الطبعة: الأولى، ١٤٠٠ – ١٩٨٠.

٥٦. تهذيب اللغة لأبي منصور الأزهري، ت: محمد عوض مرعب، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت، الطبعة: الأولى، ٢٠٠١م.

٥٧. الجبال والأمكنة والمياه، للزمخشري، دار الفضيلة للنشر والتوزيع – القاهرة، عام النشر: ١٣١٩ هـ.

٥٨. الجرح والتعديل لابن أبي حاتم، تأريخ أسماء الضفاء والكذابين لابن شاهين، ، ت: عبد الرحيم محمد أحمد القشقري، الطبعة: الأولى، ١٤٠٩هـ/١٩٨٩م.

٥٩. الجرح والتعديل لأبي حاتم الرازي، طبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية – بحيدر آباد لدكن – الهند–، دار إحياء التراث العربي – بيروت – الطبعة: الأولى، ١٢٧١ هـ.

٦٠. جمل من أنساب الأشراف للبَلَاذُري(المتوفى: ٢٧٩هـ)، ، تحقيق: سهيل زكار ورياض الزركلي، الناشر: دار الفكر – بيروت –، الطبعة: الأولى، ١٤١٧ هـ – ١٩٩٦ م.

٦١. جناية البخاري لزكريا أوزون، رياض الريس، ط:١، ٢٠٠٤م.

٦٢. جناية الشافعي لزكريا أوزون، رياض الريس، ط: الأولى ٢٠٠٥م.

٦٣. جناية أوزون عندما يتحدث الجنون، كتاب ألكتروني للدكتور حاكم المطيري في موقعه.

٦٤. حاشية الدسوقي على مغني اللبيب ، دار ومكتبة الهلال –بيروت–، ٢٠٠٨م.

٦٥. حاشية العطار على شرح جمع الجوامع للمحلي، دار الكتب العلمية، الطبعة: بدون طبعة وبدون تاريخ.

٦٦. حاشية مسند الدارمي ت: حسين الداراني، دار المغني، ط:١، ١٤٢١هـ

٦٧. حضارة العرب لغوستاف لوبون، ص:، ترجمة: د.عادل زعيتر، مؤسسة الهنداوي للتعليم والثقافة ـ مصر ـ، ٢٠١٢م

٦٨. خلاصة تذهيب التهذيب للخزرجي، ، حققه: عبد الفتاح أبو غدة، الناشر: مكتب المطبوعات الإسلامية/دار البشائر – حلب / بيروت/الطبعة: الخامسة، ١٤١٦ هـ.

٦٩. خلاصة تذهيب تهذيب الكمال في أسماء الرجال للخزرجي، حققه: عبد الفتاح أبو غدة، الناشر: مكتب المطبوعات الإسلامية/دار البشائر – حلب / بيروت، الطبعة: الخامسة، ١٤١٦ هـ.

٧٠. الدر المصون للسمين الحلبي، ت:الدكتور أحمد محمد الخراط، الناشر: دار القلم، دمشق.،

٧١. روح المعاني للآلوسي، ت: مجموعة، مؤسسة الرسالة، ط:١/١٤٣١هـ.

٧٢. الرَّوضُ البَاسمْ فِي الذَّبِّ عَنْ سُنَّةِ أبي القَاسِمِ لابن الوزير، اعتنى به: علي بن محمد العمران، الناشر: دار عالم الفوائد للنشر والتوزيع.

٧٣. الزاهر في معاني كلمات الناس، لأبي بكر الأنباري، ت: د. حاتم صالح الضامن، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت ـ الطبعة: الأولى، ١٤١٢ هـ –١٩٩٢م.

٧٤. سنن ابن ماجة، ترقيم: عبدالباقي، المكتبة الإسلامية اسطنبول، ط: الأولى.

٧٥. سنن أبي داود، بعناية: عزت الدعاس، ط: الأولى ١٩٦٨.

٧٦. سنن الترمذي، ت: بشار عواد معروف، الناشر: دار الغرب الإسلامي – بيروت – سنة النشر: ١٩٩٨ م.

٧٧. سنن الدارمي، ت: مصطفى البغا، ط: الأولى ١٩٩١م.

٧٨. السنن الكبرى للبيهقي، دائرة المعارف العثمانية، ط: الأولى

٧٩. سؤالات الترمذي للبخاري ليوسف بن محمد الدّخيل النجدي، الناشر: الجامعة الإسلامية، المدينة المنورة، الطبعة: الأولى ١٤٢٤هـ،

٨٠. شرح الكوكب المنير لابن نجار الحنبلي، تحقيق: محمد الزحيلي ونزيه حماد، مكتبة العبيكان، ط: الثانية ١٤١٨هـ

٨١. شرح النووي على مسلم، دار إحياء التراث العربي – بيروت – الطبعة: الثانية، ١٣٩٢

٨٢. شرح نهج البلاغة لابن أبي الحديد، ت: محمد أبو الفضل ابراهيم، الناشر: دار احياء الكتب العربية عيسى البابي الحلبي وشركاه.

